# ئیسلامی سیاسی و

## فیگەرەکانی لە کوردستان و ئیسلامستان

بەرگی یەکەم

نووسینی: محەمەد هەریری

چاپی ئیلکترۆنی یەکەم 2016

# ئیسلامی سیاسی و

## فیگەرەکانی لە کوردستان و ئیسلامستان

### بەرگی یەکەم

نووسینی: محەمەد هەریری

چاپی ئیلکترۆنی یەکەم ٢٠١٦

محەمەد هەریری

ناوی کتێب: ئیسلامی سیاسی و فیگەرەکانی لە کوردستان و ئیسلامستان
نووسەر: محەمەد هەریری
پێداچوونەوە: عومەر عەبدوڵلا
دیزاین: ئەبوبەکر مەلا
نۆرەی چاپ: چاپی یەکەمی ئیلکترۆنی
ساڵی چاپ: ٢٠١٦

# پێرست

# تروسکاییەك لەئاسۆیەکی دووردا!

## پێشەکی لە نووسینی ئیبراهیم مەلازادە

زمان ئەو دونیا ئاڵۆزەیە کە هیچ وتارێك ناتوانێت لە تەلیسمەکانیدا خۆی قوتار بکات و هەژموون پەیدا بکات، مەگەر وتارێك کە پیرۆزێندرابێت و هەموو خەڵك لە ئاستیدا قرِوقپ سەری بۆ بلەقێنن، بەتایبەتیش ئەو وتارەی کە ناتوانێت لە زیندانەکانی مێژوو ڕزگاری بێت و لەناو نازانستیبووندا دەتلێتەوە. وەها وتارێکیش وادەکات هاوپێچ بێت بە گەوجاندن و دۆگمابوون، بەڕەهایی و پیرۆزگەرایی. لێرەشدا ئەرکی ڕەخنەگر ئەوەیە ئەو جۆرە وتارانە ڕووت بکاتەوە، بە خستنەڕووی مەبەستی سەرەکی وتارەکە و قیتکردنەوەی هەموو ئەو پرسیارانەی کە دەکرێت لەبەردەم ئەو جۆرە وتارە مانا و مەغزای تایبەت وەخۆ هەڵبگرن.

لەوانەیە ڕەخنەگرتن لە وتاری دینی سەخت ترین و حاسێ ترین ڕەخنە بێت، بەوەی کە ڕەخنەگر ڕەفتار لەگەڵ حەقیقەتە بە ڕەهاکراوەکاندا دەکات. ڕەفتار لەگەڵ ئەو ئەقڵانەدا دەکات کە پێیان وایە ئەو دیوی دیاردەکان و حەقیقەتەکان دەبینن. ڕەفتار لەگەڵ ئەو ئەقڵانەدا دەکات کە پێیان وایە خودا بە رەهاپی لەگەڵ ئەوانە و بە شەرعیەتی خوداییەوە، شرۆڤەی واقیع دەکەن و دەبێت واقیعیش خۆی بداتە دەست هەموو ئەو ئەگەرانەی کە پێغەمبەران دایان هێناوە و ئەوانیش نوێنەرایەتی دەکەن. بۆیە ئیشی رەخنەگر لێرەدا ڕووتکردنەوەی نەك هەر مانایەکانە، بەڵکو ڕووتکردنەوەی خاوەنەکانیشیانە کە خۆیان بە جاسوسی پۆلیسی خودا تێدەگەن و لەدەرەوەی خودا و دەقە دینیەکانەوە نە کەس دەبینن و نە باوەڕیشیان بەهیچ ڕاستییەکی زەمینی هەیە.

لێرەدا، کاك محەمەد هەریری، بە حوکمی باکگراوندێکی زیاتر لە بیست ساڵەی دونیای خوێندن و شرۆڤەکردنی دەقە دینییەکان، هەڵدانەوە و خوێندنەوەی مێژووی ئیسلام و وردبوونەوە لەو توراسە

ئیسلامیەی کە بەکۆمەڵێك ئاڵقەی نادیار، لەژێر هەژموونی سەدان ساڵ لە دەستهەڵاتە تۆتالیتێرەکانی ئەمەوی و عەباسی و عوسمانییەکان، کە هەزاران گۆڕانکاری ریشەییان بەسەردا هاتووە، هەروەها بە خوێندنەوەی ئەو فیکرە ئیسلامییەی کە لە ناوەڕاستی سەدەی ڕابردووەوە، بەهێزەوە پەڕیوەتەوە وڵاتی ئێمە بەبیانۆی نوێبوونەوە و دۆزینەوەی ڕێچارە، بەڵام لەجیاتی ئەوەی ببێت بە چارەسەر بۆ کێشە لەبن نەهاتووەکانی خەڵکی کوردستان، لەپێشەوەی هەمووشیانەوە ژێردەستەیی و تلانەوە لەبن دەستی برا موسوڵمانە عەرەب و تورك و فارسەکانی، ئەو فیکرە لەخودی خۆیدا بووە بەبەشێك لە کێشەکان و درێژکردنەوەی هەژموونی ئەو نەتەوانەی کە بۆ چرکەساتێکیش بیریان لەوە نەکردۆتەوە کە نەتەوەی کوردیش وەکو ئەوان مرۆڤن و لەدینەدا بران، بۆیە دەبێت چەوساندنەوەیان بوەستێندرێت. ئا لەو دەروازەیەوە، لە چوارچێوەی بەرژەوەندی نەتەوەیی و نیشتمانییەوە، کاك محەمەد هەریری پەڕیوەتەوە ئەودیوی دۆگماکان و هەوڵ دەدات یەکە یەکەی ئەو دۆگمایانە هەڵبوەشێنێتەوە و خاوەنەکانیان لەڕوی مۆراڵ و ویژدان و فیکرەوە ڕووت و قوت بکاتەوە.

سەرەتای ئاشنایەتیم لەگەڵ کاك محەمەد هەریری، دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی هەشتاکان و سەرەتای نەوەدەکان، بەڵام دەتوانم بڵێم ئەم ناسینە بەدوو قۆناغدا تێپەڕ دەبێت. قۆناغی یەکەم تایبەتە بە ژیانێکی ئاسایی جەنجاڵی کۆڵانە هێمن و کپەکانی شاری هەولێر، بازاڕی کتێبەکانی بن قەڵات و دواجاریش بۆ ناوەندی ڕۆژنامەی مانگانەی ڕابوون، کە لەوێدا بەیەکەوە برەومان بە فیکری ڕەخنەیی و لەبەریەك هەڵوەشاندنی دونیای دووقوتبی جەنگی سارد دەدا. چونکە ئەوکاتە دونیای فیکری ئیسلامی زۆر سنوور داربوو، حیزبەکانی دەسەڵات هەژموونیان بەسەر هەموو کایەکاندا هەبوو و لەوان بەدەر کەس و هیچی دی نەدەبیندرا. ئێمە، لە ڕابووندا وەکو ڕۆژنامەیەکی سەربەخۆ و تایبەت بە فیکری ئیسلامی، لەنێوان دوو بەرداشاندا، دەمانناڵاند، بەردێشێکیان سەرەڕۆیی و لەخۆباییبوون و تەقلیدگەرایی ئیسلامییەکان لەفۆرمی بزووتنەوەی ئیسلامی، دواتریش یەکگرتوو و پاشانیش کۆنەپارێزی و نارسسیزم (narcissism)ی سەلەفییەکان بوو. بەرداشەکەی دیکەشیان هی ئەو پەراوێزخەر و ناسیۆنالیستە رادیکاڵ و شۆرشگێڕە لەخۆباییە تازە گەڕاوەکان و ئەو ڕۆشنبیرانە بوو کە بەشێکیان تا ئەمڕۆش برەو بە خۆسەپاندن و کەس بە هیچ هەژمارنەکردن دەدەن. ئەم واقیعە تاڵە، ئێمەی (ژمارەیەکی زۆر لاوی خوێنگەرمی خەمخۆر)، ناچار کرد سەرهەڵبگرین بەرەو هەندەران و لەوێوە، جارێکی دی بە خولێکی متبووندا تێپەڕبین و دوایی بەگوڕ و تین وشیارییەوە ئەگەر بە جەستەش نەبێت، بەڵام بە ڕۆح و فیکرەوە بگەڕێینەوە دونیای نیشتمان و تەواوی ڕۆژهەڵات، گەڕانەوەیەك کە هەموو دیمەن و دیاردە و ئامادەبوونەکان بدەینە بەر نوکی نەشتەری ڕەخنە و پەردە لەسەر ئەو پیرۆزاندن و گەوجاندنەی کە دونیای بزووتنەوە ئیسلامییەکانی کوردستان و ناوچەکەی گرتۆتەوە، هەڵماڵین.

ئا لێرەدا، دوای دابڕانێکی چەندین ساڵە، بۆ جاری دووەم و قۆناغی ناسینێکی تازەدا، کاك محەمەد هەریریم بینیەوە، بەکۆڵێك خەمی گەورەتر، لە واقیعێکی دوور لە وڵات، بەڵام بەرۆح لەوێ ئامادە و بەکۆڵێك نوسین و بەرهەمی زۆرەوە، بە ستایلێکی ڕەخنەئامێز، تا ئاستی لەبەریەك هەڵوەشاندنی ئەو

دۆگما حیزبی و فیکرییانەی کە دەیانەوێت درێژە بە شەوی تاریکی ئێمە بدەن. دەیانەوێت، خەڵك هەمیشە بە چاونوقاندن، سەری ڕەزامەندی بلەقێنن و لەپێناوبەهەشتێك کە ئەو حیزب و کەسایەتییە دینییانە، لەژێر کاریگەری توراسێکی سەقەت و پڕ لە وەهم و نامۆ نامۆ بە کۆمەڵگای کوردی، پۆل پۆل گەنجەکانمان بەرەو ئاشی خوێن و مەرگ بەڕێ بکەن. ئالەو زەمەنەدا، لە زەمەنی هەژموونی فیکری توندئاژۆ، زەمەنی دیماگۆجیەتی سەلەفییە کۆنەپارێزەکان، زەمەنی بەنجبوو و گەوجێنەری حیزبە ئیسلامییە ناهەشەکان، لەئاکامدا زەمەنی قاعیدە و داعش، کە ویستیان و دەیانەوێت دونیامان نقوم بکەن لە خوێن و فرمێسك، ئا لەو زەمەندا، کەسانێکی وەکو کاك محەمەد هەریری لە سەنگەری قەڵەمەوە، بە توانایەکی کەم و سەبرێکی زۆرەوە، مۆمێکی وشیارکەردنەوەیان بەدەستەوە بووە و کۆڵیان نەداوە. بەڵام بێگومان ئەو کەسایەتییە زۆر جیاواز لە کەسایەتی سەرەتای نەوەدەکان، بەتەواوەتی تەپ و تۆزی بەناو فیکری ئیسلامی لەخۆدا داتەکاندووە و ئازایانە و ئازادانە، هەم ئەو فیکرە دۆگما ئامێزە پڕ لە شیرە شیرەی ئیسلامی، هەمیش فیکری ناوەرۆك بەتاڵ و خۆسەپێنەری بەناو سەکولاریزمی توندڕۆی داوەتە بەر ڕەخنە و بەردەوامیشە.

ئەم کتێبە، "کە مەرج نییە من لەگەڵ هەموو وردکارییە خودی و بابەتیەکانی کۆك بم، چونکە هەر کەسە و ستایلێکی تایبەتی بۆ ڕەخنەگرتن هەیە"، بەرهەمی ئەو وێستگانەیە کە لەدوتوێی چاودێریکردنی هەموو ئەو دیاردە و کەسایەتییانەی کە وایانزانیوە، خەڵك گەمژەیە، بەئارەزووی خۆیان برەویان بە وتاری تێکدەر و ناهەشی خۆیان داوە. لەولایەشەوە، کاك مەحەمەد حەریری، لێیان هاتۆتە دەست و وتار و ڕەفتار و کردارەکانیانی داوەتە بەر نوکی ڕەخنەی خامەکەی و ویستوویەتی بەرچاوڕوونی بۆ نەوەی تازە، دروست بکات، بەلانی کەمەوە بە چاونوقاندنەوە خۆیان نەخەنە ناو شەپۆلی ئەو حیزب و وتاربێژ و کەسایەتییە سەرشێوێنەرانەوە.

من لەدڵەوە دەستخۆشی لە کاك محەمەد دەکەم و هیوادارم ماندوونەبێت لە کاروانی ڕۆشنفیکری و خستنەسەر پشتی دەرگا داخراوەکانی هەموو ئەوانەی کە دەیانەوێت بمانگێڕنەوە بۆ سەردەمە تاریکەکان، ئەو سەردەمانەی کە بەئاسانی توانیویانە حەز و چڵێسی خۆیان بەدەست بێنن لەئەنجامی پیرۆزاندن و گەمژاندنی خەڵکی ئاسایی، بەو کەرەستانەی کە لەخودی خۆیاندا هیچیان نە بۆ ئەمڕۆ و نە بۆئایندە پێ نەماوە.

# پێشەکی نووسەر

ئەو وتار و لێکۆڵینەوانە بەشێکن لەو نووسینانەی بەندە لەسەر ئەو دیاردەیە گرنگەی ئیسلامی سیاسی بە هەوڵ و کۆششی تاقە کەسی نوسەر کۆکراوەتەوە و ڕیزبەندی بابەتەکان کراوە لە دوو تویێی ئەو کتێبە..

ئەو بەرهەمانە لە ئەنجامی تێکەڵبوونی کرداری لەگەڵ ئەدەبیات و جولانەوە ئیسلامیەکان هاتۆتە ئارا. یانی سەرەڕای ئەزموونی کرداری، ئەزموونێکی زۆری تیۆری و خوێندنەوە و بەدواداچوون بۆ وتار وکرداری ئیسلامە سیاسیەکان لە گروپ و حزب و تاکەکان لە پشت بیروڕاکاندایە.

زۆر کەس داوام لیدەکەن ئەو کتێبانە حەیفە تەنها ئیلکترۆنی بن و دەبێت چاپ بکرێن، بەڵام بەڕاستی ئەو کارە کەسانیکی هاوکارو دڵسۆزی دەوێت، و پارە و بودجەیەکیشی دەوێت، کەمن وادیارە هیچیانم لەو دووانە نییە. کە کتێبی داعش م دەرکرد، لە چەند لاوە وەعدی چاپکردنی کتێبەکەیان دا لەبەر گرنگی کتێبەکە بۆ ڕۆژگاری ئەمڕۆ، زۆر لەوانەش خاوەن پارە ودەسەلات بوون، و سەری خەڵکیان کاس کردوە بە دروشم لێدان دژی توندڕەوی، کەچی وەعدەکەیان نەگەیاندە سەر و ملیۆنێکیان لە چاپکردنی ئەو کتێبە سەرف نەکرد. من کە نووسین و خوێندنەوە کاتێکی لە سنوور بەدەرم دەگرن بێ ئەوەی هیچ داهاتێکی مادیان هەبێت، ناشتوانم ئەو داهاتە کەمەی دەستم دەکەوێت لەبەر مەشغولیم بەو نووسینانەوە سەرفی کەم لە بلاوکردنەوەیەشیان! جارێك کتێبێکم بلاوکردەوە قەرزم بۆی کرد دامە دەستی نووسەرێکی ئیسلامی هەتا مایەکەی خۆشمی نەدایەوە نەك قازانج، هەر جارەی چەند ساڵ جارێك دەمدیتەوە خۆی لە بابەتەکە دەدزیەوە!

بۆیە ئەو بابەتانەم لە شێوەی کتێبی ئیلکترۆنی بلاودەکەمەوە تا ئەو کاتەی دەرفەتێکی باشی بۆ دەرەخسێ بۆ چاپی کاغەزیش، داخەکەم ئەوەیە سەدان و هەزاران کتێبی بێ ناوەرۆك چاپ دەکرێن کە بوون ونەبوونیان هیچ لە هەل ومەرجەکان ناگۆڕێت، ئیمڕۆ چاپکردنی کتێب لای کەسانێکی نیمچە خوێندەوار بۆتە خولیا، دەیان کتێبی بێ ناوەرۆك چاپ دەکرێن کەچی ئاوڕێک لە کتێبێکی جیدی نادرێتەوە، نە لەلایەن دەزگاکان و نە تاکەکان! بەڵام ئەوەی دڵخۆشکەرە ئەوەیە نووسینی بە سوود جێی خۆی هەر دەکاتەوە هەتا ئەگەر بە کاغەزیش چاپ نەکرێت، خەڵکانێکی خوێندەواری هەقیقی خۆیان بەدواتدا دەگەڕێن، ئەوەشی خۆی خوێندەواریکی جیدی نییە با هەر نەیخوێنێتەوە هیچ کێشەیەك نییە.

من لە پاش تەمەنی هەرزەکاریەوە دووچاری ئیسلامی سیاسی بووم لەگەڵ فیکر وئایدیا و ئایدیۆلۆژیای گەورە بووم، بۆی هەبوو تا مردنیش لەو زۆنگاوە دەرنەهاتبام، بەڵام ئەوەی ڕزگاری کردم کرانەوەم بوو بەسەر هەموو ڕەخنە و بەخۆداچوونەوەکان لە هەر لایەك بێت. لەو ڕێگایەوە سوودم لە ڕەخنەی ئیسلامیەکان و سێکیولارەکان و چەپڕەوەکانیش وەردەگرت، ئەگەر بەپێی ڕاسپاردەکانی ئیسلامی

سیاسیم کردبا خۆم لە خوێندنەوەی ڕەخنەکان ببواردبا، دوور نەبوو ئیستا تا چەناگەم نوقمی ئەو ئیسلامە سیاسیە ماڵوێرانکەر و دین تێکدەرە بووبام، زۆر دڵخۆش بووم کە پاش ساڵانێکی زۆر لە خوێندنەوە و هاوڕیانی لەگەڵیدا بۆم دەرکەوت ئەو ئیسلامە سیاسیە چ وەهم و درۆیەکی گەورەیە بەرۆکی میللەتانی موسڵمانی گرتووە وەك شێرپەنجە بە جەستەی بڵاوبۆتەوە بە خشپەیی لە پەل وپۆی کەوتاندوە.

لەو ڕۆژەوە گەیشتووم بەو قەناعەتە، بڕیارم داوە تا بۆم بکرێت، هاوڕێ و دۆست و برادەران و کەس وکار و لاوانی میللەتەکەم ئاگادار کەمەوە لەو مەترسیە کوشندەیە. هەموو نووسین و بیرکردنەوە و هزرم بخەمە خزمەتیان بەبێ بەرامبەر، چونکە نە بانگەشە بۆ خۆم دەکەم ونە بۆ حزبێک کە من حزبی نیم، نە بۆ شوێن کەوتنی شەخسی.

ئەو وتارانە لە ڕێگای ڕۆژنامە وسایتەکان پەیامی خۆیان گەیاندوە، لە کات و ڕۆژی جیا جیا نووسراون، و لە قۆناغی فیکری جیاواز نووسراون، بۆیە لەوانەیە جاروبار دوو ڕای تاڕادەیەك جیاواز لەسەر بابەتێك ببینرێت، بەڵام مێژووی وتارەکان ئاماژە بۆ قۆناغە فیکریەکان دەکەن، چونکە مرۆڤ نابێت کائینێکی نەگۆڕ بێت! من وەك وتارنووس زۆر ناسراوترم نەك خاوەن کتێب، بەڵام تا بتوانین لە لەناوچوون و پەرش و بڵاوبوون ڕزگاریان کەین، بڕیارمان دا لە دوو توێی کتێبدا کۆیان کەینەوە، هیوادارم توانیبێتم خزمەتێکم کردبێت بەو بوارە، تەنها ئامانجم خۆشبەختی وپێشکەوتنی میللەتەکەمە وهیچی تر...

محەمەد هەریری
٢٠١٦/٦/٧

# چەواشەکاریەکانی عەلی قەرەداغی ئیخوان

## ١- لێکچوونی عەلی قەرەداغی و میر تەحسینی ئێزیدیان!!!

ئەمڕۆ ڤیدیویەکی میر تەحسین بەگی یەزیدیمان لە فێیس بووك بڵاوکردەوە کە لای کەناڵە عەرەبیەکان دەڵێت ئێزیدی کورد نین، هەر لە کومێنتەکاندا کاك جوتیار ڤیدیۆیەکی داناوە هەمان میر تەحسینی یەزیدی دەڵێت ئێمە کوردین خو نکوڵی لە کوردبوونی خومان ناکەین! وا دەزانێت ئێمە عارەبی نازانین!؟؟

شێخ عەلی قەرەداغی یش کە ئەمینداری گشتی یەکیتی زانایانی ئیسلامیە، کە لە کۆر وکوبونەوەکان، ئەوە هیچ یەك ئەسەری کوردبوونی پیوە دیار نییە، نە بە عەبا کەش وفشە خەلیجیەکانی، نە لە بەیانات و دروشم و بڕیارەکانی یەکێتیەکەی، کە هیچ کاریگەریەکی سەرۆکە کوردەکەی پیوە دیار نییە. لە دوا کوبوونەوەی یەکێتیەکە لە بەیاننامەی کۆتاییان باسی روداوی کوشتنی چەند سونەیەکی عەرەبیان کردبوو لە مزگەوتیکی سونە، بەلام باسی ئەو هیرشە دڕندانە گەورەیەی داعش نەکرابوو بۆ سەر کوردستان وەك بڵێی روداوی مزگەوتەکە گەورەتر بێت لە شەڕێکی هەزار کیلومەتری سنوردا!!!! من خۆم لە یەکیك لە کونگرەی ئیسلامیانی عەرەب و کورد بەشداربووم دەمدیت قەرەداغی چەندە انبطاحی و لەسەر چوك کەوتوو بوو بو قیاداتی ئیخوانی میسری و سوری وعیراقی!!!

کەچی کاتێ علی قەرەداغی دەگەڕێتەوە کوردستان، هەر لەناو فرۆکەکەی جلە کوردیە رەسەنەکانی لەبەر دەکات و کۆنگرە وکۆڕ و سیمنارمان بۆ دەبەستێت، شای کوردایەتی یش بە سەپانی خۆی نازانیت!!! ئەویش وەك میر تەحسین وادەزانیت کورد عربی نازانن!! ئەو کوردایەتیە لە کۆڕ وکوبونەوە کانی یەکیتی زانایانی قطر و قرضاوي بکە، ئێمە بە شەهید دانانی پیشمەرگەیی تۆمان لە کوردستان بۆچیە، لە کاتێکدا دنیای ئیسلام بە کافرمان دەزانیت لەبەر شەرکردن لەگەڵ داعش؟!! ئێمە لە جیاتی کوردستان دەمانەوێت لە دۆحە و ئەستەمبوڵ بە یەك وشەش بێت، ستایشی ڕۆلی شەرعی قارەمانانەی پیشمەرگە بکەن، هەرنەبێت خەلکی گەلحۆی جیهانی ئیسلام بە کافرمان نەزانن!!! ئێمە کوردایەتی تۆمان بۆ چییە لە هەولێر وسلێمانی وکەناڵە کوردیەکان کە وەك ئاو فرۆشتنە لە کۆڵانی ئاوفرۆشان؟!!!!

## ٢- پەرۆشی قوربانیانی خەڵك و خەمساردی قوربانیانی کورد!

یەکێکی تر لە چەواشەکاریەکانی شێخ علی قەرەداغی، ئەوەیە دەبێت بەردەوام بەبیری بهێنیتەوە کە کوردە و دەبێت هەڵوێستی چۆن دەردەبڕێت بەرامبەر مزگەوتێکی بچوک لە کوێت، و ڕووداوێکی بچوك لە تونس، هەر نەبێ بەقەد مزگەوتە بچووکەکەی کوێت بایەخ و گرنگی بدە بە کۆبانێ، کە لەبەر چاوی

ئەودا لە هەمان ساتی نووسینیدا هێرشی وەحشیگەری لەسەری بووا!
دێت بە پەلە کۆمێنتی کورت و پڕ مانا و سۆزداری و پشتگیری دەنووسێت بۆ کوێت و غەزە و تونس و تورکیا هەرچیەك ڕوو بدات، بەڵام کە بە بیری دەهێنینەوە بۆ لەسەر کۆبانێ قسە ناکەیت، کابرا دەڵێت: کۆبانێ پێویستی بە بەیاننامەیەکی توند هەیە و لە چاوەڕێی یاساناسەکانی خۆمانین، تا پێیدابچنەوە و بینێرین بۆ لایەنە نێو دەوڵەتیەکان ومافپەروەر و مرۆڤ پەروەرەکان!" باشە یا شێخ نەدەکرا دوو ڕستەشت بۆ کۆبانێ نووسیبا تا ئەو پێداچوونەوەیە دەکرا؟! یان ئەوە بیانووی پاکانە کردنە بۆ بێ دەنگیەکەت و فەرامۆشکردنت بۆ برینی خوێن لێ چۆڕاوی کۆبانێ؟!
لەسەر پۆستێك کە چەند وێنەی قوربانیانی کۆچکردنی بەسەرەوەیە نووسیویەتی:
"هێشتا دەریا لاشەی منداڵانی بێ گوناح دەردەدات،کە ڕایان کردوە لە بەرمیلە باڕووتی بەشار، بە هیوای ژیانێکی باشتر بەڵام لەسەر کەناری ملشۆڕی عەرەبی مردن!!"
قەرەداغی وەك ئیخوانیەك وحزبیەك، وشەکانی بە تەرازووی ورد دادەنێت، ئەوە هیچ باسی منداڵە کوردەکە ناکات، کە هەموو دنیای هەژاند، هەتا گۆرانیبێژێکی ناوداری جیهانی وەك شاکیرا گۆرانی بەسەر ئەو منداڵە گووت و لەناو بارەگای نەتەوە یەکگرتووەکان، بە ئالان کوردی ناوی هێنا. کەچی قەرەداغی ناوێرێت ناویشی بهێنێت نەوەك بە کوردێنی بۆی حیساب بکەن! دوایی داعش و ئەردۆگان فەرامۆش دەکات وەك هۆیەکی سەرەکی کۆچی سەدان هەزار کۆچبەر. دەبینن چەند خاتری داعش و ئەردۆگان ی دەوێت؟!
ئەو پیاوە وەك هینەکەی بافلۆف دەبێت بەبیری بهێنیەوە کە کوردە، وەك دیتان بەر لە ماوەیەك پۆستێکی کردبوو بۆ تەقاندنەوەی مزگەوتێکی کوێت لە و ڕۆژانەی کە داعش دزەیان کردە ناو کۆبانێ دوو سەد کەسێکیان کوشت، کە ڕەخنەمان لێگرت یەکسەر پۆستەکەی دەستکاری کرد و بەبیری هاتەوە کوردە. بەخوا نەوشێروان ئەگەر لە حەیاتی کارێکی باشی نەکردبێت لەوە باشی کرد کە پێشوازی لێ نەکرد و ئیهمالی کرد.
عەلی قەرەداغی کۆمێنتە عەرەبیەکەی منی لەسەر ئەو پۆستەی لاداوە!!
دەستی کردوە بە چەواشەکاری و پۆستە کۆنەکەی دەستکاری کردوە و وشەی کۆبانێ ی تێخزاندوە بە ناچاری! بەڕاستی شورەییە ناچاری و هەڵمەتی فەیسبوك کوردبوونی خۆمان بیربهێنێتەوە!!! ناڵێت لە خەویشما کۆبانێم بیرنەبوە، بە کوردی وعەرەبی بیانوو دەهێنێتەوە گوایە کارەساتی کۆبانێ پێویستی بە بەیانێکی توند هەیە و نێردراوە بۆ لای ئەهلی قانونەکان. بۆپێداچوونەوەی!!! یانی سێ ڕۆژە نەتوانیت پۆستێکی بیست وشەیی بنوسیت بۆ ئیدانەکردنی کۆمەڵکوژیەکەی کۆبانێ؟!! ئەوە لە بیانووی هین دەچێت. باشە خۆ دەتوانی کاتێ شیننامەت بۆ کوێت و تونس نووسی، کۆبانێ یشی تێکەیت هەر ڕازیبووین، هەرچەندە ئەوەی لە کۆبانێ ڕوویدا شایەنی چەندین پۆستە، بۆ ناساندنی مەزڵومیەتی کورد بە دەستی ئەو جا نەوەرە داعشانە. لە بیرت نەچێت بۆ لایەنی پێداچوونەوەی زمانەوانیشی بنێریت، چونکە وشەی [حتی] بە [حتة] نوسراوە و ستحول بە سوتحول نووسراوە!!!

ئینشاڵڵا پەیجێکت بۆ دەکەین خۆ بە خشانە هەموو ئەو شتانەی بە کوردی دەیڵێت وپێت شەرمە بە عەرەبی بیڵێیت بۆتی تەرجمە دەکەین، تا برا عەرەبەکان بزانن بە کوردی چۆن تاوان دەکەیت کاتێ هاوسۆزی بۆ نەتەوەکەت دەردەبڕیت.

٢٠١٤/١٠/١٩

سەرنج:

لە کاتی ئامادەکردنی ئەو کتێبە، زۆر گەڕام بە دوای ئەو بەیاننامە شدید اللهجەیەی کە قەرەداغی باسی دەکات، بۆم دەرکەوت، کە تا ئێستاش دەری نەکردوە!

# قەرەداغی پیاوی ئیخوانی جیهانی

## داوای سەربڕینی مەزنی جووەکان دەکات!

ئەخر بۆیە مرۆڤ ناتوانیت باوەر بە ئاشتیخوازی ئەو ئیخوانە بکات، دەبێت هەردەم چاوەڕێی توندوتیژی لیبکەیت لە هەر دەرفەتێکی گونجاودا! ئێمە وا پێشبینیمان دەکرد ئیخوان داوا لە ڕاپەڕینی چەقۆوەشانی فەلەستین بکات بەو شێوەیە نامرۆییە پڕ نەدەنە پیر و منداڵ وژن و مەدەنی لەسەر شەقامەکان، چونکە ئەوەی ئەو عەرەبە فەلەستینیانە دەیکەن هەر چی بێت نەخەباتە و نە جیهاد، تەنها تیرۆرێکی رووتی نائینسانیە، لەوانەیە ببێتە هۆی کەمکردنەوەی هەموو جۆرە هاوسۆزیەک و تەعاتوفێکی جیهانیش لەگەڵ دۆزی فەلەستین. کەچی مەلا زۆر کوردەکە بە پۆشاکیکی عەرەبی فەتوای سەربڕینی مەزن دەدات! چی دەمێنێتەوە بۆ میانرەوی؟! من تێناگەم ئەو پیاوە بۆ باسی بایەخ وگرنگی و پیرۆزی ئامەد ناکات و بۆ باسی قوربانیدان ناکات بۆ خاکی پیرۆزی کوردستان لە باکوور و ڕۆژهەڵات ورۆژئاوا!؟ ئەوەیە ئەو جۆرە ئیسلامەی لە خزمەتی عروبەتدایە. دەبێت جلی ئەوان لەبەر کەیت و سەروڕیش وهەیئەتی ئەوان هەڵگریت، بەزمانی ئەوان بدوێیت و خاکە پیرۆزەکانی ئەوان تەقدیس بکەیت، ومنداڵت هاندەی فێری زمانی ئەوان بن، وخەمت کێشەکانی ئەوان بێت بە پلە یەك، تا ببیتە موسڵمانێکی مەقبول وباش! ئیسلامیبوون وەک ئاوی ناو جۆگەیەکە لە هەورازدا هەرد دەبێت بەرەو لیژایی بەناو ڕەوگەی عروبەت دابەزێت!

٢٠١٥/١٠/١٩

# چەند وشەیەکی ڕاشکاو لە کۆچی شەماڵ موفتی دا

لە دوێنێوە دەتوانین ناوی ڕوداوی کۆچی دوایی خولێخۆشبوو شەماڵ موفتی ببەین بە ڕوداوی یەکەمی فەیسبوکی کوردی...

سەدان بابەتم بەرچاو کەوت لەسەر کۆچی ئەو بەڕێزە نووسراوە...

منیش دەمتوانی زۆر بە ئاسانی وێنەیەکی بڵاوبکەمەوە و بنووسم خوات لێ خۆش بێت، بەڵام هەرچەندە ئێستاش دەرهەق بە شەماڵ موفتی مرۆڤ دەڵێم خوای لێ خۆش بێت، هیچ کێشەیەکم نییە لەو بوارەوە، بەڵام راستیەکەی لەسەر لایەنی بانگخوازی و وتاربێژی ئەو زاتە، من پێم باشتر بوو هیچی لەسەر نەڵێم تا وێنەیەکی گشتگیری زیهنی تەواوم دەبێت لەسەری!

قسەشم نەدەکرد لەسەری ئەگەر لە دوێنێوە چەند هاوڕێیەکی بەڕێز بە نامە پرسیاری بێ دەنگی من دەکەن لە ئاست ئەو ڕوداوە کە فەیسبوکی کوردی هەژاندوە، کەچی من هێشتا بێدەنگم!!

ڕاستیەکەی من فێر نەبووم بە دوای قەرەباڵغی بکەوم، تەنها پرسە نەتەوەییەکانی لێ دەرچێت، زۆرجار بە تەنها ڕێگای خۆم بە خۆم دیاری دەکەم، لە هەڵوێستە فیکری وسیاسی وکۆمەڵایەتیەکانیش هەروا بووم، و خراپ بێت یان باش، من پێمباشە.

ئەگەر شەماڵ موفتی تەنها سیاسیەکی ئاسایی با و لەبەرەی خەڵك با، بێ دڵ لە دڵ دان هەزاران درودمان بۆ گیانی دەنارد، بە وێنە وپۆستەوە. بەڵام بەڕای من شەماڵ موفتی لەبەرئەوەی خاوەن وەزیفەیەکی زۆر ترسناکە لە کۆمەڵگای کوردی، کە وەزیفەی بانگخوازی و وتاربێژی دینیە، من ناتوانم بە یەك وشەش ستایشی بکەم، چونکە من کەم گوێم لێی گرتووە، وێنەیەکی زیهنی گشتگیرم نییە لەسەری، ناتوانم لەسەر متمانەی کەسیش متمانە بدەم بە کەسێک لەو حاڵەتە هەستیارەدا، چونکە زۆرجار کە متمانەم لەسەر متمانە داوە لێی پەشیمان بومەتەوە!

وەزیفەی بانگخوازی دینی و وتاربێژی دینی بەڕای من زۆر هەستیار و مەترسیدارە، بۆیە مەلا و بانگخوازی وا هەیە زۆر بوێرانە بە گژ دەسەڵات وگەندەڵی دادەچن، بەڵام کە دەبینم هەمان ئەو مەلایە خەون بە کۆمەڵگایەکی دینی داخراو دەبینێت وەك ئەڵتەرناتیڤێك بۆ دەسەڵات، دەزانم ئەو ئەڵتەرناتیڤەی ئەوە زۆر خراپتر ومەترسیدارتر دەبێت بۆ میللەتەکەم، بۆیە ئامادە نیم بە وشەیەکیش پەسندی ئەو جۆرە کەسانە بکەم تا وەکی کابرای کوردی ئێرانیم لێ نێت کە بۆ برادەرێکی منی باس کردبوو، چونکە کاتی خۆی بۆ شۆڕشی خومەینی چوبوە ناو خۆپیشاندانەکان وهاواری کردبوو بڕوخێ شای ستەمکار، ئێستا ڕۆژانە چەندجار دەچێتە بەر ئاوێنە و دەڵێت: گ...م خوارد!

ئەوەی زیاتر دڕدۆنگی کردم، و وای لێکردم هەڵوەستە بکەم لە دەربڕینی هیچ ڕایەك دەربارەی خوا لێ خۆشبوو مامۆستا شەماڵ موفتی، ئەوە بوو کە بریارم دا گوێبگرمە کۆمەڵە ڤیدیۆیەکی بۆ فۆرمەڵەکردنی

رایەکی سەرەتایی.

پازدە بیست ڤیدیۆی کورت و درێژی مامۆستا شەماڵ موفتیم گوێ لێگرت، ڕاستە ئەوەندە بەس نییە بۆ بڕیاردانی کۆتایی بە نێگەتیڤ یان پۆزەتیڤ دەربارەی کۆی پرۆژەی دینی مامۆستا شەماڵ، بەڵام بەڕاشکاوی دەڵێم ئەوەی من گوێم لێبوو لەو چەند ڤیدیۆیە تەنها وتارێکی ئیسلامی ڕووحانی، عاتیفی، نا عەقلانی، و پڕ لە موبالەغە و زیادەڕۆیی بوو، واتە هەمان وتارە تەقلیدیەکەی بانگخوازە ئیسلامیەکان وەك هاندانی منداڵ بۆ عیبادەتی سەخت، وەك بەڕۆژوو بوون لە گەرمترین هاویندا تاکو ببیتە وەلیەک لە ئەولیای خوا، یان ئیعجازی ژمارەیی لە قورئاندا بە تایبەت ژمارە ١٩ کە وابزانم بابەتێکی سواوە پڕە لە کەلەبەر! یان کە دەڵێت هەموو بەندەکانی مافی مرۆڤ دەگەڕێتەوە سەر قسەکەی حەزرەتی عومەر کە دەڵێت مرۆڤ بە ئازادی لە دایك دەبێت: متى استعبدتم الناس وقد ولدتهم امهاتهم احرارا! ئەوەش ئیدیعایەکی ڕابوونی ئیسلامی تەقلیدیە، هەتا باڵی سونەتی ئیسلامیش باوەڕی پێی نییە! چونکە ئەگەر ئەوە ڕاست با لەسەردەمی عومەر سەدان هەزار کەس لە فتوحاتەدا بە کۆیلە نەدەکران، و ڕێگاوبانی مەدینە پڕی منداڵی بێ باوك ودایکی فارس وکورد و میللەتانیتر نەدەبوون! یان وەك سەلەفیەك دەڵێت پێغەمبەر دەڵێت: اوتيت القرآن و مثله معه! واتە قورئانم بۆ هاتوە لەگەڵ قورئانیکی تر وەك ئەو، کە مەبەست لە حەدیسە! ئەوەش کاریگەریکی ڕوخێنەری دەبێت لەسەر زیهنیەتی تاکی موسڵمان کەوا بزانێت قورئانێکی تریش هاتوە لەگەڵ قورئاندا!

شتێکیتریش زۆر نیگەرانی کردم لە مۆستا شەماڵ موفتی، ئەوەیە بۆ نمونە کە باسی بانگخوازێکی وەك عەدنان ئیبراهیم دەکەین، دەبینین ئەو پیاوە سەرەڕای هەر سەرنجێکمان هەبێت لەسەری، کە لە چەندین وتار و پۆستدا گوزارشمان لێکردوە، بەڵام بەردەوام ستایشی ڕۆڵی تەنویری ئەومان کردوە، و بە خاوەن وتارە هەرە بلیمەتەکانی جیهانی ئیسلامی دەزانین، ئینجا ئەو پیاوە کە ئیسلامێکی میانرەو و گونجاو لەگەڵ سەردەم پێشکەش دەکات، لە هەمان کاتدا زۆر بە توندی لە بنەماکانی توندڕەوی ئیسلامی دەدات، کە بەڕای من ئەو لێدانە وپوچەڵکردنەوەیەی بنەماکانی توندڕەوی ئەمڕۆ زۆر زەرورترە لەهەر لایەنێکیتری ئیسلام، بۆ کەسێك خۆی بە بانگخوازێکی میانڕەو دەزانێت.

ئەوەی زۆریش سەرم لێی سوڕما، من سەرەڕای گەڕانم هیچ وتارێکی شەماڵ موفتیم نەدۆزیەوە ڕەخنەیەکی جیدی بێت لە وتاری توندڕەوی ئیسلامی کە ئەمڕۆ مەترسیەکەی هێندە زۆرە، بۆتە سەرچاوەی نەهامەتی و کارەسات و ناڕەحەتی بۆ هەموو گەلانی موسڵمان. بۆیە من لە گوێگری عدنان ابراهیم زۆر ناترسم لادات بەلای تیرۆرست و توندڕەوان، چونکە عدنان ئیبراهیم لە بنەڕەتدا مەترسی ئەوانی بە گوێگرانی ڕاگەیاندوە، بەڵام ئەو شێوازە وتاردانەی شەماڵ موفتی کە تەنها لەسەر ڕووحانیەتی قورئان و تەقوا و تەزکیەی نەفس و ئەعمالی قلوب و ئەو مانایانە دەسوڕێتەوە، ئەوانە هەمووی لە دەقەوە سەرچاوە دەگرن.

کەوابوو مامۆستا موفتی ژێرخانێکی دینی چاك بۆ گوێگرانی دروست دەکات بۆ تەزکیەی زیاتر و تەقوای زیاتر و ترسان لە خوا زیاتر و تەقدیسکردنی دەقی دینی و توانەوە لە ناو قال الله و قال

الرسول بە فەهم و تێگەیشتنی سەلەفی سالح! کەوابوو بازرگانێکی توندڕەوی شارەزا بە دەقەکانی قورئان و حەدیس و ئەقوالی عولەما و و ئیمام و فوقەها و سولەحا، دەتوانێت زۆر بە ئاسانی گوێگر و سەرسامانی مامۆستا شەماڵ بۆ خۆی کێش بکات، چونکە ژێرخانەکە ئامادەیە، چۆن تەقوا و تەزکیە و ئیستیقامە و خۆشەویستی لە خوا [الحب في الله] جێگیر کراوە بە دەق، لە هەمان کاتدا شەڕ و قیتال و دوژمنایەتی لەگەڵ هەموو مرۆڤایەتی تا ئیمان دەهێنن! و ڕق لێ بوونەوە لە پێناو خوادا [ الكره في الله ]، بەڵکو بە کۆیلەکردنی بەندەکانی خوا، ئەوانەش هەمووی بە دەق جێگیر کراوە، لە سۆنگەی ئەوەوە موفتی ئەو حەدیسەی پێ ڕاستە اوتيت القرآن و مثله معه! [ قورئانم بۆ هاتوە لەگەڵ قورئانیکی تری وەك ئەو] وەك لە دەرسەکانی بانگەشەی بۆ دەکات.

کەوابوو هەموو مەرجێکی زاتی و مەوزوعی ئامادەیە بۆ فریودانی ئەو گوێگر وسەرسامانەی شەماڵ موفتی، چونکە نابێت بڕوات بە کۆمەڵێك دەقی رووحانی و تەقوا و تەزکیە و ترسان لە خوا بێت، لە هەمان کاتدا باوەڕت بە دەقگەلێکیتری وەك قیتال و ڕەجم و ڕق لە پێناو خوا، و جاڕدانی دوژمنایەتی لەگەڵ هەموو دنیا تا باوەڕ دەهێنن نەبێت، چونکە ئەوەی باوەڕی بە هەردوو جۆری دەقەکان نەبێت ئیسلامیەکان یەکسەر پێی دەڵێن: : {أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ فَمَا جَزَاءُ مَنْ يَفْعَلُ ذَلِكَ مِنْكُمْ إِلَّا خِزْيٌ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يُرَدُّونَ إِلَى أَشَدِّ الْعَذَابِ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ} البقرة:٨٥

[ئایە باوەڕ بە هەندێ فەرمان دەهێنن لە کیتابدا واتە قورئان و کتێبە ئاسمانەکانی تریش، و باوەڕیش بە هەندێك فەرمانیتری ناو کتێبەکە ناهێنن، سزای ئەو کەسانەی ئەو کارە دەکەن تەنها سەرشۆڕی ژیانی دنیا و توندترین ئەشکەنجەی قیامەتە، خواش بێ ئاگا نییە لەوەی دەیکەن] ئەو ئایەتە وەك زانا و موفەسیرانی ئیسلام دەڵێن دەرهەق بە جووەکان هاتۆتە خوارەوە، بەڵام بە پێی بنەمای ئسولی: [العبرة بعموم اللفظ لا بخصوص السبب] مەبەست بە گشتی گوزارشە نەك بە هۆکاری تایبەتە، وەك لە علم الأصول دا هاتوە موسڵمانیش دەگرێتەوە، کیتابیش هەر قورئان ناگرێتەوە بەپێی باوەڕی بنەما و باوکانی سەلەفیەت، و بەداخەوە بە پێی باوەڕی مامۆستا شەماڵ یش!

هەرچۆنیکی بێت ئەگەر ئیلحاحی چەند هاوڕێیەك نەبا پێم باشتر بوو زیاتر گوێی لێ بگرم بەرلەوەی دەربارەی بنوسم. بەڕای من گرنگ ئەوە نییە چۆن دەتوانیت لە ڕێگای دین کاریگەری لەسەر خەڵك جێ دەهێڵیت، چونکە لەوە ئاسانتر نییە لە ڕێگای دین کاریگەری بکەیتە سەر خەڵکە ئامادەکە لە ڕووی زیهنی و ڕوحیەوە! هونەری وتاردان و هوشیاری دینی دەبێت زیاتر ئاگادارکردنەوەی خەڵک بێت هیچیتر بازرگانانی دین و توندڕەویەت و تیرۆرستی نەتوانن زەفەریان پێ ببات، چونکە ئەمڕۆ دینداری ئیسلامی مەترسیترین مەترسییە بۆ تاکی موسڵمان ئەگەر ئاگادار نەبێت و هوشیار نەبێت.

٢٠١٦/٢/٢٠

# ئەگەر مامۆستا شەماڵ هێندە لات گەورەیە وەك ئەو گەورەبە!

وەك دەبینن خەڵكانێكی زۆر لە فەیسبوك وێنەی خوا لێخۆش بوو شەماڵ موفتی یان هەڵواسیوە لە پرۆفایلەكان و دەیان پۆستی كۆپیكراو ولاسایی كراو ئەو فەیسبوكەی قەرەباڵغ كردوە.
وابزانم زۆربەی هەرە زۆری ئەو كارە و خەم دەربڕینە لاسایی و بەگەڵ عامیّ كەوتن بوو ناڵێم دوو ڕوویی بوو. بەڕێزێك باسی یەكێك لەو پۆستكەرانەی كردبوو كە لە پۆستێكیدا دەڵێت هێندە خەمبارە لەو ڕۆژەی مردنیەوە نانی لیّ حەرام بووە، دواییش لەناو بازاڕ ئەو كەسەی دیوە گۆرانی عەزیز وەیسیەكەی دەرگای سەیارەكەی دەهەژاندەوە!
منیش پۆستێك یان بابەتێكم نووسی وەك هەڵسەنگاندن بوو بۆ ناوەرۆكی وتاری موفتی، كە دیارە خەڵكێكی زۆر هاوڕام بوون هەتا لە نزیكەكانی خوا لیّ خۆشبوو.
بەڵام ئەو چینەی كە زیاتر سوودیان لەناو ناوبانگی شەماڵ موفتی دەكرد، مەبەستم ئیخوانە كوردیەكان، چونكە موفتی تا دواڕۆژی ژیانیشی ئیخوان بوو، لە هەموان خراپتر كاردانەوەیان كرد بەرامبەر مندا.
قوربەسەر ئەوەی منداڵە ئیخوان تێی بەردەبن جوێنی وات بۆ دەنێرن لە قوتووی هیچ عەتارێكیش نەبێت! باشە چی لە دەمپاكی و نەرمونیانی موفتی فێربوون؟!
بەڕای من خەڵكانێكی بانگخواز و كەسایەتی دینی لە ئاست شەماڵ موفتی باش نیە سەر بە هیچ حزبێك بێت و دەبێت موڵكی جەماوەر بێت،چونكە بەخۆی بزانێت یان نەزانێت ئاو دەكاتە ئاشی حیزب وجەماعەت.
ئەو گیانی لێبوردەییە و ڕەوشت بەرزیە و دەست ودەم پاكیەی شەماڵ موفتی دەبوایە بەر لە هەموو كەسێك ئیخوان و یەكگرتووەكان سودیان لێی بكردایە، بەڵام بە پێچەوانەوە سەدا یەكی ئەو بەهایانەی موفتی مژدەی پیّ لێدەدا لای جەماعەتەكەی دەست ناكەون!
لە جیاتی گفتۆگۆكردن پێم دەڵێن فشەكەر و نەزان و قوربانی نازانم چی موفتی بیت! دوو سێیەكیان دەڵێت ئەگەر تۆ بمریت منداڵەكانی خۆشت بۆت ناگریێن!!!
هەرچەندە ڕاستیش نیە چەندین برادەر گوتیان بۆت دەگرین، بەڵام ئەگەر ڕاستیش بێت دەبا نەگرین بە گونی كوڕم!
پێمباشترە نەگرین و ڕاست گۆ بم لەگەڵ میللەتەكەم،نەك دووڕوو بم و هەموو میللەت شینم بۆ بكەن.
ئەگەر هێندە سەرسامی ڕەوشت و بەهای شەماڵ موفتین، ئەی ئیخوانەكان، یەكگرتوەكان وسەرسامەكان كەمێك وەك ئەو خاوەن ڕەوشتەكانی بن.
٢٠١٦/٢/٢٣

# حەسەن بەننا: چەند وێستگەیەك

## حەسەن بەننا و پەسندڕایی و تاکڕەوی [١]

### سەرچاوەی تاکڕەوێتی وپەسندڕایی حەسەن بەنا:

حەسەن بەننا لە هەموو ڕەفتارەکانی زیاتر بەرەو تاکڕەوێتی و ڕاپەسندی دەیشکاندەوە. هەتا لە سیاسەتیش هێندە سەرسامی دیکتاتۆریەت و فاشیەت بوو، ودژی ژیانی حزبی بوو، و داوای هەڵوەشاندنەوەی دەکرد، نیو هێندە لەگەڵ ئازادی و دیموکراسیەت نەبوو. ئەو تاکڕەوییە و پەسندڕاییەشی لە ژێر کاریگەری ئەو ڕێچکە تەسەوفیە بوو، کە بەننا ماوەیەکی باشی ژیانی لەگەڵ بەسەر بردبوو کە (تەریقەتی حەسافی) بوو .زۆربەی ئەو تەریقەتانەش بنەمای ڕێکخستنی تێدایە کە پەیوەندی نێوان مورشید وموريد ڕێکدەخات، ئەوەی نامیلکەی (اداب المرشد والمريد) ابن عربی بخوێنێتەوە دەزانێت کە ئەو پەیوەندییە زیاتر لە پەیوەندی بەندایەتی دەچێت... بۆ نمونە مورید بۆی نیە هەرگیز قسە بکات لە حزوری مورشیددا، تەنها ئەگەر مورشید داوای لێکرد قسە بکات، بۆشی نییە گفتوگۆ ومشتومڕی لەگەڵ بکات لەسەر هیچ بیروڕایەکی یان ڕەخنەی لێ بگرێت، بۆی نییە مورید هەر شتێکی لێ داوا بکات رەتی بکاتەوە هەتا ئەگەر ببێتە هۆی مەرگیشی!! پێویستە رۆحی مورید و جەستەی لە دەستی مورشیددا وەك لاشەی مردوو بێت لەژێر دەستی مردووشۆر ...ئەگەر مورشید مرد مورید بۆی نییە ژنەکەی ئەو بهێنێتەوە!!! هەر بۆیەش حەسەن بەننا مورتاح نەبوو بۆ هیچ ناو ونازناوێکی تر زیاتر لە نازناوی مورشیدی عام ! وهەموو بنەماکانی ئادابی مورشید وموریدی سۆفیەتی گواستەوە بۆ ناو ئیخوان، تا ئەمڕۆش هەر ئەو بنەمایانە تەحەکوم بە پەیوەندیەکانی ناو ئیخوان دەکات لە زەقترین شێوەدا.

دەڵێت: " لە قۆناغی دروستبوون، التكوين :دیاریکردنی ئەو کەسانەی شیاوی هەڵگرتنی باری قورسی جیهاد بن، و سیستمی دەعوە لەو قۆناغەدا سۆفیەتێکی ڕەهایە لە لایەنی ڕووحیەوە، و سەربازی ڕووتە لەلایەنی کرداریەوە، و دروشمی ئەو قۆناغە لە هەردوو لایەنیەوە، هەردەم فەرمان وەرگرتن و گوێڕایەڵی کردنە، بەبێ دڵ لە دڵ دان و بۆ گەڕانەوە و گومان و بێ هیچ ئیحراج بوونێك!

دەعوەش لەو قۆناغە تایبەتە، نابێت هەر کەسێ پەیوەندی پێوە بکات، جگە لەوانەی ئامادەییەکی هەقیقیان تێدا بێت بۆ هەڵگرتنی ئەرکی جیهادێکی درێژخایەن و پڕ لە ئەرک، و یەکەم نیشانەی ئامادەییش گوێڕایەڵی ڕەهایە یان کەمالی تاعەتە !" "مرحلة التكوين :استخلاص العناصر الصالحة لحمل أعباء الجهاد وضم بعضها إلى بعض ونظام الدعوة في هذه المرحلة صوفي بحت من الناحية الروحية وعسكري بحت من الناحية العملية وشعار هاتين الناحيتين دائما أمر وطاعة من غير تردد ولا مراجعة ولا شك ولا حرج.

والدعوة فيها خاصة لا يتصل بها إلا من استعد استعدادا حقيقيا لتحمل أعباء جهاد طويل المدى كثير التبعات وأول بوادر هذا الاستعداد كمال الطاعة ......

المصدر : كتاب مجموعة رسائل الأمام الشهيد حسن البنا . ص ٣٦٢ من رسالة ( التعاليم ) تحت عنوان ( الطاعة ).

ئەو خەیاڵە کاریزمە ئاسایەی حەسەن بەننا وایلێکردبوو زۆر کەم پرس ورِا بکات وزۆربەی کارەکانی بە نهێنی ئەنجام بدات هەتا کاتێك ئیسماعیلیەی بەجێهێشت بۆ قاهیرە لەناو دەیان ئەندامی زانا ودانادا، دارتاشێکی نیمچە خوێندەواری هەڵبژارد بەناوی (علی الجداوی) بۆ گرتنەوەی شوێنی خۆی، کاتێك کەسانێك نارەزاییان دەربری بوو، حەسەن بەنا بەتوندترین شێوە رەخنەی لێگرتن، تارادەی سوکایەتی ولاقرتێیی پێکردن، لەکۆتاییدا بەننا رای خۆی سەپاند بەسەر هەمووان و دارتاشەکە برِیاری لەسەر درا! مێژوو دەیسەلمێنێت کە ئەوانەی زۆر خۆیان پێ بەرز و بێ وێنە بێت، و گیانی فەردیەت و تاکرەوی زاڵ بێت بەسەریان، وخۆیان پێ قائیدی ئەوحەد بێت، هەردەم حەزدەکەن خۆیان دەورەدەن بە کەسانێکی لاواز و بودەڵە وگوێ لەمست، تا هیچ ترسناکیەك دروست نەکەن لەسەر پایەی پێشەوا و سەرۆک و ئەمیندار و ئەمیری جەماعەت، ئەو دیاردەیە لە نێو زۆربەی هەرە زۆری حزبە رۆژهەڵاتیەکان باوە بە کوردستانیشەوە.

نمونەیەکیتری راپەسندی حەسەن بەننا و هەتا خزم خزمێنێش، دەتوانین لە کەیسی راسپۆتینەکەی ئیخوان، زاوای حەسەن بەننا، عبدالحکیم عابدین بدۆزینەوە.

عبدالحکیم عابدین گەنجێك بوو چالاك لەناو ئیخواندا، زۆر نزیکبوەوە لە حەسەن بەننا تا بوە زاوای، مێردی خوشکی. ئەو پیاوە خاوەنی بیرۆکەی سیستمی سەردانی خێزانی بوو لەناو ئیخواندا، بۆ پتەوکردنی پەیوەندی ئەندامانی ئیخوان. پاش ماوەیەك چەندین شکایەت وسکاڵا گەیشتە ئۆفیسی مورشیدی ئیخوان حەسەن بەننا، سەبارەت بە داوێن پیسی وبێ رەوشتی عبدالحکیم عابدین، کە بەردەوام سەردانی ئەو ژنانەی ئیخوانی دەکرد کە مێردەکانیان لە زیندان بوون!

بۆ ئەو مەبەستە لیژنەیەکی لێکۆڵینەوە دروست بوو بە سەرۆکایەتی احمد السكري کە بە دامەزرێنەری هەقیقی ئیخوان دادەنرێت لە ساڵی ١٩٢٠، خۆی بەننای پێگەیاند، و کردیە پێشەوای خۆی! ئەو لیژنەیە گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە عبدالحکیم عابدین چەندین داوێن پیسی کردوە لەگەڵ ئافرەتە ئیخوانیەکان، و دانیشی پێدا ناوە.

لە نووسراوی لیژنەکە هاتبوو: [ لیژنەکە قەناعەتی تەواوی هەیە کە عبدالحکیم عابدین –تاوانبارە-. بەتایبەتی ئەگەر دانپێداهێنانی خۆی بۆ هەندێ ئەندامانی لیژنەشی بخەینە سەر بەڵگەکانیتر. ... بۆیە وا پێویست دەکات قورسترین سزا بدرێت، بۆیە لیژنەکە بە کۆی دەنگ دوای فەسڵکردنی عبدالحکیم عابدین دەکات لە ئەندامێتی جەماعەت... ئیمزای هەموو ئەندامانی لیژنەی لەسەر بوو]

حەسەن بەننا سەرەرای برِیاری لیژنە و ئەو ئەندامە باڵایانەی ئیخوان، کە یەکێکیان وەك ئەحمەد السكری لە ١٤ساڵیدا حەسەن بەنای پێگەیاند ویارمەتیدا و هێنایە ناو رێکخراوەکەی خۆی، بە گوێی

ڕاسپاردەی لیژنەكەی نەكرد، و ڕاپەسندیەكی بێ وێنەی نیشان دا، و لە ئاكامدا سەرەڕای ڕێزنەگرتنی لە ڕای لیژنەكە، مامۆستای خۆی احمد السكری و هەموو ئەندامەكنایتری لیژنەكەشی فەسڵ كرد، لە پێناو پەردەپۆشكردنی زاواكەی عبدالحكیم عابدین! كە ئەوەش تاوانە پەردەپۆشی بۆ كاری نائەخلاقی بكەیت، باشە كە پەردەپۆشیش دەكەیت، هەر نەبێ پاس ماوەیەك دەریكردبا لە ئیخوان، نەك لە جاران گەورەتری كەیت بەو ڕەوشتەوە؟! ڕاپەسندی و تاكڕەویی لەوە زیاتر چییە، كە تۆ بە گوێی بڕیاری ئەو لیژنەیەش نەكەیت كە خۆت پێكت هێنا بوو؟!

٢٠١٦/٥/٢٦

# حەسەن بەننا و شەخسپەرستی [٢]

هەموو ورد ودرشتی کارەکانی جەمەعاتی ئیخوانی لەژێر دەست وچاودێری حەسەن بەنا خۆیدا بەڕێوە دەچوو. لە زمانی محمود عساف لە یاداشتنامەکەی دەگێڕێتەوە کە بەننا بەرلەوەی کەسێك بکاتە یاریدەدەری خۆی لە ناو ئیخواندا تاقی دەکردەوە، ویەکێك لەو تاقیکردنەوانە ئاماژە بۆ جۆری بیرکردنەوەی فەردیەتی بەننا دەکات، کاتێ لەو کەسەی دەپرسی: " ئەگەر کودەتایەك لە ناو ئییخوان دا کرا و حەسەن بەننا دورخرایەوە، ئایا هەر لە ئیخوان کاردەکەیت؟" ... وەڵامی محمود عساف بەو شێوەیە بوو: " بانگەوازی ئیخوان موسلمین بەبێ حەسەن بەننا دەبێتە شتێکی تری جیاواز لە بانگەوازی ئیخوان کە فێری بووین وتێیگەیشتین ولەسەری پەروەردە بووین" ئەو وەڵامە هەرچەندە ئاشکرایە لەسەر حەزی بەننا بنیاتنراوە کەچی حەسەن بەننا هەردڵی ئاوی نەخواردەوە وبە عسافی گووت:" بڕوانە محمود، ئیمان بە ئیسلام لەسەر دوو شایەتمانی بەندە: (لا الە الا اللە وان محمدا رسول اللە) ئەگەر یەکێك باوەڕی بە (لا الە الا اللە) هێناو باوەڕی بە (محمد رسول اللە) نەهێنا ئەو کەسە وەك ئەهلی کیتابی لێدێت کە تەنها باوەڕیان بە خودایە ودان بە پێغەمبەرایەتی محمد ناهێنن" کەوابوو ئەوەی لەسەر ئیسلام وپێغەمبەر جێبەجێ دەبێت، لەسەر ئیخوان و حەسەن بەنناش جێبەجێ دەبێت، ئەو لۆژیکە، لۆژیکی یەکسان کردنی فیکرە وخاوەنی فیکرەیە، کەوابوو ناکرێ ئیخوان بیت وباوەڕت بە حەسەن بەننا نەبێت. بۆیە بەننا بە ڕاشکاوی لەو بارەیەوە دەڵێت: "پێویستە باوەڕ بە فیکرە وخاوەنەکەی پێکەوە بکەین، ئێمە جەمعیەتێك یان پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتی نین. ئەگەر وابا‌ین هیچ گرنگیەك بۆ سەرکردە وپێشەوا نییە، دەکرێت هەر تاکێکی جەمعیەتەکە بێتە سەرۆك. بەڵام چونکە ئێمە بانگەوازین پێویستە باوەڕمان پێی هەبێت وهەنگاو بنێین لەسەر ڕێبازی خاوەن بانگەوازەکە، وکاربکەین بۆ جێبەجێکردنی بیرۆکەکانی تا سودیان لێوەرگرین بە ڕەزامەندیەوە" مع الامام الشهید حسن البنا، محمود عساف. ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە لە زۆر دەقیتری پیاوانی ئیخوان و حەسەن بەننا ڕەنگدەداتەوە تا ئاستی خۆ بە بچووك زانین!

وادیارە بۆیە حەسەن بەننا تا ئەو ڕادەیە دژی حزب وحزبیەت بوو، چونکە حزبی هەقیقی سەرۆکێکی هەیە وهەڵدەبژێردرێت بۆ ماوەیەکی سنوردار، بۆی هەیە هەڵبژێردرێتەوە یان نا، بۆی هەیە ئەندامانی تر جیاواز بن لەگەڵیدا، بەڵام کاتێك مەسەلەکە دەبێتە (دەعوە وداعیە) ئەوە هەر جیاوازییەك لەگەڵیدا خۆی لەقەرەی کوفر دەدات ئەگەر خودی کوفر نەبێت، چونکە دەعوە بێ داعیە نابێت وبەڵکو داعیە (بانگخواز) بەرجەستەکەری دەعوەیە، کە ئەو چەمکەش زیاتر لە فیقە وفیکری شیعەگەرێتیەوە نزیکە ولە ڕووی ئایدیۆلۆژیەوەش نزیکە بەو بیرۆکە سۆڤیەتیەی کە دەیوت"باوەڕ بە پێشەوایەتی ستالین یەکسانە بە باوەڕ بە تیۆری مارکسیسزم" ئەو جۆرە پەروەردەیە لەسەر تەقدیسی زاتی خۆی، وای لە یەکێك لە دەست وپێوەندە نزیکەکانی

حەسـەن بەننا بەنـاوی احمد عـادل کامـل کـرد، بـە شـێوازی ئەدەبیاتـی سـیرەی پێغەمبـەر وەسـفی بەننـا بکات بـەو جۆرە: " لـم یکـن رضـی اللـه عنـه بالطویل ولا بالقصیر وان کان الـی القصـر اقـرب. ولـم یکـن بالرفیع ولا بالسمین وان کان ممتلئا ربما، ولـم یکن ابیض ناصـع البیاض ولا اسمر بین السـمره، ولکنـه کان سـواء بین ذلـك" [رەزای خـوای لێبێـت نـە درێـژ بـوو و نـە کـورت، هەرچەنـدە بـۆ کورتـی نزیکتـر بـوو. نـە لاواز بـوو نـە قەڵـەو هەرچەنـدە گۆشـتن و پـڕ بـوو! نـە زۆر سـپی بـوو نـە دەتوانـی بڵێیـت ئەسـمەریش بـوو، بەڵکـو لـە نێوانیانـدا بـوو] ئـەو سـەرسـامە هێنـدە خـۆی لا بچـوك دەبێتـەوە بەرامبـەر ئـەو مەزنایەتیـەی پێشـەوا تـا دەگاتـە دان هێنـان بـە زەئالـەت وبچوکـی خـۆی: "یصغـر الواحـد منـا فـی نفسـه کثیـرا ویحـس انـه لا شـئ امام عملاق ضخـم صنعـه اللـه علـی عینـه واصطنعـه لدعوتـه، فلا یجـد احدنـا حرجـا ولا غضاضـه ان یقـر انـه فـی حاجـه الـی هـذا الرجـل لیرشـده" [حەسـەن بەنـا هیـچ شـتێکی نائاسـایی تێدا نەبوو..بەڵام بـە دڵنیایـەوە نهێنیەکـی نائاسـایی تێـدا بـوو ئاسـان نەبـوو بزانیـت چییە...هـەر یەکێـك لـە ئێمـە لـە دەروونـی خۆیـدا زۆر بچـووك دەبـوەوە وهەسـتی دەکـرد هیـچ نیـە بەرامبـەر ئـەو عملاقـە زەبەلاحـەی کـە خـوا بەخـۆی دروسـتی کردبـوو بـە بایەخـی خـۆی بـۆ دەعوەتەکـەی، هیـچ کەسـێك لـە ئێمـە پێـی شـەرم نیـە دان بنێـت بـە پێویسـتی بـەو پیـاوە بـۆ ئـەوەی ڕێنیشـاندەری بکـات].

قـەرەزاوی لـە دەقێکـی دوور و درێـژ باسـی موجەدیدەکانـی ئیسـلام دەکات وەک عمـر بـن عبدالعزیـز، و نـور الدیـن محمـود و صـلاح الدیـن الایوبـي، و ئیمـام ابـو حامـد الغزالـي، و عبدالقـادر الجیلانـي، و ابـن تیمیـة. ئینجـا حەسـەن بەننـا دەخاتـە ڕیـزی ئەوانـە ودەڵێـت میسـر و جیهانـی عەرەبـی و ئیسـلامی پێویسـتی بـە پیاوێکـی بیر تیـژ و هەسـتیار و ئیمانداریکـی بەهێـز و ویسـتێکی پۆڵاییـن بـوو، هەسـت بـە دەرد وئازارەکانـی ئومـەت بـکات، و بتوانێـت دەردەکانـی دیـاری بـکات و دەرمانـی بـۆ دابنێـت و ئـارام بگرێـت لەسـەر بەدواداچوونـی چاکبوونـەوەی، تـا چـاك دەبێتـەوە ودێتـە سـەرپێ، و تـا دەگاتـە قۆناغـی هێز...ئـەو پیـاوەی کـە دەمانەوێـت بـەو سـیفەتانەوە یـان سـەرکردەی چاوەڕوانکـراو، حەسـەن بەننـا بـوو"! الإخـوان المسـلمون: ٧٠ عامـا فـي الدعـوة والتربیـة والجهـاد". مکتبـة وهبـة بالقاهـرة ١٩٩٩.

لـە کتێبـی [حسـن البنا بأقلام تلامذتـه ومعاصریـه، لجابر رزق ] هاتـووە سـەعید حـەوا پێـی وایـە حەسـەن بەننـا گەیشـبووە قۆناغـی ئیجتیهـاد، هەمـوو مەرجەکانـی تێـدا بـوو! هەروەهـا دەڵێـت ئوممـەت فیکرێکـی نییـە جگـە لـە فیکـری حەسـەن بەنـا، ئەگـەر بیەوێـت دەسـتپێکیکی دروسـت هەڵبژێریـت، هـەر دەسـتپێکێك لـە دەرەوەی فیکـری حەسـەن بەننـا پـڕ لـە کەموکورتیـە و کوێرانـە و موسـتەحیلە. بۆیـەش پێویسـتە هەمـوو موسـڵمانێك دەسـتی بخاتـە نـاو دەسـتی جەماعەتـی ئیخـوان، و نابێـت موسـڵمانێك دواکەوێـت لـە چوونـە نـاو ئیخـوان.! بەڵکـو پێیوابـوو ئـەوەی لـە ئیخـوان جیابێتـەوە، ئیسـلامەتی لەملـی خۆیـدا دادەماڵـێ، بـە پێـی تێگەیشـتنی لـەو حەدیسـەی، ئـەوەی یـەك بسـت لـە جەماعـەت جیابـوەوە ئەڵقـەی ئیسـلامی لـە ملیـدا داماڵیـوە: (من فـارق الجماعـة قیـد شـبر فقـد خلـع ربقـة الاسـلام من عنقـه). کەسـێکیتری وەك الشـیخ محمـد الحامـد پێیوابـوو بەننـا موجەدیـدی هـەر حـەوت سـەدەی ڕابـردوو بـوو، و پێویسـتە هەمـوو وشـەیەکی بـە وردی لێـی بڕوانیـن! عمـر التلمسـاني مورشـیدی جەماعـەت دیـارە ئیبـن تەیمیـەی زۆر لا گەورەیـە، ئـەوەش ئاماژەیـە بـۆ

بیری سەلەفیزمی، بەڵام دەڵیت: قوتابخانەی بەننا لە قوتابخانەی ابن تیمیە گەورەترە، چونکە پیاوی وا لە قوتابخانەکەی دەرکەوتوە موجاهید و سەرکردەی هۆشیارکەرەوەی ئوممەت! [ ص ٩١ ]
صالح عشماوی دەزگای تایبەتی چەکداری ئیخوان دەڵێت: ڕەحمەتی خوای لێبێت حسن البنا ، ڕیزپەڕێکی سروشت بوو، زۆر کەم ڕوودەدات کەسێکی وەك ئەو دەرکەوێت، ئەو نەمردوە لای خودا زیندووە! "فقد كان فلتة من فلتات الطبيعة قلما يجود بمثله الزمان ، وهو لم يمت ، بل حي عند ربه " [ ص ٦٠ ]
عبد الرحمن البنا دەڵیت : ئەو ئامادە دەکرا بۆ هەموو شتێك، بۆ هەموو هەلومەرجێك، لەبەر چاوی خودایی دروست دەکرا، و خەرمانەی ڕووناکی محمدی دەورەی دابوو! " وكان يهيأ لكل شيء ، ويعد لكل ظرف ، ويصنع على عين ربانية ، وتحيطه هالة محمدية" [ص ٧١ ]
٢٠١٦/٥/٢٣

# حەسەن بەننا و توندوتیژی
# ئایە حەسەن بەننا بوە قوربانی ڕێکخراوی تایبەت؟! [٣]

وەك چۆن لـە فكـری ئیخوانیـدا جیهـاد پلـە پلەیـە لـە جیهـادی نەفـس بـۆ وشـە بـۆ قەڵـەم بـۆ شمشـێر بەرزدەبێتـەوە، توندوتیژیـش لایـان پلـە پلەیـە ڕیزبەندیەكـەی لـە تەندوتیـژی دەروونیـەوە دەسـت پێـدەكات بـۆ ڕەفتـار و بـۆ گوفتـار و بـۆ جەسـتەیی.. حەسـەن بەننـا لـە ڕووی تیـۆری و پراكتیكیـەوە دامەزرێنـەری تووندوتیـژی ئیسـلامی سیاسـیە، هەرچەنـدە وا ناسـراوە كـە بانگەشـەی بـۆ ئاشـتیخوازانەی گەیاندنـی پەیامەكـەی كـردوە، دەكرێـت زۆر بیرۆكـەی تونـد وتەكفیـری لەنێـو نووسـینەكانی بدۆزیتـەوە و بـە تایبەتـی (رسـالة التعالیـم).

ئینجـا گەشەسـەندنی سروشـتی ئـەو بیروڕایـە توندانـە، حەتمـەن بـەرەو ئـەو توندوتیژیـە دەچێـت، و ئـەو هەمـوو لـق و پۆپـە تووندوتیـژەی لـێ دەكەوێتـەوە: سـەید قوتـب و بیـرە توندڕەوەكانـی، تەكفیـر وهیجـرە، و جەماعەتـی جیهـاد، تـا دەگات بـە قاعیـدە و داعـش، چونكـە بـۆ هەمـوو لایـەك زانـراوە كـە ئیخـوان دایكـی هەقیقـی هەمـوو لـق وپۆپەكانـی ئیسـلامی سیاسـییە.

ئـەو رسـالەیە (رسـالة التعالیم) ئاڕاسـتەی هەمـوو ئەندامانـی ئیخـوان نەكـرا بـوو، بەڵكـو وەك لـە سـەرەتای رسـالەكەدا دەڵێـت:"ئـەوە پەیامـی منـە بۆئیخوانـە موجاهیـدەكان لـە نێـوان الاخـوان المسـلمین، ئەوانـەی باوەڕیـان بـە بـەرزی دەعوەكەیـان وقودسـیەتی بیـرو وفیكرەكەیـان هەیـە، وعەزیمەتیـان كـردوە پێیـەوە بژیـن ولـە پێناویـدا بمـرن، ئـەو وشـەیە كورتـە تەنهـا ئاڕاسـتەی ئەوانـە دەكـەم . ئـەو وشـانەش وانـە نیـن بـۆ لەبەركـردن، بەڵكـو فەرمـان وتەعلیماتـن بـۆ جێبەجـێ كـردن". ئـەوە تووندوتیـژی بەرهـەم دەهێنێـت كاتـێ لـە تەعلیمـی ژمـارە ١٦، حەسـەن بەننـا داوای دابڕانـی ئیخوانـەكان دەكات لـە وەزیفـەی حكومـی " بـە پەرۆش مەبـن بـۆ وەزیفـەی حكومـی، و بـە تەسـكترین دەرگای ڕزقـی بزانیـت، و ڕەتیشـی نەكەیـەوە ئەگـەر بـۆت هەڵكـەوت، و وازیشـی لـێ نەهێنـی تەنهـا ئەگـەر هاڤدژی كـرد لەگـەڵ ئەركەكانـی دەعـوەدا!!!"

لـە تەعلیمـی ٢١ داوا دەكات " خزمەتـی سـامانی ئیسـلامی گشـتی بكرێـت بـە هاندانـی بەرهـەم ودامـەزراوە ئیسـلامیەكان وتاپێـت بكرێـت نەهێڵـی هەتـا قرشـێكیش بكەوێتەدەسـتێكی نـا ئیسـلام" ل ١١. ئـەوەش لەنـاو وڵاتێكـی فـرە ئایینـدا كێشـەیەكی زۆر دروسـت دەكات. ئینجـا چـی دەكرێـت ئەگـەر موسـڵمان پێویسـتی بـە بەرهەمـی نـا ئیسـلامی گرنـگ هەبـوو؟! لـە لەنـدەن كەسـانێكم دیتـوە شـتومەك تەنهـا لـە دوكانـی شـیعەكان یـان سـونەكان دەكـڕن!

لـە تەعلیمـی ٢٥ بـە حەرفـی داوا دەكات: " موقاتەعـەی دادگا ئەهلیـەكان وهـەر قەزایەكـی نـا ئیسـلامی بكەیـت، وهەروەهـا موقاتەعـەی یانـە وڕۆژنامـە وكۆمەڵـە وقوتابخانـەكان و هەیئاتـەكان بكەیـت كـە بەرهەڵسـتی

بیرۆکەی ئیسلامی تۆ دەکەن" کە ئەوەیان هەرە ترسناکترینی تەعالیمەکانە توندوتیژی بیر ودەروونی لێدەکەوێتەوە، و بە مانای موقاتەعەی دەوڵەتی نوێ ودەسەلاتی دادگایی دێت ، و بە مانای بایکۆتی هەموو دەزگا نوێکانی دەوڵەت و کۆمەڵ دێتەوە. (ل ١٢) ئەوەش توندوتیژیە کاتێ لە تەعلیمی ژمارە ٣٠ دا دەڵێت: " هەردەم نیەتی جیهاد و حەزی شەهیدبوونت هەبێت، و بۆیان ئامادە بیت تا لە تواناتدا بێت" لە تەعلیمێکی تری ترسناکدا ژمارە ٣٥ دا هاتوە:"ان تحارب اماکن اللهو فضلا عن ان تقربها" [جەنگگێران لە دژی شوێنی کات بەسەربردن، نەك لێی نزیک کەویەوە] لێرەدا چەمکی شوێنەکانی کات بەسەربردن و ڕابواردن دیاری نەکردوە، چونکە بابەتەکە ڕێژەییە، کەسانێکی توندوتیژ هەن هەتا شانۆ و چایخانەکانیش بە اماکن اللهو دەزانن! ئینجا جۆری موحارەبە کردنەکەشی دیار نەکردوە ئایە بە تەقاندنەوەی دەکرێت، یان بە شکاندنی کەل وپەلەکانی؟! واتە حەسەن بەننای مورشید کاری لێکدانەوەی بۆ خودی (موجاهیدەکان) جێهێشتوە!

لە دوا تەعلیمدا ژمارە ٣٨ دەڵێت: "... دەبێت خۆت بە سەربازێك بزانیت لە سوکنەی عەسکەری کە چاوەڕوانی فەرمان دەکات" ئەوە بەرهەم هێنانی توندوتیژیە، لە جیاتی دروستکردنی هەستی وریایی و ڕەخنەیی لای ئەندامانت، بیانکەیتە سەربازێکی ڕۆبۆتی، گوێ لە مستی هەموو سات وکاتێك! و بەپێی تەعلیمی ژمارە ٣٠ ش " هەردەم نیەتی جیهاد و حەزی شەهیدبوونت هەبێت" لێرەدا دەبێت چاوەڕوانی هەموو توندوتیژیەك بیت، لە جێبەجێکردنی هەر فەرمانێکی توندوتیژ!

بەری ئەو تەعالیمانە و ئەو ڕێکخراوە تایبەتە بوو کە بەننا دروستی کرد لە ١٩٤٠یان ١٩٣٦، کە توندوتیژیەکی زۆری بە دەوری خۆیدا بڵاوکردەوە، بۆ خەڵکانی نا ئیخوان وهەتا بۆ ئیخوانیەکانیش، و هەتا گومانێکی نزیك لە یەقین هەیە، کە حەسەن بەننا خۆشی کوژراوی دەستی ئەو ڕێکخراوە تایبەتە بوو بێت!

هەموو کەسێکی شارەزا بە مێژووی ئیخوان، و خودی ئیخوانەکانیش، باسی ڕۆڵی ترسناکی ڕێکخراوی تایبەت یان کردوە، کە حەسەن بەننا دروستی کرد بۆ بەرەنگاری ئینگلیز، بەڵام هەر زوو خرایە خزمەتی پاراستنی دەعوەکەی! سەرەڕای کوشتنی چەندین کەسایەتی گەورەی سیاسی وەک خازندار و محمود فهمی نەقراشی سەرۆك وەزیران، لە کۆتاییدا توندوتیژی ئەو دەزگایە کەوتە ناو ڕیزی خودی ئیخوان، ڕووداوی کوشتنی سید فایز، کە حەسەن بەننا لە دژی عبدالرحمن السندی کردیە سەرۆکی ڕێکخراوی تایبەت. سندی قوتوێك شیرینی بۆمبڕێژکراوی بۆ سید فایز نارد و کە کردیەوە کوشتی! سندی بکوژی فایز بوو بە شایەدی دەیان پیاوی ناوداری ئیخوان. سندی هێندە بەو هەموو موجاهید وفیدائیانە و چەکەکانی بوغرا ببوو، زۆر کەس دەڵێن پاش فشاری دەوڵەت وهەوڵی بەننا بۆ خۆ ڕزگارکردن لە بەرپرسیارەتی رەشەکوژیەکانیان، لە بەیاننامە ناوبانگەکەی گووتی: ئەو بکوژانە نە ئیخوانن نە موسڵمان! عبدالرحمن السندي خۆی حەسەن بەننای کوشت.

تازە بەو چەند ساڵەی دوایی ئەو گەواهیانە دەردەکەوێت پاش ئەوەی ٦٠ ساڵ تاوانەکەیان خستە ملی شا فاروق! تاقە کوڕی حەسەن بەننا، احمد سیف الاسلام ڕەتی دەکاتەوە کە شا فاروق بەننای

باوکی کوشتبێت، و گووتی بە دەستی پلانێکی نێودەوڵەتی بە هاوکاری ناوەوە کوژراوە، و بکوژەکان باش دەناسێت و بەڵگەی هەیە لەسەریان، و لە کتێبەکدا ئاشکرا دەکات، سەرەڕای ئەوەی باسی ئەوەی نەکرد کە بۆ ٦٠ ساڵە بێ دەنگ بووە لەسەر کوشتنی باوکی، کەچی تا وەفاتیشی کرد لە فیبرایەری ٢٠١٦ هەر ئەو کەسانەی ئاشکرا نەکرد، هەرچەندە لە ٢٠٠٩ وە ئەو قسانەی کرد بۆ ( جریدة الشروق الجدید)! بەڕاستی سەیرن ئەو پەروەردەکراوانەی ئیخوان! وەرە باوکت بکوژن، شەست ساڵ تێپەڕێت تازە بڵێیت شا فاروق نەیکوشتوە، و دەزانم کێ کوشتیەتی، هێشتا نەوێریت ئەو نهێنیە ئاشکرا بکەیت! جا لە سروشتی ترسنۆکانە بێت یان لەبەر بەرژەوەندی دەعوە بێت! دواجار کۆچی دوایشی کرد هەر نەیدرکاند. ئەو بێ جورئەتیە وراڕایی و نهێنی پاراستنە بێ مانایە سیفەتێکی دیاری زۆربەی کەسایەتیە ئیخوانیەکانە.

هەروەها ئەندامی باڵای ڕێکخستنی نهێنی نجیب راغب یش کە ئەندامێکی باڵای ڕێکخراوی تایبەت بوو، و نزیکی بەنا بوو لە گفتوگۆیەك لەگەڵ العربیة نت، دانی بەوەدا هێنا کە هەرگیز فاروق دەستی لە کوشتنی بەننا نەبووە، وبە ئاشکرا ئاماژەی بۆ بەرپرسیارەتی ڕێکخراوی تایبەت کرد... کەوابوو وەك دەڵێن ئاگر خۆی دەخواتەوە، ئەگەرێکی زۆر بەهێزە کە بەننا خۆی بووە قوربانی ئەو توندوتیژیەی کە خۆی دامەزرێنەری بوو! محمد غەزالی دەڵێت بەننا لە کۆتاییەکانی تەمەنی زۆر پەشیمانی دایگرتبوو لە دروستکردنی ڕێکخراوی تایبەت و تێکەڵکردنی دین بە سیاسەت!

من لەو باوەڕەدام کە حەسەن بەننا نەیدەزانی دروستکردنی ڕێکخراوی تایبەت و تێکەڵکردنی دین بە سیاسەت ئەو دەرەنجامە کارەساتبارانەی لێدەکەوێتەوە، لەو باوەڕەشم کە ئەگەر تەمەن بواری دابا زۆر شتی ڕاست دەکردەوە، کە شوێن کەوتوانی ناوێرن خۆیان لە قەرەشی بدەن، لە ترسی تۆمەتی لادان لە ڕێگای بەننا!

# حەسەن بەننا و خزم خزمێنەیی [٤]

عبدالحکیم عابدین گەنجێك بوو چالاك لەناو ئیخواندا، زۆر نزیکبوەوە لە حەسەن بەننا تا بوە زاوای، مێردی خوشکی. ئەو پیاوە خاوەنی بیرۆکەی سیستمی سەردانی خێزانی بوو لەناو ئیخواندا، بۆ پتەوکردنی پەیوەندی ئەندامانی ئیخوان. پاش ماوەیەك چەندین شکایەت وسکالاّ گەیشتە ئۆفیسی مورشیدی ئیخوان حەسەن بەننا، سەبارەت بە داوێن پیسی وبێ ڕەوشتی عبدالحکیم عابدین، کە بەردەوام سەردانی ئەو ژنانەی ئیخوانی دەکرد کە مێردەکانیان لە زیندان بوون!

بۆ ئەو مەبەستە لیژنەیەکی لێکۆڵینەوە دروست بوو بە سەرۆکایەتی احمد السکري کە بە دامەزرێنەری هەقیقی ئیخوان دادەنرێت لەساڵی ١٩٢٠، خۆی بەننای پێگەیاند، و بە پێشە خۆشی دادا! ئەو لیژنەیە گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە عبدالحکیم عابدین چەندین داوێم پیسی وای کردوە لەگەڵ خێزانەکانی ئیخوانەکان، و دانیشی پێ ناوە، وەک منداڵ دەگرییێت و خۆی لەسەر زەوی دەگەوزێنێ، داوای لێبوردن دەکات!

لە نووسراوی لیژنەکە هاتبوو: [ لیژنەکە قەناعەتی تەواوی هەیە کە عبدالحکیم عابدین –تاوانبارە-. بەتایبەتی ئەگەر دانپێداهێنانی خۆی بۆ هەندێ ئەندامانی لیژنەشی بخەینە سەر بەڵگەکانیتر. ئەو تاوانەش وەك سەرکردەیەکی دەعوەکە، زۆر گەورەیە دەرهەق بە دەعوە و هەقی ئەو کەسانەی برینداری کردوون لە عیرز وناموسیان، بۆیە وا پێویست دەکات قورسترین سزا بدرێت، بۆیە لیژنەکە بە کۆی دەنگ داوای فەسڵکردنی بەڕێز عبدالحکیم عابدین دەکات لە ئەندامێتی جەماعەت. و بڵاوکردنەوەی ئەو بڕیارەش، و کارکردن بۆ سارێژکردنی زامەکان، لە ٥صف ١٣٦٥ – ١٩٤٦/١/٩ ئیمزای ئەندامانی لیژنە: – (1)أحمد السکری ، (٢) – صالح عشماوی ، (٣) – حسین بدر ، (٤) – الدکتور إبراهیم حسن ، (٥) – حسین عبدالرازق. (٦)أمین إسماعیل.]

حەسەن بەنا سەرەڕای بڕیاری لیژنە و ئەو ئەندامە باڵایانەی ئیخوان، کە یەکێکیان وەك ئەحمەد السکری لە ١٤ ساڵیدا حەسەن بەنای پێگەیاند ویارمەتیدا و هێنایە ناو ڕێکخراوەکەی خۆی، بە گوێی ڕاسپاردەی لیژنەکەی نەکرد، و مامۆستای خۆی احمد السکری و هەموو ئەندامەکانیتری لیژنەشی فەسڵ کرد، لە پێناو پەردەپۆشکردنی زاواکەی عبدالحکیم عابدین! هەتا شێخ محمد الغزالي و خالد محمد خالدیشی فەسڵ کرد لەبەر ئەوەی ڕەخنەیان لە زاوای گرتبوو! کەوابوو یەکگرتوو لە ڕێگای ڤایرۆسی مێژوویی ئیخوانەوە ڕەفتاری پەردەپۆشکردنی فەزیحەت و داوێن پیسی و خیانەتیان وەك بۆماوە لە حەسەن بەناوە بۆ ماوەتەوە. هەر ئەو بێ باکی وتەسەیوبەیە، کە ئەندامانی باڵای یەکگرتوو و مەلای ناوداریان دەیان فەزائیحی ڕەوشتییان لێ ڕوو دەدات، و بۆیانیشیان پەردەپۆش دەکەن، بەناوی سیاسەتی سەتر کردن! لێیان ناگیرێت کە ئەمڕۆش وا بە دڵسۆزی خیانەت و داوێنپیسی شێخی مەدخەلیەت دادەپۆشن،

چونکە خۆیان پاشەڵیان پیسە، من چەندین ناوی زل و ناودارانی یەکگرتووم لەلایە کە دووچاری ئەو جۆرە سکانداڵە هەرزەکارانە هاتوون، خۆزگە بەڵگەکانم بەدەست دەگەیشتن، تا فێری سیاسەتی ئەنتی سەتریان کەین، و فێری ئەوەیان بکەین سیاسەتکردن بەو چەمکە تەقلیدیانەی غەیبەت و سەتر و قسە نالۆژیکیانە ناکرێت! خەڵك چۆن دەتوانێت متمانە بداتە هێزێکی سەتربازی وەك ئەو ئیسلامیانە، بەیانی تاوان و گەندەڵی و دزیش بکەن بۆیان سەتر دەکەن!
٢٠١٦/٥/١٧

# حەسەن بەننا و مەرایی کردن بۆ دەسەڵاتداران! [٥]

لەنامەیەکدا کە حەسەن بەننا بۆ شا فاروقی ناردوە، جگە لەوەی لێوان لێوە لە پیاهەڵدان هەندێ گوزارشی نا شەرعیشی تێدایە وەك (عرشك العزیز) و (تاجك المقدس) کەی تاجی سەری مەلیکەکان موقەدەس وپیرۆز بوە؟! ئەوەی خوارەوە بەشێکە لەو ستایشنامەیە:

السلام علیکم ورحمه الله وبرکاته.. وبعد:

فأنت یا صاحب الجلالة موضع الامل ومعقد الرجاء لوادی النیل ولابناء العروبه ولشعوب الاسلام، عاطفه من الولاء والحب غرسها الله لك فی قلوب الناس لاراده یعلمها وحکمة یریدها....

ومصر الان یا صاحب الجلالة تجتاز ادق مراحل تاریخها الحدیث وحکومتها فی مفاوضة مع حکومه بریطانیا ترجو ان تصل الی حق الوطن فی الجلاء ووحدة الوادی حتی یحیا حیاه الحریة والکرامة والاستقلال فی ظل عرشك العزیز وتاجك المقدس!!!

ئەو خیتابە وئەو عەقڵیەتە گوزارش لە عەقڵیەتی بەخواکردنی حاکم دەکات (تألیە الحاکم) کە لە سەدە کۆنەکان لە وڵاتەکانی ڕۆژهەڵات و ئەوروپای سەدەکانی نێوەڕاست هەبوو، سەدەکانی تاریکی کە مرۆڤایەتی هەوڵی خۆ لێ ڕزگارکردن لەو قۆناغە دەدات ، کەچی حەسەن بەننا هەوڵی گێڕانەوەی دەدا چونکە هەر بەننا لە بۆنەیەکی تر خەلیفەی پێ سێبەری خوابوو لەسەر زەوی(ل ١٤٠ -١٤٦) کتێبی حسن البنا الذي لا یعرفە احد، لەسایەی ئەو کۆڵەوارییە سیاسیەیەی حەسەن بەننایە، ئەو کۆمەڵە لەوەتی هەیە سەرکەوتنێکی سیاسی ئەوتۆیان تۆمار نەکردوە وهەردەم موسایەرەی دیکتاتۆرەکان دەکەن وکاتێ خەڵکی تر ڕادەپەڕێت وشۆڕش دەکات خۆیان بە شەمەندەفەری شۆڕش هەڵدەواسن وهێندەی پێ ناچێت خۆیان دەکەن بە شوفێری شەمەندەفەرەکە!!

لە بەشی نۆیەمی کتێبی [حسن البنا الذي لا یعرفە احد] نوسەرلەژێر ناونیشانی (حەسەن بەننا و مەلیك فاروق) لە سەرەتادا باسی لابردنی بەشێکی تەواوی کتێبی (مذکرات الدعوة والداعیة) ی حەسەن بەننا دەکات. ئەو بەشە لەیەکەم چاپیدا کە لە (دار الکتاب العربی) بریتی بوو لە ژمارەی لاپەڕەکانی ٢٥١ بۆ ٢٥٥ لە ژێر ناونیشانی (المؤتمر الرابع للاخوان والاحتفال بحضور جلالة الملك وتسلیمه مقالید الامور) تێیدا ستایشکردنێك ووەلائێکی موتڵەق بۆ شا فاروق نیشان دەدەن تا ڕادەی ماستاوکردن بە بۆنەی گەڕانەوەی فاروق لە لەندەن وبوونی بە شای میسر، پاش مردنی شا عەباسی باوکی فاروق، بەننا لەژێر ناونیشانی (حشد لم یسبق لە نظیر فی تاریخ مصر الحدیثة) وتارێك لە گۆڤاری ئیخوان دەینوسێتەوە ودەڵێ: " لە ساحەی عابدین شوێن پێیەکت دەست نەدەکەوت لەبەر قەرەباڵغی زۆر، ولەبەر هوتاف کێشان، کە سەدای لە ئاسماندا دەنگی دەدایەوە، بە زەحمەت گوێت لەکەسێك دەبو ئەگەر بیدواندبای. بەو جۆرە ئیخوانەکان لەبەردەم دەرگای کۆشکی شا وەستا بوون،

ئالآكانیان بەرز هەڵكردبوو هوتافیان دەكێشا (اللە اكبر، اللە اكبر، الاخوان المسلمون یبایعون الملك المعظم) (ل ١٣٥ -١٣٦) كەوابوو بڵاوكردنەوەی كتێبی مذكرات الدعوة والداعیة بەشێوەیەكی میزاجی وبژاردەیی بوە، چونكە ئەو یاداشتنامەیە لەپاش كۆچی دوایی حەسەن بەننا لە ١٩٥٠ بڵاوكرایەوە، ئەو كارەیان بۆیە كرد، چونكە وادیارە هەستیان بە كۆتایی حوكمی شا فاروق كردبوو، بۆیە ئەو بەشەیان لابرد! یان لەبەر هاتنی ناوی عمر التلمسانی بوو لەنێو ئەوانەی بەشداریان لەو ئاهەنگە مەزنەی شا فاروق كردبوو. لەڕاستیدا ئەو هوتاف كێشانە بۆ شا فاروق هێندە نەنگی نەبوو لە ساڵی ١٩٣٦ كە تا ئەو كاتە كەس فاروقی نەدەناسی، ئەوەی كە زۆر نەنگیە ئەوەیە كە ئەو رەفتارەی حەسەن بەننا وئیخوان تا دوایین رۆژی ژیانیان و تا مردنی مەلیك بەو شێوەیە بوو! بەردەوام خەریكی ماكیاژكردنی وێنەی فاروق بوون هەتا پاش دزێو بوونیشی ودەركەوتنی ڕووی دزێوی شا فاروق، ودابەزینی جەماوەری بوونی بۆ نزمترین ئاست لە كۆتایی چلەكاندا.

٢٠١٦/٥/٢٢

# غەرامیاتی شێخ قەرەزاوی
# ئەویش موشتاقێکی گەورە دەرچوو!

-١-

من دەمێکە ئاگاداری هاوسەرگیری دووەمی شێخ قەرەزاویم بە ئافرەتێک، لە تەمەنی کچی خۆی بچوکتر، کە ناوی اسماء بن قادة، بوو. ئاگاداری ئەوەش بووم کە لە ژێر فشاری کەس و کاری و کوڕ وکچەکانی، ئەو ئافرەتەی بە شێوەیەك تەڵاق دا، هەتا مرۆڤێکی ئاساییش پێی شەرمە وا ژن تەڵاق بدات! ئەخر بووە شەوی پێس تەڵاق بچیتە لای ژنەکە، شەوێکی سوور و پەمەیی بەسەر بەریت، بەیانیش لە ماڵ دەرچیت بەبێ هیچ کێشە و لە دەرەوە هەواڵی تەڵاق بنێریت بۆ ژنەکەت؟!

لای ئەو فەقیهانە ئەگەر سەرجێی ماڵئاوایی [مضاجعة الوداع] هەبێت، کە مانای سێکس کردنە لەگەڵ ژنی مردووت بۆ دواجار، چۆن سەرجێیی ماڵئاوایی پێش تەڵاق نابێت؟! ئەگەر هێندە دەروون نزم بن، سێکسی ئافرەتی مردوو حەلال بکەن، چۆن سێکسی ژنێکی زیندوو حەلال ناکەن، بەر لە تەڵاق دان بە چەند سەعاتێك؟!

پاش ئەوەی کور و کچەکانی قەرەزاوی، فشاریان خستە سەری، هەتا کوڕە شاعیرە ناودارەکەی عبدالرحمن یوسف، کە خۆی بە گیڤارا ناگۆڕێتەوە، دە ساڵ لەگەڵ باوکی دابرانی کرد، و هەتا دەڵێن لە ڕقی باوکی بووە شیعە، و باوکیشی لە ڕقی ئەو دژی شیعە هەڵمەتی کرد.

خۆی دەمێکە قەرەزاوی ژنەکەی تەڵاق داوە، پاش پەیوەندیەکی خۆشەویستی پەنهانی، تا بناگوێی تووشی عیشق و بی ئاگایی و سوتان و برژانی دڵ ببوو.

بابەتەکە بۆیە وروژاوە، کاتێ قەرەزاوی لە بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی بە ناوی المراجعات لە ئەڵقەی ٢٢، باسی چیرۆکی هاوسەرگیری خۆی کرد لەگەڵ ئەسماء ی ژنی دوومی، زۆر بە کورتی بەسەریدا تێپەڕی، و زۆربەی هوقیقەتەکانی فەرامۆش کرد، گووتی: کاتێ داوای زەواجی لەو قوتابیەی خۆی کردوە لە ٢٠ ساڵیدا! ئەسما پێی گوتوە: من لە غەیری تۆ مێرد بە پیاوەکی تر ناکەم!

ئەسما وەڵامی دایەوە و گووتی شێخ ڕاست ناکات، دەیان نامەی پڕ خۆشەویستی و غەرامیاتی بۆ نووسیوم کە ئێستاش بە دەست خەتی خۆی ماون، شیعری وای بۆ نووسیوە، هەرزەکارێکیش وا ناسوتێت بۆ دڵبەرەکەی!

## خێزانی اسماء بن قادة

ئەو ئافرەتە کچی خێزانێکی زۆر زانست پەروەرن، باوکیان ناسراوە بە باوکی بیرکاری لە جەزائیر. شەش خوشکی هەیە هەمووی هەڵگری دکتۆران. سێ برای هەیە دوویان هەڵگری دکتۆران و سێیەمیان

ماستەری هەیە. جگە لەوەش خانەوادەی ئەمیر حبدالقادر جەزائیرین، یەکێك لە گەورەترین پیاوانی مێژووی جەزایر.

ئافرەتەکە تەنها نامەیەك و شیعرێکی قەرەزاوی گواستەوە، بەڕاستی کەمن خوێندمەوە تووشی ڕاتەکان هاتم! ئەخر ئاساییە بۆ هەرزەکارێکی ژن نەدیوی، خۆپارێزی بێ ئەزموون ئەو قسانە بکات، بەڵام گەورەترین موفتی ئیخوانی موسلمین ئەو قسانە بکات، ئەوە هەرسکردنی زەحمەتە!

یا ڕەبی خوایە لە گەورە تەمەندا کەس وا منداڵ نەکەیتەوە، بە تایبەتی کەسێکی وا دینی، کە بەرپرسیارەتێکی گەورەی هەیە، لەو هەموو توندوتیژیەی لەفزی و جەستەیی و داب ونەریتییەوە، دەستێکی بالایان هەیە لە خەریک کردنی خەڵك بە ئەخلاقیاتی توندوتیژ و عەیبە، و فشار خستنە سەر ئافرەت، بە ناوی ڕابوونی ئیسلامی، کە ڕێك بە مانای خەوتنی ئافرەت دێت، لە دیوێکیەوە!

با هەندێ برگەی نامەکە بخوێنینەوە پێکەوە:

بەناوی خوای گەورە و دلۆڤان

خۆشەویستم ئەسما، سەلامی خوات لێ بێت

ئەوە یەکەم نامەیە قەڵەمەکەم دەینووسێت بۆ تۆ ئەی خۆشەویستی ڕۆحم، کولەکەی دڵم، گلێنەی چاوم، بۆئەوەی بە ڕاشکاوی گوزارش لە خۆشەویستی قووڵم بۆت بکەم کە لە دڵم شاردومەتەوە بە درێژایی پێنج ساڵ، و بۆ ئەوەی هەقیقەتی دەروونی خۆمت بۆ ئاشکرا بکەم، بۆ ئەوەی هەست و سۆزم بخەمە بەر چاوت بەبێ پەردە و شاردنەوە. ئیمە قۆناغی ئاماژەمان جێ هێشتووە بۆ ڕاشکاوی، و ئیشارەت بۆ عیبارەت، زمانی بێ دەنگی چاو بۆ زمانی قسەکەر.

هەرچیەکی بێت، تۆم خۆشویستوە ئەی ئەسمائی دولبەرم، ئەی بە نرخترین ناو و شیرینترین شێوە، و جوانترین ڕوخسار، و لەبارترین جەستە، و پاکترین دڵ، و خۆشترین دەنگ، و جوانترین دەروون، و بلیمەتترین عەقڵ، ڕاسترین ڕەوشت. تۆ ئەی دلبەرم تەنها تۆ، دڵت داگیرکردووم، چاوت رووناک کردووم، و بیرت سەرقاڵ کردووم!

# غەرامیاتی شێخ قەڕەزاوی
# ئەویش موشتاقێکی گەورە دەرچوو!

-٢-

قەرەزاوی لە بەشێکی نامەکەی دەڵێت: لە کۆڕی شاری ستێف، لە ١٩٨٤ کاتێ چاوم پێت کەوت، ویستم گفتوگۆیەکی تایبەتت لەگەڵ بکەم و بڵێم کچێکم هەیە ناوی ئەسما یە وەك تۆ، ئەوەش بۆ ئەوەی پەیوەندیەکی جیاوازت لەگەڵ ببەستم، لە کۆڕبەندی سطیف، چەند کتێبێکی خۆمم کردە دیاریت، لە سەر هەندێکیان نووسیم پێشکەشە بۆ کچی خۆشەویستم، و لەسەر هەندێکی تر نووسیم بۆ خۆشەویتم اسماء! چونکە هەستم دەکرد ئەو کچم کچمە بەربەستێکە لە نێوان من و تۆ، بۆیە بە قەست لامدا! نازانم سەرنجت دا، یان وەتزانی کارێکی ڕەمەکییە؟!

## قەڕەزاوی: چەند دەبەنگ بووم

"دولبەرم نازانی چ خەمیك سواری سەرشانم بوو، و چ پەشیمانیەك بینی گرتم، پاش ئەوەی بە فڕۆکە چوومە قاهیرە ڕۆژی ٦/٩، ویستم بڵێم دامبەزێنن، و بمگەڕێننەوە بۆ هۆتێڵ. چۆن وڵاتێك بەجێ بهێڵم تۆی لێ بیت، کاتێ بتوانم ڕۆژێ یان دوو ڕۆژی تر خۆم دواخەم؟ ئای کە دەبەنگ بووم چەندم زەرەر کرد بەو ڕەفتارە. خەتای تۆ بوو خۆشەویستم، کاتێ قسەم لەگەڵ کردی زۆر بەخێرمانەوەت لە مانەوەم نەکرد، من چاوەڕوانی زمانێکی فەرمانکەر بووم لە تۆ ئەمرم پێ بکات بە مانەوە، ئەمرم پی بکات بە دەسەڵاتی خۆشەویستی وئەڤینی، کە دەسەلاتداری دەسەڵاتدارانە! ئەگەر وا ئەمرت پێ کردبام نازانی چۆن لەو پەڕی شادیدا دەبووم!

خۆشەویستم لەگەڵ ئەو نامەیە، شیعرێکتم بۆ نووسیوە، کە هەتا لە سەردەمی لاوێتیشدا شتی وام نە نوسیوە، لە لاوێتیشدا خوشەویستی وام نەکردوە...ئەو زەوییە بەرینەی لێکردومەتە تەنگەبەر، و دەروونم وا تەسك بۆتەو پاش بەجێهێشتنت..لەو شیعرەدا بە سروشتی دەمبینیت بێ پەردە و بێ ئارایش، هەموو پیتێکی ترپەیەکە لە ترپەکانی دڵم، و خورپەیەکە لە خورپەکانی سۆزم، بیخوێنەوە و ئەو ناونیشـآنەی بۆ دانێ کە پێت خۆشە!

## دوعا بکە خەوم لێبکەوێت تا ئەرکی موسڵمانان جێبەجێ بکەم!

قەڕەزاوی لەو بەشەدا باسی شڵەژانی دەروونی و ئاگری عیشق و خەوزڕانی دەکات، و دەڵێت:

ئای جودایی چەندە پڕ قەسوەتە، و چەند قورسە لێك دوورکەوتنەوە، چی بکەم تا ئاگری ناو دڵم بکوژێنمەوە؟ ...دولبەری من دەزانیت کێشەم چییە؟ کێشەم خەوزڕانە، چونکە هەردەم بیر لە تۆ دەکەمەوە،

بۆ جاوتروکانێکیش ناتوانم لەبیرت کەم، بۆیە هەر خۆم هەڵگێڕ و وەرگێڕ دەکەم لەناو پێخەفەکەم وەک بڵێی لەسەر پشکۆ و پەنگر خەوتبم، ئینجا پێخەفەکەم جێ دەهێڵم بەرەو لای کتێبخانەکەم، زۆرجار وادەمێنمەوە تا نوێژی بەرەبەیان، کەسیش نازانی چیمە!.. ئەوە ئەو پزیسکەیە کە بووە ئاگر، و ئەو شنەبایەیە بوە ڕەشەبا، دوعام بۆ بکە هەناسەکەم بخەوم تا بتوانم ئەو ئەرکانەم جێبەجێ بکەم کە موسڵمانان لە منی داوا دەکەن، کە ئەرکێکی زۆر زۆرن، بەڵام خۆشەویستیت دەبێتە پاڵنەرێکی بە هێز بۆ بەخشینی زیاتر و بەرهەمی زیاتر لە هەموو بوارێکدا!

## ڕقیشت لێم بیتەوە دەلێم خۆشم دەوێی!

ئاخ ئەسمایە خۆشەویستەکەم، ئەگەر دەزانی بڕی ئەو خۆسەویستییەی لە دڵم دایە بۆ تۆ. من دەسەوسانم لە وەسفکردنی کەمن خاوەن سەلیقەی شیعر و پەخشانم، ئەوەی لە قەسیدەکەش گوتومە، هەر هێندەم بۆ گووتراوە، بەڵام گوزارش لە هەموو ئەوەی لەناو دڵم ناکات! ئەوەی دەتوانم بیڵێم دولبەرم ئەوەیە خۆشم دەوێیت و خۆشم دەوێیت و خۆشم دەوێیت، ئەگەر خۆشت بوێم یان ڕقت لێم بێتەوە، پێم رازی بوویت یان ڕەفزت دامێ، بۆ من بوویت یان بۆ کەسێکی تر، هەتا ئەگەر دوودڵیش بووی لە بانگ کردنم بە خۆشەویستم!

## هەمــوو خۆشەویســتی قەیــس بــۆ لەیــلا و ڕۆمیــۆ بــۆ جولیتیــش ناگــەن بــە خۆشەویســتی مــن بــۆ تــۆ!

# غەرامیاتی شێخ قەڕەزاوی

# ئەویش موشتاقێکی گەورە دەرچوو!

**-٣-**

ئەوەی زۆر سەرنجی ڕاکیشام لە بەشی دووەمی ئەو وتارە ئەو گوزارشە موحەڕەمە بوو، کاتێ شێخی عاشق لە نزیکی ٧٠ ساڵیەوە، لە دایك بووی ١٩٢٦، بە کچێکی ٢٠ ساڵە دەڵێت: "خۆشم دەوێیت، ئەگەر خۆشت بوێم یان ڕقت لێم بێتەوە، پێم رازی بوویت یان ڕەفزت دامێ، بۆ من بوویت یان بۆ کەسێکی تر!" چۆن بۆ کەسێکی تریش بێت خۆشت دەوێت وەك ئافرەتێك؟! ئەوەیە هەرزەکاری درەنگ کە لە دەروونزانی باسی دەکەن!

### - وا هەست دەکەم جەزائیر لە تۆدا کورت بۆتەوە!

"خۆشم دەوێیت بە هەموو ڕوحم، و هەموو عەقڵم و هەموو دەمارم و هەموو خانەیەکی جەستەم، بەڵکو بە هەموو گەردێك لە قەوارەم! بەسمە گەر تۆ دەیەکی ئەو خۆشەویستیەی من، منت خۆش بوێت، ناتوانیت دولبەرەکەم مونافەسەم بکەیت، هەردەم خۆشەویستی من لە پێشترە و قووڵترە. هەموو ساتێك تێدەپەڕێت زیاد دەکات خۆشەویستیم، خۆشەویستیم، خۆشەویستیم!...ئەی نموونەی جوانی و کەمالی و میینەیی و چالاکی. مرۆڤایەتی و موسڵمانێەتی و میینەی تەواوی بێ خەوشم لە تۆدا خۆش دەوێت، چۆن خۆشم نەوێیت ئەی ئەسما، هەی بۆنخۆشتر لە بۆنی گوڵاو، ناسکتر لە شنەی بەیان، بەنرختر لە ڕۆژەکانی تەمەنم، ئەی شادی رۆژگارم و هیوای ئایندە و بەهاری تەمەنم. تۆم خۆشدەویت و سەبارەت بەتۆ هەموو جازائیرم خۆشویست، وادەزانم هەموو جەزائیر لە تۆدا بەرجەستە بووە"!

### - هەمــوو خۆشەویســتی قەیــس بــۆ لەیــلا، و کوســەیر بــۆ عیــزە، و ڕۆمیــۆ بــۆ جولیتیــش پیکــەوە ناگــەن بــە خۆشەویســتی مــن بــۆ تــۆ!

لێرەدا قەڕەزاوی بە حوکمی فەرهەنگی دینی، گوزارشێکی ناوداری سۆفیەکان و تەقواداران بەکار دەهێنیت، نەك بۆ نیشاندانی لەزەت و خۆشی ئیمان و تەقوا، وەك کاتی خۆی لە کتێبێکی بەناوی الایمان و الحیاة وابزانم، بەکاری هینابوو بۆ لەزەتی عیبادەت و تەقوا! بەڵکو لێرەدا ئەو گوزارشە دەخوازێت بۆ نیشاندانی لەزەتی ئەڤینی خۆی! و دەڵێت:

"لە شادیەکدام ئەگەر پاشاکان پێی بزانن، بە شمشێر بۆ لێساندنی شەڕمان لەگەڵدا دەکەن، ئەوەش هەمووی لە سایەی خۆشەویستی تۆدا هەناسەکەم! بۆ نا دلبەرەکەم، جوانی تەواو و شیرینی تەواوم لە تۆدا خۆش ویستووە. جوانی جیهان و جیهانی جوانی لە تۆدا بەرجەستە بووە. هێزی ڕۆح و ڕۆحی هێز لە تۆدا وەردەگرم! وا هەست دەکەم هەموو خۆشەویستی پەرش وبڵاو بووی جیهان لە دڵمدا

کۆکراوەتەوە بۆ تۆ. هەموو خۆشەویستی قەیس بۆ لەیلا و کوسەیر بۆ عیزە، و ڕۆمیۆ بۆ جولیتیش پێکەوە ناگەن بە خۆشەویستی من بۆ تۆ چاوە جوانەکە! خۆشەویستی من لەوە گەورەترە وەسف بکرێت، ئەوە بەسە کە من دەیچێژم و بۆتە نیعمەتێك بەسەرم ئەی هەناسەکەم.

## - بیرکردنەوەم لە تۆ هەڵە و سەهوم پێدەکات لە نوێژ، لەگەڵ سەهوەکەش دیسان هەڵە دەکەم لە سوژدەی سەهوو!

قەرەزاوی لەو بەشەی نامەکەیدا، وەك عەوامێکی دیندار قسە دەکات، کە هەتا نوێژ و عیبادەتیشی لەبەر دولبەرەکەی لە بیرچۆتەوە، لە جیاتی زیکری خوا، زیکری حەبیبەکەی دەکات، و و اصبح فؤاده خالیا الا من ذکر اسماء! نە ئیمامەتی پێ دەکرێت و نە خوتبەی پێ دەدرێت، لەبەر زۆری هەڵە وسەهوو کردن، هەتا کاتێ دەیەوێت سوژدەی سەهووش ببات، جارێکیتر لەویش سەهوو دەکات! ئەو هەڵە کردن لە نوێژ و قوڕگ پڕگریانییەی خوتبە، موبتەلایەکی ترمان بیردەخاتەوە! چیان لێ قەوماوە ئەو شێخ و مەشایخانە وا هەرزەکارانە تی دەکەون؟! خوا قوەتیان بدات!

"هەناسەکەم تۆ هەردەم ئامادەیت لە ویژدانم و لە دۆخی وەستان و جوڵانمدا، لە ماڵەوە و لە نووسینگەکەم، بە تەنها و لەگەڵ خەڵك لە گەڵمای. لە گەڵمای کاتێ لەگەڵ خەڵک قسە دەکەم، لە کاتی نووسینمدا لە گەڵمی، لە کاتی وتاردانمدا لەگەڵمی، لە کاتی نوێژمدا لەگەڵمی! ئێستا تا بۆم بکرێت، خۆم دەدزمەوە لە ئیمامەتی پێشنوێژیدا، چونکە بیرکردنەوەم لە تۆ هەڵە و سەهوم پێدەکات لە نوێژ، لەگەڵ سەهوەکەش دیسان هەڵە دەکەم لە سوژدەی سەهوو"!

ئەو نامەیە بە مەرجێك یەکەم نامەیەتی، وەك موسارەحەنامە ناردووتی، هێشتا کچەکە گفتی پی نەداوە، و پێنج ساڵە نەیدیوە، کەچی وا قسەی لەگەڵ دەکات، وەك بڵێی کچەکە گفتی پێ دابێت، یان دەیەوێت بیخاتە ئەمری واقیعەوە!

ئافرەتەکە دەڵێت من تا ئەو ساتە بڕیارم نەدابوو، لە وەڵامی نامەکەیشیدا کچەکە هەر گفتی پێ نادات، بە پیچەوانەی ئەوەی قەرەزاوی باسی دەکات لە ئەڵقەی ٢٢ المراجعات، و دەڵێت قەت نەمگوتوە: لە تۆ زیاتر شوو بە کەس ناکەم! بەڵکو گووتم:

خۆشەویستی تیرێك نییە لە ناکاو بچێتە ناو خودم و کانیاوی هەست و سۆز بتەقێنێتەوە، بەڵکو مانایەکە بە عەقڵ دەرکی پێ دەکرێت، ئینجا پەلدەهاوێژێ بۆ ویژدان، ئەو مانایەش بە جەوهەری کەسەکە بەستراوەتەوە، ئایە تۆ ئەو جەوهەرەیت، نازانم!

إن الحب ليس سهما ينفذ إلى ذاتي فجأة فيفجر فيها نبع العواطف والمشاعر، إنه معنى يدركه العقل، ثم يفيض بعد ذلك على الوجدان، ذلك المعنى مرتبط بجوهر الشخص، فهل تمثل أنت ذلك الجوهر، لا أدري؟

لە بەشی داهاتوو باسی ئەو ستەمە و ناوزڕاندنەی ئافرەتەکە دەکەین لەلایەن شێخ و منداڵەکانی و ئیخوان بە گشتی.

٢٠١٦/٧/١٠

# قەسیدەکەی شێخ ڕۆمیۆ قەرەزاوی لە سەردەمی عاشقاتییدا!

-٤-

لە نامەکەدا دەڵێت بە نامە و قەسیدەکەوە، هێشتا نەمتوانیوە گوزارش لە خۆشەویستی ناو دڵی خۆم بکەم!

ئینجا وەرە بەو هەموو دێر و نووسینە نزیکەی دوو هەزار وشەی بۆ بنوسیت هێشتا نەتوانیبێت گوزارش لە خۆشەویستی خۆت کردبێت! ئەوە چ هەرزەکاریەکی درەنگ کەوتووە؟! من ناتوانم هەمووی وەرگێڕم، شاعیریش نیم وەك ڕۆمیۆ، تەنها ماناکەیتان بۆ وەردەگێرم. تەنها بەشێکتان بۆ وەردەگێڕم.

ئەی لەیلاکەم پەیامی دڵمت پێگەیشت؟
هەست بە دڵم دەکەیت پشێوی زیاد دەکات؟
هەست بە ئاگرم دەکەیت، کڵپەی زیاد دەکات؟
هەست دەکەیت من بوومەتە جەستە و گیانت؟
دەزانی ئاواتەخوازم وەڵامێکی تۆ ببیستم؟
تۆ بڵێی ئاهەکانم ببێتە ئاوازی پڕ ناسۆرم؟
بڵێی دووریم لە تۆ ببێتە مایەی نزیکی و پێک گەیشتن؟
بڵێی لە باغەکەت ئەوەی خۆش و شیرینە لێیکەمەوە؟
بڵێی لە پێکەکەت هەنگوینی تواوەم دەرخوارد بدەیت
ئای هیوا چەند خۆشە هەرچەندە تراویلکەش بێت!
ئای ئەگەر وەڵامی نزایەکم مسۆگەر دەبوو!
دەمگووت: خوایە جاودێری لەیلاکەم بە و پاداشتم دەرەوە
لێمگەڕێ خەونی نزیکیت پێوە ببینم با درۆش بێت!
دەرگایەکم بۆ بکەوە لە ژێرزەمینی ئایندەی نادیاردا
من لە پێناو تۆدا گیانەکەم ئەشکەنجە سیرینە لام
لە دەبەنگێك یان زیرەکیکی خۆ گەمژەکەر ناترسم
لە قسەی حەسودان گەر بڵێن پیرێکی خۆ مناڵکەرە ناترسم
هەموو لێی دەترسم ئەوەیە دڵێك لەبیرکەیت لەتۆدا تواوەتەوە
گوڵ بە درك ببینم و زێڕ وەك خۆڵ دەرکەویتەوە
ژمارەکان ببنە سفر و جیهانمان ببێتە چۆڵەوانی

خەڵك وەک دڕندە ببینم و جیهانیش وەك جەنگڵستان
تۆ دنیای منی لە پاش پیری ببە بە لاوێتی من
لە وشكانی بسورپێمەوە نە لە چیا و نە لە گردەكان سڵ كەمەوە
لە دەریا بخولێمەوە نە لە هەڵچوون و نە لە شەپۆڵ بترسم
ئەی خۆشەویست گیانەكەم گویم بۆ بگرە و سكاڵام بشنەوە
من لە دەریای ئەڤینی دەخنكێم ئەی بازنەی ڕزگاركەرم
من لە قۆناغی سوتانم وەک مۆمە تواوەكان
لەوەتی جێم هێشتووی بوومەتە نەهەنگێك لە بیاباندا!
لەوەتی جێم هێشتووی دڵم بە پشكۆ سوور هەڵگەڕاوە
پێخەفی ژێرم وەك درِكی بیابانی لێ هاتووە
شەونخونی پێڵوەكانی زامداركردووم و موشتاقیم جەستەی لەر كردووم
لە ماڵەوە نامۆی كردووم لە ناو كەس و كچەكانم
دەپرسن باوە ئەوە چیتە حەسرەت بە ڕوخسارتەوە دیارە
كوا قسە خۆش و سوحبەتە خۆسەكانی فیرت كردووی
كوا ڕوخساری درەشاوە و بزە جوانەكانت؟
چیتە كوێت دێشێ بە فیدات بین
با دكتۆرێكی بلیمەتی متمانەدارت بۆ بانگ بكەین
دڵت بپشكنێ، فسارت بپێوێ، تریەت بژمێرێ
گووتم: تەنها شەكەتی گەشتە درێژەكانم
نهێنیەكەم شاردووە لە كەس وكار و هەواڵ و مناڵم

سەرچاوە:

http://www.watanserb.com/2016/07/03/%D8%A3%D8%B3%D9%85%D8%A7%D8%A1-%D8%A8%D9%86-%D9%82%D8%A7%D8%AF%D8%A9-%D9%87%D8%B0%D9%87-%D8%AD%D9%82%D9%8A%D9%82%D8%A9-%D8%B9%D9%84%D8%A7%D9%82%D8%AA%D9%8A-/%D8%A8%D8%A7%D9%84%D8%B4%D9%8A%D8%AE-%D8%A7

# ستەمەکانی قەرەزاوی و منالّەکانی لە ئەسما!

-٥-

## ڕەخنەکانمان چییە قەرەزاوی؟

ڕەخنەی من لە قەرەزاوی و هاوشێوەکانی لە پیاوە دینیە ناودارەکان و موقتەدیرەکان، ئەوەیە کە نموونەیەکی زۆر خراپ نیشانی خەڵك دەدەن لەو بوارانەدا:

- لە خەریک بوون بە شەهواتی خۆیان، سەرەڕای تەمەن و ژنداری، و هەندێکیان زیاتر لە دوو ژنیش.

- لە نیشاندانی خۆپەرستی و بیرنەکردنەوە لەو گەنجانەی دەوروبەریان، کە شتێکی زۆر جوان دەبێت قەرەزاوی ملیاردێر لەسەر حیسابی دین، لە جیاتی بیرکردنەوە لە خۆی، سپۆنسەری پێنج شەش گەنجی زگورتی بکات لە ژن هێناندا.

-لە تەك فرەژنی، خەڵك هان دەدەن بۆ ناجوامێری و بێ وەفایی و بیرکردنەوە لو کاری زۆر خراپ، چونکە خەڵکانێکی زۆر لاساییان دەکەنەوە و بە قدوەیان دەزانن.

-ئەو بێ شەخسیەتیەی کە لەو باسە دەردەکەوێت وەك ئەسما دەڵێت:" والمشكلة أنه لم يكن حاسما في مواقفه، وإذا ما قرر الحسم يوما يكون ضدي، من منطلق أنه يرتكب أهون الشرين وأخف الضررين، وكل ذلك بعيدا عن متطلبات الشرع" کەسێکی ڕاڕا بوو و یەکلایی کەرەوە نەبوو لە هەڵوێستەکانی، ئەگەر ڕۆژێکیش بڕیاری دابا یەکلاییکەرەوە بێت، دژی من دەبوو، بە حیساب کەمترین خراپە و بچوکترین زەرەر هەڵدەبژێرێت، هەمووش دوور لە پێداویستیەکانی شەرع!

کێشەی ئەو پیاوە دینیە ناودارانە ئەوەیە، هێندە لەناو کتێب و بابەتی تیۆری دەژین هێندە لە واقیع و ناو خەڵکدا ناژین، بۆیە کە تێدەکەون خراپ تێدەکەون، کە ڕەفتار دەکەن، بە قەد پیاوێکی ئاساییش ڕەچاوی شەرع و عورف و داب ونەریت ناکەن.

کێ هەیە بە عەقڵی دابچێت، گەورەترین سەری سەلەفی ئافرەتێکی گەنج و منداڵ، فریو بدات لە مێردێکی گەنج و بێ کێشە، ئیستیغلالی مامۆستایەتی بکات، و سەرەڕای ئەوەش دوو ژنیشی هەبێت!؟ ئەو ئاستە نزمەی ڕەوشت لە خەڵکی ئاسایی کە هێندە لە دینیش نازانن و وەعزی دینیش نادەن ناوەشێتەوە.

قەرەزاوی ئەو ڕۆمیۆیە، کە لە نامەکانی دەڵێت خۆشەویستی ڕۆمیۆ و قەیس و کوسەیر، بە خۆشەویستی من ناگات بۆ ئەسما! لە دواییدا دەردەکەوێت ئەو ڕۆمیۆیە هەرزەکارە، لە ترسی کوڕ و کچەکانی دەردێك دەداتە ئەو جۆلیتە و لەیلایەی، مرۆڤیکی ئاساییش زەحمەتە وا بکات نەك ئیمامەکی دینی و موفتیەکی وا بەناوبانگ.!

ئافرەتێک تەڵاق بدات پاش شەوێکی پەمەیی، بە دەروونیکی برسیەوە بچیت دواهەمین شەویش، کە نۆرەی شەوی ئەسماش نەبوو، تا دوا سات شیلەی بنۆشیت، و ئینجا وەك ژنەکە دەڵێت بەپێی شەرعیش تەڵاق ناکەوێت لە نیوان دوو حەیزدا! دوایی وا زەلیل و ڕیسوای بکات، دوو ساڵ لە غەریبی دوور لە کەس وکاری بەجێی بهێڵێت، بێ نەفەقە و بێ خەرجی و بێ هیچ کەناڵێکی پەیوەندی! ئەوە لە کاتێکدا کە چەند زانایەکی دینی جەزائیری دەنێرێتە داخوازی و ڕجاکردن لە باوکی، چونکە باوکی ئەسما دژی ئەو هاوسەرگیریە بوو، بەڵام شێخ ڕۆمیۆ مێشکی کچەکە تازە پێگەیشتووەکەی شۆردبۆوە، بەو نامە و قەسیدە ئاگرینانەی بۆی دەنارد. باوکی ئەسما پاش ناچاری گووتی: گەرەنتی چییە کە ستەمی لێ ناکات؟! زانا دینییەکان گووتیان قەرەزاوی پەیمانی داوە لە چاوەکانی خۆیدا کچەکەت بپارێزێت!

کۆمەڵێك پیاو ماقوڵی دینی پەیمانی چاك پاراستنی و ستەم لێ نەکردنی کچەکەیان دایە باوکی بە دەمی قەرەزاوی، کەچی دوایی دەرکەوت، ئەو زانا گەورەیە بەناوبانگە تەنها شەقشەیەکە لە دەستی کچ و کوڕەکانی! جارێ کوڕێکی شاعیری هەیە، عبدالرحمن سەدان هەڕەشەی لەو ژنە کردوە، و دەساڵ قسەی لەگەڵ قەرەزاوی نەکردوە نەك لەسەر ئەوەی ژنی هێناوە بەسەر دایکی، بەڵکو بۆ دەبێت سامانی باوکە ملیۆنێرەکەی دابەش بکرێت لەگەڵ ئەو ژنە نوێیەی! ئەو شاعیرە کە هێندە ڕای لە خۆیە، لە چاوپێکەوتنەکان ببینن، خۆی بە گیڤارا ناگۆڕێتەوە، جارێکیان بە تەلەفۆن هەڕەشەی لە ئەسمای باوەژنی کردبوو کە نابێت، ناوی بنوسرێت وەك ئامادەکاری بەرنامەی [للنساء فقط] کە لە کەناڵی الجزیرة! جارێکیش ناوی ئەسما هاتبوو وەک هاوسەری قەرەزاوی لە ڕۆژنامەی الراية ی قەتەری ناڕەزایی ئەو شاعیرە و خوشك وبراکانی گەیشتە ڕۆژنامەکە، وەك بلێی ئەسما ژنی باوکیان نەبێت! قەرەزاوی نەک ڕۆمیۆ دەرنەچوو، بەڵکو کەسێکی لەرزۆك و بێ شەخسیەت دەرچوو لەبەرامبەر منداڵەکانی، تا سەر ئێسقان ستەمی لەو ژنە کرد. باشە کە تۆ لەو ئاستە نیت بەرگری لە هەڵبژاردەی خۆت بکەیت، بۆ ستەم لە کچی خەڵك دەکەیت؟! تۆ ملیۆنەها خەڵك گوایە فێری ئیسلام و پرنسیپەکانی دەکەیت، چۆن دەبیت خۆت وا نا ئیسلامانە ڕەفتار بکەیت؟!

بەڵام ئەسماء، کچێکی ئاسایی نەخوێندەوار نییە، وابزانم قەرەزاوی تووشی ڕۆژی ڕەشی خۆی هاتووە، چونکە ئەو ئافرەتە، سەرەڕای پسپۆڕی لە زانستی ماتماتیکدا وەك باوکی، دکتۆراشی هەیە لە زانستی سیاسی، و بە سێ زمان دەنووسێت و دەخوێنێتەوە! ئەسما دەڵێت: ئەو ستەمانەی قەرەزاوی و مناڵەکانی لە منیان کردوە، لەگەڵ ئەو پەیمانە درۆیینانەی قەرەزاوی بە منی داوە پێش هاوسەرگیری، هەمووی لە یاداشتەکانم بە درێژی باسی دەکەم!

قەرەزاوی لەرزی تێکەوتوە لە ترسی ئەو هەڕەشەیە، بۆیە لە لایەن میدیا و سەرسامەکانی قەرەزاوی دووچاری خراپترین و قێزەونترین هێرش بۆتەوە، جوێنی وای پێ دەدەن، بەخوای ئەبو جەهل تەریق دەبوەوە جوێنی وای بە پیغەمبەر دابا! بەڵام لەوە دەچێت، کەسایەتی ئەسما زۆر بەهێز بێت، و تەواو جیدی بێت لە نیەتی ڕیسواکردنی قەرەزاوی لە یاداشتەکانی.

ئەو ئافرەتێکی سەرکەوتووە، ئێستا ئەندام پەرلەمانی جەزائیرە، نووسەرێکی بە توانایە، داکۆکیکەرێکی

گەورەیە لە دۆزی ئافرەت لەناو ئیسلامدا، ڕەخنەی بوێرانەی هەیە لە کەلەپووری ئیسلامدا دەربارەی ئافرەت. لە هەمووشی گرنگتر نە پێش زەواجی و نە دوای زەواجیشی نەبۆتە ئیخوان، بە داهێنانی قەرەزاوی. ئەسما هەر لە بنەڕەتدا ڕەخنەگریکی سەرسەختە لە ئیسلامی سیاسی، من هەندێ وتاریم خوێندەوە لەسەر ئافرەت و ئیسلامی سیاسی، بەڕاستی سەرسامی کرد بە ئاستی بیرکردنەوەی ڕەخنەیی خۆی! بۆیە دەڵێم قەرەزاوی تووشی ڕۆژی ڕەشی خۆی هاتووە!

چەند وتارێکی دژی ئەسما لە نێو هەڵمەتی ئیخوان دا:

http://aljazair24.com/free-speech/33421.html

http://elhiwardz.com/?p=54155

# لە ٢٠٠٤ وە قەرەزاوی فەتوای تیرۆر و خۆتەقاندنەوە دەدات!

لە بیرمە لە ساڵی ٢٠٠٤ کە تازە رژێمی سەدام رووخا بوو، سەرەتای کاری توندوتیژی لە عێراق دەستی پێکردبوو، لە رۆی ١٩ ئەیلولی ٢٠٠٤ هەر لە پاس مردنی ماهر عبدالله پێشکەشکاری بەرنامەی الشریعة و الحیاة لە کەناڵی الجزیرة، ئەو کاتە کەناڵی جەزیرە خەریکی ئاگرخۆشکردنی عێراق بوو. قەرەزاوی یشیان هێنا بوو بۆ ئەو مەبەستە. وتارێکم نووسی بە عەرەبی لە سایتە عەرەبیەکان بە ناونیشانی: [القرضاوي (المعتدل جدا) يفتي للارهاب ايضا *لەسەر ئەو بەرنامەیە. لەو بەرنامەیەدا قەرەزاوی بە راشکاوی پشتگیری لە هەموو کردەوە تیرۆرستیەکان کرد لە رفاندن، و سەربرین، و کوشتن و هەتک کردن، پاش ئەوەی شێخ عەیاش یێك لە دەستەی زانایانی ئیسلامی سوونی لە رێگای تەلەفۆنەوە هاتە سەر خەت، گووتی: موجاهیدەکان ئەوانەی دەیانگرن و دەیانرفێنن بە شێوەیەکی شەرعی لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دەکەن، و دوایی دەیانکوژن و سەریان دەبرن.! یانی لای قەرەزاوی ئاساییە، کەسانێك بە دەستی تیرۆرستان برفێنرێن، و لێکۆڵینەوە و دادگاییان بکەن، بێ ئەوەی بتوانن هەتا بەرگری لە خۆیان بکەن، لە دادگای ئەو تیرۆرستانە کە جاروبار یەکتریش دەکوژن بەبێ دادگایی لەسەر بچوکترین جیاوازی دینی؟! ئینجا فەتوای دا بۆ هەموو عەرەب و موسڵمانان بێن لە عێراق شەری بەریتانیا و ئەمریکاییەکان بکەن، خۆشی کچەکانی لە بەریتانیا دەیانخوێند!

ئەو پیاوە چونکە حزبییە هیج جیاوازیەك ناکات لە نێوان دەوڵەت و جەماعەت! ئەمرۆش لە نوێترین ڤیدیۆی کە ئاشکرا بووە، هەرچەندە مێژووی دەگەرێتەوە بۆ ٢٠١٤، شەرعییەتی کردەوەی خۆتەقاندنەوە دەداتە هەر کەسێك ئەگەر جەماعەت داوای لێ بکەن !موفتی مەزنی ئیخوانەکان کە بە درێژایی مێژوویان بانگەشەی رەتکردنەوەی توندوتیژی دەکەن، دەڵێت: ئەسڵ لەو بابەتە ئەوەیە، ئەو کردەوەیە بە شێوەیەکی کۆمەڵ بکرێت، نەك تاك! ئەگەر جەماعەت، [یانی هەر حزب و گروهێکی ئیسلامی جیهادی، جا تاڵیبان بێت، بۆکۆ حەرام بێت، داعش بێت، نوسرە بێت، شباب محمدی سۆماڵ بێت] پێی باش بوو تاکێك خۆی بتەقێنێتەوە بە ئامانجێکی دوژمن، و ئاسانکاریان بۆی کرد، دروستە ئەنجامی بدات !نابێت خۆی تاك بە تەنها رەفتار بکات، دەبێت خۆی تەسلیمی جەماعەت بکات، جەماعەت دەتوانێت تاکەکان بەکار ببات لەو رێگایەی دەیەوێت! یانی کردەوەی خۆتەقاندنەوە درووستە ئەگەر جەماعە لەسەری هاورا بن و کەسە خۆکوژەکە بە تەنیا برپاری نەدابێت خۆی بتەقێنێتەوە"! دەربارەی بە کوژرانی خەڵکی مەدەنی، قەرزاوی دەڵێت:" ئەوە دەوەستێتە سەر برپاری جەماعەکە کە چۆن ئامانجەکە دیار دەکەن و چەند ئەوە لەبەر چاو دەگرن زیانەکان کەمبن".

هەرچەندە ئەو ڤیدیۆیە دەربارەی رژێمی سوریایە، بەڵام کاتێ موفتی ئیخوانەکان قسە دەکات، ئیتر ئەوە دەبێتە فەتوا بۆ ئیخوانەکان، و راهینانە لەسەر توندوتیژی و کردەی تیرۆرستی زۆر توندوتیژ،

کە ئەمڕۆ هەموو جیهانی ئیسلامی بەدەستیەوە دەناڵێنێت!

کەوابوو ئەو پیاوە چی هێشتەوە بۆ ئەو میانڕەویەی کە بانگەشەی بۆ دەکەن وەك ئیخوان؟! ئەگەر ئیخوان هەمان ئامراز و کردەی داعشیەکان پیادە بکەن؟ !نەدەبوو بیگوتبایە خەباتێکی چەکداری پاك وخاوێن بکەن لە دژی هێزەکانی ڕژێمی سوریا، حەرامە یەك مەدەنیش بکوژیت، یان بکەیتە ئامانج؟! نەدەبوو ئەو کاتە ئێمەش جیاوازیەك ببینین لە نێوان جیهادی سەلەفی پڕ لە خوێن و سەربڕین و خۆتەقاندنەوە و دەیان کاری تری قیزەون، و لە نێوان جیهادی جەماعەتێکی ئیخوانی، کە پابەند بن بە ڕەوشتێکی مرۆیی؟! هەموو جیهادیەکانی سەلەفیەت و ئیخوانییەت نەیان توانیوە بە قەد پێشمەرگەی کورد، سەرەڕای شەڕی ناوخۆیی و دەیان هەڵەیان، دەست بپارێزن لەو کردە قێزەونانەی موجاهیدەکان. ئەو پیاوە ئامۆژگاری ئەردۆگانیش دەکات، و پفی دەدات، و توانی پەلکێشی کاتەوە ناو پرۆژەی ئیسلامی سیاسی ئیخوانی، بۆیەش ئەردۆگان وا لە خۆی بوغرا بوو، ئەو دڕندەیەی لێ دەرچوو، کە هەزاران تاوان بکات لە دژی میللەتی کورد، و دەست تێکەڵ بکات لەگەڵ تیرۆرستانی داعش. ئێستاش لە هەوڵی پاشەکشەیە پاش دۆڕان و هەرەسهێنان لە زۆر بواردا، بەڵام لەوە ناچێت بتوانێت ڕووی ڕەشی سپی بکاتەوە، بە فەتوا و ستایشی هەزار قەرەزاوی و قەرەداغی!

محەمەد هەریری

# سەید قوتب لە هاندەری توندوتیژیەوە بۆ قوربانی

لە بیرمە لە ساڵی ٢٠٠٦ بوو کۆمێنتێکم لەسەر سەید قوتب نووسیبوو لە ڕۆژنامەی الشرق الاوسط، کە دەیگووت: " ناکرێت نکولی لە بلیمەتی سەید قوتب بکەین لە بواری فەرهەنگی و فیکری و ئەدەبی، هیچ چاوێکیش ناتوانێت ئاستی بەرزی کەسایەتی ئەو مرۆڤە نەبینێت، بەڵام کەسیش ناتوانێت، هەرچەندە زمان وفیکر پاراو بێت نکوڵی لە ڕۆڵی کرداری سەید قوتب بکات لە فۆرمەڵەکردنی زهنیەتی توندڕەوی ئیسلامی. لە بیرمە کاتێك (معالم في الطريق)م دەخوێندەوە، هێشتا توانای بیرکردنەوەم سنووردار بوو، ئەو تابلۆیە خوێناویەی کە سەید قوتب بۆ جیهانی دەکێشا، لە حەتمیەتی شەڕ و لەبەرێك چوون و خوێن ڕشتن! سەرەڕای حەزی زۆری خوێندنەوەم، هەوڵی خۆدزینەوەم دەدا لەو کتێبە (معالم في الطريق) کە لە خوێندنەوەی بوومەوە بیروڕاکانی مێشکمی جەنجاڵ کردبوو وتووشی دڵەڕاوکێ و سەرئێشانی کردبووم، هەوڵی خۆ لێ دزینەوە و لە بیرکردنیانم دەدا!

سەید قوتب بەرلەوەی بکەوێتە ژێر کاریگەری ئەبو ئەعلای مەودودی و ئەدەبیاتی ئیخوان بە گشتی، یەکێك بوو لە گەورەترین ڕەخنەگری ئەدەبی لە میسر، سەرەڕای سروشتی دینداری لەسەر چەندین ڕۆمانی نەجیب مەحفوز نووسیویەتی، کە دووان لەوانە [اولاد حارتنا ] و [خان الخليلي] هەرای زۆریان نایەوە گوایە پڕن لە کوفر، سەید قوتب لە نوسینێکی ڕەخنەیی ئەدەبیدا ڕۆمانی خان خەلیلی "خان الخليلي" نەجیب مەحفوزی زۆر ستایش کردوە، هەرچەندە لەو ڕۆمانە لەسەر زمانی کەسایەتیەکان قسەی زۆر ترسناك و دژی دینی تێدا کراوە، بۆ نمونە لەسەر زمانی کەسایەتی [احمد راشد] کە پارێزەرە هاتووە: "هەروەك چۆن دینەکان ڕزگاریان کردین لە وەسەنیەت، پێویستە زانست ڕزگارمان بکات لە دینەکان" "فكما انقذتنا الديانات من الوثنية ينبغي أن ينقذنا العلم من الديانات " هەروەها دەڵێت: زانایانی هاوچەرخ دەزانن ئەتۆم چی تێدایە، و دەشزانن لە دوای سیستمی خۆری ئێمە ملیۆنەها سیستمی خۆری تر هەیە، کەوابوو کوا خوا لە کوێیە؟! " العلماء المعاصرين يعلمون بما فى الذره من عناصر، وبما وراء عالمنا الشمسى من ملايين العوالم، فأين الله ؟"، هەر ئەوەش نا دەربارەی ڕۆمانی [اولاد حارتنا ] کە میانڕەوەکانیش لە ئەمسالی محمد الغزالي، نەجیب مەحفوزیان تەکفیر کرد لە سەری، وخەریك بوو بە کوشتی بدەن بە دەستی نەزانێك، سەید قوتب دەربارەی دەڵێت: ئەو ڕۆمانە ئەفسانەیەکی ئەدەبییە موستەهەقی ئەوەیە قوتابی قوتابخانەکان بیخوێنن! " إنها أسطورة أدبيه تستحق انها تدرس لتلاميذ المدارس"

سەید قوتب سەرەڕای ئەوەی دینداریەکی سروشتی تێدا بوو، بەڵام تا نەچووە ناو ئیخوان نەکەوتە ژێر کاریگەری چوار زاراوەکەی [المصطلحات الاربعة] ی ابو الاعلى المودودي ، ئەو بیروڕایە توندانەی تەبەنا نەکرد. بڵێی سەید قوتب ژیان بواری پێدابایە، پاش قۆناغی نووسینی معالم في الطريق جارێکی تر خان الخليلي بخوێندبایەوە، نەجیب مەحفوزی تەکفیر بکردبا؟ لچونکە نەجیب مەحفوز پاش ئەوەی

سەید قوتب بوو بە ئیخوان و زیندانی کرا، سەردانی سەید قوتبی کردوە وەك لە کتێبی [المرایا] باسی دەکات و پێی دەڵێت:>- جێگای داخە کە تۆ وازت لە ڕەخنەی ئەدەبی هێنا.
سەید قوتب بە دەم پێکەنینەوە وەڵامی دەداتەوە: " ئەی لەو ئاواتخوازیە جاهیلیانە" !
جێگای سەرسوڕمانە ئەدیبێکی ڕەخنەگری وا گەورە لە ماوەیەکی وا کورتدا بەو شێوەیە بگۆڕێت لەوپەڕی واڵایی بۆ ئەوپەڕی داخراوی! ئەوە نیشانەی سروشتێکی ڕیزپەڕی، توندڕەوی هەڵەشەیە، کە هەردەم سەید قوتبی لەوپەڕی ڕاست بۆ ئەوپەڕی چەپ جێگۆڕکێ کردوە! نمونەیەکی تر، کاتێ کودەتای ١٩٥٢/٧/٢٣ جمال عبدالناصر وهاوەڵانی روویدا، خۆیان روویان نەبوو ناوی بنێن شۆڕش و ناویان لێنابوو حرکة، کەچی سەید قوتب هەرزوو ناوی نا شۆڕش [ثورة]! ئەو شۆڕشە هێندە سپی و ئاشتیانە دەچوو بەڕێوە، هەتا شا فاروقیان بەوپەری ڕیز وکەرامەتەوە بە تەپڵ و مۆسیقا بەڕێکرد، بە مەراسیمێکی عەسکەری و پاسەوانی شەرەف و تەقاندنی تۆپی ڕیزلینان!
پاش ٢٠ ڕۆژێك لەو شۆڕشە کاتێ کرێکارانی ڕستن وچنین ناڕەزاییان دەربڕی، سەید قوتب هانی دەسەڵاتی دەدا، کە خۆی بەشێك بوو لەو دەسەڵاتە و ناویان نابوو بە [میرابۆی شورشی میسری] تا دوو کریکاری بەشداربووی ئەو ناڕەزایەتیە لە سێدارە بدەن، لە وتارێکدا کە لە [الاخبار] لە ١٩٥٢/٨/١٥ بلاویکردەوە لە ژێر ناونیشانی [ حرکات لا تخیفنا] تیایدا هاتوە: " ئیمە شەڕەکەمان بردەوە بەبێ گومان، وکاری خوا جێبەجێ بوو.. شەیتان هەردوو شاخەکانی دەرکردوە، با لێیان دەین، بەهێزەوە لێیان دەین، وبەخێراییەوە لێیان دەین، پێویستە گەل گۆر هەڵکەنێ و خۆڵی بەسەردا بکاتەوە"!!
کە هەڵگەڕایەوە لە شۆڕش، لە کتیبی"معالم في الطریق "دەنووسێت : "وطن المسلم الذي یحن إلیه ویدفع عنه لیس قطعة أرض إن المعرکة بین المؤمنین وخصومهم هي في صمیمها معرکة عقیدة ولیست شیئا آخر علی الإطلاق إنها لیست معرکة سیاسیة ولا اقتصادیة لو کانت شیئا من هذا لسهل وقفها، وسهل حل إشکالها، ولکنها في صمیمها معرکة عقیدة، إما کفر وإما إیمان.. إما جاهلیة وإما إسلام!". [نیشتیمانی موسڵمان کە دڵی بۆی دەسووتێ و بەرگری لێدەکات، تەنها پارچەیەك زەوی نیە... جەنگ لە نێوان ئیمانداران و ناحەزانیان لە کرۆکیدا جەنگی عەقیدەیە، نەك هیچی تر... ئەو جەنگە جەنگێکی سیاسی و ئابووری نیە... ئەگەر شتێکی وابا ڕاگرتنی جەنگەکە ئاسان بوو، و چارەسەری ئاسان بوو، بەڵام لە کرۆکیدا جەنگی عەقیدەیە، یان کوفر یان ئیمان... یان جاهیلیەت یان ئیسلام]!!
وەك گووتمان پاش جیاوازی کەوتنە نێوانیان، سەید قوتب بە دەستی هەمان هێز ئەشکەنجە و لە سێدارە درا، کە خۆی ڕۆڵیکی گەورەی گیڕا لە هاندانیان و ڕاهێنانیان بە توندوتیژی!
نمونەیەکی تر لەو گۆڕانکاریە ترسناکانە سەید قوتب بەرلەوەی بچێتە ناو ئیخوان، هەرچەندە بە جۆرێك لە جۆرەکان دیندار بوو، کەچی لە ١٩٣٨/٧/١٠ وتارێك دەنووسێت بە ناونیشانی: "خواطر المصیف - الشواطئ المیتة" ئەو وتارە ئیخوانیەکی ناوداری وەك محمود عبدالحلیم لە یاداشتەکانی بە ناوی: [الاخوان المسلمون احداث صنعت التاریخ] باسی کردوە، وهەوڵێکی زۆردرا بۆ شاردنەوەی وبەدرۆخستنەوەی محمود عبدالحلیم، بەڵام لە کۆتاییدا وەڵامیکی ئەو وتارە لە گۆڤاری ئیخوانی

ڕەسمی [النذیر] لە ژمارە ٨ ی ١٩٣٨/٧/١٨ بە ناوی "النفوس المیتة" لە نوسینی محمد حسین أبو سالم، دۆزرایەوە کە ڕاستی ئەو وتارەی سەید قوتب دەسەلمێنێت کە دەربارەی مایۆ پۆشینی ئافرەتانە لەسەر کەنارەکانی دەریا، تیایدا ئەسەف دەکێشێت کە کەنارەکان مردوون لەبەر ونبوونی قەد وبالآی مایۆ پۆشی جوان، و بەرگری دەکات لە کەناری ڕووت و دەڵێت کە جەستەی ڕووتی سەر کەنارەکان، هیچ وروژێنەر نیە تەنها سەرسامی هونەری دەوروژێنێت، وئەوانەشی وای نابینن خەڵکانێکن کە وێنەیەکی شێوێنراو لە مێشکیان دایە! ئینجا دەڵێت: "ئەوانەی داوادەکەن جلی سەرکەنار درێژ بکرێت بۆ داپۆشینی جەستەکان، ئەوانە لە ڕاستیدا دەیانەوێت فیتنەی خەوتوو بە ئاگا بهێنن، و شەهەواتی هێمن چالاك بکەنەوە، پێشیان وایە چاکخوازن"!

لە کۆتاییدا دەڵێت: " کەناری ڕووتی یاریکەر ئازاد کەن، ئەی چاکخوازانی بە غیرەت لەسەر ڕەوشت، چونکە ئەوە باشترین کارە بۆ هێورکردنەوەی شەهوەتە هەڵچوو و چەمووشەکان، چاکترین دابینکەریشە بۆ رەوشت"

"فالذین یدعون إلی إطالة "لباس" البحر وإلی ستر الأجسام بالبرنس، إنما یدعون فی الواقع إلی إثارة الفتنة النائمة وإیقاظ الشهوات الهادئة، وهم یحسبون أنهم مصلحون".

دوایی دەڵێت: "أطلقوا الشواطئ عاریة لاعبة، أیها المصلحون الغیورون علی الأخلاق، فذلك خیر ضمان لتهدئة الشهوات الجامحة، وخیر ضمان للأخلاق." ببینە ئەو دەستەواژەیەی [وهم یحسبون أنهم مصلحون] لێرە بۆ بانگەوازی کردن بۆ ڕووت و قووتی سەر کەنارەکان بەکار دەهێنیت، کەچی پاش گۆڕانی بۆ ئیسلامیەت سەدان جار ئەو گوزارشە [وهم یحسبون أنهم مصلحون] بۆ بیروڕاکانی پێچەوانەی ئەو ئاڕاستەیە بەکاری دەهێنیت، لە ژێر کاریگەری سەید قوتب خوشکەکانیشی لەو سەردەمە کراوەیەدا کە کچەکانی حسن البنا هێشتا حیجابیان نەکردبوو، کەچی خوشکەکانی سەید قوتب بە نیقابەوە وێنەیان دەردەکەوێت!

ئەوەیە هەقیقەتی سروشتی هەڵچوانەی سەید قوتب کە هەردەم لە بازنەی توندڕەوی لە هاڤدژ بۆ هاڤدژدا دەخولێتەوە، لەوانەیە ئەگەر تا ئەو ڕۆژگارە مابا ئێستا بانگخوازێکی ئاشتی توندڕەو بوو یانیش قۆناغێک لە دوای داعش دەبوو لە توندڕەوی!

# نەجیب مەحفوز چۆن باسی سەید قوتب دەکات؟!

## بەشی ١

وەك زۆر لە بنەما و بیروڕا هەڵەکانیان، بنەمایەك هەیە لە نێو ئەهلی حەدیس دەڵێت: کلام الأقران یطوی و لا یروی! واتە قسەی هاوپیشەکان لەسەر یەکتری دەپۆشرێت و ناگێڕدرێتەوە! یانی ئەو کەسانەی هاوکار وهاوپیشە و هاوسەردەم بوون لە شوێنێکدا! بەڵام بەڕای من ئەو بنەمایە هەر لە بنەڕەتدا زانستی حەدیس هەڵدەوەشێنێتەوە، چونکە بۆ نمونە قسەی ئەهلی حەدیس دەرهەق ئیمامێکی گەورەی وەك ئەبو حەنیفە نابێت بە هەند وەرگیرێت، چونکە دەکرێت لە حەسەد و چاو پێ هەڵنەهاتن بە بلیمەتی ئیمام، یان لە تێنەگەیشتن لە ئاستی وتاری ئەودا وا بەو شێوەیە دابەزیوون بەسەری و نەوە دوای نەوەش چاولێکەریان کردوە! بەڕای من شتەکە ڕێژەییە،هەندێك جار: قسەی هاوپیشەکان لەسەر یەکتری دەپۆشرێت و ناگێڕدرێتەوە! وەك لە نمونەی ئەبو حەنیفە باسمان کرد، هەندێك جاریتر: قسەی هاوپیشەکان لەسەر یەکتری دەگێڕدرێتەوە و داناپۆشرێت [کلام الأقران یروی و لا یطوی] ئەگەر زانیمان ئەو کەسەی قسەکان دەکات کەسێکی دادپەروەر و بابەتخوازە، بۆ نمونە بەڕای من قسەی حەزرەتی عومەر لەسەر خالید بن ولید یان ابو هریرە زۆر گرنگترە لە هەزاران لاپەڕەی کە ئەو دوو کەسایەتیە تەقدیس دەکرێن.

ببینە حەزرەتی عومەر چۆن مامەڵەیان دەکات وەك مرۆڤی ئاسایی و گوناهکەر وتاوانکەر، کەچی قوتابخانەی ئەهلی حەدیس دەیانفرێنێتە ئاسمانی تەقدیسکردندا! لەو بارەیەوە گەواهی نەجیب مەحفوز لەسەر سەید قوتب م لا زۆر گرنگ بوو، چونکە هێندەی من سەرنجم دابێت، نەجیب مەحفوز کەسێکی زۆر ڕاستگۆ و بابەتخواز و پیشەوەرە لە باسکردنی نزیکترین کەس تا دوورترین کەس، وە بە یەکێك لە ڕەخنەگرانی توندی سەردەمی جمال عبدالناصر دەناسرێت پەیوەندی نێوان سەید قوتب(١٩٠٦ –١٩٦٦ م ) و نەجیب مەحفوز(١٩١١ –٢٠٠٦م )، دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی دووەمی سییەکانی سەدەی پێشوو، بەڵام ئەو پەیوەندیە، بە پلە یەك پەیوەندیەکی ئەدەبی بوو، وەك نەجیب مەحفوز خۆی لە یاداشتەکانی باسی دەکات، و سەرەڕای یەکتر دیتنیان بە بەردەوامی، بەڵام هەرگیز ئەو پەیوەندیە نەچۆتە بواری ئینسانیەوە!

سەید قوتب چاکە وفەزڵی لەسەر نەجیب مەحفوز هەبووە، بەوەی وەك ڕەخنەگرێکی تا ڕادەیەك ناسراو، یەکەم کەس بووە نەجیب مەحفوزی پێشکەشی خوێنەران کردوە لە ڕۆمانەکەی بە ناونیشانی کفاح طیبة، هەروەها لە دوای ئەوەشدا لەسەر ڕۆمانی خان الخلیلی و القاهرة الجدیدة ی نووسیوە بە شێوەیەکی پڕ لە حەماسەت وسەرنج ڕاکێش مژدەی لە دایک بوونی ڕۆمان نووسێکی گەورەی داوەتە خوێنەران، کە لە کۆتایشدا هەروا دەرچوو! وەك هەمیشە سیفەتی حەماسەت ئاسای خۆی لە وەسف

کردنی ڕۆمانی كفاح طيبة سەید قوتب بە جۆش وخرۆشەوە دەڵێت: ئەگەر بە دەست من بوایە ئەو چیرۆکەم دەخستە بەر دەستی هەموو کوڕ و کچێك، چاپم دەکرد و بڵاوم دەکردەوە لەسەر هەموو ماڵێك بە خۆڕایی!! بێگومان نەجیب مەحفوز لە زۆر شوێن دا پێزانینی خۆی نیشان دەدات هەتا جارێکیان گووتی: کەسێك ئاوڕی لێ نەدەدایەوە، یەکەم کەس لەسەر منی نووسیبێت سەید قوتب بوو، ئینجا دوایی أنور المعداوي.. وەك دوو ئەدیبی لاو شتێکی نوێیان لا بوو، منیش گەنج بووم و شتێکی نوێم پێ بوو.

هەر لە یاداشتەکانی نەجیب مەحفوز دەڵێت: سەید قوتب یەکەم ڕەخنەگری ئەدەبی بوو کە ئاوڕی لە بەرهەمەکانی من دایەوە ولەسەری نووسی، لە سالانی چل دا، ئەو کات و سەردەمە ناسیم، کە سەید بە شێوەیەکی بەردەوام دەهات بۆ دانیشتن لەگەڵمان لە گازینۆی ئۆپرا..ئەو پەیوەندیەی کە دەیبەستینەوە زیاتر ئەدەبی بوو لەوەی مرۆڤایەتی بێت. بۆیە ڕای نەجیب مەحفوزم لەسەر سەید قوتب پێ گرنگە، چونکە ئەو ئەدیبە بلیمەتە زۆربەی کەسایەتیەکانی لە ژیانی واقیعیدا هەڵبژاردوە و زۆر وریایانە و بلیمەتانە بە ناخیان دادەچێتە خوارەوە، لایەنی باش وخراپی کەسایەتیەکەی دەخاتە ڕوو، بێ گوێدانە نزیکی و دووری، دۆستی ونەیاری، ئایدیۆلۆژیا و و بیری ئەو کەسە.

بۆ نمونە ڕەخنەگرێك دەڵێت: کەسایەتی "كمال أحمد عبد الجواد" لە "السكرية" دا هەر خودی نەجیب مەحفوزە، کە پڕە لە لایەنی نێگەتیڤ، و کەسایەتی السيد أحمد عبد الجواد [سی سەید] یش لە هاوسێیەکی خوازتوە، کە باوکێکی وا دیکتاتۆرو و توندوتیژ و پڕ هەڤدژی بووە! لە [اولاد حارتنا] دەڵێن، ڕوخساری کەسایەتی باوك الجبلاوي، هەمان ڕوخساری باوکی خودی نەجیب مەحفوزی هەڵگرتووە لە ڕووی جدیەت و دیسپلین وعەقڵمەندی، هەتا چایخانەکانی ناو ڕۆمانەکەی خەڵکی ئەو ناوە دەیانناسیەوە لە ڕۆمانەکانی! پاڵەوانی ڕۆمانی "السراب" لە کەسایەتیەکی هەقیقی دەوروبەری خۆی وەرگرتبوو بە ناوی حسين بدر الدين، کە گەنجێك بوو دەسەپاچەی سێکسی هەبوو، دایکی زاڵ بوو بەسەر کەسایەتیدا، دەرچووی کۆلێژی ماف بوو، دەوڵەمەند بوو، ئاڵوودەی تلیاك بوو و چووە زیندان، دەڵێن لە ڕێگای هاوڕێیەکی نەجیب مەحفوز زانیبووی کە ئەو چیرۆکەی ئەوی نووسیوە، ئەو کەسە کون بە کون بەدوای نەجیب مەحفوز دەگەڕا بۆ ئەوەی بیکوژێت! بە ناچاری ماوەیەک نەجیب مەحفوز خۆی شاردەوە!!

وەك ئاماژەم پێدا، نەجیب مەحفوز سەرەڕای پێزانینی بە پێشکەشکردن و ناساندنی سەید قوتب بە خوێنەران لە کتێبێکیدا بە ناوی [المرايا] کە لە ١٩٧٢ یەکەم چاپی کرا، کە بریتیە لە چیرۆکی چەندین کەسایەتی ئەدەبی و فیکری و سیاسی کاریگەر و گرنگ لە ژیانی خودی نەجیب مەحفوز و میسر بە گشتیدا، هەرچەندە نەجیب مەحفوز هەموویان بە ناوی هەقیقی خۆیان باس ناکات، جاروبار کەمێك گۆڕانکاریان بەسەردا دەهێنێت بۆ شاردنەوەی!

بەڵام هەندێك لەو کەسایەتیانە لە کاتی خوێندنەوەی دەقەکەدا دەناسرێنەوە لەلایان خەڵکی شارەزا، هەندێکیان هەر نووسەر خۆی ئاماژەی بە ناویانی داوە، تێیدا زۆر بە بلیمەتانە باسی ڕەهەندی دەروونی

وفیکری کەسایەتیەکانی دەکات. لەوانەیە کەسانێك بڵێن نەجیب مەحفوز بۆیە بەو شێوەیە باسی سەید قوتبی کردوە چونکە ئیسلامی بووە، و خۆشی عەلمانیە، بەلام هەر لە باسی کەسکی عەلمانی ناسراوی وەك محمود درویش ی شاعیری گەورەی فەلەستینی و عەرەبدا، کە هەر بەناوی خۆی پۆرترێیەکەی لەسەریدا نووسیوە، و زۆر تاڵتر لە سەید قوتب باسی دەکات، وەك کەسێکی گۆشەگیری، بێ هەستی ، ماستاوچی، واستەچی، هەلپەرست ، فاشیل لە خۆشەویستی، بەس خەریکی خوێندن، و دژی خەباتی قوتابیانی زانکۆ، تا ڕادەی تاوانبارکردنی بە ڕاپۆرت دان لەسەر هاوڕێیانی!!

لەگەڵ ئەوەشدا نەجیب مەحفوز زۆر خاڵی پۆزەتیڤی سەید قوتب باس دەکات لە ڕووی ئاستی فەرهەنگی و ئەدەبی ورەخنەیی سەید، بەلام لە هەمان کاتدا باسی خاڵە نیگەتیڤەکانیشی دەکات وەك مرۆڤێکی توووند لە تێروانینیدا بۆ مەسیحیەکانی ولات، توووند و هەڵەشە لە وەرگرتنی هەڵوێستدا کە سەر بە وەفد بوو، توندترین وەفدی بوو، کە بوە حزبی سەعدیەکان، توووندترین سەعدی بوو، کە بووە ئیخوان سکەی شەمەندەفەری ئیخوانی بەرەو توندترین ڕێگا پاڵ دەنا، تا ڕادەی وەلام دانەوەی بیروڕاکانی لەلایەن خودی مورشیدی ئیخوان هوزەیبی! با بزانین نەجیب مەحفوز چۆن سەید قوتبی ناسیوە پۆرترێیەکەی وەك خۆی وەردەگێڕینە سەر کوردی:

## بەشی ٢

با بزانین نەجیب مەحفوز چۆن سەید قوتبی ناسیوە پۆرترێیەکەی وەك خۆی وەردەگێڕینە سەر کوردی:

ئەو ئەمڕۆ وەك ئەفسانەیە، وەك ئەفسانەش لێکدانەوەی جیای بۆ دەکرێت. هەرچەندە من لە مامەڵەی برایانەی ڕێزدارانەم زیاتر لەو نەدیوە، بەلام قەت هەستم بە ئاسودەیی نەکردوە لە بینینی ڕوخساری و تێڕوانینی تیژ و دوو چاوی زەقی. من لە سالۆنی ئەدەبی دکتۆر ماهر عبدالکریم ناسیم لە ڕۆژگاری جەنگی جیهانی دووەمدا، ئەو کاتە تەمەنی سی ساڵ بوو، وەك مامۆستای زمانی عەرەبی کاری دەکرد لە قوتابخانەیەکی ناوەندیدا، جاروباریش بابەتی ڕەخنەیی لە گۆڤارە ئەدەبیەکاندا بلاودەکردەوە یان شیعری کلاسیکی دەنووسی. ئەو ئەزهەری بوو، هیچ شارەزای زمانێکی تری بێگانە نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا سەرنجی راکێشام، وریزی خۆی لام سەپاند، بە بەهێزی لۆژیکی کاتێ گفتوگۆی دەکرد لەگەڵ کەسانێك کە ناسراو بوون بە فراوانی و قووڵی فەرهەنگ و ڕۆشنبیریان و شارەزایی زۆریان بە زمانە بیانیەکان، وەك دکتۆر ابراهیم عقل و سالم جبر و زهیر کامل.

ئەو کەسێکی هێمن بوو زۆر پەیوەست بوو بە ئەدەبی گفووگۆ، هەرگیز بۆ جارێکیش نەمدیت توندی نیشان بدات یان هەڵچێت و یان لە بابەتخوازی لابدات، قەتیش لە ئاستی بەرزی ئەوان کەمتر دەرنەدەکەوت رۆژێك، دەتگووت هاوشانی ئەوانە بە هەموو مانای وشەوە، بۆیە قەناعەتم هێنا بە بیرتیژی و توانای گفتوگۆ و شارەزایی و زانیاری فراوانی، هەرچەندە هەموو ئیعتیمادێکی لەسەر کەلەپور [تراث] و کتێبی وەرگێڕاو بوو. هیچ گومانێکم نەبوو کە زیرەکتر بوو لە هەموویان، لە ابراهیم عقل و سالم جبر

و زهیر کامل. هەتا ڕەخنەکانیشی لە کتێبە مۆدێرنەکان لاواز و بێ ناوەڕۆک نەبوون، بە بەراورد لەگەڵ ڕەخنەی کەسانێکی پسپۆڕی هەڵگری بڕوانامە پاریسیی و لەندەنیەکان، ئەگەر جیاوازیەکی وردیش لە نێوانیاندا هەبوو، تەنها بۆ چاوێکی وردبین ئاشکرا دەبوو. ڕۆژێکیان دکتۆر ماهر عبدالکریم دەربارەی پێی گووتم: - گەنجێکی بلیمەتە، جێگای داخە کە بۆ بەعسەی خوێندن نەنێردراوە.

دکتۆر ماهر عبدالکریم لەو کەسانە بوو کە قسەکانی بە بە تەرازوێکی زۆر هەستیار دەکێشا. هەرچەندە عبدالوهاب اسماعیل [مەبەستی سەید قوتبە] باسی دینی نەدەکرد، سەرەڕای خۆ نیشاندانی وەك کەسێکی مۆدرن لە بیرکردنەوە و پۆشاك و پەیڕەوکردنی لە ستایلی فەرەنسی لە نانخواردندا، و چوونی بەردەوامی بۆ سینەماکان، بەڵام کاریگەری دینی لەسەر ئەو و ئیمانی و بەڵکو دەمارگرژی هەرگیز لە من شاراوە نەبوو. لەبیرمە نووسەرێکی لاوی قیبتی کتێبێکی پێدا کە چەندین وتاری ڕەخنەی ئەدەبی وکۆمەڵایەتی لەخۆگرتبوو، ڕۆژێکیان باسی ئەو ئەدیبە لاوەی بۆمن کرد لە قاوەخانەی الفیشاوي، و گووتی: - ئەو لاوە بلیمەت و ئاگادارە و هەستیارە و خاوەن شێواز و بیرکردنەوەی ڕەسەنە.

منیش بە بەرائەتەوە لێیم پرسی، خۆشم ئەدیبەکەم خۆش دەویست: - دەی باشە کەی لەسەری دەنووسیت؟ زەردەخەنەیەکی نامۆی کرد و گووتی: - چاوەڕوانبە، و چاوەڕوانیەکەت زۆر دەکێشێت! - مەبەستت چییە؟ زۆر بە سووربوونەوە گووتی: من بەشدار نابم لە بنیاتنانی قەڵەمێك، کە بەیانی دروست بوو هەوڵی خۆی دەخاتە گەر بۆ ڕوشاندنی توراسی ئیسلامیمان بە هەموو شێوازێکی پڕ پێچ وپەنا. منیش بە ناڕەزاییەوە لێیم پرسی: - کەوابوو لەوە تێبگەم کە تۆ دەمارگرژیت؟ بێ باکانە وەڵامی دایەوە: هەڕەشەم لێ مەکە بەو کلێشانە، چونکە کار لە من ناکات.

-بەداخەوە بۆ ئەو هەڵوێستەت - سوودی نیە لەسەر ئەو بابەتە گفتوگۆ بکەیت لەگەڵ وەفدیەك [ئەندامێکی حزبی وەفد]، من ڕۆژێك وەفدی بووم، بەڵام با بەڕاشکاوی پێت بڵێم متمانەم بە غەیرە دینەکانی تر نییە! ئەو بەڕاستی وەفدی بوو

دوایی لە وەفد جیابوەوە لەبەر دکتۆر احمد ماهر کە زۆر سەرسام بوو پێی.لە سەردەمی سەعدییەکان بەرزکرایەوە بۆ پایەی پشکنەر [مفتش]. چەند بێ سەبر ببو، ئارامی لێ بڕابوو بە هۆی کوشتنی احمد ماهرەر، دەتگووت هەمان ئەو گوللەیەی بەرکەوت کە بەر ئەو پیاوە کەوت و کوشتی! زۆر بە خەمەوە بە منی گووت: - مەزنترین پیاوی ئەو نیشتیمانە لە دەست چوو. ئەو گلەیی لە تەندروستی خۆی دەکرد هەر هەلی بۆ ڕەخسابا، بەو بیانوەش لە ڕەمەزاندا بە ڕۆژوو نەدەبوو، بەڵام باسی هەقیقەتی نەخۆشیەکەی بۆ کەس نەدەکرد، هەروەها لە ژیانیدا بایەخی بە ئافرەت نەدەدا، و هەرگیز ژنی نەهێنا، لەو بوارەوە زۆر ئەستۆ پاك بوو. سەرەڕای جدیەتی ڕەوشتی و هەڵمەتی ڕاستگۆیانەی لەدژی لادەرەکان، لایەنێکی بۆ من دەرکەوت کە قەت باوەڕم نەدەکرد ئەگەر بەخۆم لێیم نەدیتبا. ئەویش ئەوە بوو نووسەرێک هەبوو خاوەنی گۆڤارێك و چاپخانەیەك بوو، کە زنجیرەیەک کتێبی مانگانەی دەردەکرد. عبدالوهاب زۆر بە سووك سەیری دەکرد و دەربارەی دەیگووت: ئەگەر گۆڤاری خۆی نەبا کەس یەك وشەشی بۆ بڵاونەدەکردەوە. چەندە تووشی سەرسوڕمان بووم کاتێك وتارێکیم بینی لە گۆڤاری

الرسالة دەربارەی خاوەن گۆڤارەکە کە بەرزی کردبووەوە بۆ حەوت تەبەقەی ئاسمان! نەمزانی چۆن ئەو شتە لێکدەمەوە، تا زانیم کە لەگەڵی پێك هاتووە بۆ بڵاوکردنەوەی کتێبێکی بە مە بلەغێکی باش کە هیچ نووسەری تر وەری نەگرتبێت! یەکسەر هەڵوێستی کوێرانەییم بیرکەوتەوە لە نووسەرە قیبتیەکە، زۆر بێزار وجاڕس بووم بە ئاشکراکردنی ئەو لایەنە هەلپەرستەی لە کەسایەتی ئەودا، بۆیە گومانم کەوتە ڕاستگۆیی و ئەمانەتی. لەوەو بەدواوە لە دەروونمدا جۆرێك لە نفوری بەردەوامم هەبوو بەرامبەری، سەرەڕای هاوڕێیەتیمان. بەردەوام بوو لە کارکردن وەك پشکنەر و نووسەر هەتا وەزارەت کەوتەوە دەستی وەفد لە ساڵی ١٩٥٠، دوایی ناڕەحەت بوو لە مامەڵەکردنی لەلایەن وەزیرەکەی وەفد، بۆیە نامەی دەست لە کارکێشانەوەی پێشکەش کرد، و خۆی دابڕاند بۆ کاری ڕۆژنامەگەری. لەو ماوەیەدا ناسراو بوو بە هێرشکردنی بەردەوامی بۆسەر حوکمەتی وەفد، لە هەمان کاتدا دەستیکردبوە نووسینی کتێبی هاوچەرخ دەربارەی ئایینی ئیسلام، کە بە شێوەیەکی بێ وێنە سەرکەوتنی بە دەست هێنابوو. ئەوەبوو شۆڕشی یۆلیۆی ١٩٥٠ هەڵگیرسا لە کاتێکدا ئەو سەرقاڵی هێرشکردنە سەر وەفد و بەرگریکردن بوو لە ئایینی ئیسلامدا، بەلایەنی کەمەوە دوو ساڵ تێپەڕی کەقەت یەکترمان نەبینی و هەواڵی تایبەتی لەمندا بڕا. ڕۆژێکیان لە سەردانی مامۆستا سالم جبر بووم و پێی گووتم: لەوەدەچێت بەوزووانە ئەستێرەی بەختی عبدالوهاب اسماعیل بدرەوشێتەوە.. بە بایەخەوە لێم پرسی: - مەبەستت چییە؟ - ئەو بۆتە موقەرەبەکان [نزیکەکانی دەسەڵات] - وەك نووسەرێکی سیاسی یان وەک نووسەرێکی ئایینی؟ - بەڵکو وەك یەکێك لە ئیخوانی موسلمین. بە سەرسوڕمانەوە گووتم: - ئیخوان؟! بەڵام من دەمناسی وەك سەعدیەکی توندڕەو. بە تەوسەوە گوتی: - پاکی و بێ گەردی بۆ ئەو خوایەی گۆڕان دەکات و ناگۆڕێت!

دوایی لە پاش نزیکەی ساڵێك چاومان بەیەك کەوت لەبەردەم باری ئەنگلۆ زۆر بە گەرمی تۆقەمان کرد، پێکەوە بە دەم قسەوە هەنگاومان دەنا تا باسی شۆڕش هات، کاتێ زۆر بە تەحەفوزەوە گووتی: - شۆڕشێکی پیرۆزە، بەڵام زەحمەتە بزانیت چییان دەوێت.. لە قسەکانی هەستم بە تاڵاویەك دەکرد نهێنیەکەیم پێ هەڵنەهێنرا و نەشی درکاند. توانای پاراستنی نهێنیەکانی هەبوو کە بە دەگمەن ئەو توانایە لە ناو میسریەکان دەست دەکەوێت.

پێیم گووت: - زانیومە بوویتە ئیخوانی موسلمین؟ زەردەخەنەیەکی لێڵی کرد و گووتی: - هەر موسڵمانێك چاوەڕوانی ئەوەی لێدەکرێت! اي مسلم عرضة لذلك! - جێگای داخە کە تۆ وازت لە ڕەخنەی ئەدەبی هێنا. بە دەم پێکەنینەوە گووتی: - ئەی لەو ئاواتخوازیە جاهیلیانە! لێرەدا جیا بووینەوە و هەستم دەکرد لە ئایندەدا پێك ناگەینەوە تەنها بە ڕێکەوت نەبێت لە ڕێگادا. لە یەکەم بەریەك کەوتی شۆڕش و ئیخوان دا یەکێك بوو لەو ئەندامانەی جەماعەت کە دەستگیر کران، پاش دادگایی کردن بە ١٠ ساڵ زیندان حوکم درا. ساڵی ١٩٥٦ ئازادکرا لە زیندان، پێمباش بوو سەردانی کەم بۆ پیرۆزبایی، چووم بۆ ماڵەکەی لە شەقامی خیرت.

لە ڕاستیدا زۆر نەگۆڕا بوو، سەری سپی ببوو، وەك چاوەڕوانە بۆ هەر پیاوێکی تەمەنی پەنجا و حەوت

و پەنجا و هەشت دا، کێشیشی زیادی کردبوو تا ئەو ڕادەیەی وا هەستم کرد تەندروستی لە جاران باشتر دیاربوو. پاش چاك وچۆنی، پرسیار کردن لە حاڵ و ئەحواڵ، ئەو هێستا وەك هەمیشە سەنگینی و ساردی دەماری دەگمەنی خۆی پاراستبوو، بەبێ پێشەکی هاتە سەر باسە گشتیەکان، و بەو پەڕی متمانەوە بیروڕاکانی دەردەبڕی.. - پێویستە قورئان شوێنی هەموو یاسا هاوردەکان بگرێتەوە. دەربارەی ئافرەتیش گووتی: پێویستە ئافرەت بگەڕێتەوە ماڵەوە، قەیناکا بخوێنێت، بەلام بۆ ماڵ نەك وەزیفە، هیچی تیدا نیە کە دەوڵەت گەرەنتی مووچەیەکی بۆ بکات لە حالەتی تەڵاق یان لەدەستدانی بە خێوکەر. بە توندی گووتی: سۆشیالستی و نیشتیمانی و ژیاری ئەورووپی شتی پیس وقێزەونن، پێویستە لە دەروونماندا ڕیشەکێشیان بکەین..

زۆر بە توندی هێرشی کردە سەر زانست ، تا ئەو ڕادەیەی واقم وڕما و لێیم پرسی: - هەتا زانستیش؟! - بەڵێ، ئێمە ناتوانین شتێکی ئەوتۆ لەو بوارە پێشکەش بکەین، لەو بوارەدا پێشمان کەوتوون و ئێمەش هەر وا بە بەجێماوی دەمێنینەوە هەرچەندە هەوڵمان دا و تێکۆشاین، هیچ پەیامێکی زانستمان پێ نییە پێشکەشی جیهانی بکەین، بەلام پەیامی ئیسلام و تەنها پەرستنی خوامان هەیە، نەك سەرمایەداری و مادیەتی دیالەکتیکی.... زۆر گوێم بۆ ڕاگرت و بە سەرکوتکردنی هەڵچوونەکانم تا ئەرکی موجامەلە پێشێل نەکەم، دوایی هەڵسام بۆ ڕۆیشتن ولێیم پرسی: - ئەی چی دەڵێی دەربارەی ئایندە؟ - هیچ پێشنیارێکت پێیە؟ - بەڵێ پێشنیارێکم پێیە، بەلام دەترسم نەفامی وجاهیلی بێت، ئەویش ئەوەیە بگەڕێیتەوە بۆ ڕەخنەی ئەدەبی! لەسەرخۆوە گووتی: - ئۆفەرێکی کارکردنم پێگەیشتوە لە دەرەوەی وڵات.

- ئەی چیت بڕیاردا؟ - بیری لێدەکەمەوە.. ماڵئاواییم لێکرد و ڕۆیشت. لە پاش تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر ئەو یەکتربینینە، ڕۆژنامەکان هەواڵی پیلانێکی نوێی تری ئیخوانیان بڵاوکردەوە، ئەو کاتە هیچم نەزانی دەربارەی چارەنووسی عبدالوهاب ئیسماعیل [سەید قوتب] کە پێموابوو وڵاتی جێهێشتووە بۆ کارکردن لە دەرەوەی وڵات. بەلام هاوڕێم قەدری رزق بۆی دووپات کردمەوە کە ئەو دەستی لە پیلانەکەدا هەبووە، و بەرەنگاری ئەو هێزەی کردۆتەوە کە بۆ دەستگیرکردنی ڕۆیشتوون، لە ئاکامدا گوللەیەکی کوشندەی بەرکەوتوە و جەستەی بێ گیانی کەوتۆتە سەرزەوی. المرایا، عبدالوهاب اسماعیل، ل ٢٥٧، نجیب محفوظ

# سەید قوتب:
# ئیسلام لە نێوان پەیامی زانستی و پەیامی بەها بەرزەکان!

سەید قوتب لە زۆربەی کتێبەکانی بیرۆکەیەک دەڵێت ودەڵێتەوە و جەختی لەسەر دەکاتەوە کە لە بواری زانست و تەکنۆلۆژیا "ئێمەی موسڵمان هیچ دەستکەوتێك و پەیامێکی زانستیمان پێ نییە پێشکەشی جیهانی بکەین، چونکە لەو بوارەدا جیهانی خۆرئاوا و ئێستا ژاپۆن و چین و کۆریاشی هاتەسەر، زۆر پێشمان کەوتوونەتەوە و هەرواش بە بەجێماوی دەمێنینەوە هەرچەندەش هەوڵمان دا پیشبڕکێیان لەگەڵدا بکەین!

بەڵام لە بواری بەها و ڕەوشت و مەعنەویاتدا، پەیامی ئیسلام و یەکتا پەرستی خوا و بەها بەرزەکانی ئیسلاممان هەیە پێشکەشی بکەین " منیش لەگەڵ نیوەی یەکەمی قسەکەی سەید قوتب م کە " هیچ پەیامێکی زانستیمان پێ نییە پێشکەشی جیهانی بکەین" بەڵام کارەسات لەوەدایە بەشی دووەمی قسەکەشی کە بریتیە لە پێشکەش کردنی " پەیامی ئیسلام و یەکتا پەرستی خوا و بەها بەرزەکانی ئیسلام " یش نەهاتە دی، وبەڵکو ئەو پەیامە گۆڕا بۆ سەرچاوەی نیگەرانی و شوهرەت بەدی موسڵمان، ومالۆیرانی، ومرۆڤ کوژی و دڕندایەتی ناوەوەی جیهانی ئیسلام و دەرەوەش!

ئیسلامێکیان پێشکەشی خەڵک کرد کە پڕاوپڕە لە هونەری کوشتن و سەربڕینی وەحشیانەی، کە بۆ ئاژەڵێش گوناهە بەو شێوەیە ئەنجام بدرێت و بە کۆمەڵ خەڵك بەبەرچاوی یەکەوە و چاوی کامێراوە، بە نۆرە سەرببڕیت!

ئیسلامێك کە هەموو دنیا باسی پیرۆزکردنی ئازادیەکان دەکات، کەچی ئەو ئاوات دەخوازێت بە گەڕانەوەی سەردەمی کۆیلایەتی و سبایا و جاریەچیەتی!

ئیسلامێك خەڵک پاش دیتنی هەزار ڕەحمەت بۆ فاشیزم و گۆڕی مۆسۆلینی دەنێرێت!

ئیسلامێك هەر خەریکی تەکفیر وتەفسیق و ڕەجمکردن و کوشتن و دەستبڕینی خەڵکە!

قەت بە عەقڵم داناچێت کەسێك لە بلیمەتی و ڕۆشنبیری و هەست ناسکی سەید قوتب دابێت، ئەگەر بژیا با ئەو کارەساتانەی بدیبا ڕازیبا پێی.

پاش ئەوەی سەید قوتب لە ئەمریکا گەڕایەوە، دیارە زۆر سەرسام بوو بە شارستانیەتی خۆرئاوا توشی شۆکێکی کلتوری و سەدمەیەکی حەزاری بوو، لەبەر بێ هیوایی لە پێشبڕکێی زانستی لەگەڵ خۆرئاوا، لە جیاتی ڕووکردنە زانست، ڕووی کردە ئەو بوارەی کە بە تێگەیشتنی خۆی خۆرئاوا بە چەندین سەدە لە پاش ئیسلامیستانە! ڕووی کردە دین و بەهای ڕەوشتی و ڕوحی، کەچی لەو زیندووکردنەوەیەی بەها دینی و ڕەوشتی وڕوحی ومەعنەویەکان، لە ژێر ناوی سەحوە و ڕابوونی ئیسلامیدا، ئەو وەحشە دڵ رەق و درندە و بێ ڕەوشت و بێ بەهایەی لێ وەپاش کەوت، کە گومانم نییە کە سەید قوتب

سەرەڕای خێرایی لە گۆڕانی بیروڕا و فیکریدا، ئەگەر بەو ڕۆژە گەیشتبا و بیدیبا، سروشتی شاعیرانەی و باگراوندی ئەدەبی و فەرهەنگی زەبەلاحی بە گەواهی نەجیب مەحفوز، قەت ڕێگای پێ نەدەدا وەك تەماشاکەرێك بمێنێت لەبەردەم ئەو هەموو فەزاحات ودڕندەییە و کارەسات وخوێنەی کە شانۆی بوکەڵەکەی چەند داوێکی بە بیر و پەنجەکانی سەید قوتب دەجوڵێنران!

# محەمەد عەمارە لە ستایشی توندڕەوی و ئیبن تەیمیە دا!

محەمەد عەمارە خاوەنی زیاتر لە(٧٠) کتێب و سەدان لێکۆڵینەوەیە، لە سەرەتادا لە ژێر کاریگەریی قوتابخانەی (جەمالەدینی ئەفغانی و مەحمەد عەبدە و قاسم ئەمین و محەمەد ڕەشید ڕەزا) بوو، زیاتر لە عروبەت و لیبراڵیەت نزیکبوو، لە ڕێگای نووسینی چەندین کتێب لەسەر موعتەزیلە و وەک سوارچاکانی عەقلانیەتی ئیسلامی؛ ستایشێکی زۆری عەقڵی دەکرد. من زۆربەی کتێبەکانی (محەمەد عمارە)م خوێندیتەوە، سەرەڕای سەرنجی زۆرم هەیە، لەسەر ئەو ڕوحە عروبیە نەتەوەپەرستییەی، کە زاڵە بەسەر ئەندێشەی تا دەگاتە ڕادەی ستایشکردنی حزبی بەعسی عەرەبی!

بەڵام هەر ناتوانرێت نکوڵی لە فراوانی فەرهەنگی ئەو پیاوە بکرێت، دوای گۆڕانکارییەکی ڕەگوڕیشەیی بەسەردا هات، کە لە بانگەوازی بۆ عروبەتێکی لیبڕاڵی و دیموکراتی ڕێچکەی گۆڕی بۆ ئیسلامیزمێکی شەریعەتخواز و بە چنگ و نینۆك بەرگری لە گەڕانەوەی دەوڵەتی ئیسلام و شارستانی ئیسلامی بکات تا ئەو ڕادەیەی زۆر نوسەر و بیرمەندان و ڕەخنەگران بە مونەزیری بزوتنەوەی ئیسلامی جیهانی دادەنێن، خۆشی دەڵێت: ئەوە شەرەفێکی گەورەیە بۆ من، هەرچەندە ئەوانەی ئەو نازناوەم دەدەنەپاڵ، وەك ستایش وا ناڵێن، بەڵکو بۆ وروژاندنی دەسەڵاتە لە دژی من!

سەرەڕای ئەوەی عمارە بە هەموو ڤایرۆسی عروبەتیەوە هاتە ناو تەوژمی ئیسلامیزمی، بەڵام من هەردەم وەک کەسێکی نزیک لە میانڕەوانی ئیسلامی حسێبم بۆی دەکرد. بەڵام بەو دواییە بە تەواوی گومانم لە (محەمەد عمارە) دروستبوە، کە نرخی قسە ونوسینەکانی بۆ ڕازاندنەوەی ڕووی قێزەونی سەلەفیەت وەردەگرێت لە وڵاتانی خەلیج. خەریکە دەگەمە قەناعەت کە وەك هەر نوسەرێکی تری قەڵەمفرۆش، بازرگانی بە قەڵەمەکەیەوە دەکات.

نازانم چۆن دەتوانێت لە یەککاتدا ستایشی موعتەزیلە وسەلەفیەت و سۆفیەت بکات، ئەخر کێ هەیە نەزانێت کە سەلەفیەت لە مامۆستای گەورەیان (ئیبن تەیمیە)وە فێری تەکفیرکردنی هەموو نەیارە موسڵمانەکانیان بن، ئەوە باسی تەکفیرکردنی خەڵکی تری بێ ئاگاش هەر ناکەین، بەس نیە ئیبن تەیمیە دەڵێت:

"کافر خوا پێی ناخۆشە ڕزقیشی بخوات و لێی حەرامە؟!" "ئەگەر کافر چاکە و پیاوەتیشی لەگەڵ کردی دەبێت دوژمنایەتی بکەیت!" "کافر خۆی و ماڵ ومنداڵی بۆ موسڵمان موباح وحەڵاڵە!" "ئەگەر کافر خۆشیویستیشی دەبێت ڕقت لێی بێتەوە"

ئەو (ئیبن تەیمیە)ی تەقدیسی ڕقوقینە و دوژمنایەتی دەکات و دەڵێت: إذا أقمت فی دار الکفر للتطبب أو التعلم أو التجارە، فأقم بینهم وأنت تضمر العداوة لهم". یانی "تۆ ئەگەر چوویتە وڵاتانی غەیری ئیسلامی بۆ چارەسەری تەندروستی، یان خوێندن، یان بازرگانی، و لەوێ نیشتەجێبویت، دەبێت لە

دڵەوە دوژمنایەتیان بکەیت!!" ئەو ئیبن تەیمیەی کە دەڵێت: ئەوەی گوناهی زۆر بوو باشترین دەرمانی جیهادکردنە! بەو قسەیەی هەزاران شەلاتی و داوێنپیس وبێکەڵك پیشەیان بۆتە سەربڕین و کوشتنی خەڵك، بەوپەڕی خۆپەرستی وئەنانیەتەوە خەڵك دەکوژن تا خوا لەوان خۆش بێت!

ئەو ئیبن تەیمیەی دەڵێت:" ئافرەت دەبێت لە منداڵ زیاتر چاودێری بکەیت، چونکە لە منداڵیش بێ عەقڵترە، بریتیە لە پارچە گۆشتێك لەسەر کۆتەی قەساب"!! ئەو ئیبن تەیمیەی تەنها لە کتێبی (مجموع الفتاوی) کەی، ئامارێککراوە لەسەری دەڵێت: (٢١٦٩) جار ژمارەی ئەو تەشریعانەی کە داوای کوشتنی موخالیفانی ئیسلام و هەتا موسڵمانانیش دەکات لەکاتی موخالەفەکردنیان!! ژمارەی وشەی کافرکردنی خەڵک و موسڵمانان (٩١٧)جار هاتوە، کافری مورتەد (٢٩) جار هاتوە، خوێنی حەڵاڵە (١٩) جارهاتوە، ئەگەر تۆبەی کرد، دەنا دەکوژرێت (٩٧) جار هاتوە، دەکوژرێت (٨٤٩) جارهاتووە. تۆبەی پێدەکرێت (٢١٩) جار هاتوە، لە گەردنی دەدرێت (٣٩) جار هاتوە، ئێستا زانیتان داعش لە کوێوە هاتوە ئەی خوێنەواران؟!

هەزار قسەی قۆڕی تری نا مرۆیی، کە دەبوایە (محەمەد عمارە) شەرمی لە خۆی کردبا وا ستایشی فاشیستفکرێکی وای کردبا. ئەو (محمەد عەمارە)یە سێ چوار کتێبی لەسەر سەلەفیەت نوسیوە، بە ناوەکانی: (السلف و السلفیة) هەیە هەمووی پێداهەڵگوتنە بەو فیکرە فاشستە. کتێبێکی هەیە لە بەرگری (ابن تیمیە) بە ناوی: رفع الملام عن شیخ الاسلام ابن تیمیە!

من زۆر شۆکنەبوم بەو ستایشکردنانەی کە محەمەد عەمارە لە ئیبن تەیمیە دەیکات، چونکە کابرایەك بەرگری لە سەدام و عودەی بکات دەبێت چی لێ چاوەڕوان بکرێت، لە پیاهەڵدان زیاتر بە کەسێکی تا سەر ئێسقان عروبەتچی؟! بەداخەوە بۆ قەڵەمیکی وا نرخی لەبازاڕ عەرزبکرێت.

ئەو یەک دوو دێرەی زۆر جارسی کردم، گەیشتمە قەناعەت کە بازرگانیی دەکات وکابرا کاسبە! عمارە لە کتێبی: رفع الملام عن شیخ الاسلام ابن تیمیە دەڵێت: [ئەگەر پڕۆژە نوێخوازەکەی ئیبن تەیمیە [دەوڵەتێك...و سیاسەتێك]ی دۆزیبایەوە بۆ جێبەجێکردنی، ڕووی جیهانی ئیسلامی و ئاڕاستەی گۆڕیبوو، ئومەتی ئیسلامی لە تەمەنی چاخەکانی پاشەکشەی شارستانی وژیاری چەندین سەدەی کورت کردبوەوە.] ل٩.

باشە ئەوە دەوڵەتی شاگردەکانی (ابن تیمیە) لە موسڵ و ڕەقە داعش دروستبوە، کە وابزانم هێشتا لە فیکرەکانی (ابن تیمیە) نەرم ونیانترن، ئەمە بە دەقەکانی خودی خۆی بۆتان دەیسەلمێنم. ئەو جۆرە دەوڵەتە دەیان وسەدان سەدە دەمانباتە پشتەوە، یان پاشەکشەی ژیاریی کورتتر دەکاتەوە ئەی محەمەد عمارە؟!

سەرەڕای ئەو هەموو ستایشانەش نوسەرێکی ناوداری سەلەفی (عبدالمنعم الشحات)، لە وتارێکدا بەناوی: [د. محمد عمارە سلفی بعقلە عقلانی بقلبە] دژی ستایشکردنی محەمەد عمارە بۆ ئیبن تەیمیە دەوەستێتەوە کە دەڵێت ئیبن تەیمیە دڵی زۆر فراوانبوو[!] پێویستە سەلەفییەکان ئیقتیدا بە ئیمامەکەیانەوە بکەن! کابرای سەلەفی وەڵامی ئەو ستایشەشی دەداتەوە ودەڵێت: هەندێك داوامان

لێدەکەن کە ئەوانی تر قبوڵبکەین و سنگفراوان بین بەرامبەریان، وەك ئیبن تەیمیە، بێ ئەوەی پێمان بڵێن ئەوانی تر کێن؟! بۆ زانین هیچ ئەوانێکی تر نییە [لە غەیری سەلەفی]، کە ئیبن تەیمیە وەڵامێکی دەمکوتکەری بۆیان نەبوو بێت!

لەوەش سەیرتر سەرەڕای ئەو هەموو ماستاوەی محەمەد عمارە بۆ سەلەفیەت و ئیبن تەیمیەی دەکات سەلەفیەك لە [ملتقی اهل الحدیث] لە ژێر کتێبێکی محەمەد عمارە نوسیبوی: "الدکتور عمارة حامل لواء الاعتزال وسادن الوثن العقلانی فی هذا الزمان. عجیب أن ینخدع بە من ینتمی إلی العلم مع أنە یصرح لیل نهار أنە معتزلی ودراستە الأکادیمیە کلها فی الدفاع عن فکر المعتزلە.." دکتۆر محەمەد عمارە هەڵگری ئالای موعتەزیلەیە، وزێوانی وەسەنیەت و بتی عەقلانیەتە لەو سەردەمەدا.. سەیرە کەسانێك لە ئەهلی عیلمی دین پێی هەڵخەڵەتێن، هەرچەندە شەو و ڕۆژ دەڵێت موعتەزیلیە و توێژینەوە ئەکادیمیەکانی هەمووی لە بەرگریکردن لە فکری موعتەزیلەدا نوسیوە!"

بۆیە من گاڵتەم بە زۆربەی ئەهلی میانڕەوی ئیسلامی دێت، چونکە ئەوە هەرە بلیمەتەکەمانە بزانە چۆن وەسفی سەلەفیەت و ئیبن تەیمیە دەکات، لە کاتێکدا هێشتاش لێی ڕازی نین و جوێنی پێدەدەن وتەکفیری دەکەن! دەبوایە ئەگەر خۆفرۆشتن نەبێت بە پارەی پەترۆدۆلار، چەندین کتێبی لەسەر پەتای ئیبن تەیمیە وسەرەتانی سەلەفیەت نوسیبا.

٢٠١٥/١٠/٢

# محەمەد سەعید بوتی و هەڵوێستی لە شۆڕشی گەلانی سوریا!

لە بیرمە لە کۆنگرەیەکی وتوێژی ئیسلامیەکانی کورد وعەرەب لە ٢٠٠٨/٤/١٢ لە لەندەن، کاتێ باسی هەڵوێستی زانایانی ئیسلامیم دەکرد کە تا چ ڕادەیەك نێگەتیڤ بووە لە کێشەی کورد، گوتم تا عەرەبەکان وانەزانن لە گیانێکی ڕەگەز پەرەستیەوە ئەو ڕەخنانە دەگرین لێیان، هاتمە سەرباسی محەمەد سەعید بۆتی [البوطی]، کە هەمو لایەک دەزانن کە زانایەکی ئیسلامی کوردە، یەکسەر چەندین لە کەسایەتیە دیارەکانی ئیخوان وسەرەڕای بەشیر نافیع موسی وتیان جا ئەوە خۆی کوردە!! گوتم: کێشەکە لەوەدایە کە کوردە، کەچی لەوەتی هەیە وەک عەبدێکی زەلیلی دەسەڵاتی بەعسە وبڕواننە کتێبەکانی کە چۆن وەسفی حافز ئەسەد دەکات دەڵێی وەسفی هاوەڵێکی پێغەمبەر دەکات... ئەوەی بێزاری دەربڕی وئەوەی استغفر الله ی کرد، لە پێش هەمویان زانایەکی کوردی دانیشتووی خەلیج بە جواب هات کە بەدرێژایی کۆنگرەکە هەر خەریکی ماستاو ساردکردنەوە بوو بۆ عەرەبەکان، ودەیویست کۆنگرەکە بەس قسەی خۆش وهەمومان براین وجیاوازیمان نیە وئەو شتانەی تێدا باس بکرێت!

دەبێ ئێستای ڕای ئەو زانایانە چۆن بێت پاش ئەوەی شۆڕشی سوریا هەڵگیرسا و هەڵوێستە نا ئیسلامی ونا ئینسانیەکانی شێخ محەمەد سەعید بوتی یان بە چاوی خۆیان دیت کە ئەو پیاوە ئەگەر دەریایەک خوێنیش لە گەلانی سوریا بڕژێ ئامادە نیە بداتە لای بەرەی هەق و جەماوەر دەست لەو ملهوڕە دیکتاتۆرە هەڵبگرێ..

لە سەرەتای شۆڕشەوە دەستی کردە ئامۆژگاری خەڵک وداوای لێکردن:"شوێن بانگەوازی سەرچاوە نادیار نەکەون کە دەیەوێت ئاژاوە بوروژێنێت لە سوریا." کە دیتی خەڵک گوێی بۆ شل ناکەن و جەماوەر باشیان ناسیوە وەك زانایەکی وەعزبێژی سوڵتانان و کاتێ خوتبەیان بە قسە پڕ لە نیفاقەکانی بڕی، ئەو جارەیان وەک بڵێی خودا لەبەر خاتری بەشار وبەعسدا کەشفی حیجابی دەروونی خەڵکی بۆ کردبێت گوتی: " ورد بوومەوە لێیان [لە شۆڕشگێڕەکان] دیم زۆربەیان شتێک نازانن ناوی نوێژ بێت، نێوچەوانی زۆربەی هەرە زۆریان سوژدەی نەبردوە"!! ئەوەیە هێزی دەروونی کەرامەت وتەلپاسی بوتی.

لە فەتوایەکدا لێی دەپرسن حوکمی بەزۆر ناچارکردنمان بۆ سوژدەبردن لەسەر وێنەی بەشار ئەسەد چیە؟ وەڵام: جائیزە، وابزانە لەسەر بەرماڵێك سوژدە دەبەیت!! پرسیان: حوکمە ناچارکرنیمان چیە لەسەر شیرك بڕیاردان بۆ خوا، کە ئەمنەکان ناچارمان دەکەن بڵێین بەشار تەنها خوامانە؟! دەڵێ: بۆ پرسیار لە ئەنجام دەکەیت وپرسیار لە هۆکار ناکەیت؟ ئەگەر ئەو کەسە نەچێتە ناو خۆپیشاندان وداوای ڕۆیشتنی سەرۆک نەکات، بۆچی ناچاری دەکەن ئەو کارە بکات؟!!!

کەوابوو بەپێی مەنتیقی خواروخێچی شێخ کێشە نییە لە ناچارکردنی خەڵك سوژدە بۆ غەیری خوایان پێببەن یان شیرکیان پێ بڕیار بدەن، کێشەکە لە ئێمەدایە کە بۆ ناڕازی دەبین بەو تاغوتانە؟ ئەوە

نوکتەیەکی دکتۆرێکی بەبیرهێنامەوە کە کاتی خۆی لە هەولێر کاک نەزمی حەلاقی هاوڕێ وهاوسێمان بۆی دەگێڕاینەوە: گوایە نەخۆشێك دەچێتە لای دکتۆرێک دەڵێت؛ دکتۆر کە دەچمە شوێنی بەرز وتەماشای خوارەوە دەکەم سەرم دەسوڕێ وگێژ دەخوات! دکتۆرەکە یەکسەر دەرمانی بۆ دەنوسێت، کە رۆشێتەکە دەداتە دەرمانسازەکە، کابرای دەرمان ساز دەڵێت: ئەوە دەرمانی کرمی بۆ نوسیوی! کابرای نەخۆش بە توڕەییەو دەچێتە لای دکتۆرکە دەڵێ: ئەوە چییە من دەڵێم سەرم دەسوڕێ کەچی تۆ دەرمانی کرمت بۆ نوسیوم! دکتۆرەکە دەڵێ: ڕاستە بە غەڵەت نەمنوسیوە، ئەگەر ئەتو کرمت نەبێ بۆ دەچیتە شوێنی بەرز تا تەماشای خوارەوە بکەیت و سەرت گێژ بخوات؟!!

دوا هەڵوێستی بوتی پاش ئەو هەمو کوشتارەی بابە عەمرۆی شاری حومس ناوی لە کۆنگرەی هاوڕێیانی سوریا دەنێ کۆنگرەی هاوڕێیانی ئیسرائیل!! جاران کە کاتێ بوتیم بەس لەڕێگای کتێبەکانی دەناسی زۆر شانازیم بە کورد بوونی دەکرد، بەڵام لە یەکەم چاوپێکەوتنی لە تورکیا لە ١٩٩٥ هەستم کرد ئەو پیاوە چەند ماستاوچییە بۆ دەسەڵاتدارەکان، ئەوە هیچ لەوەتی هەیە قسەیەکی خێری بۆ کورد نەکردوە [ئەگەر وەرگێڕانی مەم وزینی لێدەرکەین] لەو کۆنگرەیە پاش ئەوەی پێشمان گوت ئاماژە بە کوردبوونی شێخ سەعیدی نورسی بکات نەیکرد ولەجیاتی ئەوە بە تورکی دەدوا و موجامەلەی تورکەکانی دەکرد وەک چۆن لە دیمەشقیش موجامەلەی بەعس دەکات! ئەوە شورەییەک کە بەداخەوە بە پەنجەی کوردێك تۆمار دەکرێت لەو شۆڕشە مەزنەی گەلانی سوریا.

شورەیی دوەم بە دەستی کەسانێک تۆمار دەکرێت کە پاش دەرکردنی سەرۆکەکەیان لە سوریا لەلایەن ئەسەدەوە وبە گرتدانی بە دەستی تورکان وگرتن وراوەدونانی سەدان وهەزاران لە ئەندامیان لە لایەن دەزگاکانی ئەمن وموخابەراتی سوریا، پاش ئەوەی ئاپۆکەیان نکولی لە بوونی بەشێك لە کوردستان لە سوریا کرد وسەرەڕای چەندین خزمەتی تری کردەوە چەپەڵەکانی نهێنی!

# هارون یەحیای موهەڕیج

کینس میللەر زانای بایۆلۆژی ببینە چۆن ئەو موهەریجە ملپانەی تورکان هەڵدەسەنگێنێت کە ناوی هاروون یەحیایە، دەڵێت دەیان بەرگی نووسیوە لەسەر پوچەڵکردنەوەی تیۆری پەرەسەندنی داروێن.. ئەگەر بەرگریکارانمان لە ئیسلام وەک داعش و هارون یەحیا بێت، کە لە بەرنامە تەلەفزیۆنەکانی یەک مێگەڵ سۆزانی ڕووت وقووت لە خۆی کۆدەکاتەوە! دەبێت چاوەڕێی چ خێرێك بکەین لە جیهانی ئیسلام؟!

ئەو زانایە دەڵێت چەندین ئیمێڵم بۆ دەهات کە پرسیار بوون لەبارەی تیۆری پەرەسەندنەوە، منیش سەیرم پێهات وگووتم بۆ ئەو پرسیارانە دەکەن، لە وەڵامدا منیان ناساند بە بیروڕاکانی کەسێك بەناوی هارون یەحیا، زنجیرە کتێبەکانی هاڕون یەحیا یان بۆ ناردین دەربارەی تیۆری پەرەسەندن بە ئینگلیزی کرابوون! کە خوێندمنەوە دوو بەشی شتی خۆشی تێدا بوو، یەکێکیان چاوەڕوانکراو بوو، دووەمیان پێکەنین هێنەر بوو:

ئەوەی چاوەڕوانکراو بوو هەموو ئەو قسە وبەڵگانەی دژی تیۆری پەرەسەندن لەو بەشەدا باسکرابوو بەکارهینانەوەی [ڕیسایکلی] ئەو بەڵگە و قسانەی مەسیحیەت ئەوروپا بوو!

بەشی دووەم کە زۆر پێکەنین هێنەر بوو: ئەوەیە کە هارون یەحیا دەڵێت تیۆری پەرەسەندن پیلانێکی خاچپەرستی خۆرئاوایی مسیحیە بۆ فریودانی لاوانی موسڵمان - یانی لاوانی موسلمان بەو تیاترۆخانەیەی هارون یەحیا فریو ناخوات بە تیۆری پەرەسەندن دەیخوات؟!- بەڵگەش لەسەر ئەوە چارڵز داروین لە کەنیسەیەك دەیحوێند تا ببێتە قەشە، ئەوەش بەڵگەیە کە سەڵیبیە!

کینس میللەر دەڵێت لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە شتێکی زۆر فێر دەبین لە مێژوی ئیسلامدا کە لە سەدەکانی چوارەم وچواردەی زاینی سەنتەری زانست وزانیاری بوون، بەڵام بەداخەوە ئێستا گەیشتۆتە ئاستی سفر!

هارون یەحیا باشترە خەریکی ڕاقیسە وتیاترۆکانی بێت نەك بە ناوی دین قسە لەسەر زانست و تیۆری پەرەسەندن بکات، ئەو پیاوە نەدیندارە و نە زانا!

# شەحرور و زیادەڕەویە زمانەوانیەکانی

ئەو پیاوە بۆ ماوەیەك دەكرێت سەرسامت كات، بەڵام كە درێژە بە گوێگرتن لێی دەدەیت، هەست دەكەیت زۆر لە بیرو ڕاكانی لەسەر بنچینەیەكی زۆر لاواز و عەرەب گوتەنی موتەهافیت بنیان ناوە، لە زۆر بابەتدا زیاد لە حەد ڕۆدەچیت لە ڕووی لێكدانەوە زمانەوانەكانی بۆ قورئان. هەتا پێسكەشكارەكەش لەو ڤیدیۆیە پێی پێ دەكەنێت، بەڵام بە زۆر خۆی گرتووە كاتێ دەڵێت النساء مانای ئافرەت نایەت بەڵكو كۆی النسئ ە! چونكە ئایەتەكە دەڵێت زین للناس حب الشهوات من النساء، چونكە الناس بۆ ژن و پیاو بەكار دێت، كەوابوو النساء مانای ئافرەت نیە لەو ئایەتەدا! جارێ الناس بۆ پیاویش بە تەنیا بەكار دەهێنرا، چونكە كۆمەڵگای عەرەب، كۆمەڵگایەكی نێرسالاری بوو، بیگومان لە ڕووی اصطلاحیەوە بۆ پیاو بەكار دەهات، لە رووی زمانەوانیەوە پیاو و ژن دەگرێتەوە. قورئان لە زۆربەی ئایەتەكانی ڕووی لە پیاوە، هەتا ژنان گلەییان كرد جارێك، ئەو كاتە ئایەتەكە گووتی: المؤمنون والمؤمنات، المسلمين والمسلمات،،، دوایێ پێم ناڵێیت لە وەتی ١٤٠٠ ساڵدا كەس هەیە نەزانێت النساء بە مانای ژنان دێت؟! ئەوە تەكلیف و زۆر لە خۆكردنە لە ئەنجامی ئیحراج بوونەوە دێت بەرامبەر دەقەكان، كە من وتارێكی سەربەخۆیم لەسەر نوسیوە، لە فەیسبوكەكەم هەیە. سەدان كتێبی گەورەمان هەیە بەناوی فتاوی النساء، بۆ كەسێك ڕۆژێك لە هیچ دەقێك النساء ی بە مانای تازەوە بەكار نەهیناوە؟ منیش پێمخۆشە وابیت، بەڵام نە زمان و نە مێژوو و نە لۆژیک ئەوە قبوڵ ناكات. ئەی ئەو ئایەتانە چ لیدەكات: فانكحوا ما طاب لكم من النساء [خەڵك زەواج بكەن لەگەڵ ژنان یان لەگەل تازەگەری]؟! ئەی ئایەتی {يأيها الناس اتقوا ربكم الذي خلقكم من نفس واحدة وخلق منها زوجها وبث منهما رجالا كثيرا ونساء} خۆ دیارە دەڵیت ئێوەی دروست كردوە لە یەكێك كە ئادەم و حەوایە و دوایێ پیاوی زۆر و ژنانی لی وەپاشخستەوە. خۆ ناكرێ بڵێیت پیاو و تازەگەری لی وەپاش خستەوە؟!

دوایێ لە بنەڕەتدا نسئ بۆ تاخیر بوون هاتووە نەك بۆ تازەگەری!

لە وتاری [ئەگەر دینی خوایە بۆچی ئیحراج دەبن؟!] باسی ئەو جەماعەتەم وا كردوە: "دەستەیەكیتر هەر لەبەر هەمان ئیحراجیدا، هاتوون دەریچەیەكی سەیریان دۆزیوەتەوە، ئەویش پەنا بردنە بۆ نكوڵی لێكردن و سەرلەنوێ پێناسەكردنەوەی زاراوەكان و ماناكان! ئەوانە زیاتر قورئانیەكان و كەسانیتریشن، هێندە متمانە نیشان دەدەن بەڵام لەبەرامبەر گفتوگۆی جیدی خۆیان پیناگیرێت، دەزانم خەڵكی باش و نیەت پاكن، دەیانەوێت دین دوورخەنەوە لە هەموو شتێكی دژ بە مرۆڤایەتی و نالایق، هاتوون وێنەیەكی زیهنی زۆر میسالیان بۆ دین داتاشیوە، ئەوەی بەدەر لە قورئانە لەو هەموو حەدیس و تەفسیر و فیقە و سیرە و مێژوو و علومی قورئانیش نكوڵی لێدەكەن، هەر ڕوداوێكی هەتا متواتر بێت ڕەتی دەكەنەوە و دەڵێن لە قورئاندا نەهاتووە.

باشە قەیناکا، بەڵام کە دێنە سەر قورئانیش. لەبەرئەوەی قورسە قورئان ڕەتکردنەوە، ئەوجارە سەرلەنوێ چەمك وزاراوە و ماناکانی کە هەزار و چوارسەد ساڵە ئومەت لەسەری ڕێککەوتوون، ئەوان نکوڵی لە ماناکانی دەکەن هەتا بەدیهیترین ماناش بێت وەك بۆ نمونە دەڵێن: اقطعوا ایدیهما، مانای دەستیان ببڕن نییە!

ماملکت ایمانکم، ملك الیمین کە هەتا ساڵانی ١٩٤٥ یش لە هەموو وڵاتە عەرەبی و ئیسلامیەکان هەبوو، دەڵێن بە مانای کۆیلەکردن نایەت!

کە دێنە سەر ئایەتی: [والذین هم لفروجهم حافظون الا علی ازواجهم او ماملکت ایمانهم فانهم غیر ملومین] ئەوانەی دامێنیان دەپارێزن تەنها لە ژن و کەنیزەکانیان نەبێت] دەڵێن نەخێر وانیە دەبێت بە زەواج و هاوسەرگیری لەگەڵی بخەوێت، سەرەڕای یەك چیا لە توراسی کۆیلایەتی و دەستور وئادابی کۆیلەداری! بەو شێوەیە بۆ هەموو باسێکی ئیحراجکەر وەڵامێکیان پێیە، بەشێوەیەکی نا ئیرادی پاکسازی دین دەکەن، لەبەر ئیحڕاج بوون.

سەیرم بەو کەسانە دێت لە جیاتی خوا ئیحراج دەبن؟! ئەگەر ئەو دەقانەی لێی ئیحراج دەبن دینی خوایە، بۆ ئیحراج دەبن لە جیاتی خوا؟! کە ئیحراج دەبن مانای ئەوەیە یان دینی خوا نییە، یانیش ئێوە نازانن چۆن ڕەفتار بکەن لەگەڵ دینی خوا".

٢٠١٥/٩/١٤

# ناونشانی یەکەم کتێبی دکتۆر عەدنان ئیبراهیم دەستپێکێکی سەرکەوتوو نییە

(مطرقة البرهان و زجاج الالحاد ) [چەکووشی بورهان و شووشەی ئیلحاد] کە ناونیشان یەکەم کتێبی دکتۆر عەدنان ئیبراهیمە، وادیارە ئاڕاستەی ئیلحاد ومولحیدەکان کراوە! بێگومان دکتۆر ئیبراهیم عەقڵیەتێکی گەورەی ریفۆرمخوازی دینیی عەرەبە، وکاریگەری ئیجابی لەسەر بیرکردنەوەی هەزاران کەس جێ هێشتوە، وبە بەردەوامیش جێ دەهیلێت، هەرچەندە من وەك شارەزایەکی بواری فیکری ئیسلامی ڕازی نیم لە هەموو وتارەکانی، جاروبار زۆر خراپ بەبێ قەسد شکۆی میسداقیەتی خۆی دەشکێنیت کاتێ ستایشی کەسانیك دەکات بە شیوەیەك کە موستەهەقی نین وەك ستایشی قادیرۆفی سەرۆکی شیشان کە دەڵێی باسی ئەسحابەیەك دەکات!

جاروبار شکۆی زانستی خۆی لەکەدار دەکات بە گێرانەوەی هەندێك لە کەرامات وخورافاتی سۆفیەت وەك وەعز دانی عەبدولقادری گەیلانی بۆ هەزاران کەس و لە ئاسمان وەستان لەسەر بساط الريح [ڕایەخی فڕیو]! یان دیتنی جنۆکە وقسەی تری بێ سەروبەر، کە وابزانم بۆ مەکانەتی زانستی خۆی باش نییە، و لە هەمان کاتدا هاندان و پشتگیری کردنی کەسانی نەزان و نەفامە بۆ زیاتر باوەڕکردن بەو خوڕافاتانەی سۆفیەت، تا کەسانێکی نا هاوسەنگ و خۆشباوەڕ بە خورافەت و کۆیلەی سەگوەڕی شێخە ناپاکەکانی سۆفیەتیان لێ دەرچێت، کە بە دەگمەن نەبیت شێخێکی چاك وپاکیان لە ناودا نادۆزیتەوە!

یەکێك لە کەموکورتیەکانی تری دکتۆر عەدنان ئیبراهیم، برادەرێکی عەرەب ئاماژەی پێکرد بوو ئەمانەتی علمیە، زۆرجار لەکاتی هێنانەوەی باسێك ئاماژە بەو سەرچاوەیە ناکات کە لێی وەرگرتووە، نازانم لەبەر حەماسەتی وتارەدانیەتی یان هەر پێی خۆشە وەك بەرهەمێکی خۆی بیخاتە بەر گوێی بیسەران وبینەرانی؟! من خۆشم چەند جار ئەو شتەم لێی سەرنج داوە، کاتێ دیومە خەڵکانی کۆمینتیان نووسیوە هێندە بە حەماسەت باسی بیرۆکەکانیان کردوە، نەمویستوە ئەو سەرسامیەیان بکوژێنمەوە، چونکە گرنگ گەیشتنی چەمکەکە بووە لای من، هەرچەندە لە دڵەوە پیم ناخۆش بووە. شتێکی تر دەربارەی ئەو کتێبە (مطرقة البرهان و زجاج الالحاد] ( چەکووشی بورهان و شووشەی ئیلحاد] بۆ یەکەم کتێب ناونیشانێکی سەرکەوتوو و موەفەق نییە! لەبەر چەندین هۆ:

-ئیلحاد سەرەڕای زیادبوونیشی لە جیهانی ئیسلامدا، نەگەیشتۆتە حاڵەتی ترسناکی گەورە بۆ سەر ئیمان و ئیمانداران، لە بەلایەنی زۆرەوە ڕێژەیان لە ٥٪ تێپەڕ نادات!

-بەڕای من شەڕی سەرەکی دکتۆر عەدنان ئیبراهیم لەگەڵ ئیلحاد نییە، ئەوەندەی دەبێت لەگەڵ توندڕەوی سەلەفی بێت.

-مولحید وئیلحاد هیچ کاریگەریەکی ترسناکی دژی مرۆڤایەتی نییە، وەک توندڕەوی سەلەفی داعشی وقاعیدە و نوسرە ومیلیشیا زۆر ئیماندارەکانی شیعە !بەڵکو دەسەلاّتدارانی ئەوروپا کە زۆربەیان مولحید ولادینین ولا ادریین بەلای کەمەوە، باشترین نموونەی تەبایی و ڕیزگرتنی ئاڵوگۆڕی نێوان هەموو بیروباوەڕەکانیان پێشکەشی مرۆڤایەتی کردوە، ناکرێت کە باسی ئیلحاد دەکەین بەس وێنەی مولحیدەکانی سوپای سووری کۆمەنیستمان بیربێتەوە کاتێ پێشێلی پیرۆزیەکانی موسڵمانانیان دەکرد! ئیلحادیش جۆری هەیە.

-دکتۆر عەدنان ئیبراهیم ناوبانگ و شوهرەتی لە شەڕی دژی توندڕەوی سەلەفی وەرگرتووە، نەك ئیلحاد، دەبوایە عینوانی یەکەم کتێب و ناوەرۆکی ئاڕاستەی ئەو توندڕەوانە کرابا، دەترسم ئەوەش بۆ مەشغولکردنی لایەنگر ودۆستانی بێت لە شەڕی هەقیقی کە دژی توندرەوی سەلەفی یە.

-هەموو توێژینەوەکان دەڵێن زیادبوونی ئیلحاد بە هۆی کاریگەریە نێگەتیڤەکانی توندڕەوی دینی سەلەفی وشیعیە، کە وایان لە لاوان کردوە پەنا بۆ بێ باوەڕی ببەن بۆ ڕاکردن لەو وێنە دزێو و خویناویەی پیاوانی بەناو خوا بۆ دین و باوەڕیان کێشاوە، کە سەرەڕای کوشتنی هەموو ئاواتەکانیان و نەهێشتنی هەموو شتە خۆشەکانی ژیان، هێشتا رازی نین تا خوێنیشیان نەڕژێنن. کەوابوو شەڕی دکتۆر عەدنان ئیبراهیم دژی نیشانە و ئەعرازەکانی **symptoms** نەخۆشیەکیە [کە ئیلحادە]، نەك خودی نەخۆشیەکە کە [توندڕەوی دینییە]، ئەوەش لە پزیشکیدا بە چارەیەکی کاتی و ناکاریگەر دادەنریت.

-دکتۆر عەدنان ئیبراهیم لە دوو سێ گرتە ڤیدیۆییدا زۆر مرۆڤ دۆستانە باسی ئیلحاد ومولحیدەکان دەکات، وەک هەڵوێستێکی مرۆیی و فەلسەفی، هەرچەندە جاروبار زگ پێ سووتانەوەشی پێوە دیارە کە باش نییە وابێت، بەلاّم هەر هەڵوێستێکی ناوازەیە بۆ عەقڵیەتێکی دیندار و لەسەر مینبەر بەو جۆرە باسیان بکات! بۆیە بەڕای من لەبەر ئەو هۆیانە پێموایە دکتۆر عەدنان ئیبراهیم دەستپێکەکەی دروست نەبوو ولە ڕیزبەندی وئەولەویاتدا هەڵەی کردوە، هیوادارم هەڵە بێت وبە ئەنقەست نەبێت ونرخی ئەو نزیکبوونەوەی نەبێت لە بازنە خەلیجی وسعودیەکە!!

٢٠١٥/٢/٢٣

# نووسین بە ڕوحیەتی ئیسلامی تورکی!
# تاوتوێی وتارێکی عوسمان عەلی

بەشی ١ لە ٢

قەت باوەڕ ناکەم میللەتێك لەو جیهانە هەبێت نوخبەو دەستەبژێرەکانی بە ڕادەی کورد ڕۆڵی نێگەتیڤیان هەبێت، کاتێك وتاری عەرەبێك یان تورکێك یان فارسێکی شیعی یان سێکیولار دەخوێنیەوە لەسەر دۆزی کورد، ئێمە چاوەڕوانی هەموو تەزویر و بێ ویژدانی و داڕمانێکی ڕەوشتی و بەهایین لێیان، بەڵام بەداخەوە هەندێك نووسینی بەناو کوردانێك دەخوێنینەوە هەست دەکەیت بە ڕوحیەتێکی بێ ڕەحمانە و بێ ویژدانانە زیاتر لە ڕوحیەتی نەتەوەی سەردەستی تورك و عەرەب نووسراوە. بڕوانە عبدالباري عەتوان چۆن ڕوحی بەرگری و عەرەبچێتی و عروبەت بڵاودەکاتەوە، کە بۆ میدیای بێگانەش قسە دەکات باس لە مەزڵومیەت و بێ دەرەتانی عەرەب دەکات، هەتا پاکانە بۆ هەموو توندرەویەك و مرۆڤ کوژی گروپە توندڕەو و تیرۆرستەکانیش دەکات.

نوخبەی کوردی لە پێناو ئایدیۆلۆژیەتی تەسکی ئامادەیە مێژوو تەزویر بکات لە بەرژەوەندی دوژمنانی کورد، و کورد تاوانبار بکات، مەزڵومیەتی کورد پەردەپۆش بکات و بیانکاتە زاڵم، خاڵی لاوازی کورد بە دیاری بۆ ئاغایانی بنێرێت، و شاری کوردی لە ناسنامەی کوردی داماڵێت تا عەرەبێك پێی بڵێت بارك الله و فارسێك پێی بڵێت ئەهسەنت ئاغا، و تورکێشیش بڵێت: عەفارم ئۆغلم!

مامۆستا عوسمان دەمێکە برادەری منە و هەردەم جێگای ڕێزی من بووە، و زۆر شتیشی لێ فێربووم لەبواری مێژوودا، بەڵام وەك دەڵێن فلان حبيبنا، و الحق احب الينا منه! خۆی دەزانێت من موجامەلات نازانم لە گەرمترین کاتی دۆستایەتیم لەگەڵ مامۆستا عوسمان عەلی، ناسراو بە ئازاد گەرمیانی، کە مامۆستای مێژووە لە زانکۆی سەلاحەدین، ڕەخنەی خۆمم پێی گوتوە بەوپەڕی دڵسۆزی و ڕێزەوە، بەڵام بەوپەڕی ڕاشکاویەوەش .هیچ کاتێك ئەو پەیوەندیە نا هاوسەنگیەی ئەو و تورکەکانی ئاك پارتی ئەردۆگانم بە دڵ نەبووە، خۆشی ئەو هەقیقەتە دەزانێت. لە بیرمە جارێك نامەیەکی پڕ لە ئامۆژگاری نووسیبوو بۆ ئەردۆگان و عەبدوڵلا گوڵ کە چۆن هەڵسوکەوت بکەن لەگەڵ کورد و دۆزی کورد، کە ئەو کاتە پەیوەندیان لەگەڵ باشوور بە گشتی و پارتیش خراپ بوو، داوای ڕای منی کرد لەسەر نامەکە، منیش وەك کوردێك و برایەکی دینی و لە پرنسیپی الدين نصيحة، دین ئامۆژگاریە، پێیم گووت: ئەو نامەیە ئەگەر ناوی تۆی لەسەر نەبا دەمگووت لە نامەی سەرۆك مستەشارێکی وەك ارشد زیباری دەچێت بۆ سەدام حسێن نووسیبێتی، ئەو نامەیە لە کەسێکەوە نەنووسراوە خەمی دۆز و مافی کوردی هەبێت، بە قەد ئەوەی خەمی باڵادەستی دوژمنی میللەتەکەی بێت لە ژێر هەر پاساوێك و پەردەیەك وبیانوێك بیت! وابزانم ئێستاش نامەکەم لە ئەرشیفێکدا ماوە .ئەوەش هۆکارە زاهیرەکەیە لای کاك

ئازاد گەرمیانی لە پاکانەکردن بۆ ئەو هەڵوێستانە، چونکە من هەموو هۆکارەکان نازانم، لەبەر ئەوەیە چونکە حزبە کوردیەکانی باشوور و باکوور سێکیولارن و دژە ئیسلامن، بەلاّم دەسەلاّتی تورکیا بۆ نمونە ئیسلامی و هەڵگری پرۆژەیەکی ئیسلامی پەنهانین.

جارێکیتریش کە بابەتێکی لەسەر کەرکوك و پەیوەندی کورد وتورکمان نووسیبوو کە من ئێستاش بابەتەکەیم ماوە، لە عەرەبێك و تورکمانێك بەخشندەتر بوو لە دانهێنان بەوەی کەرکوك پێناسنامەی تورکمانییە یان ناتوانیت بڵێیت کوردیە یان تورکمانی یان عەرەبی، بەڵکو ئەو گومانەی دەخستە پێناسنامەی هەولێریش، وەك توندڕەوترین ئەندامی جەبهەی تورکمانی! منیش وەك سەرنووسەری گۆڤار ئەو بڕگەیەکم لە وتارەکەی بڕی، یەکەم لەبەر سومعەی خۆی، دووەم لەبەر سومعەی گۆڤارەکە و خۆشم وەك سەرنووسەر، بێگومان زۆر توڕە بوو، بەلاّم منیش ڕای خۆم پیی گووت، دوایی هەر بە هەمان بڕگەکانی بلاّویکردەوە لە چەند گۆڤار وسایتی عەرەبی، کە مایەی دەستخۆشیەکی زۆری عەرەب و تورکمان بوو وتارەکە!

سەیرم لەوە دێت یەکێك نزیکەی دەساڵێك دەبێت گەرابێتەوە کوردستان، هێشتا بجوکترین گۆڕانکاری لە هەڵوێست و ئەو نەزعەیە ئیسلامییە سەرەتاییە توندئاژۆیانەی لەو پیاوە دایە نەگۆڕیوە، بە هەمان ڕوحیەتی جاران پشتگیری لە ئەردۆگان دەکات، وادیارە وجودیشی لە ناوچەی پارتی و نزیك بوونەوەی لە بازنەکانی پارتی زیاتر هاندەرە بۆ ئەو ئەردۆگانیزمیستەی کە بەڕای من هیچی کەمتر نییە لە ئەردۆگانیستیەکەی شێخ عەلی قەرەداغی، کە وابزانم کار وابڕوات دەبێتە دیاردەیەك لەناو ئیسلامیەکان لە ژێر ناوی عەلی قەرەداغیزم.

ئەو قسانەم بە بۆنەی خوێندنەوە وتارێکی دکتۆر عوسمان عەلی کرد، کە لەسەر هەڵبژاردنەکەی سەرەتای ئەو مانگە نووسیبوی بە ناونیشانی:

ئەنجامە چاوەڕوانکراوەکانی هەڵبژاردن و کاریگەریەکانی لەسەر کورد!

The possible outcomes of the elections and their effects on Kurds

بەداخەوە لەو وتارە کاك عوسمان هەروەك چاوەڕوان بووم یەك تاقە قسەیەکی خێریش بۆ کورد ناکات، من زۆر وتاری تورکەکان بە ئینگلیزی دەخوێنمەوە، لە هەموو ئاڕاستەیەکی سێکیولاری و ئیسلامی و نەتەوەیی، بە خودای گەورە تورکەکان زۆر مونسیفتر و عادیلتر بوون لە دابەشکردنی ڕەخنەکان بەسەر ئەردۆگان و پەکەکە، ئەوە باسی وتاری کافرەکانی ئەوروپا و ئەمریکا هەر ناکەم، چونکە کاك عوسمان پێیوایە ئەوروپا و ئەمریکا و ئیسرائیل و عەلمانیە کافرەکان هەمووی دژی ئەردۆگانن و لێی دەترسن وەك لە چەندین وتار و کتێب و کۆمێنتێ وادەڵێت! بەڵکو هاوڕێیەکمان بە دوژمنایەتی ئیسلام تۆمەتبار دەکات چونکە ڕەخنەی لە ئەردۆگان گرتووە!

من لێدەگەڕێم خۆی قسەکان بکات، تەنها وەریدەگێرمە سەر کوردی و دەقە ئینگلیزیەکەش دەتوانن لە لینکی وتارەکە بچنەوە سەری، لەگەل کۆمێنتێکی خۆم:

“بڕیاری نا عاقلاّنەی هەدەب بە لە کیسدانی هەلی ئەوەی ببێتە نوێنەرێک لە پڕۆسەی ئاشتی، کە لەلایەن ئاک پارتی دەستی پێکرد، ئەویش بە پشتگیری کردنی لە توندوتیژی پ ك ك، بووە هۆی

بێ هیوابوونی کورد لە هەدەپ، چونکە کورد ئەو پرۆسێسە بە تەنها ڕێگا بۆ بنیاتنانی ئاشتیەکی هەمیشەیی لە ناوچەکە دەبینێت".

مامۆستا عوسمان نازانم چۆن تۆمەتی پشتگیری هەدەپ بۆ توندوتیژی پ ک ک وابێ باکانە دەبەخشێتەوە، چونکە ئەگەر وابا ئەردۆگان دەمێك بوو هەدەپی داخستبوو. دووەم سەیرە یەکێك خۆی بە کورد بزانێت لەسەر برین و ناسۆری کۆبانێ باز بدات، کە هەموو جیهان شاهێدی بوو، چۆن ئەردۆگان یارمەتی تیرۆرستانی داعشی دەدا بۆ کوشتنی کورد، چۆن ئەو تەقاندنەوانەی گەنجانی جوانی هەدەپە لە پرسوس و ئامەد و ئەنقەرەت چاوپۆشی لێکرد، کە هەموو جیهان دەزانێت کاری سوڵتانەکەتە!؟ چۆن ئەوە لە بیر دەکات کە هەتا بڕیاری لێدانی داعش لەلایەن ئەردۆگان بۆ لێدانی یەپەگە و پ ک ک بوو، بە شاهێدی هەموو ڕۆژنامە موعتەبەرەکانی جیهان. ئینجا کەی ئەردۆگان ئامادە بووە هەدەپ بکاتە هاوبەش لە دەسەڵات؟! باشە گوتمان هەدەپ بڕیاری بێ عەقڵانەیدا، باشە بۆ ئەردۆگان لەگەل مەهەپ و جەهەپ حکومەتی پێك نەهێنا؟!

خۆ ئەردۆگان هیچی لەوان کەمتر نییە لە تورکچیاتی و ڕەگەزپەرستی !یان تەنها ڕازیە بە حکومەتێکی تاك ڕەوانەی فول ئاك پارتی؟! لە بەشێکیتردا دەڵێت: "بە پێچەوانەی حکومەتەکانی پێشوو، وتاری ئاك پارتی دەرهەق بە دۆزی کورد لەگەڵ چارەسەری ئەمنیدا نییە بۆ ئەو دۆزە، ئاك پارتی پێی پەسندترە کە مامەڵە لەگەڵ هەقیقەتی کوردی بکات بە هەستی دان پێداهێنانەوە، لەبەر ئەو هۆیانە ئاك پارتی هەوڵیدا چارەسەرێکی سیاسی بۆ ئەو دۆزە بدۆزێتەوە. ئەوەش دەکرێت لە تۆماری ئاك پارتی بۆ دەیەی ڕابردوو ببینرێت. ئەو تۆمارە بەدەنگی بەرز دەڵیت تابۆی کۆن سەبارەت بە بوونی کورد لە تورکیا تێکشکێندرا".

جاری وەهمێك هەیە لای ئیسلامیەکانی کورد بە گشتی کەوا ئەردۆگان پرۆسەی ئاشتی دەست پێکردوە لەگەل کورد! لە ڕاستیدا تورگوت ئۆزال ١٩٩٣- ١٩٢٧یەکەم سەرۆکی تورکیا بوو، لە حزبی نیشتیمانی دایك [ئەنا پارتی] کە سیاسەتی کرانەوەی کوردی دەست پێکرد لە نەوەدەکان، لە پاش یەکەم دانیشتن لەگەڵ پ ك ك، بڕیاری ئاگربەستی پ ك ك دەرچوو ١٩٩٣/٣/٢٠، ئۆزال کە نیوەی کورد بوو، تا سەر ئێسقان حەزی بە چارەسەری ئەو کیشەیە دەکرد و هەوڵی زۆریشی بۆدا، و مرۆڤێکی تا بڵێی دیموکراتی هەقیقی بوو، بە هانای کوردیش هات لە کۆڕەوە گەورەکە، هێندەی نەبرد لە بارودۆخێکی تەم ومژاویدا گیانی لە دەستدا، زۆربە سیاسەتوان و بیرمەندان و نووسەران کۆکن لەسەر ئەوەی کە ئەو پیاوە بە دەستی ناحەزانی ئاشتی کوژرا.

سەرچاوەی وتارەکەی:

http://www.dailysabah.com/op-ed/2015/10/30/the-possible-outcomes-of-the-elections-and-their-effects-on-kurds

# نووسین بە ڕوحیەتی ئیسلامی تورکی!
# تاوتوێی وتارێکی عوسمان عەلی

بەشی ٢ لە ٢

من گومانم نییە ئەگەر تەمەن بواری تورگوت ئۆزالی دابایە، دەمێك بوو کیشەی کورد چارەسەر کرابوو، خەڵکی تورکیش ناچار نەدەبوون متمانەی خۆیان بدەنە دەست ئەردۆگانێک کە تەنها یاری بە کات دەکات و هێزەکانی کۆمەڵگای تورکیا یەك بە دوای یەك سەرکووت دەکات بە نەزعەیەکی ئیسلامی پەنهانی و لە ژێر پەردەیەکی تەنکی دیموکراسیدا، کە هەموو عەورەتی دیکتاتۆریانەی لێوە دیارە.
ئەردۆگان بیرۆکەی ئۆزالی برد، بەڵام لە ناوەرۆکی خۆی بەتاڵیکردەوە، ئەردۆگان کارتی کوردی بەکارهێنا دژی سوپا و دادگای باڵای دەستوری تا توانی ئەوان کۆنترۆڵ بکات، بەڵام کە ئەوانی لە پەل و پۆ خست، بایدایەوە لای کورد ولێیدان، ئێستا دەستی لەگەڵ تاریکپەرسترین هێزی جیهان کە داعشە تێکەڵ کردوە لە پێناولێدانی کورد لە سوریا و تورکیا! ئەو پیاوە دەساڵ زیاترە مێشکی کاس کردووین بە باسی چارەسەری کێشەی کورد، کەچی یەك هەنگاویش نەچۆتە پێش، بەڵکو گەڕانەوەیەکی خێرا هەیە بەرەو خاڵی سفر! کێ فریو دەخوات بە پرۆژەی چەواشەکارانەی ئەردۆگان جگە لە فریوخواردوە خۆبەخشەکان نەبێت؟!
ئینجا باسی چاکەکانی ئەردۆگان بەردەوام دەبێت، کە کوردستانی کردۆتە دووەم بازاڕی هەناردەی کەل وپەلەکانی! نازانم کێ زیاتر سوود لە کێ وەردەگرێت وکێ دەبێ مەمنوونی کێ بێت؟! لە دنیای بزنسدا فرۆشیار هەموو جۆرە نازێکی کڕیار دەکێشێت، هەتا هەڵەش بکات، چونکە دەڵێن کریار هەردەم لەسەر هەقە، کەچی مامۆستا عوسمان هێشتا ئەو فرۆشیارە تورکەمان بە چاکە پێ دەفرۆشێتەوە، کە هەموو کاڵای ساختە وبەسەرچوویان بەسەر کوردستانی باشوور ساغ دەکەنەوە، هەر خۆی دەڵێت کاتی خۆی تورکیای ئەردۆگان لە ترسی نفوزی ئێرانی گەمارۆی لەسەر کوردستان هەڵگرت! کەوابوو ئەگەر ئەو مامەڵەیە پڕ قازانجەی ئەردۆگان بە چاکەش لە قەڵەم بدرێت، ئەوە لەبەر ئیسلامەتی وپیاوەتی ئەردۆگان نەبووە، بەڵکو لە ترسی نفوزی ئێرانی بوە!
دوایی دەمانترسێنی بەوەی کە لە ئاك پارتی باشتر بۆ کورد نە هەبووە و نەدەشبێت، ئەگەر بدۆڕێنێت، گەورەترین زیان بەر کورد دەکەوێت! "ئەگەر حزبەکەی ئەردۆگان نەمێنێت، ئەوە کورد ئەو ڕێگایەی هەناردەکردنی ]نەوتی[ لێ دەگیرێت، تورکیاش ئەو سەرچاوە داراییە پڕ بەهایەی هەناردەکانی بازرگانی دەرەوەی لەدەست دەچێت"!
یانی باشە ئەوەندەش ئیعتیراف دەکەیت کە تورکیاش سەرچاوەی دارایی هەناردەکانی بازرگانی دەرەوەی لەدەست دەچێت، بەڵام لە بیری چوو بڵێ، ئەو هەموو نەوتە هەرزانەی کوردستان و داعشستانیشی

لە دەست دەچێت!

ئینجا لەسەر شێوازی ئەوانەی هیچ بەڵگەیەکیان نییە دەڵێت: " ئیجماع هەیە لەناو کورددا کە هەدەپە ئەو دەسەڵاتەی کە دەنگدەرانی کورد پێیان دا بەکاری نەهێنا بۆ بەرژەوەندی کورد. دەبوایە هەدەب ئەو هەلەی بقۆزتایەوە بۆ نیشاندانی لایەنی مەدەنی و دیموکراتی خەباتی کوردی بۆ تورک و بۆ هێزە خۆرئاواییەکان، هەروەها پەکەکەش، لەجیاتی پەنابردنەوە بەر توندوتیژی و کۆتایی هێنان بە پرۆسەی ئاشتی" جارێ نازانم ئەو ئیجماعەی لە کوێ هێناوە مامۆستا عوسمان کە کورد هەمووی وا سەرکۆنەی هەدەپ دەکەن، ئینجا کە دەڵێم بە ڕوحیەتێکی تورکتر لە تورک ئەو وتارە نووسراوە بۆ ڕازیکردنی دەسەڵاتی ئاك پارتی و تێرکردنی غروری ئەردۆگان و تورکی فاشیست، هێشتا کەمم گووتوە. چونکە هەدەپ کە ڕووی دیموکراتی و نزیکی لە لیبڕالیەت نیسان دەدات، هەر ئیسلامیەکانی تورک وکورد دەهۆڵی پشتگیری لە هاوڕەگەزبازی بۆ لێدەدەن، لە کاتێکدا ئەردۆگان بە واقیعی دانی بە مافەکانیان دا هێناوە !کەباسی پەنابردنەوە بەر توندوتیژی پەکەکە و کۆتایی هێنان بە پرۆسەی ئاشتی دەکەیت، ئەوە کەس هەیە نەزانێت ئەردۆگان لە کۆبانی توندوتیژی بەکاردەهێنا ویارمەتی داعشی دەدا بە سنوور بۆ کردنەوە و بە چەك، بەوەش نەوەستا هەستا بە ئەنجامدانی زنجیرەیەك تەقاندنەوە لەناو لایەنگارانی هەدەپە لە پرسوس و ئەنقەرە و ئامەد و شوێنیتریش، هەر سەرۆك وەزیران داود ئۆغلۆش دانی بەوەدا هێنا کە خۆکوژەکانیش دەناسن بەڵام ناتوانن بیانگرن چونکە زۆر دیموکراتین! بەڵام هەزاران لایەنگر و چالاکوانی هەدەب بگرن کیشەیەك نییە بۆ دیموکراتی، و کەمپینی هەڵبژاردن سوور کەن لە خوێنی لایەنگرانی هەدەپە کێشەیەک نییە بۆ دیموکراتی!

ئاسایە بۆ تورکیك ئەو هەموو خیانەت و دژایەتیەی ئەردۆگان بۆ کورد نەبینێت، بەڵام بەخوای بۆ کوردێك لە پایزی تەمەن و دکتۆر لە مێژووی کوردیدا نەنگییە و ئەوپەڕی بێ ئاگایی و بێ ویژدانییە خۆی وانیشاندا پێی نازانێت.

کە دەڵێم هەتا تورکەکان کە دەنوسن بە ویژدانتر دەنووسن، ئەو دوو بڕگەیەو وتارێکی تورکێك دەخەینە ڕوو، کە لە وتارێکدا هاتووە، کە خودی کاك عوسمان لە وتارەی کۆتەیشنی لێ وەرگرتوە، تا بزانین چۆن نوخبەی کوردی زۆر نادادپەروەرتر و نابابەتیانەترن لە دەستەبژێری میللەتانی سەردەست لە داگیرکەرانی کوردستان، نوسەری وتاریTurkey Is in Serious Trouble ، نوسەر Soner Cagaptay دەڵێت: "لە گەرمەی یاخیبوونی پەکەکە دا لە ١٩٩٠ دەکان، چومە ڕێوڕەسمی ناشتنی چەند ئەندامێکی خێزانی ئۆفیسەرێکی ئاسایش کوژرابوون لە شەڕی پ ك ك، خێزانەکە ستایشی ڕۆڵی حوکمەتیان دەکرد لە بەرەنگاربوونەوەی یاخیەکان، و سوپاسی حکومەتیان دەکرد لە ستایشی ڕۆڵی خۆشەویستانیان. لە تەموزەوە ٧٠ پۆلیس و سەربازی تورك کوژراون لەلایەن پ ك ك وە، بەڵام لە زۆربەی حالەتدا ئەو جەنازانە گۆڕاون بۆ دژایەتی ئاك پارتی و خۆیشاندان دژی ئەردۆگان. " لێرەدا دەردەکەوێت هەتا تورکەکانیش ئەردۆگان بە موسەبیبی ئەو ئاشتی تێکچوونە دەزانن!

لە بەشێکی تری وتارەکەدا باسی ستراتیژیەتی فریودەرانەی ئەردۆگان دەکات بۆ لێدانی بە نۆرەی

هێزەکانی تورکیا و لیدانی کوردیش لەوەوە دێت کە نۆری هاتووە لێیبدرێت:
"سەرچاوەی جەمسەرگیری کێشمە کێش هەر ئەردۆگان خۆیەتی. ئەردۆگان زنجیرەیەک هەڵبژاردنی بردۆتەوە لە ساڵی ۲۰۰۲ وە، و عیبادەتی شەخسی بنیات ناوە، وەك جۆرێك لە دەسەڵاتداری موستەزعەف، خۆی وەک قوربانیەك وێنا دەکات کە ناچار بووە بە توندی لەو [پیلانگێڕانە بدات] کە دژایەتی دەسەڵاتی ئەو دەکەن. لەسەر ئەو بنچینەیە توانی بە سەرکەوتوویی و دڕندایەتیەکی سیاسی سوپای سێکیولاری تورک، و بیزنس و لیبڕاڵەکان و جووەکان و دەنگدەرە چەپڕەوەکان و عەلەویەکانیش بکاتە ئامانج، و ئێستاش کورد" !
ببینە ئەو تورکە چەند شەفافتر شتەکان دەبینێت، کە تۆ لەو چەند دێڕێکت وەرگرتووە، ماقوڵە ئەو ڕەخنانەی ئەویشت نەدیوە؟ !هەر وتارەکە خۆی ناونیشانەکەی زەنگێکی ترسناکە: تورکیا لە کێشەیەکی جیدی دایە!
لە کۆمێنتێکتدا دەڵێیت من ڕەخنەم گرتوە لە ئەردۆگان، باشە کاک عوسمان من چ لە ڕەخنەی تۆ بکەم لە ئەردۆگان کە لە ڕووداو و سپێدە وکۆمەڵ دەیگریت بە کوردی، کەچی لەولاوەش بە ئینگلیزی بۆ ئەردۆگان و داود ئۆغلۆ دەنووسیت و بۆشت دەکەن بە تورکی، تیایدا یەك پارچە ستایشی ئەردۆگان و حزبەکەیەتی، وەك مەهدی مونتەزەر نیشانی دەدەیت، و هەموو ڕەخنەکانیشت ئاڕاستەی هەدەپ و پەکەکە دەکەیت؟! تۆ ئەگەر ڕاست دەکەیت ڕەخنەت لە ئەردۆگان هەیە، لەو وتارە هاوسەنگی خۆت بپاراستبا و یەك دوو ڕەخنەت ئاڕاستەی ئەویش کردبا! خۆ تۆ علی قەرەداغی نیت لە کوردستان کوردستانی و لەدەرەوە قەتەریانە بدوێیت؟! خۆزگە هەر بەبواری مێژوو خەریك دەبوویت خۆت لە سیاسەت و دەستوورناسی و هەندێ دۆزیتری فیکری هەڵنەدەقورتاند تا نەکەویتە ئەو هەڵە کوشندانە. هیوادارم وتارەکەم ببێتە خاڵێک بۆ بەخۆداچوونەوەت، ئاوڕدانەوەیەک لە نەتەوە و میللەتی خۆت، کە دەبێت لە پێش هەموو کەسانیتر بن دوور لەو عەقیدە ساختەیەی ولاء وبراء ی سەلەفی!
15/11/2015

# ئەو ئەردۆگانیە بناسن،
# عەلی قەرەداغی لە چاو ئەودا شێخ سەعیدی پیرانە!

عوسمان عەلی ناسراو بە ئازاد گەرمیانی، وتارێکی بە عەرەبی بە ناونیشانی: "ترکیا والولایات المتحد ة والحزب الاتحاد الدمقراطی (PYD) الکردی والافاق المستقبلیة" لە سایتی ستاندارد کورد بڵاوکردۆتەوە، بە ڕوحیەتی جەندرمەیەکی بێ ویژدانی تورکی شۆڤێنی نوسراوە، بە یەك وشەش هەتا ئاماژەی بۆ کوژراوە مەدەنیەکانی دەستی شۆڤێنستەکانی خەلیفە خوێن ڕێژەکەی ئەردۆگانی نەکردوە! ئێستا من زیاتر بۆم ڕوونە بۆچی کورد تا ئەمڕۆ وابێ دەوڵەتە و هەر لە ژێر دەستی دوژمنان دایە! ئەگەر دکتۆرە مێژوونووسەکەی، کە دکتۆراکەی لە کەنەدا هێنا بێت وا بێ ویژدان بێت دژی میللەتەکەی و ئەو هەموو کارەساتە مێژووەی بەسەر کورد هاتووە لە ئەنجامی نەزانی و خۆفرۆشی نوخبەی ڕۆشنبیری، وانەیەکی فێرنەکات و بە کەمترین نرخ خۆی بفرۆشێت بە ئەردۆگانی شۆڤێنست، ئەی چی لە جاشێکی نەخوێندەواری دوژمنداری بێ ئاگا بکەین؟!

ئەو زەلامە زۆر بێ شەرمانە هەموو قسەکانی موخابەراتی تورکی وئەردۆگان بە زیادەوە دەسەلمێنێت لە دژی پەیەدە وکوردانی باکووردا...دەڵێت پەیەدە بەکرێگیراوی ئەسەد و ئێرانن، هەتا ئەمریکاش ئەو قسەیەی بەدرۆخستەوە! دەڵێت پەیەدە بوو تەقاندنەوەی لە ئەنقەرە کرد! پەیەدە ئەو چەکانەی بە یارمەتی وەریدەگرێت لە ئەمریکا و وڵاتانیتر بۆ پ ک ک ی دەنێرێت!

دەڵێت پەیەدە گەریلا لە کوردستانی سوریا مەشق پێدەکات و دەیاننێرێتە تورکیا! پەیەدە ستەمی کردوە لە عەرەب و تورکمان وەك قسەکانی ئەردۆگان و داود ئۆغلۆ!

من لەوتارێکدا بە ناونیشانی:[ نووسین بە ڕوحیەتی ئیسلامی تورکی!] لە دوو ئەڵقەدا ماهیەتی عوسمان عەلی یم بۆ خوێنەرانی کورد دەرخست و لە بەشێکیدا گوتومە: "قەت باوەڕ ناکەم میللەتێك لەو جیهانە هەبێت نوخبە و دەستەبژێرەکانی بە ڕادەی کورد ڕۆڵی نێگەتیڤیان هەبێت، کاتێك وتاری عەرەبێك یان تورکێك یان فارسێکی شیعی یان سێکیولار دەخوێنیەوە لەسەر دۆزی کورد، ئێمە چاوەڕوانی هەموو تەزویرو بێ ویژدانی و داڕمانێکی ڕەوشتی و بەهایین لێدەکەین، بەڵام بەداخەوە هەندێك نووسینی بەناو کوردانێك دەخوێنینەوە هەست دەکەیت بە ڕوحیەتێکی بێ ڕەحمانە و بێ ویژدانانە زیاتر لە ڕوحیەتی نەتەوەی سەردەستی تورك یان عەرەب نووسراوە. بروانە عبدالباري عەتوان چۆن ڕوحی بەرگری و عەرەبچێتی و عروبەت بڵاودەکاتەوە، کە بۆ میدیای بێگانەش قسە دەکات باس لە مەزڵومیەت و بێ دەرەتانی عەرەب دەکات، هەتا پاکانە بۆ هەموو توندرەوی و مرۆڤ کوژیەکی گروپە توندڕەو و تیرۆرستەکانیش دەکات.

نوخبەی کوردی لە پێناو ئایدیۆلۆژیەتی تەسک ئامادەیە مێژوو تەزویر بکات لە بەرژەوەندی دوژمنانی کورد، و کورد تاوانبار بکات، مەزلومیەتی کورد پەردەپۆش بکات و بیانکاتە زاڵم، خاڵی لاوازی کورد بە دیاری بۆ ئاغایانی بنێرێت، و شاری کوردی لە ناسنامەی کوردی داماڵێت تا عەرەبێك پێی بڵێت بارك اللە و فارسێك پێی بڵێت ئەهسەنت ئاغا، و تورکێشیش بڵێت: عەفەرام ئۆغلم! لە خوارەوە لینکی ئەو وتارە نوییەی ئەو تورکچیە دادەنێم لەگەڵ وتارەکەی من لەسەر ئەو، هیوادارم ئەوەی عەرەبی دەزانێ بیخوێنێتەوە بزانێ عەلی قەرەداغی لەچاو ئەو شێخ سەعیدی پیران نییە!:

http://www.skurd.net/.../2014-07-26-.../4037-2016-02-20-06-48-17

وتارەکەی من کە دوو بەشە: یەکەم

http://archive.penusakan.com/.../31806-2015-11-14-19-15-25.ht...

دووەم:

http://milletpress.com/Detail.aspx...

## کاك سەلام ناوخۆش، ئەگەر بەڵگە لەسەر مەلای خەتێ نییە

# خۆ نوسینەکانی عوسمان عەلی لەبەر دەستە

بەشی یەکەم

خۆزگە خۆت نەدەهاوێشتە ئەو گێژەلۆکەیەی مەلای خەتێ و ئەو شانامەیە دوور ودرێژەی پێویست نەدەکرد، چونکە بەر لە بڵاوکردنەوەی وتارەکەی کاك ئیبراهیم بۆ منی نارد بۆ پێداچوونەوەی، هەر خۆی لە کۆتایی وتارەکەی [من ملا الخطي الی عثمان علي التاریخ یعید نفسە] نووسیبووی کە ئەو باوەڕی بەوە نییە مەلای خەتێ خیانەتی کردبێت، بەڵام لە نێوەندی فەرهەنگی کوردی وا باوە کە ناوی مەلای خەتێ وەک سیمبۆلیك بۆ خیانەت بەکار هاتووە، بۆیە بەکاری دەهێنم... سەیر لەوەدایە تۆ و کەسانیتریش هاتوون لەو وتارە بەس ناونیشانەکەی دەبینن، بێ ئەوەی بچیتە ناو ناوەرۆکەکەی ببینیت عوسمان عەلی چۆن خۆی هەرزان فرۆش کردوە و چۆن ڕێ وشوێن بۆ تورک وئەردۆگان دادەنێت بۆ زیاتر لێدانی کورد و ناوزڕاندنی کورد و تاوانبارکردنیان بە تیرۆریزم.

ئینجا ئەگەر کاك ئیبراهیم موەفەق نەبوو بێت لە هەڵبژاردنی عینوانی مەقالەکەی، ئەوە عینوانی مەقالەکەی تۆ: [لە سەروەری مەلای خەتێ وە بۆ سەروەری دکتۆر عوسمان عەلی] نەك هەر هەڵەیە بەڵکو خیانەتە لە کورد و لە بابەتخوازی و لایەنگیریکردنێکی ڕووتە بۆ ئیسلامیزمیەکەت. نمونە زۆرە بۆ نمونە تۆ هیلاك بویت هێندەی بەرگری لە زەواجی عائیشە بە پێغەمبەر بکەیت وبڵێیت لە ٩ساڵی نەبوو، بەڵکو لە ١٨ ساڵی بوو، توێژینەیەکی درێژت وەرگێڕا لەو بارەوە، بەڵام جارێ تۆ و نوسەری ئەو توێژینەوە لەلایەن ئەوانەی ئەهلی سونە و حەدیسن تەحریفچی و چەواشەکار حسێبن، چونکە بەڵگەی حەدیسی بوخاری وموسلیم بە درۆ دەخەنەوە، دووەم دەیانی وەک تۆش بابەتی وای نوسیوە، کەچی هێشتا هەر زانایەکی ئیسلامی دەوی بکاتەوە بڵێت راست نیە عائیشە لە ٩ ساڵان زەواجی کردبیت لەگەڵ پێغەمبەر ئەوە سەدان زانا دەمکوتی دەکەن! کەوابوو توێژینەوەکەی کە وەرت گێڕاوە لەوانەیە هەر دڵی خۆت و دوو سێ منداڵە ئیسلامی خۆش کات و هیچیتر، ئێستاش ئومەتی ئیسلامی لەسەر ئەو قەناعەتەیە کە عائیشە لە ٩ ساڵی دراوەتە دەستی پێغەمبەر، و ڕۆژانە زیاتر لە ٣٠٠٠٠ سی هەزار کچی منداڵ باجی ئەو نامرۆییە دەدات!

باوەڕ ناکەم نە بە قەد من عوسمان عەلیت ناسیبێت، و نە بە قەد من وتوویژت لەگەڵ کردبێت، ڤایرۆسێك هەیە لە ئیسلامیان دەدات، هیوادارم هێستا لە تۆی نەدابێت، کە بە درێژایی کات دەیانکاتە دژی کورد، بە بیانووی ئایدیۆلۆژی ئیسلامی، لەوەتی ئەو پیاوە هەیە من سەرنجی ئەوەم لێیداوە، ئامادەبوو کار بۆ ڕژێمی سەدام و جمهوری ئیسلامی ئێران و ئێستاش لەوەتی ئەردۆگان لەسەر حوکمە

کاری بۆ دەکات، بە ڕوحیەتیکی کۆیلەی زەلیلی خۆفرۆش، کە دەیانجار رەخنەم لێگرتووە ڕوو بەڕوو کە ئەو کارە عەیبە لە دژی میللەتی خۆت!

نەك هەر هێندە جارێك بابەتێکی نوسیبوو لەسەر کەرکوك، کە خۆشی گوایە کەرکوکیە، تیایدا پێناسنامەی کەرکوکی خستبوە ژێر پرسیارەوە، و حەرفیەن نوسیبووی، کەرکوك ناتوانیت بڵێی شارێکی کوردیە یان تورکمانیە یان عەرەبی! هەتا کە من ئەو برگەیەم لادا پێش بڵاوکردنەوەی لە ئاڵای ئیسلام، زۆر لە من توڕە بوو، منیش گووتم توڕە بیت یان نا، من ناهێڵم شتی وا بڵاوبێتەوە لە ژێر دەستبەکاری مندا وەك سەرنووسەری گۆڤارەکە. دوایی بە هەمان عیبارەتە لادراوەکاندا بۆ عێراقیە عەرەبەکانی ناردبوو لە چەندین گۆڤار و شوێن بڵاویکردبوەوە کە کەرکوک کوردی نییە.

کاتی خۆی نامەیەکی بۆ ئەردۆگان و گوڵ نوسیبوو، بەس بڵاوی کەمەوە، باوەڕت بێت دەبێت وەك شەیتانی حەج پەیکەرێکی بۆ بکەن و ئەوەی کورد بێت بەردی تێبگرن! جارێ نامەکە لەبەر دەستم نییە کە دۆزیمەوە بۆتی دەنێرم، ئەو کاتە دەزانیت ئەو سەروەرییەی بەو پیاوەت داوە تاوانێکی گەورەیە، چونکە تۆ بە یەک وشە ئیدانەی ئەو وتارەت نەکردوە کە تیایدا عوسمان عەلی بە ڕونترین شێوە خۆفرۆشی بۆ ئەردۆگان دەکات.

## گرێی مەلای خەتێ

ئینجا با بێینە سەر گرێ کۆرەی مەلای خەتێ، نازانم جەنابت و هەموو ئیسلامیەکان بۆ هێندە سەخڵەت دەبن بە ناوهێنانی مەلای خەتێ! بێگومان ناهەقتان نییە چونکە ئەو پیاوە لە مێژوودا تۆمەتی خیانەتکردنی لە میری سۆران دراوەتە پاڵ، دیارە خیانەتیش لای ئێوەی ئیسلامی دەبێت زۆر گەورە بێت! ئەوە بەهایەکی جوانە کە بەو ڕوانگەیە بروانن بۆ خیانەت، بە مەرجێك لە حاڵی ئێستادا مەناعەتتان دژی خیانەتکردن نەگەیشتبێتە چڵە پۆپەی! بەڕای تۆ وەك نووسەرێکی ئیسلامی، شارەزا لە مێژوو خیانەت چییە؟

خیانەت چیە لەوەی زیاتر حەز بە دۆڕاندنی میللەتەکەت بکەیت لە پێناو سۆزانی سیفەتێکی تورکی وەك ئەردۆگان؟!

خیانەت چیە لەوەی زیاتر ئەردۆگان بە فریشتە ببینیت، و چاو لە هەموو ڕاپۆرت و وتارەکانی هەتا بە دەستی تورکیش نوسراو بپۆشیت کە ئاماژە بۆ شەڕانگێزی ئەردۆگان دەکەن، لە جیاتی بێیت هەدەپە تاوانبار کەیت و گاڵتە بە دەمیرتاش بکەیت؟!

تۆ کە بە تەوسەوە بە دەمیرتاش دەڵێیت ئۆبامای کوردی، زۆربەی کورد وەك خۆت دەڵێیت متمانەیان بەو پیاوە داوە، و کوردەکانی هەرچوار پارچەی کوردستانیش خۆشیان دەوێت، ئەوە دژایەتی کورد نییە لەبەرئەوەی ئیسلامی نییە گاڵتەی پی بکەیت؟!

لەوەی زیاتر چییە فریو خواردوو بیت بە دوژمنێکی کورد وەك ئەردۆگان، فریو بخۆیت بە ئیسلامەتی ئەو دژی هەموو میللەتەکەت بیت چونکە بەڕای تۆ حزبێکی نا ئیسلامی چەپرەو خەباتی کورد بەڕێوە

دەبات؟!

هەرچەندە هەدەپ لە لیبڕالیزمەوە نزیکترە تا لە چەپرەوی، بەڵام گریمان چەپڕەویش بوون، خۆ چەپڕەو بیت و ڕاستگۆ بیت دوور بیت لە ئەندێشەی ئیسلامی سیاسی داعشی، سەدان قات چاکترە لەوەی فریو بخۆیت بە ئیسلامەتیە سۆزانیەکەی ئەردۆگان؟!

خیانەت چیە لەوەی زیاتر تا ئەو ساتەش بەرگری لە پەرێزی پیسی ئەردۆگان بکەیت، کەچی دوو دێرە وتارێك نەنووسیت لەسەر ئەو هەموو دایك و خوشك و برا و منداڵانەمان کە بەدەستی ئەو ئیسلامیە سۆزانیە دەکوژرێن؟!

تۆش بە هەمان لۆژیکی دکتۆر عوسمان لە وتاری **The possible outcomes of the elections and their effects on Kurds**

کە بۆ تورکەکانی نوسیبوو، دەتەوێ چاکە وفەزڵی ئەردۆگان بە چاوی کورد دادەیەوە و دەڵێیت:

"من نامەوێ ناوەڕۆکی هیچ یەکێک لەو کتابانە باس بکەم ، تەنیا ئەوەندە نەبێت دەمەوێ پرسیارێک لە تاکی کوردی دەرەوەی هەژموونی حیزبی کوردی بکەم : ئایا لە ١٩٢١ەوە هەتا ٢٠٠١ هیچ حیزبێکی عەلمانی لە تورکیا دەرگای لە شوناسی کورد کردەوە؟؟ ئەوەی عەدنان مەندەریس و جەلال بەیار لە پەنجاکان کردیان بە ئینقلابێکی جەندرمە و جەمال وەڵامدرایەوە و گیانی سەدان کەسی وەک عەدنان مەندەریس لە تورک و کورد...هەڵوشی! لەو هەشتا ساڵە شوناسی کوردی ، زمانی کوردی ، دۆزی کوردی ، ئاڵای کورد تەواو قەدەغە و بقە بوو، چونکە بەپێی دەستووری ئینقلابچیەکانی تورکیا یەک نەتەوە و زمان و ئاڵا هەبوو. "

منیش هەمان وەڵام بۆ تۆ دەنوسم:

[جاری وەهمێك هەیە لای ئیسلامیەکانی کورد بە گشتی کەوا ئەردۆگان پرۆسەی ئاشتی دەست پیکردوە لەگەل کورد! لە ڕاستیدا تورگوت ئۆزال ١٩٢٧ -١٩٩٣یەکەم سەرۆکی تورکیا بوو، لە حزبی نیشتیمانی دایك [ئەنا پارتی] کە سیاسەتی کرانەوەی کوردی دەست پیکرد لە نەوەدەکان، لە پاش یەکەم دانیشتن لەگەڵ پ ك ك، بڕیاری ئاگربەستی پ ك ك دەرچوو ١٩٩٣/٣/٢٠، ئۆزال کە نیوەی کورد بوو، تا سەر ئێسقان حەزی بە چارەسەری ئەو کیشەیە دەکرد و هەوڵی زۆریشی بۆدا، و مرۆڤێکی تا بڵێی دیموکراتی هەقیقی بوو، بە هانای کوردیش هات لە کۆڕەوە گەورەکە، هێندەی نەبرد لە بارودۆخێکی تەم ومژاویدا گیانی لە دەستدا، زۆربە سیاسەتوان و بیرمەندان و نووسەران کۆکن لەسەر ئەوەی کە ئەو پیاوە بە دەستی ناحەزانی ئاشتی کوژرا من گومانم نییە ئەگەر تەمەن بواری تورگوت ئۆزالی دابایە، دەمێك بوو کیشەی کورد چارەسەر کرابوو، خەڵکی تورکیش ناچار نەدەبوون متمانەی خۆیان بدەنە دەست ئەردۆگانێک کە تەنها یاری بە کات دەکات و هێزەکانی کۆمەڵگای تورکیا یەك بە دوای یەك سەرکووت دەکات بە نەزعەیەکی ئیسلامی پەنهانی و لە ژێر پەردەیەکی تەنکی دیموکراسیدا، کە هەموو عەورەتی دیکتاتۆریانەی لێوە دیارە.

ئەردۆگان بیرۆکەی ئۆزالی برد، بەڵام لە ناوەرۆکی خۆی بەتاڵیکردەوە، ئەردۆگان کارتی کوردی بەکارهێنا

دژی سوپا و دادگای باڵای دەستوری تا توانی ئەوان کۆنترۆڵ بکات، بەڵام کە ئەوانی لە پەل و پۆ خست، بایدایەوە سەر کورد ولێیدان، ئێستا دەستی لەگەڵ تاریکپەرسترین هێزی جیهان کە داعشە تێکەڵ کردوە لە پێناولێدانی کورد لە سوریا و تورکیا! ئەو پیاوە دەساڵ زیاترە مێشکی کاس کردووین بە باسی چارەسەری کێشەی کورد، کەچی یەك هەنگاویش نە چۆتە پێش، بەڵکو گەڕانەوەیەکی خێرا هەیە بەرەو خاڵی سفر! کێ فریو دەخوات بە پرۆژەی چەواشەکارانەی ئەردۆگان جگە لە فریوخواردوە خۆبەخشەکان نەبێت؟.!

# کاک سەلام ناوخۆش، ئەگەر بەڵگە لەسەر مەلای خەتێ نییە

# خۆ نوسینەکانی عوسمان عەلی لەبەر دەستە

بەشی دووەم و کۆتایی

تۆ و بەر لە تۆش دکتۆر عوسمان هەمان قسەی کرد لە تاوانبارکردنی هەدەپ لە وتارە ئینگلیزیەکەی کە بۆ میدیای تورکی نووسیبوو ودەڵێت: " ئیجماع هەیە لەناو کورددا کە هەدەپە ئەو دەسەڵاتەی کە دەنگدەرانی کورد پێیان دا بەکاری نەهێنا بۆ بەرژەوەندی کورد. دەبوایە هەدەب ئەو هەلەی بقۆزتایەوە بۆ نیشاندانی لایەنی مەدەنی و دیموکراتی خەباتی کوردی بۆ تورک و بۆ هێزە خۆرئاواییەکان، هەروەها پەکەکەش، لەجیاتی پەنابردنەوە بەر توندوتیژی و کۆتایی هێنان بە پرۆسەی ئاشتی"
سبحان الله قسەکانتان چەند بەیەك دەچێت کە تۆش دەڵێیت:
"زۆربەی کوردی باکوور هەموو لە چواردەورەی هەدەپە کۆبوونەتەوە،ئەوانیش زۆربە ئۆجەلان بە ڕێبەری خۆیان دەزانن ، ئۆجەلانیش لە شوباتی ١٩٩٩ دیلە لای تورکەکان ، کەواتە دەبوو پرسی هەبوونی کورد و بەردانی ئۆجەلان لە کارە بەراییەکانی هەدەب بوایە , دەمیرتاشی ئۆبامای کوردانی چەپ دەبوو دوای بردنەوەی لە هەڵبژاردن کاری لە سەر شوناسی کورد و گۆڕینی دەستووری تورکی ...بکردبایە ، بەڵام ئەو ئۆمابایە یەکسەر دوای ڕاگەیاندنی ئەنجامی حوزەیرانی ٢٠١٥ بە زەبر و دیماگۆژی ئەمریکا وتی :" هەدەپ حکومەت لەگەڵ ئاکپارتی پێکناهێنێت"!!!!
جارێ نازانم دکتۆر عوسمان ئەو ئیجماعەی لە کوێ هێناوە کە کورد هەمووی وا سەرکۆنەی هەدەپ دەکەن، ئینجا کە دەڵێم بە ڕوحیەتێکی تورکتر لە تورک ئەو وتارەکانی دەنوسێت بۆ رازیکردنی دەسەڵاتی ئاك پارتی و تێرکردنی غروری ئەردۆگان و تورکی فاشیست، هێشتا کەمم گووتوە. چونکە هەدەپ کە ڕووی دیموکراتی و نزیکی لە لیبڕالیەت نیشان دەدات، هەر ئیسلامیەکانی تورك وکورد دەهۆڵی پشتگیری لە هاوڕەگەزبازی بۆ لێدەدەن، لە کاتێکدا ئەردۆگان بە واقیعی دانی بە مافەکانی هاوڕەگەزبازان دا هێناوە !کەباسی پەنابردنەوە بەر توندوتیژی پەکەکە و کۆتایی هێنان بە پرۆسەی ئاشتی دەکەیت، ئەوە کەس هەیە نەزانێت کە ئەردۆگان لە دەیەها وتاریدا ناوی پ ک ک ەی بە تیرۆرست هێنا و پرۆسەی فریودەری ئاشتی تێکدا! لە کۆبانی توندوتیژی بەکارهێنا ویارمەتی داعشی دەدا بە سنوور بۆ کردنەوە و بە چەك، هەتا ئەو ساتەش هەروا دەکات بۆردومانی عەفرین و ناوچەکانیتر دەکات، پێری سەدان سەگوسواری ئیسلامی داعشی ناردە سەر گرێ سپی، بەوەش نەوەستا هەستا بە ئەنجامدانی زنجیرەیەك تەقاندنەوە لەناو لایەنگارانی هەدەپە لە پرسوس و ئەنقەرە و ئامەد و شوێنیتریش، هەر سەرۆك وەزیران داود ئۆغلۆش دانی بەوەدا هێنا کە خۆکوژەکانیش دەناسن بەڵام

ناتوانن بیانگرن چونکە زۆر دیموکراتین! بەڵام هەزاران پیرو گەنجی کورد بکوژن و هەزاران لایەنگر و چالاکوانی هەدەب بگرن کێشەیەك نییە بۆ دیموکراتی، و کەمپینی هەڵبژاردن سوور کەن لە خوێنی لایەنگرانی هەدەپە کێشەیەک نییە بۆ دیموکراتی! کەچی تۆ و دکتۆر عوسمان باسی دژایەتی هەدەپ بۆ ئاشتی دەکەن؟! ئەو ساویلکەییە لە تۆ نەدەوەشایەوە، بەس ئاخ ئایدیۆلۆژیا مرۆڤ چۆن هەڵگێڕ و وەرگێڕ دەکات!

ئینجا پێمخۆشە وەڵامی نوسەرێکی تورکت نیشان بدەم کە شایەدی دەدات ئەردۆگان هۆکاری وەستاندنی پرۆسەی ئاشتیە و مرۆڤێکی دیکتاتۆرە وەك ئێستا ناویان ناوە بە قەزافی تورکیا لە نێوەندی میدیایی جیهانی! نوسەری وتاری Turkey Is in Serious Trouble ، نوسەر Soner Cagaptay دەڵێت:

"لە گەرمەی یاخیبوونی پەکەکە دا لە ١٩٩٠ دەکان، چومە ڕێورەسمی ناشتنی چەند ئەندامێکی خێزانی ئۆفیسەرێکی ئاسایش کوژرابوون لە شەڕی پ ك ك، خێزانەکە ستایشی ڕۆڵی حوکمەتیان دەکرد لە بەرەنگاربوونەوەی یاخیەکان، و سوپاسی حکومەتیان دەکرد لە ستایشی ڕۆڵی خۆشەویستانیان. لە تەموزەوە ٧٠ پۆلیس و سەربازی تورك کوژراون لەلایەن پ ك ك وە، بەڵام لە زۆربەی حالەتدا ئەو جەنازانە گۆراون بۆ دژایەتی ئاك پارتی و خۆپیشاندان دژی ئەردۆگان. " لێرەدا دەردەکەوێت هەتا تورکەکانیش ئەردۆگان بە موسەبیبی ئەو ئاشتی تێکچوونە دەزانن!

لە بەشێکی تری وتارەکەدا باسی ستراتیژیەتی فریودەرانەی ئەردۆگان دەدا بۆ لێدانی بە نۆرەی هێزەکانی تورکیا و لیدانی کوردیش لەوەوە دێت کە نۆرەی هاتووە لێیبدرێت:

"سەرچاوەی جەمسەرگیری کێشمە کێش هەر ئەردۆگان خۆیەتی. ئەردۆگان زنجیرەیەک هەڵبژاردنی بردۆتەوە لە ساڵی ٢٠٠٢ هوە، و عیبادەتی شەخسی بنیات ناوە، وەك جۆرێك لە دەسەڵاتداری ستەملێکراو، خۆی وەک قوربانیەك وێنا دەکات کە ناچار بووە بە توندی لەو [پیلانگێڕانە بدات] کە دژایەتی دەسەڵاتی ئەو دەکەن. لەسەر ئەو بنچینەیە توانی بە سەرکەوتوویی و دڕندایەتیەکی سیاسی سوپای سێکیولاری تورک، و بیزنس و لیبڕاڵەکان و جووەکان و دەنگدەرە چەپڕەوەکان و عەلەویەکانیش بکاتە ئامانج، و ئێستاش کورد!

ئاسایە بۆ تورکیك ئەو هەموو خیانەت و دژایەتیەی ئەردۆگان بۆ کورد نەبینێت، بەڵام بەخوای بۆ کوردێکی دکتۆر لە مێژووی کورد و بۆ تۆی شارەزا ونووسەر لە مێژووی کورددا زۆر نەنگییە و ئەوپەڕی بێ ئاگایی و بێ ویژدانییە تۆمەتباری قوربانی بکەن و ستایشی جەلاد بکەن!

سەیرم بەوەش دێت کە دەڵێیت: "هیچ کەسێک چاوەڕێ ناکات ئەردۆگان وەک کوردێک و موسلمانێکی عەقیدەیی بیربکاتەوە. ئەو ئیسلامیەی ئەو بانگەشەی بۆ دەکات ئیسلامیەکەی مێژووییە ، نەک عەقیدەیی، بەڵام هەر ئەو حیزبەکەی بوو چۆکی بە عەلمانیەتی عەسکەری تورکیا دادا . ئەو دەرگاکردنەوەی ئەردۆگان لە کورد دەبوو حیزبی کوردی باکوور تەواو پاڵپشتی بکردبایە ، چونکە ٨٠ ساڵە کورد لە شوناس و مافی دەستوری و سەرکردەکەی دوورە، بەداخەوە باڵەکانی پەکەکە لە باکوور و ڕۆژئاوا خەریکی دروستکردنی قەڵەمڕەوی ئایدیۆلۆژی ئیکسپایەر بوو . ئەو ئەمریکا و رووسیایەی هەردەم خەون

بە لەناوبردنی " ئیسلامی کەمانجەژەن"یشە ، جا باڵەکانی پەکەکە لە باکوور و رۆژئاوا بوونەتە ئامێرێک بە دەست دژەکانی ئەردۆگان!!"

جارێ ئەگەر ئیسلامی مێژوویی ئیسلامی ئەردۆگانە، ئەدی بۆ ئیسلامی ئایدیۆلۆژی وەک ئێوە و دکتۆر عوسمان و قەرەداغی و قەرەزاوی و هەموو جیهادی و ئیخوانی دنیا هێندە پەرۆشی ئەردۆگانن؟! لەوەش نەتپێکاوە چونکە ئەردۆگان بە فێڵ ئەو ڕووە ئیسلامیە مێژووییە نیشان دەدات، دەنا تا سەرئێسقان ئیسلامی و ئیخوانییە، خەریکە تورکیا لە وڵاتێکی سێکیولار دەکاتە سەڵتەنەتی نیو عوسمانی، بۆتە قیبلەی ئیسلامی و داعشیەکان! ئەو چۆک بە عەسکەر دادانەشی هەر لە فێڵەوە بۆی چوە سەر، چونکە بەناوی دیموکراتیەت وباوەڕ بە سێکیولاریزم هاتە ناو گەمەی سیاسی، و بە نۆرە هەموو هێزە سێکیولاریەکان و دام ودەزگاکانی دەستبەسەر کرد تا گەیشت بە کورد! ئینجا دەرگای چی لە کورد کردەوە؟!

زەلامێك بەو هەموو ماوەیە نەتوانێت هەنگاوێك بهاوێژێت بۆ چارەسەری کێشەی کورد سەرەڕای پاڵپشتی پ ک ک بە ڕاگرتنی هەموو چالاکیەکی و سەرەڕای پاڵپشتی دەنگدەری کورد بە ملیۆنەها بۆ ئەو مونافیقە، دەتەوێ تاکەی کورد خۆی فریودات بە پاڵپشتیکردنی؟! ئەردۆگانێك سەدان ڕێکەوتنی سەربازی و ئابووری هەیە لەگەڵ ئیسرائیل و گەورەترین هاوپەیمانی ناتۆ و ئەمریکا، هێشتا تۆ دەڵێیت: "جا باڵەکانی پەکەکە لە باکوور و رۆژئاوا بوونەتە ئامێرێک بە دەست دژەکانی ئەردۆگان!!" کورد لە ڕۆژئاوا بەرگری لە وجودی خۆی دەکات، ئەردۆگان هێزەکی دەرەکییە شەڕیان پێ دەفرۆشێت ودەیەوێت داعش ونوسرە ناوچە کوردیەکان داگیرکەن، کەوابوو کوا عەقڵ و لۆژیک لەو تەرحە؟!

پێکەنینم بەو قسانە هات: "هەندێ قەڵەمدار نایانەوێ ئێمەی کورد بەرەو داهاتوو هەنگاو بنێین ، بەڵکو هەر بەرەو پاشەوە بگەڕێینەوە ناهەقیان نییە ئەوان تەڵقیندراون ، نەک ئاکتیڤ ، ئەگینا لە نێو کورددا کەم مێژوونووسی وەک دکتۆر عوسمان هەن ...ئاخر دکتۆر عوسمان چ بکا پەیەدە قەبووڵی سوپای بەشار لە قامیشلۆ بکات ، بەڵام قەبووڵی هێزێکی کوردی نەکات ! من دژی پەیوەندی پەیەدە و بەشار نیم ، چونکە موعارەزەی سوری لە بەشار شەریفتر نین ، ئەوانیش باوەڕیان بە مافی کورد لە سوریا نییە!"

پێمناڵێیت کێ داوای چونە پاسەوەی کردوە، ئەوەی دەیەوێت کورد تەسلیمی ئەردۆگانی ئیسلامی داعشی بێت کە هیچ ئاسۆیەکی لە ئاییندەشدا لێ چاوەڕێ ناکرێت، هەموو جیهان لێی پەستە چونکە عەڕابی داعیشە، یان ئەوانەی پشتگیری خەباتی کورد دەکەن بۆ سەربەخۆیی؟! ستایشی عوسمان عەلی دەکەیت وەک مێژوو نووسێك، ئەوە هیچ نرخێکی زانستی نییە، چونکە تۆ بە پاڵنەری ئیسلامی عەقیدەیی ئەو قسە دەکەیت، و لە بواری مێژووشدا خولیاکاریت زیاتر لەوەی پرۆفێشناڵ بیت! لەبەرنەبوونی ڕەخنەی جیدی و ڕەخنە بەگشتی کەسانیك لیمان دەبنە ئەو لوتکەیە. دەبا دوو سێ تایبەتکار لە مێژوو هەبا بە چاوێکی ڕەخنەیی نوسینەکانی هەڵبژاردبا بزانە دەتوانی وا ستایشی بکەیت! خەڵک هەیە پازدە بیست کتێبی لە بازاڕە هێشتا ڕەخنەگرێك نییە دووانیانی بۆ هەڵسەنگێنێت!

سەیرە هەمان قسەی پارتی و پرۆکسی ئەردۆگان، عوسمان عەلی دوبارە دەکەیتەوە: " ئاخر دکتۆر عوسمان چ بکا پەیەدە قەبووڵی سوپای بەشار لە قامیشلۆ بکات ، بەڵام قەبووڵی هێزێکی کوردی نەکات !" پەیەدە هەر دوێنێ گەورەترین پێکدادانی کرد لەگەڵ سوپای ئەسەد، ئەمریکا بەدەمی خۆی شایەدی دووری پەیەدەی دا لە بوونی هیچ پەیوەندیەك لەگەڵ بەشار ئەسەد، هەرچەندە من ئێستا دەڵێم بەشار ئەسەد لە داعش ونوسرە و جیش الحر و جیش الاسلام وباقی پۆخڵەواتەکانیتر باشترە. پەیەدە کام هێزی کوردی قبوڵ نەکردوە؟! ئەوەی پارتی بە ئیعازی ئەردۆگان دروستی کردوون؟! دەك دەستیان خۆس بێت کە ناهێڵن هێزێکی سەگوسواری ئەردۆگان هەبن لەو مەیدانەدا.

ئێوە تا سەر ئیسقان بەرگری لە پەرێز پاکی مەلای خەتێ دەکەن، بەڵام بەخوا مەلای خەتێ ئەو تاوانەشی کردبا هێشتا ناگاتە بە تاوانی کەسانێکی شارەزا بە مێژووی تورک و کورد، کە لەوەتی هەن تورك ستەم لە کورد دەکات، کەچی هێشتا لەبەر ئیسلامەتیەکی ڕووکەشی ساختەچیانە پشتی برایانی میللەتی خۆیان دەدەن لە عەرز و پشتی سۆزانیە سیاسیەکانی وەک ئەردۆگان و داود ئۆغلۆ دەگرن! ئێوە نکولی لە خیانەتێکی تەنها دەکەن بۆ مەلای خەتێ، کەچی پێتان ئاساییە ڕۆژانە خیانەتێکی وەك ئەو بکەن.

لە کۆتاییدا دەڵێم لە بیرمە زۆر سەرسام بووم بە کوردپەروەری تۆ، پێش ئەوەی تووشی پەتای ئیسلامی سیاسی بیت، قەت باوەڕم نەدەکرد ڕۆژێك بگەیت بەو ئاستە پەسندی ئەردۆگان بدەیت بەسەر بە شەرەفترین و ئازاترین کوردا، بەڵام کە ڕۆژێك ئەگەر بەبیرت بێت پێت گووتم من زۆرم پێ خۆش بوو ئۆجەلان گیرا و ریسوا بوو، هەستم کرد پەتایەکە لە تۆشی داوە، هیوادارم بە خۆت دابچیتەوە دوای کەسانێك مەکەوە لەسەد ئاوی خیانەتیانداوە تا ئێستا بێ ئەوەی تەڕ ببن!

https://www.facebook.com/salam.bakir/posts/1256413524388688?comment_id=1257040767659297&notif_t=feed_comment_reply

# سەرنجێك بۆ كاك سەلام ناوخۆش بە ڕوحیەتێكی دنیاگەرایی

كاك سەلام دەتوانی ئەنجامی دەستێوەردانی دین لە سیاسەت و كارەساتەكانی ببینیت لەهەر شوێنێك كە ڕویداوە، و نمونەش زۆرەلە سعودیە وە بۆ تاڵیبان و بۆ سودان وسۆماڵ و بۆ داعش. تۆ باسی كەسانێك و حزبانێك دەكەیت كە بەس ناویان سێكیولار ودیموكراسیەتە دەنا فریان بەسەر ئەو دوو چەمكە نیە، ئەوەی من زانیبێتم تۆ هەردەم دوور بوویت لە حزبایەتی ئیسلامی كەچی لەو نوسینە بەرگری سەرسەخت دەكەیت لە ئیسلامی سیاسی و نوێنەرەكانی. ئەو سەردەمەی كە لێی دەژین هیچیتر تەحەمولی حوكمێكی دینی ناكات، جا ئیسلامی بێت یان مەسیحی. حوكمی ئیسلامی یانی جێبەجێكردنی هەموو سزا توند و خوێناویەكان لە بەردباران كردن تا مردن و مل پەڕاندن و دەست وقاچ قرتاندن و تێهەڵدان لە بینایەتی بەرز. حوكمی ئیسلامی یانی بەزۆر ڕیشداركردنی پیاوان و سەرپۆش خستنە سەری ئافرەتان. یانی جیاوازی كردن لە نێوان كوردی موسڵمان و كوردی یەزیدی وكاكەیی وشەبەك یان مەسیحیەك و جولەكەیەك وزەردەشتیەكی كوردستان.
ئەو عەدالەت و ئاسایشەی كە عەلمانیەتی دیموكراتی هەقیقی دروستی كردوە، بە هیچ دین و بەرنامەیەك دروست نابێت، مەگەر خۆمان لە ترسی هەڕەشەی دین وابڵێین نەوەك ئیمانمان بڕوشێ. چونكە تەنها لە ڕژێمێكی سێكیولاری دیموكراسی كەرامەتی هەموو دینێك وبێ دینێك پارێزراوە، و دەوڵەت لە خزمەتی هەمووانە. هیچ دینێك ناتوانیت بە چاوێكی یەكسان بڕوانێتە دینداریكی خۆی و دینداریكی دینێكی تر، ئەوە باسی مولحید هەر ناكەین. ئەو سوێدەی كە باسی دەكەیت سەرەڕای ئەوەی زۆربەی خەڵك هەر باوەڕی بە دین نیە، خۆشگوزەرانترین و دڵخۆشترین و پڕ ئاسایشترین و كەمترین ڕێژەی تاوانی تێدا ئەنجام دەدرێت.
تۆش وەك ئەو دەروێشە قیامەتگەراییە دەتەوێت لە ترسی ئاخیرەتت هەموو میللەتەكەت بەرەو حوكمی دینی بەرتەسك و ناشارستانی ببەیت، كۆمەڵگایەكی ڕیشن و پڕ لە مونەقەبە و شەرواڵ كورت دروست بكەیت، من گومانم نیە كە هەر حوكمێكی دینی هەرچەندە ئیدیعای میانڕەویشی كرد چارەنووسی بەرەو داعشیەت دەڕوا زوو یا درەنگ. لە سایەی ئیخوان لە میسر نیوەی پەرلەمان كەوتە ژێر دەستی سەلەفیە داعشیەكان. خوا دەزانێت ئەگەر مابان تا ئێستا یەكێتیەكی ئیسلامیان لەگەل دەوڵەتی داعش دروست دەكرد وەك وەحدەكەی جمال عبدالناصر لەگەل سوریا! هێشتا قیامەتگەراییەكەی كاكی دەروێش باشترە چونكە هەر نەبێت هەڵوێستێكی فەردیە و ناڵێت دەبێت ئیلا كۆمەڵگا وەك من ببنە دەروێش تا خوا لێم ڕازی بێت! بەڵام ئەو ئیسلامە سیاسیەی تۆ پەسندیان دەكەیت بەسەر دەروێشێكی هەژار و بێ دەخل، دەیانەوێت هەموو كۆمەڵگا بفڕێنن و بەزۆر پرۆژە و بەرنامەی دینی سیاسی خۆیانیان بەسەر بسەپێنن، كامەیان ترسناكترە؟! دەبوایە خەباتی كەسێكی وەك تۆ بە ئاڕاستەی مەدەنیەت و دیموكراسیەت با نەك لەبەر ترسی ئاخیرەتت بتەوێ تەرویج بكەیت بۆ پرۆژەی ئیسلامی سیاسی كە تەنها پەرتەوازەیی و دواكەوتوویی و ماڵوێرانی لێ دەكەوێتەوە.

# ناسری سوبحانی و بەکافر کردنی هەندێ لەبەر هەندێ گوناهـکردن!

ناسـری سـوبحانی ناوێکـە لەنـاو دیندارانـی کـوردی ماوەیەکـە بایەخـی پـێ دەدرێت، ڕاسـتیەکەم منیش جاروبـار هەنـدێ لـە بیروڕاکانـی دەخوێنـەوە، هەندێـک بیـروری بـاش وجوانـی هەیـە، هەرچەنـدە ئـەوەی ئـاگاداری ئەدەبیاتـی دینـی عەرەبـی نەبیـت لەوانەیـە بلیـت راگەلیکـی نوێـن، بـەلام لـە ڕاسـتیدا، زۆر لـەو رایانـەی کـە بـە نـوێ خەلـک و سەرسـامانی باسـی دەکـەن، پێشـتر باسـکراوە ، لەنێـو ئـەو ئارگیومەنتـە مێژوویانـەی نیـوان فیرقـە ومەزهەبـەکان، یانیـش لەلایـەن نووسـەرانی هاوچەرخدا! ئـەوە مانـای ئـەوە نیـە هیجـی نویـی نەبیـت تـا بیلێـت، بیگومـان هەیەتـی، کەسـێک هەمـوو تەمـەن و ژیانـی خویندنـەوە و وردبوونـەوە بیـت لـە زانسـتە دینیـەکان و قورئـان بیگومـان رای نویشـی دەبیـت. بـەڵام کاتـی خـۆی پیاوچاکان قسـەیەکی خۆشـیان دەکـرد و دەیانگـووت: پیـم خۆشـە کلکـی هـەق بـم، نـەک سـەری ناهـەق! خۆزگـە ئیمـەی موسـلمان کاتـێ هـەر کۆشـش و ئیجتیهادێکمـان دەکـرد هـەوڵی ئەوەمـان دابـا تخفیـف و ڕەحمەتمـان بـۆ خـەڵك فراوانتـر کردبـا، نـەك ئـەوەی بـە مێشـکی هـەرە توندڕەوانـی مێـژووی ئـەو ئومەتـە دانەچـووە، تـۆ داهێنانـی تێـدا بکەیـت، وزیاتـر لـە خەڵکـی قورسـتر و بـە قەسـوەتتری بکەیـت، بـە تایبەتـی ئەگـەر ئـەو قورسـتر کردنـە سـەربکێشێت بـۆ تەکفیرکردنـی خـەڵك!

بـەو لیکدانەوەیـەی ناسـری سـوبحانی بـۆ دوو ئایەتـی ١٧ - ١٨ سـورەتی النسـاءی کـردووە، بێگومـان دەرگای تەکفیـر زیاتـر دەکاتـەوە، چونکـە ئەگـەر لـە سـەرتاسـەری مێـژووی ئیسـلام کەسـیک نەیگووتبێـت مـرۆڤ بـە هەنـدێ گوناهــ کـردن کافـر دەبێـت.... (مامۆسـتا سـوبحانی لـە جیاتـی ئـەوەی تـا دوورکەوێتـەوە لـە فیکـر و بیـری تەکفیـری، دێـت ئیبـداع دەکات لـە دۆزینـەوەی چەندیـن پاسـاویتر بـۆ کافرکردنـی ئادەمیزاد! بـەڕای مـن زانایانـی بەرایـی لەبـەر جیـاوازی سـیاقی حـەزاری هـەردەم خـوا مەبەسـتیان بـووە، مـرۆڤ هیـچ بایەخێکـی ئەوتـۆی بەرنەکەوتـوە لـە لایـەن زانایانـەوە، پێویسـتە لـەو سـەردەمە پێچێك بکرێتـەوە بـەرەو جەختکردنـەوە لەسـەر فەراهەمکردنـی مافەکانـی ئادەمیـزاد و بەسـەنتەرکردنی لەنـاو پیرۆزیەکانـدا، چونکـە لـە قورئانیشـدا لـە مـرۆڤ پیرۆزتـر باسـی نەکـراوە، نـەك مـرۆڤ هینـدە ژیانـی بـێ ئـەرزش بێـت لەسـەر بچوکتریـن هـۆ بڕیـاری ڕشـتنی خوێنـی بدرێـت پـاش بـە کافرکردنـی!

ناکریـت مـرۆڤ وابـەبـێ ئەرزشـی بمێنێتـەوە لـە فیقهـی ئیسـلامیدا، تەنهـا پیـرۆزی و مافەکانـی خـوا بـە نـەزەری ئیعتیبـار بگیرێـت، هـەر بۆیـەش زانایانـی کـۆن تـا پێیـان کـراوە جەختیـان لەسـەر حق الله علی العباد کـردوە و حق العباد علی الله یـان فەرامـۆش کـردوە، هینـدە بچوکیـان کردیتـەوە بـۆ نمونـە لەسـەر نیـەت هێنانـی نوێـژ بـە دەنـگ وەک لای ابن تیمیـە، یـان خویـن حـەڵاڵ کردنـی ئـەوەی پێیوایـە زەوی خـڕە وەك ابن بـاز، یـان تەکفیرکردنـی هـەر شـارێك ئەگـەر مەزارێکـی تیـدا بێـت وەك محمـدی کـوڕی عبدالوهـاب.

بابەتیکی ناسری سوبحانی م بەرچاو کەوت لە پەیجی دۆستانی ناسری سوبحانی و موفتی زادە، کە من نازانم چی ئەو دووانە کۆدەکاتەوە؟!- کە تایبەت بوو بە تەفسیری دوو ئایەتی ١٧-١٨ سورەتی النساء : {١٧} إِنَّمَا التَّوْبَةُ عَلَى اللَّهِ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ السُّوءَ بِجَهَالَةٍ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِنْ قَرِيبٍ فَأُولَئِكَ يَتُوبُ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ( ١٧ ) خوای گەورە تەنها ئەو تەوبەو پەشیمانیە قبوڵ دەکات و ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە گوناهـ و نادروستی بەنەفامی و نەزانی ئەنجام دەدەن و پاشان بەزوویی تەوبە دەکەن و پەشیمانی دەردەبڕن، ئا ئەو جۆرە کەسانە خوا تەوبەیان لێ وەردەگرێت و هەمیشە و بەردەوام خوا زانایە و دانایە.

{١٨} وَلَيْسَتِ التَّوْبَةُ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ السَّيِّئَاتِ حَتَّى إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ قَالَ إِنِّي تُبْتُ الْآنَ وَلَا الَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمْ كُفَّارٌ أُولَئِكَ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ( ١٨ ) تەوبەو پەشیمانی بۆ ئەو کەسانە نیە کە بەردەوامن لەسەر گوناهو تاوان، ئەوکاتەی مردن یەخەی بەیەکێکیان گرت ئەوسا بڵێت: ئەوە ئیتر من بەڕاستی لە ئێستەوە تەوبەم کرد، تەوبە لەوانەش وەرناگیرێت کە بەکافری دەمرن، بۆ ئەو جۆرە تاوانبارانە هەموویان سزایەکی بەئێشمان ئامادە کردووە.

بابەتەکە بە ناونیشانی: هەندێ گوناهـ کردن" ئینسان کافر ئەکات....مامۆستا سوبحانی لەو بابەتە بەپێی ئەو کەسەی بابەتەکەی نوسیوە گوایە گەیشتوتە دەرەنجامێکی بێ وێنە وکەس بەرلەو پەی پێ نەبردوە! دەڵێت: " ئیماندار(مؤمن) " کەسێکە کە ئیمان و عەمەلی صالحی هەبێت و گوناهی گەورەی نەکردبێت، یان ئەگەر گوناهی کەبیرەی هەبوو" زوو تۆبەی کردبێت و پەشیمان بووبێتەوە... کەواتە: ئەگەر ئیماندارێک گوناهی کەبیرەی نەبوو،ئەوە هەر زووسەبەبی مەغفیرەتی گرتۆتە بەر. ئایەتی ٣١ النساء،٣٧ الشوری ،٣٢ النجم.

- موسڵمانێک گوناهێکی گەورە ئەکات، لە حاڵەتی لاوازیی ئیمان و زاڵ بوونی غەریزە بەسەریدا ،یان جەهل، یان تووڕەیی "کۆنترۆڵی خۆی لەدەست داوە،بەڵام هەر کە لەزەتی تاوانەکە ڕۆشت، یان تووڕەییەکە نەما" هەست بەخەجاڵەتی و شەرمەزاریی ئەکات و زوو تۆبە ئەکات.. ئەمە گوناهەکەی شیرک نیە، بەڵکو مەعصیەتە، لەدین دەرناچێ و گوناهەکەی ئەگەرچی کەبیرەیە"بەڵام قابیلی بەخشینە.. ئەمەیە مانای (شفاعتی لاهل الکبائر من امتی)، واتە شمولی شەفاعەتی پێغەمبەر دەکات(صلی الله علیە وسلم) مادام تۆبەی لێ کردووە"!

وەك دەبینین سوبحانی دەڵێت" ئەوەی گوناهی گەورەی دەکرد و [من قریب] زوو تۆبەی نەکرد ، قورئان ئەفەرموێ: ئەمانە خوا هەرگیز لێیان خۆش نابێ..( ئایەتی ١٨النساء). چونکە ئەوانە موشریکن."!!!

لێرەدا سوبحانی دیاری ناکات ئەو چۆن لە [من قریب] تێگەیشتوە و بە چەند ماوە خەملاندویەتی: ڕۆژێك ، مانگێك ، ساڵێك؟! کێشەی من لەو لیکدانەوەیە ئەوەیە کە یەکیك بۆ نمونە پیاوێکی ناسی خزمی بوو یا جیرانی بوو، نوێژی نەدەکرد، دە ساڵ تێپەڕی هەر نوێژی نەدەکرد، ئەو [من قریب]ە لەسەری جێبەجێ نابێت بە پێی مفهومی سوبحانی؟! یانی ئێمە هەر کەسێکمان دیت بە گوناهی کبائرەوە چەند دەتوانین سەبری لەسەر بگرین بەپێی دەستەواژەی [من قریب] زوو، بەرلەوەی بڵێین ئەو کەسە کافرە،

چونکە زوو تۆبەی نەکردوە ؟! لە تەفسیری ئەو دوو ئایەتە، گەورە موفەسیرانی قورئان بەشێوەیەکی زۆر میانڕەوانە تەفسیریان کردوە بە پێچەوانەی ناسری سوبحانی، لە تەفسیری : [ إِنَّمَا التَّوْبَةُ عَلَى اللَّهِ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ السُّوءَ بِجَهَالَةٍ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِنْ قَرِيبٍ فَأُولَئِكَ يَتُوبُ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا] لە تەفسیری الطبري دا دەڵێت: بە نسبەت لێکدانەوەی ئەوەی خودا دەفەرموێت: [ إِنَّمَا التَّوْبَةُ عَلَى اللَّهِ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ السُّوء بِجَهَالَةٍ]{ :تۆبەی خودا لەسەر کەسێك نییە لە بەندەکانی تەنها بۆ ئەوانە نەبێت کە کاری خراپە دەکەن} { مَا التَّوْبَة عَلَى اللَّه لِأَحَدٍ مِنْ خَلْقه , إِلَّا لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ السُّوء مِنْ الْمُؤْمِنِينَ بِجَهَالَةٍ . } ئینجا قسەیەکی زۆر جوان لە السُّدِّيّ نەقل دەکات کە دەڵێت: { إِنَّمَا التَّوْبَة عَلَى اللَّه لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ السُّوء بِجَهَالَةٍ} مادامەکێ بێ ئەمری خوادەکات، ئەو نەزانە! { مَا دَامَ يَعْصِي اللَّه فَهُوَ جَاهِل }

بە نسبەت تەفسیری من قەریب دەڵێت: عَنْ اِبْن عَبَّاس : { ثُمَّ يَتُوبُونَ مِنْ قَرِيب} [زوو دەکەوێتە نێوان خۆیی و تا دەروانێتە فریشتەی مەرگ!] { وَالْقَرِيب فِيمَا بَيْنه وَبَيْن أَنْ يَنْظُر إِلَى مَلَك الْمَوْت .} لە تەفسیری ابن کثیر یش هاتوە: وَقَالَ الضَّحَّاك : مَا كَانَ دُون الْمَوْت فَهُوَ قَرِيب .[ئەوەی بەر لە مەرگ بێت زووە!] الْحَسَن الْبَصْرِيّ دەڵێت : " ثُمَّ يَتُوبُونَ مِنْ قَرِيب « مَا لَمْ يُغَرْغِر، ئەگەر لە ڕوحکێشان وگیانەڵا نەبوو، عِكْرِمَة دەڵێت: دینا هەمووی زووە : الدُّنْيَا كُلّهَا قَرِيب!

من هەرچەندە کەسێکی ئەسەری نیم، بەڵام ڕای جوان و مرۆڤ دۆستانە لە هەر کەسێك ولە هەر کوێیەك بێت دەبێت قبوڵی کەین، نەك ئەوەی بەراییەکانیش بۆ خەڵکیان ئاسان کردوە و تخفیفیان کردوە لەسەر شانیان، بێین ئیجتیهادی تێدا بکەین بۆ ئەوەی قورسی کەین! جیاوازی ئەو تەفسیرانە ولێکدانەوەی سوبحانی لە دیارینەکردنی ماوەی [من قريب] ، کەچی لەو تەفسیرانەدا بەڕونی دیاریکراوە دەڵێت: هەموو دنیا زووە بۆ ئادەمیزاد تا تۆبەی تێدا بکات.

کەوابوو لە ماوەی هەموو تەمەنی هەر مرۆڤێکدا، هەر گوناهێکی کەبیرەشی دەکرد بۆمان نییە شەو و ڕۆژ چاودێری بکەن تا واز لەو گوناهە دەهێنێت، یان پێمان وا بێت سنوری زوو [من قريب] ی بەزاندوە دەبێت تەکفیر بکرێت، چونکە دنیا هەمووی زووە! سوبحانی لە تەفسیری ئایەتی دووەمدا دەڵێت: وَلَيْسَتِ التَّوْبَةُ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ السَّيِّئَاتِ حَتَّى إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ قَالَ إِنِّي تُبْتُ الْآنَ وَلَا الَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمْ كُفَّارٌ أُولَئِكَ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا

جۆری دووەم: " ئەگەرگوناهی گەورەی ئەکردو (دوای ئەوەی کە حەقی بۆ ۆشنکراوەتەوە)" تا وەختی مەرگ بەردەوام بوو" قورئان ئەفەرموێ: ئەمانە خوا هەرگیز لێیان خۆش نابێ..( ئایەتی ١٨النساء). چونکە ئەوانە موشریکن." جۆرێکی تر گوناهی گەورە هەیە " ئەو موسڵمانە کەئەیکات" هەست بە خەجاڵەتی و شەرمەزاری ناکات بەرانبەر خوا،بۆیە بە لەزەتەوە ئەیکات و غەرقی ئەبێت و،گوناهەکەی دەوری ئەدات(بلى من كسب سيئة و احاطت به خطيئته فاولئک اصحاب النار ـــ٨١ البقرة) وبیری ئەوەی نیە کە لێی دەربێتەوە، چونکە ئیتر ئەمە کاریەتی و ئەم ڕێگەیەی گرتۆتەبەر، (مەسەلە زاڵ بوونێکی کاتیی ئارەزوو نیە )، بۆیە بیری لای تۆبە نیە و ، تۆبە ناکات تاکاتی مردن" ئەو کاتە ئەڵێ:

ئای ئەوا تۆبەم کرد... خوا ئەفەرموێ: نە ئەمەو نە ئەوکەسەش کە بەکافریی مردووە" هیچیان تۆبەیان قبوڵ ناکەم و لێیان خۆش نابم وجێگەیان جەهەننەمە ..

نازانم لە کوێوە گەیشتۆتە ئەو دەرەنجامەی کە ئەوانە موشریکن و بە کافری دەمرن؟! چونکە ئایەتەکە تەنها باسی : وَلَا الَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمْ كُفَّارٌ، دەکات کە کافرن لە بنچینەدا! لە تەفسیری ئەو ئایەتە الطبري دەڵێت: «الْقَوْل فِي تَأْوِيل قَوْله تَعَالَى : { وَلَيْسَتْ التَّوْبَة لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ السَّيِّئَات حَتَّى إِذَا حَضَرَ أَحَدهمْ الْمَوْت قَالَ إِنِّي تُبْت الْآن }يَعْنِي بِذَلِكَ جَلَّ ثَنَاؤُهُ : وَلَيْسَتْ التَّوْبَة لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ السَّيِّئَات مِنْ أَهْل الْإِصْرَار عَلَى مَعَاصِي اللَّه , حَتَّى إِذَا حَضَرَ أَحَدهمْ الْمَوْت , يَقُول : إِذَا حَشْرَجَ أَحَدهمْ بِنَفْسِهِ , وَعَايَنَ مَلَائِكَة رَبّه قَدْ أَقْبَلُوا إِلَيْهِ لِقَبْضِ رُوحه قَالَ : وَقَدْ غُلِبَ عَلَى نَفْسه , وَحِيلَ بَيْنه وَبَيْن فَهْمه بِشَغْلِهِ بِكَرْبِ حَشْرَجَته وَغَرْغَرَته : إِنِّي تُبْت الْآن , يَقُول فَلَيْسَ لِهَذَا عِنْد اللَّه تَبَارَكَ وَتَعَالَى تَوْبَة , لِأَنَّهُ قَالَ مَا قَالَ فِي غَيْر حَال تَوْبَة .»

[یانی تۆبە بۆ ئەوانە نیە کە کردەوەی خراپ دەکەن و سوورن لەسەر گوناهکردن تا ساتی ڕوحکێشانیان و دیتنی فریشتەی مەرگ.] دوایی تەبەرتی ڕایەکی زۆر سەرنج ڕاکێشەر دەڵێت:[ ئەهلی تەئویل ناکۆکن لەسەر ئەوەی مەبەستی خوا کێیە لە : { وَلَيْسَتْ التَّوْبَة لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ السَّيِّئَات حَتَّى إِذَا حَضَرَ أَحَدهمْ الْمَوْت قَالَ إِنِّي تُبْت الْآن} هەندێك دەڵێن مەبەستی مونافیقانە ... لە ڕەبیعەوە دەگێڕنەوە: ئایەتی { إِنَّمَا التَّوْبَة عَلَى اللَّه لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ السُّوء بِجَهَالَةٍ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِنْ قَرِيب} ئەوە لە بارەی ئیماندارانەوەیە، ئەوەی ناوەندی { قَالَ : نَزَلَتْ الْأُولَى فِي الْمُؤْمِنِينَ , وَنَزَلَتْ الْوُسْطَى فِي الْمُنَافِقِينَ , يَعْنِي {وَلَيْسَتْ التَّوْبَة لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ السَّيِّئَات} ئەویتریش لە بارەی کافراندایە، واتە { وَلَا الَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمْ كُفَّار} هەندێکی تر دەڵێن بەڵکو مەبەستی ئەهلی ئیسلامە" یانی ئەو هەموو سەماحەتە و ئەگەری ڕاکردن لە تۆمەتباری کردنی ئیمانداران لەبەردەم سوبحانی دابوو بەڵام سوور بوو لەسەر توندترین ئەگەر، ئەویش بە کافر وموشریك زانینی موسڵمانانە!

منیش ڕایەکی ترم هەیە لە تەفسیری ئایەتی دووەم ١٨ واتە { وَلَيْسَتْ التَّوْبَة لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ السَّيِّئَات حَتَّى إِذَا حَضَرَ أَحَدهمْ الْمَوْت قَالَ إِنِّي تُبْت الْآن} هەتا ئەگەر گریمان لە بارەی موسڵمانان دا هاتوە ئەو ئایەتە، بەڵام هیچ ئاماژەیەکی تێدا نیە بۆ بەکافر حسێب کردنیان هەتا ئەگەر تۆبەشیان لێ قبوڵ نەکات لەبەر گۆکردنی تۆبە لە کاتی بەسەرچوودا! کێشەی من لەگەڵ ئەوەیە، ئایە ئەو کەسەی بە کبائرەوە دەمرێت، بە کافری دەمرێت؟ و کە خودا دەڵێت تۆبەی لی وەرناگیرێت، یانی کوفر وشیرکی ئەو کەسە دەسەلمێنێت؟! من پێموایە ئەو تۆبە وەرنەگیراوە هەر لەو کبیرە وسەیئەتەیە و جوزئیە نەك کوللی، و سزاشی هەر لەسەر ئەو کبیرەیە دەبێت، بەڵام کافر وموشریك نابێت، چونکە ئایەتەکە دەڵێت: یعملون السیئات کە دیارە کردەوەی خراپە و سیئاتی کرداریە، کاتێ سوبحانی دەڵێت کافر و موشریك دەبن، دەبێت بزانین شیرك سیئاتی ئیعتقادیە نەك کرداری! ئینجا بەڵگە هێنانەوە بەو ئایەتەش لەلایەن سوبحانی: (بلی من کسب سیئة و احاطت بە خطیئتە فاولئک اصحاب النار —٨١ البقرة) لە بنچینەدا لەسەر کافران قسە دەکات با وەك خواریج و توندرەوان نەبین هەر ئایەتێك لەسەر کافران و مونافیقان

دابەزیبێت بیخەینە گەردەنی موسڵمانانەوە.

ئەوەیە قسەی من لەسەر ئەو دوو ئایەتە، هیوادارم لاوانمان زیاتر مایل بە تەخفیف و رەحمەت و میانرەوی بن کاتی چەند ئەگەرێکی پۆزەتیڤ و مرۆیی هەبوو، با تا بکرێت دوورکەوینەوە لە ئەگەرە نێگەتیڤ و ترسناك و نامرۆییەکان، لەو بوارەدا موفتیزادەی ڕەحمەتی کە بەڕای من ناکریت بخرێتە یەك تای تەرازوو لەگەڵ سوبحانی، ڕایەکی زۆر ناوازەی هەیە: کە پێیوایە لە ڕۆژگاری ئەمرۆدا هەر کافر وجودی نییە بە چەمکە قورئانیەکەی، ئەو ڕایەم لە هەموو دۆست و شاگردانی موفتیزادە گوێ لیبوە، هەرچەندە نازانم شتی نوسراوی هەیە لەو بارەیەوە یان نا.. لەو بابەتە تەنها مەبەستم دەرخستنی چەند هەقیقەتێکر یان لانی کەم ئەوەی من بە هەقیقەتی دەبینم، مەبەستیشم هەر ئەوەیە، دەنا لە مەبەستی مندا نییە لە قەدر وریزی ناسری سوبحانی کەم کەمەوە، هەموو کەسیکیش قابیلی پیکان و نەپێکانە.

٢٠١٤/١١/٢

لینکی بابەت:

https://www.facebook.com/permalink.php?story_substory_index=0&id=100007136867462&fbid=1527002617547619

# ئێستاش نۆرەی نکوڵی کردنە لە حۆریەکان!
# خۆزگە بێ بنەماکانی عەبدوڵڕەحمان سدیق!

بەشی یەکەم

ئەو بیر وڕایانە ولێکدانەوە ڕیزپەڕانەی عبدالرحمن صدیق، بەر لەوەی باسیان بکات لە دەیان کەسایەتی وسایتی ئیسلامی عەرەبیم گوێ لیبوە و دیومە، ئەگەر خوێنەری کوردیش نەیدیوە یان نەیخوێندیتەوە،ە لە سەرچاوە عەرەبیە ئیسلامیەکان، مانای ئەوە نیە نەبووبێت، چونکە شتی سەیروسەمەرەتریش دەڵێن، بەڵام ئەو شتە سواو و بی بنەمایانە بەڕای من سوودی بۆ خوێنەری کوردی نییە لە مەودای دوور، لەبەر نالۆژیکیەتی و نا عەقلانیەتی و پێچەوانەکردنی لەگەل دەقی ڕاشکاوی قورئان، و زانستی عەرەبی و سروشتی تێگەیشتنی ئاسایی. نەمویستوە خوێنەری کوردی چەواشەکەم هەتا ئەو چەواشەکاریەی پێ خۆش بێت! یان سەری خوێنەری کوردی پێ بیەشێنم، چونکە هەموو لینگویستیک و زمانزانانی دنیا کۆکەیتەوە ناتوانیت، قەناعەتت پێ بکات وشەی ضرب لە بۆ لێدانی ژن لە [اضربوهن] بە اضراب، و پشتلێکردن لێکبداتەوە لەو سیاقەی کە لە قورئان هاتوە!

هەموو لینگویستیک و زمانزانانی دنیا کۆکەیتەوە ناتوانیت بڵێت [ما ملكت ايمانكم] جاریە وکۆیلەی ژن نەبوون کە بە دەقی قورئان سێکس لەگەڵ کردنیشیان حەڵاڵ بووە، [والذين هم لفروجهم حافظون الا على ازواجهم او ما ملكت ايمانهم...]..

یان لە بەرنامەیەکی تردا دەلێت غزو بەمانای جیهاد نەهاتووە! وشەی غزو مورادیفی جیهادە لە وەتی ئیسلام هەیە. ماقولە غزوة البدر بە ناولێنانی کافرەکانی قوڕەیش ناو لێنرابێت بە غزوة؟! پێغەمبەر ناوی کەسانێکی دەگۆڕی بۆ ناوی ئیسلامی ئەگەر ناوەکەی دزێو با لە ڕووی دینی و ماناوە، ماقولە ناوێکی کە کافرەکانی قوڕەیش دایانهێنا بێت پێغەمبەر تەبەنای بکات، لە جیاتی ئەوەی بیگۆڕێت!؟ باشە خۆ غەزوەی بەنی قوڕەیزە و غەزوەی تەبوک موسڵمانان دەستیان پێکردوە و ناموسڵمانان هێرشیان نەکردۆتە سەر موسڵمانان، باشە بۆ هەر ناوی بە غەزوە دێت؟!

ئەو کارەی کاک عەبدوڵڕەحمان سدیق دەستی داوەتێ، هیچ بنچینەیەکی زانستی نییە، جگە لە نکوڵی لێکردن نەبێت، بەو نکوڵی لیکردنەش دەبێت یەك چیا لە سەرچاوە قاموس و تەفسیر و مێژوو سەرچاوە فیقهیەکان و حەدیسەکان بسڕیتەوە! ئینجا ئیدیعایەکی زۆر لوتبەرزانەشە، کە ئەو هەموو زانایانەی دین و زانستە عەرەبیەکان لە قورئان و عەرەبی تێ نەگەیشتوون بە قەد عەبدوڵڕەحمان سدیق یان هەتا شەحرور سامر ئیسلامبولی و کەسانیتر!

ئەو مەنهەجیەتەی ئارایشکردنە و هەڵوەشاندنەوە و سەرلەنوێ لێکدانەوە ومانا پێ بەخشینەی عبدالرحمن صدیق، بۆ جەماوەرێکی عاتیفی دیندار باشە، بۆ ئەوەی جۆرێك ئاشتبوونەوە دروست بکات لە نێوان

ئیمانی و عەقڵی و فشارەکانی ژیانی سەردەم، یان بۆ چەند ساڵێکیتر بەنج بکرێن بەو جۆرە تەفسیراتانە و قسانە، بەڵام ئەو مەنهەجیەتە هیچ لە هەقیقەتی بوونی ئەو بابەتانەی وەک ملك الیمین و لێدانی هاوسەرت و بوونی حۆری لە قورئاندا ناگۆڕێت.

ئەوەی کە نکوڵی لێ ناکرێت کە کاک عبدالرحمن سدیق هەوڵێکی باش و زۆر دەدات لە پێناو ئاشتکردنەوەی چەمکە دینیە توندوتیژەکان و نەگونجاو بە ژیانی سەردەم لەگەڵ موسڵمانانی کورد بە گشتی، و هەوڵی سەرلەنوێ پێناسەکردنەوە و داڕشتنی زهنیەتی دینی دەدات لەسەر بنچینەیەکی دوور لە توندوتیژی و چەمکە ترسناکەکان. لەو ڕێگایەشدا زۆرجار مانای جوان و زۆر مرۆییانە بەبەر دەقەکان دەکات، ئەگەرچی دەقەکانیش هەڵینەگرن! و بە جۆرێك باسی مانای ئایەت و حەدیسەکان دەکات، لەوانەیە سەحابە و موفەسیرانی پێشوو و فوقەهاکان گوێیان لێی بێت، ئیسلام نەناسنەوە! دەزانم نیەتی خێرە وەك خۆی لە ئەڵقەی حۆریەکان دەڵێت: ئەو بابەتە بەرپەچدانەوەی داعشە، کە موسڵمانانیان زۆر مەشغول کردوە بە جنس و حۆری! بەڵام ئایە ئاسانە ئەو هەموو هەزارەها کتێب و بابەت و ئەبوابی فیقهی و حەدیسەی لەسەر حۆریەکان نوسراوە، دەستبەرداری لێ بکرێت؟! من لەو باوەڕە نیم، مەگەر بە ڕاشکاوی ئەو دەقانە قەدەغە بکەیت لە باسکردن دا!

زیانی ئەو ڕێگایە لەوەدایە لەبەرئەوەی ئەو هەوڵ کۆششانە لەلایەن، عولەما و فوقەهای ئیسلامی ڕەسمی هیچ نرخێکی نییە، کە خەڵك لە ژێر کاریگەری ئەوانن زیاتر، لەوانەیە کاک عبدالحمن، ئەو قسانەی لە کۆڕێک لە سعودیە، یان هەر وڵاتێکی عەرەبی بڵێت، بە تەکفیرکردنەوە هەڵمەتی بۆبەرن! بۆیە موسڵمانی کورد تووشی شیزوفرینیای واقیع و تیۆری نویی لێکدانەوەی دەقەکان دەبێت، کاتێ هەردەم دەبێت لە واقیع کردەوە و شتگەلێکی خەراپ ببینێت، کە بە پشت بەستن بەو دەقانە ئەنجام دەدرێت، کەچی هەمان ئەو دەقانە لەلای ئەو مانای پۆزەتیڤی باشی تریان بەبەرداکراوە، و تا کاری دەبێتە پینەچی، و هەر خەریکی پینەکردنی واقیع و دەرەنجامەکانی ئەو دەقانە دەبێت، کە لەلای ئەو دەبێت هیچ کێشەگەلێکیان تێدا بێت.!

# ئێستاش نۆرەی نکوڵی کردنە لە حۆریەکان!
# خۆزگە بێ بنەماکانی عەبدولڕەحمان سدیق!

بەشی دووەم

ئایەتەکانی قورئان لەبارەی حور عین هێندە ڕاشکاون لەسەر وجودی حۆری، نکوڵی لێکردنیان بە پێی بنەماکانی ئیسلام هەر لە دینت دەردەکات، وەك نکوڵی کردنە لە وجودی دۆزەخ یان بەهەشت. لە کۆنەوە ئەو هەقیقەتە پاڵنەرێکی زۆر گرنگ بووە بۆ موجاهیدان، دوور نییە ئەوەش بێت وای لە هێزی ئیسلام کردبێت لەماوەیەکی کەمی پیوانەییدا دوو ئیمپراتۆریەتی فارسی و ڕۆمانی لە ناوچەکە بشکێنێت، چونکە ئەو کاتە هەردوولا بە چەکی سەرەتایی شەڕیان دەکرد، و ئەوەی ورە و ڕوحیەت و هیمەتی بە هێزتربا سەردەکەوت، ئەو ورە و ڕوحیەتە و مژدە گەورانەی قورئان و حەدیسیش بە موسڵمانی دەدات، لە کاتی شەهید بوونیدا لە چوونە لای خوا [احیاء حند ربهم یرزقون] و پێشوازی حۆریەکان [ولهم فیها أزواج مطهرة وهم فیها خالدون ]، وباقی نیعمەتەکانی تر، هێزێکی لە حەدبەدەری بە هێزی موسڵمانان دا لە شەڕەکان، کە ئەمڕۆ تەنها ئەگەر هێزی تەکنۆلۆژیا بتوانێت بەرامبەر ئەو توندوتیژیە بوەستێتەوە! هێزێك هەتا هیتلەر ئێرەیی پێ دەبات ودەڵێت: ئەڵمانەکان بە هەڵە دینێکی مێینەیان هەڵبژارد کە مەسیحییەتە، ئێمە پێویستمان بە دینێکی نێرانەی وەك ئیسلامە، کە جەنگاوەرەکانی پەیمانی حۆری و شەراب و ڕابواردنیان پێ درابێت!

ئەو وەسفە ئاشکرایانەی حۆریەکان بەبێ خوێندنەوەی موفەسیرەکانیش، عەرەبی زانان تێی دەگەن. چۆن دەتوانیت نکوڵیان لێ بکەیت وا بە ئاسانی؟! حور العین نە محوەرە و نە تیرۆک و نە گۆڕانی بەردەوام، سەیر لەوەدایە عەبدولڕەحمان سدیق دەڵیت پیاویش حورالعین و حۆرین؟! بە حەسەن سیساوەیان گۆت ئەوە لۆ هەر گۆرانی بەسەر ژناندا دەرێی؟! گۆتی: ئەدی خۆ بەسەر پیاوی گون لەکن چۆچکی نارێم!

جارێ ئەو حەدیسەی ٧٢ حۆریە هەر مقدام ابن معد یکرب نەیگێڕاوەتەوە، بەڵکو چەندین سەحابەی تر گیراویانەتەوە وەك ابو هریرە و ابی سعید الخدري و ابو امامە، و عبدالله بن ابي الاوفی وکەسانی تریش.

ئینجا ئەگەر عەبدولڕەحمان سدیق دەڵێت ئەو حەدیسەی حور عین لە بوخاری وموسلم نەهاتووە، حەدیسی تر سەبارەت بە حۆری لە بوخاری و مسلم هاتووە، بەڵام حۆریەکان ٢ دانەن، کە شەرحکەری ئەحادیسەکان دەڵێن هەموو موسڵمانێك بچێتە بەهەشت ٢ حۆری هەیە بەبێ خۆ بە کوشتدان، کە شەهیدیش بوویت ٧٠ حۆریت پێ دەدەن ٧٠ + ٢ = ٧٢ حۆری!

لە بوخاریدا هاتووە:

عن أبي هريرة رضي الله عنه : عن النبي صلى الله عليه و سلم [ أول زمرة تدخل الجنة على صورة القمر ليلة البدر والذين على آثارهم كأحسن كوكب دري في السماء إضاءة قلوبهم على قلب رجل واحد لا تباغض بينهم ولا تحاسد لكل امرئ منهم زوجتان من الحور العين يرى مخ سوقهن من وراء العظم واللحم] [يەکەم جەماحەت کە دەچنە بەهەشت لەسەر شێوەی مانگی بەدری چواردە....هەر یەکێك لەوانە دوو هاوسەری دەبێت لە حوری عێن کە مۆخی ئێسکی قاچ وقوڵی لە پشت ئێسک و گۆشت دەبینرێت]!!

کەوابوو حوری عێن هەیە، جا ٢ بێت یا ٧٢، ئەوە کێشە نییە، بوخاری ومسلم یش سەلماندوویانە، ئەگەر بیانووت بوخاری و موسلیمە!

لەو ئایەتانە بزانە چەند ڕاشکاوانە باسی دەکات:

{ولهم فيها أزواج مطهرة وهم فيها خالدون }..[البقرە: ٢٥] لە بەهەشت هاوسەری پاکیان هەیە! هەرچەندە هەموو موفەسیران وزانایان دەڵێن باسی ژنانی حۆری دەکات کە پاکن لە هەموو جۆرە خوێن دیتن و هەر شتێك کە لە مرۆڤ دەردەچێت! بەڵام ئەوە ئاسانە بۆ مەنهەجیەتی کاک عبدالرحمن بڵێت مەبەستی ژنانی خۆیانن لە دنیا!

بەڵام کە دەڵێت:{ كذلك وزوجناهم بحورعين }..[الدخان: ٥٤ ] تەزویجمان کردن بە حۆریەکان! خۆ وەکی کابرای مەسیحیش لە سؤال جریئ ناڵێی مەبەستی ترێی ڕەشمان پێ بەخشین؟! خۆ ترێ بە ئاشکرا ناوی هاتووە لە قورئان [اعناب]. لێکدانەوەی حور بە محور هیچ قاموسێکی عەرەبی بەرگەی ناگرێت.

ئینجا کە دەڵێت : { فيهن قاصرات الطرف لم يطمثهن إنس قبلهم ولا جان فبأي آلاء ربكما تكذبان. كأنهن الياقوت والمرجان}..[الرحمن : ٥٨]ئەو چاو شەرمنانەمان دانێ کە پێشتر کەس دەستیانی لێ نەداوە لە مرۆڤ و جنۆکە! کێنە ئەوانەی کەس دەستیانیان لێ نەداون؟! دەبێت خەلقێکی نوێ بن.

- کواعب اترابا لەو حۆریە جوانانە بوویتە ژووری چوارگۆشەی هەڵواسراو!

کێ تەسەور دەکات ئەو هەموو موجاهید و جەنگاوەرەی ئیسلام، ئەگەر لەبەر شەوقی ئەو حۆریە جوانانە نەبا، کە دەتوانیت لە وەسفی جوانییاندا، چەند موجەلەداتی لی کۆکەیتەوە بە ئایەت وحەدیس و تەفسیر و شیعرەوە، خۆیان بە کوشت دابا لە پێناو باخچەیەك وهەندێ ژووری چوارگۆشەی هەڵواسراودا؟!

( إن للمتقين مفازا حدائق وأعنابا وكواعب أترابا....)

دەربارەی ئەو ئایەتە، ئەگەر تەفسیرەکانیتر و لێکدانەوەکانیتری مامۆستا عەبدولرەحمان سدیق، بە تایبەتی لە ڕووی زمانەوانییەوە، ناماقول و دوور بن لە ڕاستیدا، ئەوە لێکدانەوەی بۆ کواعب اترابا هەر گاڵتەجاریە.

جارێ کواعب و تاکی کاعب لە هەزاران شیعری جاهیلی پێش ئیسلام و دوای ئیسلامیش هاتووە بە مانای ئافرەتی تازە سنگ خڕکردوو .تا ئێستاش ئەو وشەیە لە زۆر زاری عەرەبی بەکار دێت، کەچی

عەبدولرەحمان سدیق دەڵێت: نا مەبەستی ژووری چوارپاڵووە کە لە سویدیش دروستیان کردوە بەناوی خانووی هەڵواسراو!

ئەوەش قەیناکا، ئینجا دەڵێت اترابا کۆی وشەی تەریبی کوردییە! ئەوە نەك تەفسیر نییە گاڵتەجاریشە، تۆ بە وشەیەکی کوردی تەمەنی پەنجا ساڵیش نابیت وشەی اترابا ی تەمەن هەزار و چوارسەد ساڵ تەفسیر بکەیت؟! جارێ خودی تەریب وەك وشەیەکی نوێی کوردی پێویستی بە ڕاڤەیە و لە کوێوە هاتووە؟!

لە تەفسیری کواعب اترابا، ابن كثير دەڵێت:

( كواعب ) أي : نواهد ، يعنون أن ثديهن نواهد لم يتدلين لأنهن أبكار عرب أتراب ، أي : في سن واحدة . " کواعب: ئەوەی سنگی کردوە، مەمکیان بڵ نەبوە چونکە کچن! اتراب: هاوتەمەن.

قورتبی، القرطبي دەڵێت: کواعب کۆی کاعب ە، بەوە دەڵێن کە سنگی خڕ کردوە، دەوترێت: كعبت الجارية تكعب كعوبا ، وكعبت تكعب تكعيبا ، ونهدت تنهد نهودا.

"وكواعب أترابا كواعب : جمع كاعب وهي الناهد ] ; يقال : كعبت الجارية تكعب كعوبا ، وكعبت تكعب تكعيبا ، ونهدت تنهد نهودا .

وەك شاعیر قيس بن عاصم دەڵێت:

[وكم من حصان قد حوينا كريمة ومن كاعب لم تدر ما البؤس معصر ] اتراب: هاوتەمەنی یەکتر، تاکەکەی ترب ە!"

تەبەری، الطبري دەڵێت: کواعب اترابا: ئەوانەی سنگیان خڕکردوە و لە یەك تەمەندان "وقوله) : وكواعب أترابا (يقول : ونواهد في سن واحدة "

ئەوە تەفسیری سێ موفەسیری گەورە و سەرچاوە سەرەکیەکانی ئیسلامە دەربارەی کواعب اترابا، ناشێت بڵێین ئەوانە لە عەرەبی کۆڵەوار تر بوون لە عەبدولڕەحمان سدیق؟!

## وشە گۆڕکێ!

لەو ئایەتەش شتێکی تر دەکات کە زۆر سەیرە } :إنا أنشأناهن إنشاءً فجعلناهن أبكاراً عرباً أتراباً لأصحاب اليمين }..[الواقعه: [٣٥ئێمە بە بیکری و کچێنی دروستمان کردون، عربا: دەڵێن زمانیان عەرەبی دەبێت، تەعریب گەیشتە بەهەشتیش!، اترابا هاوتەمەن لە ٣٣ ساڵ، خۆزگە لە دنیاش تەمەنی مێینەی ئامادە بۆ هاوسەرگیری بەو بەخشندەییە دیاری کرابا، هەر نەبا بە ٢٠ ساڵ، نەك ٩ ساڵ کە هەموو کتێبە فیقهەکان بۆ زەواجی مێینەیان داناوە؟!

قال ابن أبى حاتم ذكرَ عَنْ سَهْل بْن عُثْمَان الْعَسْكَرِيّ حَدَّثَنَا أَبُو عَلِيّ عَنْ جَعْفَر بْن مُحَمَّد عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدّه قَالَ : قَالَ رَسُول اللَّه عُرُبًا - قَالَ - كَلَامهنّ عَرَبِيّ وَقَوْله أَتْرَابًا قَالَ الضَّحَّاك

عَـنْ ابْـن عَبّـاس يَعْنِـى فِـى سِـنّ وَاحِـدَه ثَـلاَث وَثَلاَثِيـنَ سَـنَه.

مامۆستا عەبدولڕەحمان سدیق وشەی أبكاراً لە [إنا أنشأناهن إنشاءً فجعلناهن أبكاراً عرباً أترابـاً] بە الْإِبْـكَارِ ی بەرەبەیان لیکدەداتەوە! ئەبكار جیایە لە ئیبكار، ئەبكار بۆ كچی شوو نەكردوو بەكار دێت وەك لە قورئانیش دەڵێت: [ ثَيِّبَـاتٍ وَأَبْـكَارًا ] یانی بێوەژن و کچان! ئێستاش لە پێناسنامەی عێراقی بۆ شوو نەكردوو دەنوسرێت: بكر!

إِبْكَارِ بە مانای بەیانی زوو دێت و ئەویش لە قورئان هاتووە وەك: [بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَارِ]

چۆن دەبیت بە كەیفی خۆت أبكار بكەیتە إِبْكَارِ؟!

# ئێستاش نۆرەی نکوڵی کردنە لە حۆریەکان!
# خۆزگە بێ بنەماکانی عەبدولڕەحمان سدیق!

بەشی سێیەم

## تەفسیری پیاوسالارانەی قورئان!

مامۆستا عەبدولڕەحمان سدیق دەڵێت: "تەفسیرەکان بە ڕوانگەیەکی پیاوانە نووسراوەتەوە، ئەگەر بۆ پیاو حوری هاتبێت، ئەی بۆ ژنان چی هاتووە؟ وەك بڵێیی قورئانەکە بۆ پیاو هاتبێت!

کەوابو حور العین نابێت هەر ژن بێت، تەفسیراتی قەدیم هەڵەیان کردوە!" ئەی ئەگەر خودی ئایەتەکە ڕووی دەمی لە پیاو بیت کە حۆری بۆ خوڵقاندوە، چی دەڵێیت؟! یانی تۆ مەرج دەخەیتە پێش خوا کە چۆن باسی بابەتەکان بکات؟! قورئان لەبارەی خوداوە دەڵێت: [لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ] ٢٣ الأنبياء [خودا پرسیاری لێ ناکرێت چی دەکات، مرۆڤەکان لێیان دەپرسرێت]

جارێ تەفسیراتی قورئان ڕاستە بە ڕوانگەیەکی پیاو سالارانە نووسراوەتەوە، ئەوەش ڕەنگدانەوەی ژینگەی ڕووحی وعەقڵی سەردەم و کۆمەڵگای عەرەبییە. هەقیقەتێکیش هەیە کە نابێت لەبیری بکەین ئەوەیە، کە قورئان لە زۆربەی زۆری ئایەتەکان دەمی ئاڕاستەی لە نێرە، جاروباریش وتارەکەی ئاڕاستەی ژن وپیاو کراوە، لە چەند حاڵەتێکی کەمیشدا ئاڕاستەی ئافرەت کراوە بە تەنها. یانی کێشەکە هەر لە تەفسیرەکان نییە، جاروبار خودی ئایەتەکان ئاڕاستەی پیاو کراوە، و ئافرەت وەك بەخششێك و نیعمەتێک لە نیعمەتەکانی خوا بۆ پیاو باسکراوە، و لە بەرامبەردا ئەو پەیامە ئاڕاستەی ئافرەت نەکراوە، وەك لەو ئایەتەدا دەڵێت ( زين للناس حب الشهوات من النساء والبنين والقناطير المقنطرة من الذهب والفضة والخيل المسومة والأنعام والحرث ذلك متاع الحياة الدنيا والله عنده حسن الثواب ) آل عمران (١٤)

لەو ئایەتە وشەی الناس، کە بە مانای خەڵك دێت لە ڕووی زمانەوە، و دەبێت نێر ومێش بگرێتەوە، قورئان ئاڕاستەی پیاوی کردوە بە تەنها، چونکە ئاشکرایە پیاو حەز وئارەزووی شەهەواتی هەیە لە ژن، بەڵام شەهوەی ژن بۆ ژن ناچێت، لە ڕوانگەی قورئانییەوە، ئەگەر ئەو لادانە سێکسیە لە ژیانی هاوچەرخیش ڕوو بدات! چونکە ئەگەر بڵێیت الناس لەو ئایەتە ژنیش دەگرێتەوە، ئەوە دانهێنانی قورئان دەبێت بە مافی لێزبیانیەتی ژن وژن! کەوابوو لەبەر بێ بایەخی ئافرەت لە ژیانی گشتیدا هەتا وشەی الناس یش تەنها مەبەست لە پیاوەکان بووە. هەتا ام سلمة جارێك گوێی لە بانگی ايها الناس بوو، ڕایکردە لای مزگەوت، پێیان گووت: مەبەستی پیاوانە، گووتی: منیش لە الناس م! کەوابوو زۆرینەی خەڵکیش دەیانزانی الناس واتە پیاوەکان لە زۆربەی حالەتەکاندا!

## قورئان دینە، خۆ جاڕنامەی مافی مرۆڤ نییە!

ئەو قسانەی کە عەبدوڵڕەحمان سدیق دەیکات: گوایە نابێت خوا وەسفی ئافرەتەکان بکات بە سنگی گەورە، چونکە ئەو ئافرەتانەی سنگیان بچوکە زگیان بە خۆیان دەسووتێ! زۆر بێ بنەما و ساویلکانەیە! چونکە جارێ هەر لە ژیانی دنیای واقیعیدا، ئەگەر بە حسابی عەبدوڵڕەحمان سدیق بێت، مرۆڤەکان دەبێت نارەزایی دەربڕن بەرامبەر خودا، کە کەسانێکی وەک قەترانی ڕەش دروست کردوە، وکەسانێکیتر وەک بەفری سپی، و کەسانێکی بستە باڵاو و کەسانێکی درێژ و کەڵەگەت، کەسانێکی لەش وولار جوان و کەسانێکیتری ناحەز و هتد.. ئینجا موفەسیرەکان دەربارەی کواعب دەڵێن ئەو ئافرەتانەن کە سنگیان تازە خڕکردوە، ناڵین مەمکی گەورە، ئەوە تەنها قسەی عەبدوڵڕەحمان سدیق خۆیەتی! سێیەم قورئان دەیەها فەرق و جیاوازی کردوە لە نێوان مرۆڤی دنیا و مرۆڤی بەهەشت، کە یەکێکیان نەمرییە و یەکێکی تر پیر نەبوونە، تا هانی مرۆڤەکان بدات بۆ کارکردن بۆ گەیشتن بە بەهەشت، کەسیش زگی بە خۆی ناسوتێت، چونکە دەڵێت لەوێ چیت دەوێت بۆت دەکرێت، وەک کابرایەکی زۆر ئیماندار حەزی لە جگەرەی ڕۆتمان بوو؛ دەیگووت بەهەشت هەتا جگەرەی ڕۆتمانیشی تێدایە!

ئینجا کاک عەبدوڵڕەحمان سدیق دەڵێی لە بارەگای نەتەوە یەکگرتوەکان وەستاوە، دژی سیستمی ئەپارتاید و ڕەگەزپەرستی وتار دەدات و دەڵێت:

ئەگەر خوا مەبەستی لە حور العین ئافرەتی سپی بێت ئەوە تەمیزە و جیاکاریە لە وجودی ئەو هەموو ژنە ڕەشپێستە!

یان ئەگەر چاوی حوریەکان بە مانای گەورە بێت، ئەوە خەڵکی کۆریا وژاپۆن وچین گلەیی دەکەن لە خوا! بۆ بەچاو بچووکی دروستی کردوون! وەڵڵا موسڵمانان ١٤٠٠ ساڵە واش تێگەیشتوون لەو ئایەتانە، تێگەیشتنی تۆ و ئەمسالی تۆ لە ژێر فشاری بیر و ژیانی هاوچەرخ لە دایک بوونە، بە درێژایی تەمەنی ئومەتی ئیسلامی نەمانزانیوە، ئەفریقیەك گلەیی پێست ڕەشی لە خوا کردبێت، یان ئەندەنوسیەك گلەیی چاو بچووکی لە خوا کردبێت!

## مافەکانی مرۆڤ لە دنیا و ئاخیرەتدا!

ئەگەر باسی مافەکانی مرۆڤ بکەین دەبێت لە دەیان شوێن ڕەخنەمان هەبێت لە حەدیس و لە قورئانیش، بۆ نمونە ئەو ئایەتەی سورەتی ئەحزاب، کەدەڵێت: يا أيها النبي قل لأزواجك وبناتك ونساء المؤمنين يدنين عليهن من جلابيبهن ذلك أدنى أن يعرفن فلا يؤذين وكان الله غفورا رحيما . الاحزاب) 59 ( [ئەی پێغەمبەر بە هاوسەرانت و کچەکانت و ئافرەتانی ئیماندار بڵێ: کە بە پۆشاکی باڵا پۆش خۆیان داپۆشن ئەوە لەبارترین شتە کە پێی بناسرێن، تا ئازار نەدرێن و (توشی گیروگرفت نەبن)، هەمیشەو بەردەوام خوا لێخۆشبوو میهرەبانە].

کە دەڵێت خۆتان داپۆشن تا ئازار نەدرێن وبزانن ژنانی ئازادن خاوەن شەرەف وکەرامەتن، وەك

شوکانی دەڵێت: [ادنی ان یعرفن یانی تا جیاواز بن و لە کەنیزەکان، و بناسرێن کە ژنانی ئازادن کۆیلە نین، تا ئەزیەتیان نەدرێت لە لایەن بەدکارانی شارەکە بە ڕێگرتن و گێچەڵی سێکسی. مەبەست لە ذلك ادنی ان یعرفن ئەوە نییە ئەو ئافرەتە بناسرێت کییە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە بزانرێت کە ئافرەتی ئازادن و کۆیلە نین، چونکە جلێکیان پۆشیوە تایبەتە بە ئافرەتانی ئازاد.]

وەك شەوکانی دەڵێت: "أدنى أن يعرفن أي : أقرب أن يعرفن فيتميزن عن الإماء ويظهر للناس أنهن حرائر فلا يؤذين من جهة أهل الريبة بالتعرض لهن مراقبة لهن ولأهلهن ، وليس المراد بقوله : ذلك أدنى أن يعرفن أن تعرف الواحدة منهن من هي ، بل المراد أن يعرفن أنهن حرائر لا إماء ؛ لأنهن قد لبسن لبسة تختص بالحرائر." فتح القدير الجامع بين فني الرواية والدراية للشوكاني

باشە ئەگەر ژن خەمی پێستی سپی و چاوی گەورە و ڕەشی بێت لە ئاخیرەت، زگی بەخۆی بسوتێت، چۆن لە دنیا ئەو ئافرەتە کەنیزە وکۆیلانە زگیان بەخۆیان ناسوتێت، کە لە ئاسمانەوە داوا لە ژنانی ئازاد دەکرێت خۆیان لەوان جوداکەنەوە، و پۆشاکێکی تایبەت بپۆشن، تا ژنە ئازادەکان ئەزیەت و ئازار نەدرێن، و گێچەڵیان پێ نەکرێت، کەچی ئەو ئافرەتە کۆیلانە زیاتر بەرجەستە و هایلایت بکرێن، بخرێنە بەر ئەگەری دەستدرێژی شەلاتیەکانی مەدینە، و بکرێنە ئامانجێکی ئاسان بۆ ئەزیەت دانیان!

بۆ ئەوانە با کۆیلەش بن، خۆ هەر مرۆڤن و خوا بەخۆی دروستی کردوون! بەو دواییە لە شارێکی بەریتانیا تەنها دەرگای خانووی پەناهەندەکانیان بە سوور ڕەنگ کردبوو، خەریك بوو چەندین بەرپرسی گەورەی بەریتانیا ئایندەیان تێ بچێت، و گووتیان ئەوە کارێکی نامرۆڤانە و جیاکاری و ترسناکە، ئێوە بە ڕەگەزپەرستان دەڵێن ئەوەتا ماڵە پەناهەندە هێرش بکەنە سەریان! شتی تریش زۆر زۆرن لەگەڵ مافەکانی مرۆڤ هەڤدژن، بەس با ئەو نمونەیە بەس بێت.

بۆیە کاك عەبدولڕەحمان سدیق، باش نییە دۆسێی مافەکانی مرۆڤ بکەیتەوە لەکاتی لێکدانەوەی دەقەکانی دین!

شتێکیتریش مامۆستا عەبدولڕەحمان سدیق نیگەران دەکات، وادەزانێت قورئان دەبێت هەموو مافەکانی ئافرەتان و فێمینیزم بەخۆی بگرێت، کە ئەوەش مەحاڵ و زۆرلەخۆ کردنە. ودەڵێت: "ئەگەر خوا لە بەهەشتدا حورالعين ی بۆ پیاو دروست کردبێت، ئەی چی بۆ ژن دروست کردوە؟! ئەی چۆن ژن کاتێ قورئان دەخوێننەوە تورە نابن کە هیچیان بۆ دیاری نەکراوە لە بەهەشت!؟"

جا قورئان لە دنیادا چەندین بڕیاری جیاواز و جۆراو جۆری بۆ پیاو و ژن تێدایە. مەسەلەی دوو شایەدی ژن بە شایەدێکی پیاو، و دوو بەشی میرات بۆ پیاو و یەك بەش بۆ ئافرەت، چوار ژن هێنان بۆ پیاو و یەك مێردی بۆ ئافرەت، ولە کۆی ئیسلامدا دەیەها مافی ئافرەت بە نیو کراوە، هەتا کاتێ لە دایك دەبێت کچ یەك ئاژەڵی بۆ دەکرێتە گوێزەبانە و کوڕ دوو! هەتا خوێنبایشی نیوەی پیاوە لە کاتی کوشتنیدا! هەزارەها و ملیۆنەها ئافرەت ئەو هەقیقەتە دەزانن، و زۆریشیان بەو هەموو بڕ وبیانووانەشی کە ئیسلامیەکان بۆیان دەهێننەوە باوەڕیان نییە، بەڵام لە ترسی لە دەستدانی ئیمانیان رازین! ئەگەر لە دنیادا ڕازی بن بەو هەموو کەم بەشییە، کە خاوەنی هەموو غەریزە دنیاییەکانیشن، چۆن لە بەهەشت

و ئاخیرەت ڕازی نابن نیعمەتە سێکسیەکان بەس بۆ پیاوان بن!؟
ئینجا بە پیی قورئان خۆشیەکانی بەهەشت هەر لە سێکسدا چڕنابێتەوە، بەڵکو بەپیی ئایەتی ٧٢ سورەتی التوبة: [وَعَدَ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللَّهِ أَكْبَرُ ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ] [خوا بەڵێنی داوە بە ئیمانداران لە پیاوان و لە ئافرەتان، بەوەی کە باخەکانی بەهەشتیان پێ دەبەخشێت کە چەندەها ڕوبار بەژێر درەختەکانیدا دەڕوات و جاریە بە بەردەم کۆشکەکانیاندا، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی هەمیشەیی و نەبڕاوە تیایدا، هەروەها چەندەها جێگە و ڕێگە و کۆشک و تەلاری خۆش و ڕازاوەی تایبەتی لە بەهەشتداو لەناو باخی چڕوپڕی (عەدن) دا، لەگەڵ ڕەزامەندی خوای گەورەدا، کە لە هەموو نازو نیعمەتەکان بەنرخترو گرنگترە، ئەوە خۆی سەرفرازیەکی زۆر گەورە و بێ ئەندازەیە.]
کەوابوو خۆشتر لە بەهەشت و ناز ونیعمەتەکانی، هەتا حۆریش، رازیبوونی خودایە کە قورئان دەڵێت ڕازیبوونی خوا گەورەترە، و سەرکەوتنێکی هەرە مەزنە.

# ئێستاش نۆرەی نکوڵی کردنە لە حۆریەکان!
# خۆزگە بێ بنەماکانی عەبدوڵڕەحمان سدیق!

بەشی چوارەم

## ئافرەتیش بۆ پیاو دروستکراوە، نەك هەر حۆری!

هیچ گومانی تێدا نییە، کە وتاری قورئان و ڕوحیەتە جیهادی و جەنگاوەرەکەی ئاڕاستەی پیاو کراوە بە پلە یەك، چونکە ئەرکی ڕاپەڕاندن و سەرکەواندنی دینەکەی بە ئەستۆی پیاوەکان سپاردوە، و جیهادی ژنان بریتیە لە حەج و گوێڕایەڵی پیاوان.

عائشة لە پێغەمبەری پرسی: [ئایە ئافرەت جیهادی لەسەرە؟، گووتی: بەڵێ جیهادێکی بی شەڕی لەسەرە، حەج وعومرە! ( یا رسول الله هل على النساء من جهاد ؟ ) ، قال : (( نعم عليهن جهاد لا قتال فيه الحج والعمرة )) [رواه احمد].

السرخسي لە بابی قتال النساء مع الرجال وشهودهن الحرب لە شرح السير الكبير (١٨٤/١) دەڵێت: [پێمان باش نییە ژنان لەگەڵ پیاوان لە شەڕدا بن، چونکە بونیادێکی گونجاویان نییە بۆ جەنگان، لەوانەیە لە دۆخی شەڕکردنیدا، ببێتە هۆکاری عەیبە بۆ موسڵمانان، و موشریکەکان دڵیان پێی خۆش دەبێت، و زیاتر ببێتە هۆی جورئەتکردنیان لەسەر موسڵمانان، ودەیکەنە بەلگە لەسەر لاوازی موسڵمانان، و دەڵێن: پێویستیان بە هاریکاری ژنان بوە بۆ شەڕیان لە دژی ئێمە!] ( لا يعجبنا أن يقاتل النساء مع الرجال في الحرب ; لأنه ليس للمرأة بنية صالحة للقتال , ... وربما يكون في قتالها كشف عورة المسلمين , فيفرح به المشركون وربما يكون ذلك سببا لجرأة المشركين على المسلمين , ويستدلون به على ضعف المسلمين فيقولون : احتاجوا إلى الاستعانة بالنساء على قتالنا..)

شێخ رەبیعی مەدخەلی دەڵێت: ئافرەت بۆ پیاو دروستکراوە، نەک پیاو بۆ ئافرەت، یان بۆ یەکتر دروستکرابن! دەڵێت بڕوانە ئایەتەکان دەبینیت ئافرەت وەک نیعمەتێک و کاڵایەك بۆ پیاو دروستکراوە لە دنیا و ئاخیرەت: قال تعالى ( والله جعل لكم من أنفسكم أزواجاً وجعل لكم من أزواجكم بنين وحفدةً ورزقكم من الطيبات ) سورة النحل آية . ٧١

وقال تعالى : ( ومن آياته أن خلق لكم من أنفسكم أزواجاً لتسكنوا إليها وجعل بينكم مودةً ورحمةً إن في ذلك لآيات لقوم يتفكرون) الروم ٢١ بڕوانن ئەی موسڵمانانی نێر ومێی عاقڵ کە دەفەرموێت:( خلق لكم من أنفسكم ) و(جعل لكم من أنفسكم ) تا بزانن چۆن خودا پیاوی پەسند داوە بەسەر ئافرەت، و ئافرەتی بۆ پیاو و لەبەر پیاو دروستی کردوە، ئەوەش نیعمەتێکی گەورەیە. ئینجا نیعمەتێکی تریشی لێدەکەوێتەوە، ئەویش ئافرەتەکان منداڵ و وەچەی بۆ دەهینن، کە دەدرێنە پاڵ پیاو، نەك پاڵ ئافرەت، دەگوترێت کوڕی فلان پیاو و کچی فلان پیاو، و نەوەی فلان پیاو... بڕوانە [لتسكن

الیها] ڕاناوەکە بۆ ئافرەت دەگەڕێتوە لە الیها."
ئینجا دەڵێت: " وقال تعالى : ( زين للناس حب الشهوات من النساء والبنين والقناطير المقنطرة من الذهب والفضة والخيل المسومة والأنعام والحرث ذلك متاع الحياة الدنيا والله عنده حسن الثواب ) آل عمران (١٤)
[ئارەزووی ئافرەت و بوونی نەوەی نێرینە و خاوەنێتی ئاڵتون و زێڕو زیووی زۆرو زەبەندە و ئەسپی چاك و ڕەسەن و هەروەها ماڵات و زەوی و زاری كشتوكاڵ بۆ خەڵكی ڕازێنراوەتەوە، ئەوانە هەمووی نازو نیعمەتی ژیانی دنیان، خوایش (بۆ چاكان) شوێنی گەڕانەوەی ڕازاوەو خۆشی لای خۆی ئامادە كردووە.]
لەو ئایەتە ئەو شتانەی سەرەوەی كردۆتە جێگای شەهەوات و ئارەزووی پیاوان و لەو شتانەیە كە لە دنیادا چێژی لێ وەرگرن، لە نێو ئەوەشدا و بەڵكو لە پلە یەكدا حەز و شەهوەی ئافرەتە، كە بۆ حەزی پیاو و سەرتۆپی حەز و شەهوەكانیەتی!]
فجعل هذه الأشياء من شهوات الرجال ومطامحهم ومما يتمتعون به في هذه الحياة الدنيا ومن ضمن ذلك بل أولها المرأة فهي من متاع الرجل وفي مقدمة شهواته. "
كەوابوو ئەگەر قورئان لە وشەی الناس دا مەبەستی پیاو بێت وەك لە ئایەتی زين للناس دا دیارە بە وازحی، كەوابوو لە ئایەتەكانیتری وەك:
[وَبَشِّرِ الَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ.... وَالسَّابِقُونَ السَّابِقُونَ أُوْلَئِكَ الْمُقَرَّبُونَ...وَأَصْحَابُ الْيَمِينِ مَا أَصْحَابُ الْيَمِينِ...إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَنَعِيمٍ... إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي مَقَامٍ أَمِينٍ...]
كە تیایدا باسی نیعمەتی حوری عین و هاوسەری پاك وخاوێن، ازواج مطهرة كراوە، زۆر ئاشكرایە كە وتارەكە ئاڕاستەی پیاو كراوە، و ئافرەت لە دەقی قورئانیدا لە چەند جێگایەكی تایبەت نەبێت، دەنا بە تایبەتی ناوی نەهاتووە، ئەویش زانراوە پاش ئەوەی بەپێی ڕیوایەتەكان كە ئافرەتان چوونە لای پێغەمبەر و سكاڵای حاڵی خۆیان كرد، كە بۆ وەك پیاوان ناویان نایەت لە قورئاندا:
لە تەفسیری: [ إن المسلمين والمسلمات والمؤمنين والمؤمنات والقانتين والقانتات والصادقين والصادقات والصابرين والصابرات والخاشعين والخاشعات والمتصدقين والمتصدقات والصائمين والصائمات والحافظين فروجهم والحافظات والذاكرين الله كثيرا والذاكرات أعد الله لهم مغفرة وأجرا عظيما]
الإمام أحمد :دەگێڕێتەوە كەوا [گوێم لێبوو ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر گووتی، بە پێغەمبەرم گووت: بۆچی ئێمەی ئافرەتان لە قورئاندا باسمان ناكرێت وەك پیاو؟ هێندەی نەبرد ڕۆژێك لەسەر مینبەر بانگی كرد...منیش چووم بۆ ژورێك لە ژورەكانی ماڵەكەم، گوێم گرت، دەیگووت: خەڵكینە خودا دەڵێت: [ ان المسلمين والمسلمات والمؤمنين والمؤمنات]
عبد الرحمن بن شيبة ، سمعت أم سلمة زوج النبي صلى الله عليه وسلم تقول : قلت للنبي صلى الله عليه وسلم : ما لنا لا نذكر في القرآن كما يذكر الرجال ؟ قالت : فلم يرعني منه ذات يوم إلا ونداؤه على المنبر ، قالت ، وأنا أسرح شعري ، فلففت شعري ، ثم خرجت إلى حجرة من حجر بيتي ، فجعلت سمعي عند الجريد ، فإذا هو يقول عند المنبر : " يا أيها الناس ، إن الله يقول : ( إن المسلمين

والمسلمات والمؤمنين والمؤمنات) الى آخر الآية. تفسير ابن كثير
لە تەفسیری القرطبي هەمان ئایەتدا هاتوە: كەوا ام عمارەی ئەنسارِی هاتە لای پێغەمبەر [د.خ] گوتی: دەبینم هەموو شتێك هەر بۆ پیاوە، و نابینم ئافرەت هیچ باسبكرێن. هەر دوای ئەوە ئەو ئایەتە دابەزی: إن المسلمين والمسلمات والمؤمنين والمؤمنات الآية .]
روى الترمذي عن أم عمارة الأنصارية أنها أتت النبي صلى الله عليه وسلم ، فقالت : ما أرى كل شيء إلا للرجال ، وما أرى النساء يذكرن بشيء ! فنزلت هذه الآية : إن المسلمين والمسلمات والمؤمنين والمؤمنات الآية
هەر لە تەفسیری الطبري یش هاتووە "كە ئافرەتان بە كۆمەڵ چوونەتە لای پێغەمبەر سكالآیان كردوە: خودا باستان دەكات لە قورئان، ئێمە قەت باس ناكرێین، كەسمان یان هیچمان تێدا نییە تا باسبكرێت؟ خودا ان المسلمين والمسلمات والمؤمنين والمؤمنات والقانتين والقانتات...هتد دابەزاند
عن قتادة قال : دخل نساء على نساء النبي - صلى الله عليه وسلم - ، فقلن : قد ذكركن الله في القرآن ، ولم نذكر بشيء ، أما فينا ما يذكر ؟ فأنزل الله تبارك وتعالى ( إن المسلمين والمسلمات والمؤمنين والمؤمنات والقانتين والقانتات )
هەر ابن كثير و الطبرى لە تەفسیری ئایەتێكی هاوبابەتی تردا: [فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّى لَا أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِنْكُمْ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى بَعْضُكُمْ مِنْ بَعْضٍ) ڕیوایەتێكی تریان گواستۆتەوە دەربارەی ئەو ئایەتەی لە ام سلمة، كە دەڵێت: ئەی پیغەمبەری خودا، نابینم خودا لە بابەتی هیجرەت كردنەوە بە هیچ جۆرێك باسی ئافرەتانی كردبێت؟ خودا بەدوای ئەوەدا ئەوەی دابەزاند: [فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّى لَا أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِنْكُمْ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى بَعْضُكُمْ مِنْ بَعْضٍ)
عن عمرو بن دينار ، عن رجل من ولد أم سلمة ، عن أم سلمة :أنها ]ص [ 488 :قالت : يا رسول الله لا أسمع الله ذكر النساء في الهجرة بشيء؟ فأنزل الله تعالى " : فاستجاب لهم ربهم أني لا أضيع عمل عامل منكم من ذكر أو أنثى بعضكم من بعض . "
دەربارەی ئایەتی [مَنْ عَمِلَ صَالِحاً مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُمْ بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ] النحل الآية: ٩٧ و ئایەتی تری هاوشێوەش هەمان چیرۆك و هۆكار هاتوە. بێگومان ئافرەتانی ئەو سەردەمە، عەرەبی پەتی بوون، و بە سروشتی چەشەی زمانزانییان دەیانزانی ئەو ئایەتانەی باسی حۆری و ازواج مطهرة دەكەن، پەیوەندیان بە پیاوەوە هەیە.
قورئان ئیمانداران بە هەموو خۆشی و چێژەكانی دنیا مژدەدار دەكات: وەك باغ و باغات و ڕووبار و گۆشتی تەیروتواڵ لحم الطير، و میوەجات، و ڕووباری شەڕاب و شیر و هەنگوین، باشە بۆ باسی جنس و سێكسی تێدا نەبێت كە بە هێزتری و بەچێژترین غەریزەیە لای مرۆڤ؟! ئایە خواردن و خواردنەوە و میوەجات بە قەد ئافرەت شیعر و جیرۆك و ئەدەبیاتی تری لەسەر نووسراوە؟! بە قەد ئافرەت شەڕ و مونافەسەی لەسەردا كراوە؟! كەوابوو چۆن قورئان دەتوانێت فەرامۆشی بەهێزترین و لوتكەی حەزەكانی پیاوە جەنگاوەرەكانی بكات لەو ژینگە وشك وبرینگەی كەتیایدا دەژیان؟!

# ئێستاش نۆرەی نکوڵی کردنە لە حۆریەکان!
# خۆزگە بێ بنەماکانی عەبدولڕەحمان سدیق!

بەشی پێنجەم

## بۆچی ئەو ئایەتانەی باسی مێی تێدا کراوە حۆری تێدا نییە؟!

ئەو هۆکاری دابەزینە، واتە سکاڵای ژنان لە ناونەهاتنیان لەگەڵ پیاواندا، لە زۆربەی ئەو ئایەتانەی کە باسی ئافرەتانی تێدا کراوە دووبارە دەبنەوە. ئەوەش بایەخ وگرنگی خۆی هەیە لەو سەردەمە دوور ودێرینە، ئەو ئافرەتانە هێندە بە تەنگ هاتنی ناویان بن، وەك پاداشتێك بۆ کار و قوربانیەکانیان بۆ دینی نوێ. پێیان ناخۆش بووە، وەك پیاوان کۆشش بکەن و کۆچ بکەن بۆ حەبەشە و مەدینە، و کەس وکاریان بەجێ بهێڵن، لە شەڕەکان بەشدار بن، کەچی ناویان بە تایبەت نایەت لە ئایەتەکاندا. ئەوەش گرنگە ئەگەر بزانین ئافرەت هەن لەو سەردەمەدا لەناو و دەرەوەی ئیسلامیەکان، هێشتا عەقڵیان بە مافەکانیان ناشکێت، ناوێرن نەک سکاڵا لە قورئان بکەن، بەڵکو ناوێرن ئەو حەدیسانەی وەك ناقیساتی عەقڵ و دین یش ڕەخنە بکەن! ئەوە بوو لە ئەنجامدا وەڵامی داخوازیەکانیان درایەوە، و ناویان لە چەندین ئایەت هات بە تایبەتی.

بەڵگەش لەسەر ئەوەی ئەو ئایەتانەی باسی حۆری و هاوسەری پاکی لێکراوە مەبەستی پیاو بووە، ئەگەر بڕوانینە ئەو ئایەتانەی کە باسی نێر ومێ و ژن و پیاودا پێکەوە کراوە، بە هیچ جۆرێك پەیمانی حۆری و هاوسەری پاك، ازواج مطهرة نەدراوە تیایاندا، کەچی لەو ئایەتانەی باسی ئافرەت و مێ نەکراوە باسی حۆری و مۆری کراوە! کەوابوو مەبەست هەرپیاو بووە لە پەیمانەکاندا:

لەو ئایەتانە وەک دیارە، نە لە ئایەتەکانی پێش ونە لە پاشی هیچ باسی حۆری و ازواج مطهرة نەکراوە:

﴿إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ وَالْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَالْقَانِتِينَ وَالْقَانِتَاتِ وَالصَّادِقِينَ وَالصَّادِقَاتِ وَالصَّابِرِينَ وَالصَّابِرَاتِ وَالْخَاشِعِينَ وَالْخَاشِعَاتِ وَالْمُتَصَدِّقِينَ وَالْمُتَصَدِّقَاتِ وَالصَّائِمِينَ وَالصَّائِمَاتِ وَالْحَافِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَالْحَافِظَاتِ وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيراً وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُمْ مَغْفِرَةً وَأَجْراً عَظِيماً﴾ الأحزاب ٣٥

(فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لَا أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى بَعْضُكُم مِّن بَعْضٍ فَالَّذِينَ هَاجَرُوا وَأُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ وَأُوذُوا فِي سَبِيلِي وَقَاتَلُوا وَقُتِلُوا لَأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَلَأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ ثَوَابًا مِّنْ عِندِ اللَّهِ وَاللَّهُ عِندَهُ حُسْنُ الثَّوَابِ) ال عمران١٩٥

(وَمَن يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتِ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا) النساء ١٢٤

ئەوەش کردەوە چاکەکان ئەنجام بدات نێر بێت یان مێ لەکاتێکدا ئیماندار بێت، جا ئەوانە دەچنە

بەهەشتەوەو بەقەدەر پەردەی ناوکی خورما ستەمیان لێناکرێت.
(مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ) ٩٧ النحل

ئەوەی کارو کردەوەی چاکەی کردبێت، پیاو بێت یان ئافرەت لە کاتێکدا بڕوادار بێت، سوێند بە خوا بەژیانێکی کامەران و ئاسوودە لە دنیادا دەیژێنین، لە قیامەتیشدا پاداشتیان بەجوانتر دەدەینەوە لەوەی کە ئەوان دەیانکرد.

( وَلَا تَتَمَنَّوْا مَا فَضَّلَ اللَّهُ بِهِ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبُوا وَلِلنِّسَاءِ نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبْنَ وَاسْأَلُوا اللَّهَ مِن فَضْلِهِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا)
النساء ٣٢

(وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُولَئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ
(وَعَدَ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللَّهِ أَكْبَرُ ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ) التوبة ٧١- ٧٢
(لِّيُدْخِلَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَيُكَفِّرَ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَكَانَ ذَلِكَ عِندَ اللَّهِ فَوْزًا عَظِيمًا ) الفتح ٥
(يَوْمَ تَرَى الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ يَسْعَى نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَانِهِم بُشْرَاكُمُ الْيَوْمَ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ) الحديد ١٢

[ڕۆژێک دێت کەدەبینیت پیاوانی ئیماندارو ژنانی ئیماندار بەرەو بەهەشت بەڕێ دەکرێن، نوورو ڕوناکایەکی ئاشکرا لەبەردەم و لەلای ڕاستیانەوە دەڕوا، فریشتەکان پێیان دەڵێن: مژدەی ئێوە ئەمڕۆ باخەکانی بەهەشتەکەچەندەها ڕوبار بەناویاندا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی هەمیشەیی و نەبڕاوە تیایدا، ئا ئەوەیە سەرکەوتن و سەرفرازی گەورەو بێ سنوور

إِنَّ الْمُصَّدِّقِينَ وَالْمُصَّدِّقَاتِ وَأَقْرَضُوا اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَاعَفُ لَهُمْ وَلَهُمْ أَجْرٌ كَرِيمٌ

ئەوانەی کەخێر خوازن لەپیاوان و ئافرەتان، ئەوانەی کەقەرز دەدەن بەخواو ماڵ و سامانیان لەپێناوی ڕەزامەندی ئەودا دەبەخشن، ئەوانەچەند بەرابەر پاداشتیان دەدرێتەوە و پاداشتی بەڕێزو بەنرخ چاوەڕێیانە]

(وَالَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ أُولَئِكَ هُمُ الصِّدِّيقُونَ وَالشُّهَدَاءُ عِندَ رَبِّهِمْ لَهُمْ أَجْرُهُمْ وَنُورُهُمْ وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَئِكَ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ) الحديد ١٨-١٩

[ئەوانەی کەباوەڕیان هێناوە بەخواو پێغەمبەرەکانی، ئا ئەوانەڕاست و ڕاستگۆکانن، شەهیدەکانیش لای پەروەردگاریان پاداشت و نوور و ڕوناکی تایبەتی خۆیان هەیە، ئەوانەش کەباوەڕیان نەهێناوەو ئایەت و فەرمانەکانی ئێمەیان بەدرۆزانی، ئا ئەوانەنیشتەجێی دۆزەخن]

چونکە لە ئایەتی یەکەم باسی ژن و پیاو هاتوە، لە ئایەتی دووەم بە گشتی و بە کۆی نێریش قسە

دەکات، بەڵام باسی حۆری ناکات چونکە لە ئایەتی پێشوو وتارەکە ئاراستەی ئافرەت و پیاوە، نەوەك بە هەڵە تێبگەن!

ئەوانە هەموو ئەو ئایەتانەن کە باسی ئافرەت و پیاو پێکەوە کراون، و باسی پاداشت بەهەشت و ڕۆژی دوایی و ناز ونیعمەتەکان کراوە، وەك دەبینین بە هیچ جۆرێك باسی ازواج مطهرة و حور عین نەکراوە! کەوابوو ئەو جۆرە تەفسیرانەی کە دەڵێن ئایەتەکانی حور عین مەبەستی ئافرەتیشە، یان ژن و پیاو هەردووکیان دەبنە حۆری، وەك تەفسیرە سەیرەکەی مامۆستا عبدالرحمن سدیق، کە ئەو بەناوی تەفسیری تایبەتی کوردی برەوی پێدەدات، لە ڕاستیدا لە تەفسیری گەنجێکی میسری تازە پێگەیشتوو امین صبري و ئەو ئاڕاستە نوییانە ژێر فشاری ژیانی هاوچەرخ وەریگرتووە، کە سەرەڕای ئەوەی سوودیان هەیە بۆ سووک کردنەوەی گرژی و توندوتیژیەکانی ناو دەقەکان، بەڵام خودی تەفسیرکردنەوەکە بەو شێوەیە، کە ڕەچاوی هیچ بنەمایەکی لۆژیکی و مێژوویی زمان و فەرهەنگ و زانستە عەرەبی و ئیسلامیەکان ناکات هەمووی بێ بنەمان، زۆر ئاسان دەتوانرێت هەڵبوەشێنرێنەوە.

ئەمن لەوە سەرم سوڕماوە، سەرەڕای ئیدیعای عەبدوڵڕەحمان سدیق کە تەفسیرێکی کوردی دەکات، بۆ گوێبگرینە تەفسیری عەرەبی، کەچی بۆم دەرکەوت، هەموو ئەو تەفسیر و لێکدانەوانەی مامۆستا عبدالرحمن سدیق کردوویەتی، لە منداڵکارەیەکی وەرگرتوە ناوی امین صبری یە دەقا و دەق، لە یوتیوب بگەڕێن بۆ ئەلقەی امین صبری لا جنس في الجنة بۆتان دەردەکەوێت ئەو گەنجە میسرییە چەندە تەڵەکەبازە لە یاری کردن بە وشەکان و ماناکانی بەبێ ڕەچاوکردنی بچوکترین قواعیدی زمانەوانی و فەرهەنگی و لۆژیکی.

ئەوەش دەیسەلمێنێت کە عەرەب هەتا شەرەفی دیاردەیەکی زمانەوانی یان دەنگی [الظاهرة اللغوية او الصوتية] شیان بەرناکەوێت، وەك هەمیشە وا وەسفیان دەکرێت.

ئەمین سەبری هەموو خۆشیەکانی بە هەشت بە مێوە لێکدەداتەوە، وەك بڵێی بەهەشت گومرگی هەولێر یان عەلوەکەی سلێمانییە. عەبدوڵڕەحمان سدیق هەنگاوێکی تریش دەچێتە پێش و دەڵێت: هەموومان من و تۆ بە نێر و مێمان دەبینە حۆری لە بە هەشت!!! یانی مەلا مەسعود و مەلا مەزهەر و و سووسەیی و مەلا سەمەد و مەلا عبداللطیف و دختۆر عبدالواحید یش ...هتد. دەبن بە حۆری چونکە ئەهلی ئیمانن!

٢٠١٦/٦/٢٢

# عبدالرحمن سدیق و گەندەڵی کوردی

مامۆستا عبدالرحمن سدیق باسی چارەسەری گەندەڵی دەکات لە تەلەفزیۆنی خواوەندی گەندەڵان دا. وەك هەمیشە بەڵگە و ئارگیومنتەکانی زۆر جوانە بەڵام هێندە نەزەری باسی گەندەڵی دەکات وەك بڵێی باسی ئەقوامی کۆنی پێش هەزاران ساڵ دەکات. یەکەم پایەی ڕەخنەگرتن لە گەندەڵی خۆ جیاکردنەوەیە لە گەندەڵکارەکان و دەزگاکان و دەستە و دایەرەیان. قسەکانی زیاتر لەسەر ئایەتی تلك الدار الاخرة نجعلها للذین لایریدون علوا في الارض ولا فسادا ، دەکات. دەڵێت پارەی گەندەڵی لە قومار خراپترە چونکە قومار بۆیە حەڕامە یەکێك پارەی هەموو قومارچییەکان دەباتەوە، گەندەڵیش مانای ئەوەیە چەند کەسێك پارەی هەموو خەڵك بدزێت و بیخوات. ئەگەر بەپێی ئەو لێکدانەوە بێت کێ هەیە لە هێما وسیماکانی دەسەڵاتی کوردی گەندەڵێکی حەڕامخۆرتر نەبێت لە قومارچییەکان؟!
بۆ باسی ئەو هەموو دزی و گەندەڵیە ناکات کە لە دەوروبەری خۆی ڕوودەدات؟!
چ پێویست بە باسی نەزەری دەکات لە کاتێکدا ژیانی عەمەلی کوردستان هەمووی نوقمی گەندەڵی بووە؟! خەریکە گەندەڵی هیچ مانایەك بۆ کوردبوون و هەستی ئینتیما ناهێڵێت.
گەندەڵی کوردی تام و بۆنێکی تایبەتی هەیە لە هیچ گەندەڵیتری وڵاتان ناچێت. گەندەڵی کوردی زۆر بێ ئیحساستر و بۆگەنتر ودەبەنگترە، بەڕادەتەك مرۆڤ تووشی خەمۆکی و شیزۆفرێنیا دەکات، توشی شێتبوون دەکات، منداڵەکانی دوێنێی بنەماڵە دەسەڵاتدارەکان بە ملیاردەها دۆلاریان لە دەستە کەچی سەرەڕای ئەوەی ئەو نەوتەی کوردستان شەو و ڕۆژ بەتاڵان دەبردرێت، کەچی هێندە بێ شعور و چڵێس و بێ عەقڵن گەندەڵەکانی کوردستان، هەتا مووچەی پێشمەرگەش بە جوانی نادەن!!
گەندەڵی کوردی هێندە پیسە خودی باسکردنیشی گەندەڵ بووە!

٢٠١٥/١٢/١٠

# مەنهەجی پینە وپەڕۆکردنی عبدالرحمن صدیق

ئەو مەنهەجیەتەی پینە وپەڕۆکردنی عبدالرحمن صدیق بۆ جەماوەرێکی عاتیفی دیندار باشە بۆ ئەوەی چەند ساڵێکیتر بەنج بکرێن بەو قسانە، غزو مورادیفی جیهادە لەوەتی ئیسلام هەیە. ماقولە غزوة البدر بە ناولێنانی کافرەکانی قورەیش ناو لێنرابێت بە غزوة ؟! پێغەمبەر ناوی کەسەکانی دەگۆڕی بۆ ناوی ئیسلامی، ماقولە ناوێکی کە کافرەکانی قورەیش دایانهێنا بێت ئەو تەبەنای دەکات، لە جیاتی ئەوەی بیگۆڕێت!؟

باشە خۆ غەزوەی بەنی قورەیزە و غەزوەی تەبوک موسڵمانان دەستیان پێکردوە و ناموسڵمانان هێرشیان نەکردۆتە سەر موسڵمانان، باشە بۆ هەر ناوی بە غەزوە دێت؟! دوایێ ئەگەر لەبەر تێپەڕبوونی ١٥٠ ساڵێك گومان بخرێتە هەموو سیرە، ئەی کەوابوو بوخاری و مسلم هەر شایەنی باسکردن. نین کە دوو سەد ساڵ زیاتر لەدوای هیجرەتەوە نوسراونەتەوە! ئینجا لە هەمووی ترسناکتر تۆ ڕیوایەتی عطیة القرظی ڕەتکەیتەوە کە خۆی لەناو غەزوەکەی بنی القریطة بوو و مێردمنداڵ بوو، ئەی ڕیوایەتی کێ قبول دەکرێت لەو نزیکتر و شاهێدتر؟! لەوەش خراپتر ئەوەیە دەڵێت کاتێ بوخاری و مسلم وباقی کۆکەرەوەی حەدیس هاتن دەوڵەتی ئەمەوی خەریکی غەزوە و شەڕی تالان وبڕۆی عەرەبی جاهیلی بوون، بۆیە بوخاری وموسلم لەژێر کاریگەری ئەو وەزعە ئەو حەدیسانەیان. لە جیهادەوە کردە غەزوە؟!

بەو قسەیە بێت دەبێت تێکڕای حەدیسی بوخاری وموسلم و ئەوانیتر ڕەتکەینەوە، نەك بەخۆت هەر لەو ڤیدیۆیە دەڵێیت دەبێت دانە دانە ڕەتیان کەینەوە!!!

٢٠١٥/١٢/٢٥

# شێخ مستەفا زەڵمی و چەند سەرنجێك!

من دانی پێدا دەنێم كە كەسایەتی شێخ مستەفا زەڵمی باش ناناسم، شتێكی زۆر كەمیشم لەسەری خوێندۆتەوە، هەرچەندە تێكرای كارەكانیم لەسەر ئینتەرنێت دۆزیەوە كە لەسەر ئەركی نێچیرڤان بارزانی چاپ كراوە، كە ئەوە بەڕای من یەكێكە لە كارە بە سوودە دەگمەنەكانی نێچیرڤان [هەرچەندە بەبێ دەستنوێژیشم، داوای لێبوردن لە جلال پەرێشان دەكەم]!!. بەڵام لە تێكرای چاو خشاندن بە ناوەڕۆكی بابەتەكانی دەردەكەوێت كە كەسێكی ریفۆرمخواز و موجتەهیدیكی گەورەیە لە بواری فیكری دینیدا. گرنگترین ئەو بابەتانەی كە وروژاندیەتی مەسەلەی كۆتایی هێنانە بە كۆیلایەتی و نەك تەشریع كردنی، و هەروەها مەسەلەی هەڵگەڕانەوە و نەبوونی نەسخ لە قورئاندا، و لە هەمووشی گرنگتر مەسەلە گرنگەكانی ئافرەت لە شەریعەتدا كە بەڕاستی تەنها بایەخ دانی بەو بوارە خۆیلە خۆیدا جیاوازی عەقڵیەتی موجتەهیدی كوردی دەسەلمێنێت، كە چەندە ئافرەت و باسەكانی گرنگن وجێی بایەخن، لە بەراورد بە عەقڵیەتی فەقیهی عەرەبی كە كەمتر بە ڕوحیەتێكی ریفۆرخوازیەوە دەڕواننە ئەو باسە گرنگانەی ئافرەت هەتا ئەگەر دەیان موجەلەداتی لەسەر بنوسێت! ئەوەی من سەرنجم دا لەو چاوپێكەوتنەی دكتۆر شێخ مستەفا زەڵمی لە ڕووداودا ئەوەیە كە لەوە دەچێت زیاتر بتوانێت گوزارش لە خۆی بات لە ساتی نووسیندا، نەك لە چاوپێكەوتنی تەلەفزیۆنیدا، چونكە ئەو بیروڕایانەی دەریدەبڕین دەربارەی ئافرەت زۆر دوور بوون لەو ڕوحیەتەی كە ئەو پێی ناسراوە، بۆ نمونە ئەویش دەیگووت نابێت ئافرەت بەبێ مەحرەم سەفەر بكات، كە ئەوە لە سعودیە یاسایە و زۆر بەشێوەیەكی گوماناوی مامەڵە لەگەڵ سەفەركردنی ئافرەت دەكەن و وەك منداڵێك لێی دەڕوانن كە ناتوانێت خۆی بپارێزێت و وەك شێخ مستەفا زەڵمی یش گووتی: ئافرەت غەریزەی زاڵە بەسەر عەقڵی بۆیە نابێت بە تەنیا وبێ مەحرەم سەفەر بكات! بەڕای من هەتا ئەو حەدیسانەی كە هاتوە دەربارەی سەفەرنەكردنی ئافرەت بەبێ مەحرەم، زیاتر جەخت لەسەر پاراستنی ئافرەتەكە دەكات لە بەدكاران، نەك ڕێگا لە ئافرەتەكە بگرێت لە غەریزەی زاڵی بەدكاری بەسەر عەقڵیدا! ئەوەش ئەو حەدیسانەیە كە لەو بارەیەوە هاتووە، كە گرنگترینیان دەڵێن: قول النبی صلی الله علیه وسلم: «لا تسافر المرأة إلا مع ذی محرم, ولا یدخل علیها رجل إِلا ومعها محرم، ....!» (البخاري ١٧٦٣).

[ئافرەت سەفەر ناكات بەبێ مەحرەم، پیاویش ناچیتە لای ئەگەر مەحرەمێكی لا نەبوو...]

عن أبي هريرة عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: "لا يحل لامرأة تؤمن بالله واليوم الآخر أن تسافر مسيرة يوم إلا مع ذي محرم"(البخاري ١٠٣٨، مسلم ١٣٣٩).

[ حەلال نیە بۆ ئافرەتێك كە ئیمانی بە خوا و ڕۆژی دوایی بێت، سەفەر بكات ڕۆژەڕێیەك تەنها بە

مەحرەمەوە بێت]

ئەو حەدیسانە بۆ کاتی خۆی گرنگ بوو لەبەر ئەو ڕێگاوبانە پڕ مەترسیەی کە بۆ پیاویش زۆر ترسناك بوو، دەگێڕنەوە بەر لە سەد ساڵ ئەو پیاوەی کە بۆ حەج دەچوو، بەتەمای خۆی نەبوو بەسەلامەتی بگەڕێتەوە، چ جای ئافرەت لەو بیابان وچۆڵەوانیە، بەلاّم ئەمڕۆ وەزعەکە زۆڕ گۆڕاوە، ڕێگاوبانەکان زۆر ئەمینن، و ئافرەت بۆی هەیە بە فرۆکە بە چوار پێنج سەعات لە سعودیەوە سەفەر بکات بۆ بەریتانیا، کە ناکاتە یەک لە پێنجی ڕۆژەرێیەك!

هەروەها شێخ مستەفا زەڵمی لە باسی تێکەلاّوی و ئیختیلاّتیشدا بە هەمان عەقڵیەتی سەلەفی تەحریمی تێکەلاّوبوونی بە ڕەهایی دەکرد لە نێوان کور وکچ دا لە پاش باڵق بوون! یانی هەر لە پاش قۆناغی سەرەتایی خوێندن!

نازانم دەبێت جیاوازیمان چی بێت لەگەڵ عەقڵیەتی سەلەفگەرای سعودیە وخەلیج کە بە هەمان پیوەری ئەوان مامەڵە لەگەڵ تەحریم و تەحلیلی مەسەلە پەیوەستەکانی بە ئافرەت بکەین، و لە هەموویش ناخۆشتر وەك ئەوانیش ئافرەت بە لاواز و مەخلوقێکی شەهوانی غەریزە زاڵ بەسەر عەقڵیدا بکەین، وبە کورتی وەك منداڵێکی زل سەیری بکەین؟! من دڵنیام شێخ مستەفا زەڵمی لە کتێبەکانیدا زۆر گەورەترە لە بیروڕاکانی لەو چاوپێکەوتنەدا، چونکە مەرج نیە من لە نووسین باش بووم، لە وتاردانیش یان چاوپێکەوتنی تەلەفزیۆنی یان لە سیمناریش باش بم، هیوای تەندروستی وتەمەن درێژی بۆ شێخ مستەفا زەڵمی دەخوازم.

٢٠١٥/١/٢٣

# شەڕی ئەهریمەن بە مۆسیقای تڕادیشناڵی ئێرانی دەکەن!

زۆرن لەو ڕۆژگارە ئەوانەی لە ئاست تەشەنەکردنی توندڕەوی و مەترسی بە مێگەلکردنی کۆمەڵگا بە دەستی سەلەفیزم، بێ دەنگ و بێ دەخل و بێ نقەن! خۆزگە هەر بەو بێ هەڵوێستیەش بەسیان کردبا و خەریکی خوێندنەوەی کتێبە سارد وسڕە یوتیوبیەکانیان بان لە سوچی ماڵە هێمنەکانیان لەسەر مۆسیقای سونەتی ئێرانی. نا بەوە ڕازی نین کەس یەخەیان ناگرێت و پێیان بڵێت: با بزانین ئێوە لە بەرامبەر ئەو شەپۆلە ترسناکەی بە سەلەفی کردنی هەموو کۆمەڵگا موسڵمانەکان، وەرن بابزانین چ دەکەن؟ کاریگەریتان چیە بۆ پاراستنی تاکی کورد لەو مەترسییە؟! لەناو کۆمەڵگا ڕۆژانە چەند سەکۆ و مینبەر ومیدیا بەکار دەهێنن بۆ ڕەتکردنەوەی ئەو هەڵمەتە ترسناکەی سەلەفیەت بۆ سەر کۆمەڵگا؟! ئەوانە نەك بێ دەنگ نین، بەڵکو وەك هەڵکەوت زاهیر و هەردی سەلاح و قەڵەمفرۆشە سێکیولارەکانی دەسەلات، سەرسەخترین بەرگری لە پرۆژەیەکی مەترسیداری سەلەفیزم دەکەن، کە مەرگی خۆیانی تێدایە، ئەگەر هاتنە سەر دەسەلات یان توانیان زەوجێکی ناشەرعی نیوان سەلەفیەت و دەسەلات بهێننە دی!

کاک هیمداد شاهین و لقمان بەکر وتارێکی دوو قۆڵیان نووسیوە تیایدا لە ژێر بەنجی ئایدیا خەیاڵی و میسالیەکانی سید حسین نصری خاوەنی فەلسەفەی ترادیشنالی ئێرانی بەو شێوازە میسالیە بەرگری دەکەن لە دەست والاکردنی سەلەفیەت بۆ قووت دانی کۆمەڵگای کوردی، و لە بەرامبەریشدا هێرش دەکەنە سەر من و هەموو ئەوانەی بەرەنگاری شالاوی سەلەفیزم بونەتەوە! کاک لقمان ناناسم نەوەك نووسەر و نە وەك هاورێیەتی، کاك هیمداد من دەمێکە دەیناسم نازانم چۆن خۆی وا لێ گۆڕا بووە بەو ئیسلام ناسە گەورەیە لە کاتێکدا هەتا عەرەبیش نازانێت! لە بیرمە شیعرێکی ابن عربی بە هەڵە وەرگێڕا بوو، کە ئاگادارم کردەوە لە دەقە عەرەبیەکە گووتی: من عەرەبی نزانم لە فارسیەوە وەرمگێڕاوە! وابزانم بەس فارسیەکەی باشە، خەریکی بە خۆماڵی کردنی ئایدیاکانی قوتابخانەی تڕادیشناڵە و وەرگێڕانەکانی بە بەرهەمی خۆماڵی بە خوێندەواری بێ ئاگای کورد دەفرۆشێتەوە. من وەك ئیسلامیەکان ناڵێم دەبێت هەموو علومی عەرەبی نحو صرف قواعد و هتد بزانیت تا بتوانی توێژینەوە بکەیت لە ئیسلامدا، بەڵام لایەنی کەم تێبگەیت کاتێ شیعرێکی عەرەبی یان دەقێکی عەرەبی دەخوێنیتەوە.

بەداخەوە من کاك هیمدادم دیت لە بەرنامەیەکی ڕووداودا لەگەڵ یەك دوو مەلا، کە پرسیاری داعشیان لێکرد، هیمداد نەوێرا لە ڕووداو بە ڕوونی بڵێت داعش ڕەگێکی لاوازیشی هەیە لەناو توراسی ئیسلام دا. کە بەڕای من ڕەگێکی بەهێزیشی هەیە نەك لاواز!

دەشڵێن: "دواجار ئەوەی بۆ ئێمە گرنگە شەڕی حەقیقەتە نەك کەسایەتییەک، بێ گومان ئەمە

موجامەلەکردنی سەلەفییەت نیە، چونکە دژایەتی سەلەفییەکان بۆ ئێمە تا ئاستی بەکافردانان ڕۆیشتووە" سەلەفیەت بێ گومان ئێوەی پێ کافر و ڕافیزی و سەر بە ئێرانە، وەك چۆن هەموو کەسانیتری پی گومڕا وکافرە! ئەوە هیچ ئازایەتیەکی تێدا نییە ئێوەیان پێ کافرە، هەڵکەوت زاهیر یشیان پێ دەیوس و بێ ڕەوشت و کافرە، کەچی فەتوای ساختەی دەنگیشی بۆدان!

ئەخر ئێوە هێندە بێ مزەرەت بن بۆ داعشیش چۆن زیانتان دەبێت بۆ سەلەفیەت، چۆن دەبنە لەپەڕ لەبەردەم هەڵمەتی شێرپەنجەییدا؟! ئەخر خوێنەری سەلەفی چ لەو زمانە تێدەگات کە ئێوە پیی دەنووسن: " ئێمە هەمیشە پێداگیریی لەسەر ئەوە دەکەین کە سەلەفیەت لەئاستی فیکریی و تیۆریدا پرۆبلەمەتایز بکەین و لەدیدێکی ئیزۆتێریکیەوە ڕەخنەی زانستیانەی خۆمانی ئاراستە بکەین.." کوا ڕەخەکانتان بۆ سەلەفیەت؟! یان هەر لە ئەفلاکی ئایدیا خەیاڵیەکانی سید حسێن نەسر دەخولێنەوە؟! باشە ئەگەر خۆتان هیچتان پێ ناکرێت لە لاساییکردنەوە ئەو فەلسەفە سارد وسڕە نامۆیەی بە کۆمەڵگای کوردی بەناوی تڕادتشناڵ کە زیاتر گوزارشت لە تەنگژەکانی کۆمەڵگایە شارستانیەکانی خۆرئاوا دەکات لە ڕوئیایەکی دینی تەقلیدیەوە، بۆ کاری خەڵکیش بێ بەها دەکەن؟!. ئەگەر لە ڕوئیا و ئامانجی کێشەیەك تێناگەن بە تەرازووی قالبە سواوانەی بیرتان بۆ دەیکێشن؟! بەتەمای ئەو قسە زل و قەبانە بین دەبێت چەند ساڵیتر کۆمەڵگای کوردی ببێتە سعودی.

ئایە ئەوانەی شەڕی ئەهریمەنی سەلەفیەت دەکەن و ناو و ژیان و سومعەیان بە خۆڕایی دەخەنە مەترسیەوە، جەنابشت لە پەناو و پەسێوان بەس کتێبەکانی سید حسین نصر دەخوێننەوە، دێن بە کەسانی وەك من کە سەدان وتاری رەخنەییم لەسەر سەلەفیەت نووسیوە، دەڵێن ئیفلاسی مەعریفی؟! وچەندین گوزارشی تری ڕوشێنەرتر کە لەو وتارە دوو قۆڵیە نووسیوتانە؟!

بەخوا بەو خاو و خلیچکیەی ئێوە بێت بەو وشە باق وبریقانەی فەلسەفەی تڕادیشناڵ بێت کە بەس خۆتان تێیدەگەن. بەو ترسنۆکی و شەرمنیەتان بێت، تاڕادەی ك ئەوەی نەوێرن دڵی داعشیش بشکێنن، سەلەفیەت هەر لە بەهێزبوون بەردەوام دەبێت تا جێگەی دانشتنی ئێوەشی تێدا نابێتەوە. بەرێز حاجی سێوکانی سەرنجێکی جوانی بۆ نووسیبوون: " ئەم پیاوانە خەڵکێکی بەرێزن بەڵام بەداخەوە خەڵکی دنیا نین...!!!دکتۆر گیان لەگەڵ ئەو پەری ڕێزمدا بەڵام ئەوی ئێوە دەیفەرموون تەنیا خەیاڵێکی جوانەو لەئەرزی واقیعدا سەنگی پوشێکی نیە ...."

ئەو دوو برادەرە تڕادیشناڵە وادەزانن شەڕی ئەهریمەن بە فەلسەفەیەکی سارد وسڕی تڕادیشناڵ و مۆسیقای سونەتی ئێرانی دەکرێت. کە من هیچ ڕەخنەیەک ناخەمە ڕوو لەسەر فەلسەفەی تڕادیشناڵی سید حسین نەسر مانای ئەوە نییە ئاگادار نەبم لێی و ڕەخنەم نەبێت لەسەری، بەڵکو لەبەر ئەوەی بە دژی بەشەری نازانم وەك سەلەفیەت، بە پێویستی نازانم یەك دێڕیشی لەسەر بنووسم، بەڵام زۆر سەرنج و ڕەخنەم لەسەری هەیە. ئەولەویەتی من شەڕی ئەوانەیە بەناوی سەلەفیەت دەیانەوێت کۆمەڵگایەکی مێگەلی بەدەوی و نا شارستانی دژ بە ژیان و ژن و مرۆڤ دروست بکەن!

ئێوە دەبێ بزانن ئێمە شەڕە جوێن ناکەین، ئێمە تەنها هەقیقەتێکی ژیانی دووفاقی ئەوانەمان ئاشکرا

کردوه، تا خەڵك لەوه بگەن خۆشیان لە تاریکی باوەڕیان بەوه نییە کە لە ڕووناکی شەو ورۆژ بە هەزاران کەسی دەڵێن! ئەوە ئەوانن دان بە هەڵەکانیان نانێن لە جیاتی جوێن وپەلاماری من و دەیانی وەك من دەدەن، و هەڕەشەیان بۆ من و هەموو مامۆستاکانی پەیمانگاکە و خەڵکی دەرەوش ناردوه هەی بێ ئاگاینە! ئێوە تێناگەن و نازانن کە ئێمە بتێکی گەورە وردوخاش دەکەین لە پێناو بەتاڵکردنەوەی قودسیەتی خوداوەندی ئەو بتە!

وەك کاك ژوان دڵشاد جوان بۆی نووسیبوون لە بارەی کارەکەی مندا کە دەڵێت: " سوپاست دەکەم دکتۆر لوقمان. ڕایەکت جوانە و مەعقوولە. بەڵام نازانم چەند فکر دەکەمەوە، قەناعەتم بەوە نیە ئەو ڕێگا نەرمە بە کەڵکی لەتیف و تاقمەکەی بی. لایەنگرانی ئیستحمار کراون، بەو ڕێگا توندە بێ یان بە ئوسلوبێکی نەرم؛ ئەوان بڕیاریان داوە کە هەر ئەو بتە بپەرستن. مادام هەر ئەوهایە، با پشتگیری محەمەد هەریری بکەین. کو قەومەکەی ئیبڕاهیم وەکو ئەو سەلەفیانەی ئێستا لە لایەن مەلا لەتیفەوە کەر کرابوون، بە دەستی نەمروود کەر کرابوون؛ ئیبڕاهیم دیتی چارەی نیە، خەڵکەکە بەردەوامە لە ئیستحمار و بتپەرستی خۆی؛ چوو بە قازمەی بتەکانی شکاند. محەمەد هەریریش شتێکی لەو بابەتەی کرد. ".

# داماوەی شانازی بە دۆستایەتی فەیسەڵ قاسم و ئەردۆگان و داعش دەکات!

هەی داماوی کاسبکاری خیانەت و دژایەتی کورد کردن، ئەی ئەو دەبەنگەی پێتوایە ئەردۆگان موعجیزەی خوڵقاندوە وەك موعجیزاتی چیرۆکە خەیاڵیەکان وەك لە وتارە پڕ لە خیانەتکاریەکەت نووسیوتە! [منذ مجئ أردوغان إلى السلطة في عام ٢٠٠٣، تشهد تركيا تغيرا جذريا متصاعدا وملفتا، يشبه إلى حد كبير المعجزات التي نسمعها في القصص التي تتلى على مسامعنا حول التاريخ الغابر.]

تۆ ئەگەر یەک تۆزقاڵ شەرم و حورمەتت هەبا لە کاتێکدا ئەردۆگان میللەتەکەمان دەکوژێت و دەیان ساڵە گاڵتەمان پێدەکات بە ناوی پرۆسەی ئاشتی، نەدەهاتی وەك کلاوخوارێکی تورك بەو جۆرە ستایشی ئەردۆگان بکەیت: [ئۆردوغان مەردە پیاوی میللەتانی مسوڵمان. سوڵتانە پڕ بە مانای وشە. تەحەددای ئەڵمانیای کردووە. ئەمەیە عیززەت نەفس. ئەم ئۆردوغانە شانازیەکی هەرە گەورەی مسوڵمانانە لەم سەردەمەدا.]!!!

ئەی ئەو کەسەی لە جیاتی دوو وشە بە تورکی شۆڤێنست بڵێیت کە هەزاران ماڵ و دوکانی کوردانیان لە سەرتاسەری تورکیا سوتاندوە، کە لە سەدان کوردیان داوە لەسەر بچوکترین هۆکار وەك لەبەرکردنی جلی کوردی، دێیت لە جیاتی ئەوە جوێن بە گەنجانی کوردی داماوی دڵ بریندار دەدەیت، چونکە ئالآی بۆگەنی تورکیای کەمالیستی ئەردۆگانیست دەسوتێنن وپییان دەلییت هەرچی وپەرچی وحثالات! حثالە و هەرچی وپەرچی ئەوەیە کە خۆی بەداعش فرۆشتوە، کە هەزاران ئافرەتی کوردیان بە کۆیلەکردوە، لە جیاتی قسە بەوان بڵێیت، جوێن بە ئێزیدیەکان دەدەیت لەگەڵ نوسەرە زۆرەبڵێکە ودۆڕاوەکەی بزوتنەوەی ئیسلامی؟!

ئەگەر لەبەر جاشایاتیت نییە دە دوو جنێویش بەو تورکە گورگە بۆ رانە بدە، کە ڕاست وچۆپ دەستدرێژی دەکەنە سەر کورد و کچی کورد بە ڕووتی فڕێدەدەنە سەر شەقام و ڕەسمی یادگاری لەگەڵ لاشەی پیرۆزی کچانی کورد دەگرن. دەبەنگیت دەبێ لە چ سنورێك بوەستێت کاتێ پێتوایە شەرق وغەرب پیلان دژی ئەردۆگانی داعشڕەو دەگێڕن، و خەباتی پەکەکە ش تەنها هاندانێکی لایەنەکانی ئەو پلانگێڕانەیە. هەی قەزمی بستە بالآ، وتارێکی پڕ لە خیانەت و عەقڵیەتی داعشیەت نوسیوە بۆ ستایش و ئامۆژگاری ئەردۆگانی داعشڕەو، بەوە سەد بست بالآت کردوە کە شۆڤێنستێکی وەك فەیسەڵ قاسمی جەزیرە لە پەیجی خۆی بلاویکردۆتەوە!

وا دەزانی ئەگەر یەك زەڕە خێری میللەتی کوردی بێ پشتیوانت هەبا، فەیسەڵی شۆڤێنیزم وتاری تۆی برەو پیدەدا؟! هەی داماو ئەوەی تۆ دژی میللەتەکەت وهێزە خۆبەختکەرانی دەڵێیت، کە پ ك ك و دۆستانیت پێ کافرە وعەلەویە و شیعیە، سەرەڕای ئەوەی ناموس و بوونی کورد پ ك ك دەیپارێزێت لە سوریا و تورکیا و عێراق یش، ئەگەر من شتی وا بڵێم و بنووسم و دڵی شۆڤێنیستە عەرەبەکانم

خۆشـكردبا، ئێسـتا بەرنامـەم هەبـوو لـە تەلەفزیۆنەكانیـان. لـەو لەندەنـە داوای پیشكەشـكردنی بەرنامـەم لێكرا، بـەڵام بـە مەرجگەلیك كـە لەیەكـەم دیتنمدا ڕەتـم كردەوە، چونكـە ئامـادە نیـم وەك تـۆ دژی میللەتەكـەم بـم، هێشـتا دەڵێیـت مـن لـە حەژمەتـی ئـەوەی فەیسـەڵ قاسـم ستایشـی كردوویـت ئێرەییـت پـێ دەبـەم؟! جـاش هـەروا بسـتە بـاڵا وبچوكـە، بەخـوا ببیتـە بەڕێوەبـەری كەناڵـە بۆگەنەكـەی الجزیـرة ش ئێرەییـت پـێ نابـەم، بەڵكـو زیاتـر زگـم پێـت دەسـوتێت، وەك ئێسـتا زگـم پێـت دەسـوتێت، كۆمەڵێـك داعـش و عەرەبـی شـۆڤێنی هەڵـت دەپەڕێنـن تـا دژی كـورد بـەكارت بهێنـن.

٢٠١٥/٩/٢١

# سەردەمی فریودانی دینی بەسەرچووە!

کابرایەکی دەمشڕی میزاج موراهیقێکی داعشی، کە بەقەد دنیا سەقتەی ئەخلاقی دەزانم، وباش بۆیان باس کردم چۆن هەردەم سەفارەت بە سەفارەت گەڕاوە و موخابەرات بە موخابەرات گەڕاوە بۆ کاسبی دژی کورد . هاتووە پۆستێکی نوسیوە دەڵێت: پێم سەیرە کوردێك خۆی بە موسڵمان بزانێت باوەڕییە خوا وهتد هەبێت یەك تۆز مەیلی پەکەکەی هەبێت، چونکە بە قسەی ئەو پ ك ك سەرکردایەتی عەلەویە و مارکس یان پێ خوایە! وچەندین قسەی قۆڕیتریش.

من بەومیزاج داعشیە دەڵێم، ئەدی پێت سەیر نییە کوردێك باوەڕی بەخوا و قیامەت بێت پشتگیری هەموو دوژمنکاریەکانی و کۆمەڵکوژیەکانی ئەردۆگان بکات لە دژی کورد؟! ئەو ئیمانەی کە مەرجی ئەوەم لەسەر دادەنێت پشتی میللەتی مەزلومی بێ کەسی خۆم بەردەم، شەو و ڕۆژ هێرش کەمە سەریان بەو ئەدەواتەدینیە ئێکسپایەرە و بەو عەقڵیەتە داعشیە، و شەو و ڕۆژ ستایشی ئەردۆگانی لە خۆت گەمژەتر وبێ بەهاترکەم، سەگم لەو ئیمان ودینە بەردا پێشکەشی ئێوە بێت با ئەردۆگان و خەلیفە بەغدادی و فیصل قاسم ئافەرین لە تۆ بکەن بۆ ئیمانی بۆگەنت. تف لەو ئیمانەی کە دەمکاتە دوژمنی میللەتی خۆم و دۆستی دوژمنانی وەك ئەردۆگان و داعش . سەردەمی مەلای خەتێ و تڕاندنی دینی گوزەشت.

٢٠١٥/٩/١٩

# ئەردۆگانیەکان و هاوەڵانی فەیسەڵ قاسمی
# شۆڤێنی قەڵسن بە نەورۆز!

کابرایەکی مێژووچی کە تا سەر ئێسقان خۆیی و فیکر وقەڵەمی خستۆتە خزمەت ئەردۆگان و هەر زیانێك بۆ کورد، هاتوە وتارێکی نوسیوە بە عەرەبی لەسەر نەورۆز هەمان بیانووەکانی مەلا سەلەفیەکان و ئیسلامیەکان بە گشتی دووبارە دەکاتەوە، نازانیت چۆن بڵێت نەورۆز حەڕامە و بیدعەیە، بە ناچاری پەنا دەبەنە بەر بیانووی تر...

کاتی خۆی لە بیرمە ئیسلامیەکان کە بەژداری هیچ ئاهەنگ و گەشتێکیان نەدەکرد، کە کوران وکچان لێیان دەپرسین بۆ بەژداری ناکەن، دەیانگووت چۆن بەو هەموو ئەنفالە و کیمیا بارانە بەژداری ئاهەنگ وگەشت بکەین! شەرمیان دەکرد بڵێن ئاهەنگ وگۆرانی وگەشتیش حەڕامە بە تایبەتی ئەگەر کچ وکوڕ تێکەڵاوبوون!

دەڵێت: شەرع هیچ قەدەغەیەکی تێدا نییە بۆ ئاهەنگ گێڕان بە نەورۆز نە لە ئیسلام و نە دینە تەوحیدیەکانی تر، بەڵام لەوانەیە ئاهەنگ گێران بەو شێوەیە خزمەتی ئامانجە باسکراوەکان ناکات، ئەگەر لە دەستپێکی هەڵەوە دەستمان پێکرد"!

"نعم لیس هناك في الشرع ما یمنع الاحتفال بمناسبة النورورز لا في الاسلام ولا القیم التوحیدیة السماویة الاخری.ولكن قد یكون الاحتفال بهذه المناسبة بطریقة لا تخدم اهدافها المذكورة اعلاها اذا انطلقنا من بعض المنطلقات الخاطئة:"

ئەو پیاوە وادەزانێت کە لەقەبت گەورە بوو، دەتوانی بە کەیفی خۆت قسە بکەیت. نەزانیەکەی بەڵایە، نازانم لە کام شەرعی ئیسلام نەورۆز بە شێوەیەکی زانستی و دۆستانە باسکراوە، شەرع لە کوێ ڕێگای بە نەورۆز داوە!؟

دەستپێکە هەڵەکانی ئەوانەن:

یەکەم: دانانی ئەو بۆنەیە بە جەژنێکی نەتەوەیی تایبەت بە کورد لەسەر بنچینەی مێژوویی هەقیقی بنیات نەنراوە، و هەوڵێکی بێ هودەیە بۆ داهێنانی میسۆلۆژیایەك بۆ بیری نەتەوەیی کوردی لەسەر بنچینەی نازانستی.

اولا ان اعتبار هذا المناسبة هو العید القومي الكوردي الخالص لا تسند علی اسس تاریخیة حقیقیة ومحاولة یائسة لخلق میثولوجیا للفكر القومي الكوردي علی اسس غیر علمیة.

جارێ هیچ کوردێك نەیگوتوە نەورۆز تەنها جەژنێکی کوردیە، بەڵام کورد دەڵێت وەك چۆن فارس بە جەژنی خۆیان دەزانن ئەوانیش بە جەژنی خۆیان دەزانن، وکورد هیچ میسۆلۆژیایەکی لێ دروست نەکردوە، بەڵکو هەزاران ساڵە کورد ئاهەنگی بۆ دەگێڕێت، وەك مێژوو باسی دەکات، لە سەردەمی

ئەمەوی و عەباسی و ئەیوبییەوە تا دەگاتە عوسمانی. چ ڕێگە دەگرێت گەر کوردە نەتەوەییەکان سودی لێ وەرگرن بۆ بەهێزکردنی گیانی کوردبوون؟! کورد تەنها بەو جەژنە مەگەر کوردایەتی بجوڵێت، ئەی خۆ بە تەما نیت بە جەژنی قوربان گیانی خەباتی بجوڵێت کە ئەویش جەژنێکی هەر کوردی نییە؟! ئینجا دەڵێت: "فارسە ئێرانیەکان ئەو بۆنەیە بە ڕۆژێکی قەومی خۆیان دەزانن [بە پێی ئەفسانەی شاهنامەی فردەوسی] کە لەو ڕۆژەدا کاوەی ئاسنگەری فارسی سەرکەوت بەسەر دواهەمین شای میدیەکانی کورد زوحاك. ئەو ئەفاسانەیە ڕاستیە مێژوویەکان پاڵپشتی ناکەن. ئەگەر فارسەکان ئاهەنگی پی دەگێڕن لەبەر ئامانجی نەتەوەیی خۆیان تێناگەم بۆ ڕۆشنبیرە کوردەکان برەو بەو درۆیە دەدەن بۆ فریودانی گەل. گەلی کورد دێرینە شکۆمەنەدی و دیرەگی نەتەوەیی سەروزیادی هەیە، پێویستمان بەو ئەفسانەیە نییە"!

يعتبر الايرانيون الفرس هذه المناسبة يوما قوميا لهم لانهم يعتقدون (وحسب اسطورة الشهنامه التي الفه الكاتب الايراني الفردوسي) في يوم نوروز انتصر كاوة الحداد الفارسي على اخر ملوك الميدين الكورد زوحاك ( ازديهاك). هذه اسطورة لا تدعمه الحقائق التاريخية. واذا كان الفرس يحتفلون بها لاهداف قومية لهم لا افهم لماذا يقوم المثقفون الكورد بترويج هذه الاكذوبة وخداع الشعب. فالشعب الكوردي شعب عريق وله من الامجاد والمقومات القومية الكافية لسنا بحاجة الى هذه الاسطورة الكاذبة.

ئەوەیە ئامانجی هەقیقی لەو وتارە ترسنۆکە و چەواشەکارە، ناوێرێت بڵێت نەورۆز حەرامە و بیدعەیە وەك مەلا عبداللطیفی مەدخەلی، دێت باسی بنچینەی مێژوویی و کوردبونی زوحاك و فارس بوونیکاوە دەکات!

برادەرەکەی فەیسەڵ قاسمی شۆڤێنیش کە ڤایرۆسی سەلەفیەتی داعشیەت لێیداوە، ئەوەی بە ناوی علی سیرینی دەنوسێت، شەو ورۆژ ستایشی ئەردۆگان و فەیسەڵ قاسم دەکات وجوێن بە شەڕڤانانی کورد دەدات، ئەویش وەك ئەو ئەردۆگانیە هەر بە عەرەبی دەڵێت: " لە ٢١ ئادار ڕۆژی ئەوەی ناوی دەنێن بە جەژنی نەورۆز تێدەپەڕێت. گەلی کورد لەوانەیە تەنها گەلێك بێت لە جیهان کە ئاهەنگ بەبۆنەی دارمان و دۆڕانی دەگێڕێت...لەو ڕۆژە دوا شای میدیەکان زوحاك لەناوبردرا، کاتێ کۆرشی مەزن، کە دایکی کچی ئەو سایە میدیە زوحاك بوو، توانی کۆدەتا بکات بەسەر باپیری ودەست بگرێت بەسەر مولکی و بنچینەی یەکەم دەوڵەتی ئەخمینی فارسی دامەزرێنیت بۆ یەکەمجار لە مێژوو، لە ساڵی ٥٥٠ ی پێش زاینی!"

ي ٢١ آذار من كل عام تمر ذكرى ما يسمى بعيد النيروز." الشعب الكُردى قد يكون الوحيد فى العالم فى الإحتفال بسقوطه وهزيمته أمام أعدائه. ما يسمى بعيد النيروز ليس سوى تتويج للفرس وحيازتهم لأول مرةْ على الحكم.... لكن الغريب هو قصةْ نيروز. ففى هذا اليوم تم القضاء على آخر ملك ميدى وهو أستياك (يسميه العرب ضحاك) حيث قام كورش الكبير، الذى كانت أمه بنت هذا الملك الميدى، بالإنقلاب على جده (أب أمه) واستولى على ملكه، وبذلك

أسس أول بنيان للدولة الأخمينية الفارسية لأول مرة في التاريخ، في عام ٥٥٠ قبل التاريخ.

## بە نسبەت ئەو دوو ئەردۆگانیەوە دەڵێم:

ئەوە تەنها بیانوی دیندارییە وات لیدەکات ئەو قسە هیچ و بێ بنەمایانەی فیردەوسی لەلایەک بڵێیت ئەفسانەیە و لەلایەکیتر بڵێیت کەوابوو نابێت کورد بە ڕۆژی خۆی بزانێت چونکە شاهنامە دەڵێت جەژنی فارسە! و لە لایەکیتر بڵێیت کورد لە دێرینەوە هەتا لە سەردەمی ئەیوبیەکانیش ئاهەنگیان گێڕاوە بە نەورۆز! لەلایەکیتر بڵێیت کوردە نەتەوەیەکان دەیانەوێت نەورۆز بکەنە میسۆلۆژیا فکری نەتەوەیی! ئەو هەموو هەڤدژیە تەنها ئاماژە دەکات کە تۆ بە پاڵنەرێکی دینی ئیسلامی سیاسی کە دژی هەموو بۆنەیەکی نا ئیسلامیە دەوەستیتەوە چونکە بەڕای ئێوە ناکۆکە لەگەڵ ئەندێشەکانی سەلەفی ساڵح! ئەوە کاری مێژوو نوسانە بێن بەرگری لە مێژووی میلەتەکەیان بکەن، نەک مێژووناسان بێن بە عەقڵیەتێکی سەلەفی وشکەوە زۆربەی مێژووی کورد بشەیتانێنن.

ئەگەر کورد لەوەتی هەیە ئاهەنگ بگێڕێت بەو بۆنەیە، کەوابوو ئەگەر کورد بۆچوون و چیرۆکی خۆسی نەنوسیبێتەوە دەربارەی هۆکاری ئاهەنگ گێڕانی بە نەورۆز بەڵام چیرۆکی پشتاو پشتی زۆرمان هەیە دەربارەی نەورۆز، دەکرێت بڵێین مەسەلەی کاوە وزوحاك وکردنەوەی ئاگری ئازادی هەمووی لە بنەڕەتدا داستانێکی یان ئەفسانەیەکی کوردی نە نوسراو بێت وکورد لە بەدبەختی خۆی تۆماری نەکردبێت لەلایەن زانایانی لەوانەیە لەبەر هۆی ئایینیەوە یان لە نەزانییەوە، فارسەکان هەرزوو دەستی خۆیان وەشاند وزۆربەی ئەفسانە وداستانی ئارياییە کۆنەکانیان بۆخۆیان تۆمار کرد وبە هەوەستی خۆشیان دەسکاریان کردوە.

فیردەوسی داستانی شاهنامە دەنوسێت لە جەوێکی ئەفسانەیی، تێیدا بە کەیفی خۆی کەسەکان ورِوداوەکان ئاڵ وگۆڕ دەکات هەتا زوحاکیش بەعەرەب لەقەڵەم دەدات وبەشێوەیەکی ئەفسانەئامێزانەش ئاماژە بە بوونی کورد دەکات، گوایە لەو منداڵە رزگاربوانە لە سەربڕینی زوحاك کورد دروست بوە.

[کنون کرد از این تخمه دارد نژاد کز یباد ناید بدل برش یاد]

[جا کوردەکان لە تۆرەمەی ئەو لاوانەن کە نەیاندەزانی ئاوادانی چیە][٢] دەیەوێت بڵێت کە کورد لە فارسەوە وەپاش کەوتوە پاش هەڵاتنیان بۆ کێوەکان! لە بنەڕەتدا فارسن ولەدەست زوڵمی پاشای عەرەب ڕایان کردوە،

کەوابوو ڕاست ناکەن کە دەڵێن زوحاك پاشای میدی کوردە لە شاهنامە، بەڵکو لە شاهنامە زوحاك بە عەرەب دانراوە!

شاهنامە نەورۆز ناگێڕێتەوە بۆ شەری کاوە وفەرەیدون لە دژی زوحاك، یان کودەتای کۆرِوشی مەزن بەسەر ئەستیاگی پاشای میدیەکان، کە سەرلەبەری ئەفسانەیە، بەڵکو بەو جۆرە ئەفسانەیەوە باسی دەکات: " ئینجا جەمشید هات سەر تەختی فەرمانڕەوایی لە پاش باوکی تەهمورت کە ئەویش وەك ئەو سەرکەوتو بوو بەسەر دێو ودرەنجەکانیش وتوانی لەسەر قەروێڵە ڕازاوەکەی بفرێت بەسەر هەموو

مەملەکەتەکانی بە هۆی جنۆکەکانیەوە!! جنۆکەکان لەو رۆژە هەڵیان گرت کاتێ خۆر کەوتە قوللەی حەملەوە، وزۆر دلخۆش بوو ومەی دەبەخشرایەوە وئەو رۆژە ناونرا بە رۆژی نەورۆز کە بوە عورفێکی پیرۆز لای فارسەکان. "[٣]

شاهنامە لە ڕووی ڕاستیەوە ناکرێت پشتی پێ ببەسترێت زۆر لە رەخنەگران پێیان وایە کە قۆناغی یەکەمی شاهنامە: سەردەمی ئەفسانەییە کەباسی گیومیرت وجەمشید وزوحاک وفەرەیدون وکاوە دەکات، کە ئەو قۆناغە هیچ نرخێکی مێژوویی نییە ورەنگی ئەفسانەیی زاڵە بەسەریدا.

لە کۆتاییدا ئەو بەشەی نوسینێکم لەسەر نەورۆز دووبارە دەکەمەوە: " ئەو دژە نەورۆزانەی چیرۆکی کاوە وزوحاکیان هێندە بە جدی وەرگرتوە دەڵێی باسی کەسانێکی سەدەی بیست ویەکەم دەکەن، وکاوەی داماو دەکەنە خاین وخۆفرۆش، کە ئەمڕۆ هەزاران کورد ناوی کاوەیە! وزوحاک دەکەنە دوا پاشای میدیەکان [ئەشتیاگ] نازانم بە چ پێودانگێك کە تۆ نەتوانی هیچ مێژویەکی کۆن بە وردی دیاری بکەیت؟! پێم وایە مێژووی نەورز دەگەڕێتەوە بۆ زۆر کۆنتر لە مێژووی ڕوخانی دەوڵەتی مادەکان یان دامەزراندنی دەوڵەتی ئەخمینیەکان، نەورۆز کۆنترین داستان یان ئەفسانەی ئارياييە، ئەفسانە بەرهەمێکی گرنگی عەقڵی مرۆڤە بە گشتی. هەرچۆنێکی بێت چیرۆکی کاوە وزوحاک دەبێت لە چوارچێوەی داستانێك یان ئەفسانەیەکی نیشتیمانی بخوێندرێتەوە نەك وەك مێژوویەکی واقیعی، خوێندنەوەی بەو شێوەیە داستانێکی بەسوود دەبێت بۆ پتەوکردنی هەستی ئینتیما بوونی پوکاوەمان.." ئینجا ئەگەر بەدوای ڕاستی وناڕاستی ئەفسانەی نەتەوەیی بگەڕێیت دەبێت گریکەکان هەموو ئەفسانەکانی خۆیان گڕ تێ بەردەن!

کورد نەورۆزیشی نەمێنێ کە ملیۆنەها کورد دەهێنیتە سەر جادە و کۆبوونەوە و خۆپیشاندانەکان وەك لە باکوور دەیبینین، چی دەمێنێتەوە لەو ئەمجادانەی کە باسی دەکەیت؟! مەگەر ئاهەنگ بە لە دایکبوونی سەلاحەدینی ئەیوبی بکەین، کە لەبەر خراپی عەرەبە هاودینەکانمان، خەڵکێکی زۆر ڕقی لە سەلاحەدینیش بۆتەوە!

کەوابوو شانامەش پشتگیری ئەو چەواشەکاریانەتان ناکات، و پاڵنەری دینی سەلەفیانەتانە وا هانتان دەدات لە دژی جەژنێکی کۆنی کورد، ئەوەش ڤایرۆسێکی دینداریە ئەوەی گرتی بەلایەنی کەم پازدە ساڵی دەوێت تا بەریدات یان خراپتر ڕۆ بچێت!

# کەسانێك باسی هزری ئیسلامی دەکەن
# بە مەقەسی ترسنۆکی ڕەقیبەوە!

زۆرن ئەوانەی کە دەم دەکەنەوە لە باسکردنی کێشە وباسە فیکریەکان لە ڕووی تیۆریەوە، وادەزانیت گوێ لە ئیبن ڕوشد دەگریت، کەچی ڕۆژێک لە ڕۆژان هەڵوێستێکی هزری وفیکری شایستەی وایان لێ نابینین، کە یەك لە سەد پاڵپشتی قسە تیۆریەکانی بکات. کەسێکن هەڵدەکەن لەناو حزبی بێ هزر و تەژی لە دوژمنانی هزر وبیرکردنەوەی تەقلیدی لە سەلەفیەکان وسیاسیە هەلپەرستەکان، کەچی هیچ کێشەیەکی نیە لەگەڵ ئەوانەی ڕۆژانە ژەهری توندڕەوی دەڕێژنە ناو کایەکانی کۆمەڵگاکەمان ومێشکی لاوەکانمان، بێدەنگە لە هەموو قەباحەتەکان بەوپەڕی ترسنۆکی وبێ جورئەتەوە، بۆتە پاسەوانی بتە کۆنەکان، نە بە نهێنی ونە باشکرا ناوێرێت باسی بت و تابۆکان بهێنێت!
یەکێك لەوانەی کە گوایە بایەخ بە فیکر دەدەن، و سەرۆکی سەنتەرێکی فیکری ئیسلامیە، هاتوە وبابەتێکی دوور ودرێژی لەسەر تایبەتمەندییەکانی هزری ئیسلامیی نووسیوە، هەمووی لە چوارچێوە تیۆری دەخولێتەوە، کە بەڕای ئەو وتارە تیۆریانە و هەزار وتاری تریشی لەو جۆرە بخەیتە سەر، بە قەد هەڵوێستێکی پراکتیکی هزری نایەت کە دەریبڕیت، بێ گوێدانە پلە وپایە وبرادەراتی ونان بڕان و قسە وقسەڵۆک، وئەو قسە قۆڕەی کە دەڵێت: دۆستت هەزار بێ کەمە ودوژمنت یەك بێ خەمە! ئەو قسەیە بۆ شەڕی کۆڵانان باشە، لەناو کایەی فیکر وهزر ولای خاوەن فیکری ئازاد جێیان نابێتەوە! ئەوەی لە بواری فیکر وهزر کاردەکات دەبێت جورئەتی فیکری هەبێت پێش ئەوەی دکتۆرا و ماستەر وئەلقابی زەبەلاح، کە زۆر لەو خاوەن ئەلقابە زلانەمان دیون بای جورئەتی توندرەوێکی نەخوێندەواریشیان تێدا نیە! کێشەی ڕۆژهەڵات ئەوەیە کە توندڕەوەکانی بەوپەڕی حەماسەت ولەخۆبردنەوە پشتگیری لە هزرە سەقەتەکانیان دەکەن، کەچی میانڕەوانیان لە ئاستی دکتۆرا و لەقەبە زلەکانی تر، ناوێرن فزە بکەن، ودڵی شەیتانی ڕەجیمیش ناشکێنن! بۆیە بەڕای من بڵاوبوونەوەی توندڕەوی سێ بەشی تاوانەکەی لە ملی حزب و کەسایەتی وڕێکخراوە بەناو وەسەتیەکان ومیانڕەوەکانە!
تۆ کە خۆت بە خاوەن هزر وپڕۆژەی هزری زەبەلاح ناوزەد دەکەیت خۆت کۆمەڵ بیت، بەڵام لەگەڵ یەکێتی، یەکێتی بیت، ولەگەڵ گۆڕان، گۆڕان بیت، ولەگەڵ پارتی پارتی بیت، ولەگەڵ یەکگرتوو، یەکگرتوو بیت، لەگەڵ سەلەفی سەلەفی بیت، ولەگەڵ ئەشعەری، ئەشعەری بیت هتد، چی دەمێنێتەوە بۆ فیکر لە ناو ئەو فەزایە پڕ لە ترسنۆکی وبێ جورئەتی و دڵی مێشێك نەڕەنجانەدا؟!
بەر لەماوەیەك لەو سەنتەرە بۆ لێکۆڵینەوە فیکریە برایەکی ڕێزدار نامەیەکی بۆ ناردم کە هاوکاریان بکەم بە نووسین، منیش کەمێك خۆم دواخست لەبەر ناسینی سەرۆکی ئەو سەنتەرە و ڕادەی بوێری فیکری ودەمزانی دەنگی دەهۆڵی ئەو کەسە لە دوورەوەش بۆمن خۆش نیە، کەوابوو پێویست ناکات نە

ئەوان و نەخۆم ئیحراج كەم، چونكە من سروشتی نووسینەكانی خۆم دەناسم، نامەوێ وەسفیان بكەم كە زۆر باشن یان خەراپ، بەڵام دەزانم لە كاتی نووسیندا تەنها موراعاتی هەقیقەت دەكەم وبەس! هەقیقەتی ڕەهاش نا، بەڵكو هەقیقەت وەك من لەو ساتەدا دەیبینم. بەدەر لەوە هیچ حیساب بۆ تابۆكان و كەسەكان و دۆستەكان و كەسوكارەكان وناوە زلەكان وحزبە قەبەكان وتیرۆرستە پیاو كوژەكان وكەسی تریش ناكەم.

لەو مەسلەكەم بە پێچەوانەی سەرۆكی ئەو سەنتەرە بۆ لێكۆڵینەوە فیكریە تووشی زۆر سەر ئێشە وجوێن و سوكایەتی و هەڕەشە و موحارەبەكردن لە ڕزق و ناحەز پەیدا بوون وزۆر شتی تر بووم، بەڵام لە پێناو گەیاندنی هەقیقەت وەك خۆی ونەفرۆشتنی وشە وسازش نەكردن لەگەڵ هێزە تاریك و نەگریس و فریودەرەكان، هەست بە ئاسوودەیەكی ویژدانی زۆر دەكەم، هەست دەكەم ڕاستگۆم لەگەڵ ئەوانەی چاوەڕوانی نووسینەكانم دەكەن، وهەست دەكەم دەتوانم كاریگەریم بەجێبێڵم لەسەر ئەو گەنجە پاكانەی كە عەوداڵی هەقیقەت و خزمەتكردنی میللەتەكەیانن لەناو ئەو زەلكاوە گەورەی توندڕەوی و ساختەكاری و فریودەری وخۆفرۆشیەی ڕۆژهەڵات.

پاش ماوەیەك هەمان برا نامەیەكی تری بۆ ناردم بۆ هاوكاری لەگەڵ سوكە گلەیەك، منیش ئەو بابەتێكم بۆ ناردن، كە بۆ هیچ لایەنێكم نەناردبوو، بابەتەكەم بە ناونیشانی[ موعتەزیلە و بوێری لە ڕیزگرتن لە عەقڵدا، تەرازوە سەقەتەكەی جەرح وتەعدیل!! ] كە بابەتێكی هزری وفیكری بوو، زۆر بوێرانە باسی هەڵوێستی موعتەزیلە بوێرەكانی دەكرد لە ڕەتكردنەوەی هەر حەدیسێك كە دژی قورئان و لۆژیك وعەقڵی دروستی ئادەمیزاد بوایە، و دادگاییەكی ئەو بنەمایە خوار وخێچانەی دەكرد كە زانستی جەرح وتەعدیل ی حەدیس پەیڕەوی كردوە لە بەڕاست دانان و لاوازدانانی حەدیسێك و ڕاویەك وگێڕەرەوەیەك، كە لە ئەنجامدا هەزاران پیاوخراپ و خەڵكانی بێ متمانە، متمانەیان پێ بەخشرا، وهەزاران خەڵك وزانایانی گەورەی وەك ئەبو حەنیفە وزانایانی تری موعتەزیلە ومەزهەبەكانی تر، كە ئەهلی حەدیس بە موخالیف وناحەزی خۆیانیان دەزانین بێ متمانە كران و بە پیاو خراپ ودرۆزن ولاواز دانران، ودەیان تۆمەتی تریان خرایە پاڵ!

كەچی سەرۆكی سەنتەری لیكۆڵینەوەی فیكری ڕازی نەبوو ئەو بابەتە فیكریە بلاوكاتەوە بە بیانووی: قسە وقسەڵۆك بۆ سەنتەرەكەی دروست دەكات؟! سەنتەرێك تەنها ئەو بابەتانە بلاوكاتەوە كە یەك قسە وقسەڵۆك [ووروژاندنی فیكری ڕاسترە] نەوروژێنێت، بوون ونەبوونی چ لە بابەتی هزری ئیسلامی دەگۆڕێت، تۆ نەوێریت بابەتێك بلاوكەیتەوە كە بەدەستی كەسێكی سەنتەرەكەش نەنوسراوە، دەبێت جورئەتی گۆڕانی چیت هەبێت؟! تۆ لەبەر خاتری توندڕەوان نەهێڵیت هیچ بابەتێكی پەیوەست بە حەدیس بوروژێت، چونكە سەلەفیەكان كە باسی حەدیست كرد وادەزانن باسی شەڕەف وكەرامەتیان دەكەیت، ئەی كەی باسی حەدیس كەین، ئەو حەدیسەی خەریكە سەری خودی ئیسلام دەخوات، كەی باسی كەین، تا داعش هەموو جیهانی ئیسلامی داگیردەكات بە پشت بەستن بەو حەدیسە سەقەتانە؟!

٢٠١٤/٧/٢٧

# شازی دوعاکانی مەلا مەزهەر: لاپەڕەیەکی ون لە کتێبی هەواڵی دەبەنگ وگێلەکان

لە کتێبی (اخبار الحمقی والمغفلین) ی ابن الجوزی (الشیخ الامام جمال الدین ابو الفرج عبد الرحمن بن علی بن محمد بن علی الجوزی) نوکتە گەلێگی زۆر خۆش ونایاب هەیە، تا ڕادەی ئەوەی ناتوانم باسی هەمویان بکەم، چونکە لە سایەی ئەو گرژی ومچ ومۆڕیەی کە بە ناوی دینداری بلاوبۆتەوە ناتوانیت زۆر لەو قسانە بکەیت کەبەر لە زیاتر لە هەزار ساڵدا کراوە!! بەڵکو هەتا حەدیس وفەرمودەی وا هەیە لە بوخاری وموسلیم بە پێوەری نەفسی ومیزاجی سەلەفیەتی هاوچەرخ مایەی قبول کردن نیە، هەرچەندە جورئەتی ڕەتکردنەوەی ناکەن بە شێوەیەکی ڕاشکاوانە.
لەو کتێبەدا باسی هەواڵی دەبەنگ وگێلەکان دەکات بە شێوەیەکی گشتی، ئینجا پۆلینیان دەکات بە پێی پۆلینکردنی پیشەیی.
بێگومان خوێندنەوەی ئەو کتێبە جگە لەوەی ئاسۆیەکی تری فیکری ئیسلامیت نیشان دەدات، بەلام لە هەمان کاتدا چێژێکی خۆشیش دەبەخشێتە خوێنەر، لەو کتێبەدا نوکتەیەکی بێشوماری تا ڕادەی نوکتەی سێکسی تێدایە، ودەمارگرژیشی بۆ کەس تێدا نیە هەتا بۆ ئەئیمەکان وموحەدیسەکان وواعیزەکان وزاهیدەکان وهتد. نەک وەک هەندێ موسڵمانی ئەمڕۆ بەرگری لە هەموو قسەیەکی قۆڕ وبێ ئەرزش دەکەن لە کەسێکی ناو گۆڕەپانی ئاینی دەربچێت، وبەرگری لە شێت وهاریش دەکەن ئەگەر بەناوی ئیسلام قسە بکەن.
چەند نمونەیەک لە نوکتەکانی ئەو کتێبە دەخەینە ڕوو:
مەلایەک لە کاتی نوێژدا لە سورەتی روم دا ئەو ئایەتەی بەو شێوەیە خوێندەوە: (الم غلبت الترک) لە جیاتی غلبت الروم، یەکێ پێی گووت: ڕاستیەکەی غلبت الروم. لە وەلامدا گووتی: هەمووی هەر دوژمنن گرنگ نییە! (کلهم اعداء لا نبالی بهم)!
- مەلایەک نوێژی زۆر درێژ بوو خەڵکی گەڕەک لێی بێزار ببوون، ویستیان دەری کەن، وتی هیچیتر وا درێژی ناکەم، بۆ بەیانی کە پێشنوێژی بۆکردن لە پاش خوێندنی الحمدلله، کەمێک وەستا وبیری دەکردەوە ئینجا گوتی: دەڵێن چی (عبس) باشە؟ کەس وەلامی نەدایەوە جگە لە پیرەمێردێکی ڕیش لەو درێژتر ولەو بێ ئەقڵتر، وگوتی: باشە بەردەوام بە.
- لای هەندێک دینداری گێل یان غەریبۆکە (زهاد المغفلین) -ئەوە قسەی ابن الجوزی یە کە دەیسەلمێنێ دینداریش گێلی ودەبەنگی تێدایە- ئەو ئایەتەی سورەتی یوسف یان خوێند:: " وقال نسوه فی المدینه امرأة العزیز تراود فتاها عن نفسه " گووتی: واز لەو ئایەتانەی فاجیران بێنن (فقال: دعنا من آیات الفجار)!!

- دەگێڕنەوە گوایە زاهیدێکی دەبەنگ هاتە شوێنێک خەڵک تەبەڕوکیان پێدەکرد، لەو مەجلیسەدا باسی حەزرەتی لوت کرا، زاهیدەکە گوتی: نەفرەتی خوای لێ بێت!! گوتیان ئەوە پێغەمبەرە هەی هەش وەسەر، ئاوڕی دایەوە لای قازی کە لە مەجلیسەکەدا بوو گوتی: نەمدەزانی، ئەوە لەسەر دەستی تۆ تۆبە دەکەم، پاش باس وخوازێکی زۆر باسی فیرعەون کرا، پێیان گوت: ئەی ڕات دەربارەی ئەوە چۆنە؟ گوتی: من تۆبەم کردوە توخنی باسی پێغەمبەران ناکەوم!!

- یەکێک لای واعیزێک گوێی لەو ئایەتە بوو: " يتجرعه ولا يكاد يسيغه " (واتە بە زۆر ئەیخواتەوە بە بێز وقێزەوە) کە لە وەسفی ئەشکەنجەی جەهەنەمدا هاتوە باسی نۆشتنی کێم وخوێنێکی قێزەون دەکات لە دۆزەخ و يُسْقَى مِنْ مَاءٍ صَدِيدٍ، کەچی کابرای دەبەنگ گوتی: خوایە لەوانە بین کە ئەیخۆنەوە بەبێ بێز!! (فقال: اللهم اجعلنا ممن يتجرعه ويسيغه.)

- کابرایەکی ئەعرابی حەجی کرد وچوە ناو مەککە بەر لە خەڵک ودەست ودامێنی پەردەی کەعبە بوو وگوتی: خوایە بمبورە بەرلەوەی خەڵک هێرشت بۆ بێنن!! ( اللهم اغفر لي قبل ان يدهمك الناس)

- کۆمەڵە کەسێک لە سەفەردا بوون کە توشی ڕەشەبایەکی توند هاتن تا بێ هیوا بوون لە ژیان بەڵام ڕزگاریان بوو، هەر کەسەی بەندەیەکی ئازاد کرد بۆ خوا، پیاوێکی دەبەنگ کە بەندەی نەبوو گوتی: خودایە بەندەم نییە ڕزگاری کەم بەڵام ئەوە ژنەکەم سێ بە سێ تەڵاق دەدەم لە پێناو تۆ) !!

لە دوایەکی تری شاز کابرایەکی تر دەیگوت: خوایە بە تەنها لەمن خۆشبە!، گوتیان بۆ دوعاکەت فراوانتر ناکەیت خوا لێبوردنی زۆر وفراوانە، گوتی: نامەوێ بارگرانی بۆ خواکەم دروست کەم! (اكره ان اثقل على ربي)

- دەبەنگێگ گوێدرێژێکی هەبوو کە نەخۆش کەوت، ئەویش نەزری کرد ئەگەر گوێدرێژەکەی چابوەوە دە ڕۆژ بە ڕۆژوو بێت، گوێدرێژەکە هەر زوو چابوەوە، ئەویش دەستی بە ڕۆژوو گرتن کرد کە دەیەمینی تەواو کرد گوێدرێژەکەی مرد (یان تۆپی!)، کابرا گوتی: خوایە پێتڕابواردم! بەڵام خۆ ڕەمەزان دێت!! (فقال: يا ربت تلهيت بي! ولكن رمضان إلى هنا يجيء)

- محمد سەیرافی م دی کە ریشی درێژ بوو دەستی بۆ ئاسمان بەرز کردبۆوە ودوعای دەکرد ودەیگوت: ئەی رزگارکەری مردوان وخنکاوان!! ئەی قەبوڵکەری تۆبان، ولێبوردە لە هەڵەکان، تۆ کەسانی ترت دەست دەکەوێت ڕەحمیان پێبکەیت، منیش کەسیتر نادۆزمەوە ئەشکەنجەم بدات جگە لە تۆ!!!

" رأيت ابا محمد السيرافي وكان طويل اللحيه يدعو ربه وقد رفع يديه إلى السماء وهو يقول: يا منقذ الموتي ومنجي الغرقي وقابل التوبات وراحم العثرات انت تجد من ترحمه غيري وانا لا اجد من يعذبني سواك."

لەو نمونەیەدا بە ناوی (خشوع الحمقى) باسی دیندارێکی تر دەکات کە بەو جۆرە دوعا دەکات لە سوژدەدا: عن بشر بن عبد الوهاب قال: كان يجلس إلى عمود في دمشق رجل جميل الهيئه فرايته يوما وقد سجد ويقول في سجوده: سجد لك خضرتي وحمرتي وصفرتي وبياضي وسوادي خاشعا ضارعا خاضعا ..... ومن انا عندك! الزاني ابن الزانيه حتى لا تغفر له.

(سەوز وسور وسپی وڕەشم بۆ تۆ کرنۆش ئەبات، بە خشوع وپاڕانەوە ومنی کە هینی دایکی... (ڕووی مەجلیسی نیە)، منی زیناکەری کوڕی ئافرەتێکی زیناکەر کێیە هەتا لێی خۆش نەبیت!! نوکتەی تری گەلێک زۆری تێدایە ناکرێت باسی هەمویان بکەین، خۆزگە یەکێک وەریدەگێڕایە سەر کوردی، بەڵام تا کتێبەکانی دەستوری توند وتیژی وفەتواکانی ئەبو قەتادە هەبێت کێ گرنگی بەو لەهوە دەدات!

لە کوردەواریش ڕوداوێکی زۆری دوعا ومەلا هەن کە دەبوایە لاپەڕەکانی کتێبێکی وەک کتێبەکەی ابن الجوزی بونایە، خۆشترینیان ئەو مەلایەی ئەو دوایەی هەولێرە (لەوە ناچێت خەڵکی هەولێر بێت) کە شازی دوعا دەکات، دوعاکانی هەرچەندە ئەو بەو پەڕی جیدیەوە دەکات، وبرادەرێکی قۆشمەچیش پێیوایە ئەوە داهێنانە لە دوعا!! بەڵام ئەو دوعایانە ترۆپکی کۆمیدیایە، خوا خێری بنوسێتن بۆ دوعاکانی نا، بەڵکو بۆ بە پێکەنین هێنانی هەزارانی وەک من، ئەوەش نمونەیەکە لە دوعا شازەکانی یان شازی دوعاکانی:

"ئەوەی نەچوتە کۆلێج بچێتە کۆلێج! ئەوەی ژنی نەهێناوە ژن بێێ! ئەوەی یەکێکی هەیە بیکا بە دوان، ئەوەی دوانی هەیە بیکا بە سێیان، ئەوەی سێیانی هەیە بیکا بە چوار (قوڕ بەسەری ژنان ئەگەر گیرا بێت)!! خوا چوار سەیارەی بداتێ ، چوار خانی بداتێ! چوار مەعاشی بداتێ هەر مەعاشەی لە سێ ملیۆن کەمتر نەبێ (چوار مەعاش بێگومان ئەوە دوعایە بۆ مەعاشی بندیواران!) ... ئەوەشی ئیهانەی پێغەمبەر دەکات یارەبی بایعەکەی ببڕێ! فۆرمی بایعەکەی بزر ببێ تایەی سەیارەکەی بتەقێ!! ... ئاردەکەی پڕ ئەسپێ بێ، مەعاشەکەی ببڕێ، هەتا ماوە کۆلێج تەواو نەکات!! هەتا ماوە تەعین نەبێ، قەبرەکەی دۆڵێک بێ لە دۆڵەکانی جەهەنەم!!! یارەبی ئەو ڕۆژەی ئەمرێ مامۆستا لەوێ نەبێ، نوێژی لەسەر نەکرێ!! کفن نەبێ بیکەیتە بەری، مردوشۆر نەیشۆرێ!! کە ئەیبەن بۆسەر قەبران تایەی ئەو سەیارەیەی جەنازەکەی تیایە بتەقێ، ڕۆژێکی زۆر گەرم بێ خەڵکی بێزار بێ!! یارەبی کە ئەیبەن بۆ سەر قەبران قەبرەکەی حازر نەبێ، حەفارە پێی هەلنەقەنێ ئەوەندە ڕەق بێ، مامۆستای سەر قەبران تەڵقینی لەبەر نەبێ!!! (ئەخر هەی بێ ویژدان خودی پێغەمبەر کە لە تایف گاڵتە وئیهانە وبەرد بارانیان کرد تا زامداربوونی کاتێ وەک حەدیسەکە باس دەکات فریشتەی چیاکان پێیگوت: ئەگەر حەزت لێیە ئەو دوو چیایە بەسەریاندا دەڕمێنم ، لە وەڵامدا گوتی: (بل ارجو ان یخرج الله من اصلابهم من یعبد الله وحده لا یشرک به شیئا) کەچی جەنابت دوعا دەکەیت تایەی ئەو سەیارەی جەنازەکەشی هەڵگرتوە بتەقێ!! خۆ کابرا مردوە شەیتانیش دەستی لێ شتوە! دەبێت کەسێک ئەو جۆرە دوعایانەی بە جیدی لێ دەرچێت دەبێت چارەسەری کێشە دەروونیەکانی بکات! بەڕاستی غەریبە!

٢٠٠٩/٦/١٣

# بەخوای دەمی پیسە لەگەڵ ڕێز و حورمەتما

ئەو ناخە بۆگەنەی مەلاژنی پێ وەزیفەیەکی زۆر سووکە، وەك عەقڵیەتی توراسی عەرەبی کە هەتا ناوی کردەی سێکسی نێوان ژن وپیاو، هەمووی بە سوکایەتی داتاشیوە بۆ ئافرەت. ئەویش هەموو فەرهەنگی خۆی لەعەرەبی وەر گرتووە، بۆیە هێندە وەزیفەی ژنایەتی هاوسەری خۆی لا سووکە. پەیوەندی ژن ومێرد دەبێت ببێتە مایەی خۆشەویستی و ڕیزی بەردەوام، نەك بە ڕوانگە و مینزاری عەرەبی، کە چۆن ڕەفتار دەکات لەگەڵ ئاژەڵەکانی بە هەمان شێوە زاراوەکانی بەکارهێناوە لەکاتی ڕەفتارکردنی لەگەڵ ژنیدا، هەتا وەسفی جوانی حوشتریشی وەك الدلصاء والضرعاء و الدحدوح و القیدود ، ئەوانە هەمووی بەشدارن لە نێوان حوشتری ناقە و ژن دا! دەربارەی پەیوەندی سێکسی ژن وپیاو هەمان زاراوەی ئاژەڵی بۆ بەکار دەهێنێت وەك :

امتطاء، الوطا، اعتلاء، درس، تحته امرأة، فرش امراته

چەندین ناویتر کە وا نیشان دەدات ئەو کارەی لەگەڵ خێزانی خۆشت دەکەیت زۆر قێزەون و شورەییە بۆ خێزانت! مەلا مەزهەریش بۆیە ئەوەی پێی دەڵێن مەلا لە ڕقان بەمەلا ژنیان دەچوێنێت، چونکە لە مەلاژن سووکتر وخراپتر نیە لای ئەو!چونکە لای ئەو ئافرەت هەرئەو حوشترە مێیەیە کە کاری بەس هەڵگرتنی خاوەنەکەیەتی، داوەشێی لەگەڵ خۆت و فەرهەنگت لەگەڵ ڕێز وحورمەتما.

٢٠١٥/٨/٢٣

# مەلا شێرزاد وپاسپۆرت بە نیقابەوە!!

من یەکێکم لەوانەی حەز بە گوێگرتن دەکەم بۆ وتارەکانی مامۆستا مەلا شێرزاد، نەك لەبەر ڕاستی ناوەرۆکەکانی، بەڵکو زیاتر لەبەر ئەو زارزمانە هەولێریە خۆشەی کە لە وتارەکانیدا قسەی پێدەکات، هەولێریەکی پەتی لەگەڵ قەڵەوکردنی چەند پیتێک لەژێر کاریگەری زمانی تورکمانی... مەلا شێرزاد بەو دوایە هەست دەکەم زۆر ڕۆچووە لە لایەنە سەلەفیەکەی بەبێ بیرکردنەوە چیرۆکە پر پڕوپاگەندە ودرۆکانی سایتە سەلەفیەکان دەگێڕێتەوە بۆ خەڵکی هەولێری دیندار وسافیلکە کە لەبەر خۆشەویستی دین وئیسلامدا ئامادەن باوەڕ بە هەموو ڕاست ودرۆیەک بکەن کە لە دەمی مەلایاندا دەردەچێت.

بەڕاستی هەست دەکەیت لە هەولێر لایەنی دینداری لە کەسایەتی هەولێریدا زۆر لە سنوری خۆی گەورەتر کراوە لەسەر حیسابی هەموو لایەنەکانی تر، بۆ نمونە لایەنی عەقلانی یان سیاسی. وەك نمونە بۆ لایەنی عەقلانی خزمێکی دیندارم لە هەولێر لە شوێنێك ئایس کرییمان دەخوارد هێندە گەورە و قەرەباڵغ بوو، زۆر بە سادەیی گوتی دەزانی مەلا فلان کچەکەی خۆی پێشکەشی ئەو کوڕەی خاوەن ئەو شوێنە کرد، هەر بە جلی بەریەوە!! گوتم وەڵڵا مەلا باشی لێدەزانێت، کچەکەی خۆی پێشکەشی بەو کورە باوك ملیۆنێرە کردوە، ئەگەر ڕاست دەکات دەبا پێشکەشی کوڕە هەژارێکی وەك تۆی کردبا وەك سعیدی کوڕی جوبەیر، ئەوە کەی پێشکەش کردنە، بەڵکو زەواجێکی پێشکەش بە کچی خۆی کردوە زۆربەی کچان خەونی پێوە دەبینن!

ئەنانیەت وخۆپەرستی بانگخوازەکان گەلێك زۆرە لە بیرمە یەك لەو بانگخوازە قسە قەڵەوانە بە خەڵکی دەوت خوشکانتان بدەنە هەژار وموجاهیدان، خۆشی خوشکەکانی دەدایە دەوڵەمەند وئیخوانە دوور لە جیهادەکان!! جارێک بە یەکێکی گوتبوو فلان کەس دەیەوێت بێتە داخوازی بۆ خوشکت، بەڵام هیچی نیە نە ماڵ نە پارە ونەکار!! ئەویش پێی گوتبوو: بە شەرەفت تۆ خوشکی خۆتی دەدەیێ تا من بیدەمێ بەو حاڵە؟!!

بابێینەوە سەر باسەکەی مامۆستا مەلا شێرزاد لە کاتی پارشێودا، کە چیرۆکی کچێکی ڕوسی دەگێڕایەوە کە موسڵمان ببوو لەسەر دەستی کوڕێکی عەرەب بەناوی خالید. ڕۆژێك ژنە ڕوسیەکە داوای کردبوو سەردانی ماڵە باوکی بکات ولەوێش پاسپۆرتەکەی نوێکەنەوە، دەچنە ڕوسیا ولەو شارە لە هوتێڵ دادەبەزن بۆ بەیانی دەچنە فەرمانگەی پاسپۆرت بۆ نوێکردنەوەی پاسپۆرتەکە، تا ئێستا وەزعەکە عادیە، دوایێ فەرمانبەرەکە دەبینێت ژنەکە وێنەی نوێی بە نیقابەوە گرتوە بۆ پاسپۆرتە نوێیەکە!! کابرای فەرمانبەر ڕازی نەبوو بەو وێنەیە، چونکە نەك لە ڕوسیا بەڵکوو لە هەموو جیهانیش بە سعودیەوەش وێنەی بە نیقاب کە زۆربەیان هەموو ڕوخساری ژنەکە دادەپۆشێت ولە چاکترین حاڵەتدا دوو کونی چاوی بۆ کراوە، کە سەلەفیەکان ئەوەشیان بە دڵ نیە دەڵێن چاوەکان کە بە تەنیا

دەردەکەون فیتنەن!! یاسایی نیە لەسەر پاسپۆرت بدرێت.
کاک خالید هێشتا نەرمتر بوە لە ژنە روسیە تازە موسڵمانبوەکەی بە ژنەکەی وت: ئەی هەوار ژنێ ئەخر لۆ توشی ئەو موشکیلەیەمان دەکەی، بڕۆ بە حیجابەوە وێنە بگرە با دەموچاوت دەرچێت لە کۆڵ بینەوە. کەچی ژن سواری سەر سەری بوو گۆتی: کورە خالید ئەوە ئەتوو دەرێی چ، وەڵڵاهی وەعدم دایە پاش موسڵمان بوونم کەس روخسار ویەك تاڵە پرچم نەبینی!! هەڵبەتە مامۆستا مەلا شێرزاد زۆر بە شانازی پێکردن ومەدحەوە باسی هەڵوێستی ژنەکەی دەکرد بێ ئەوەی حوکمی شەرعی نیقاب بۆ خەڵک ڕونبکاتەوە کە نەواجیبە ونە سونەت!
وەلحاسڵ کابرای فەرمانبەر تورە بوو لێیان وپاسپۆرت وئەوراقی موعامەلاتەکەشی لێ وەرگرتن وگۆتی: دەبڕۆن نە پاسپۆرتی نوێ ونە کۆنەکەشتان نادەدەمەوە مادەم وادەکەی؟! ژنی ڕوسی لەگەڵ خالید بەرەو هوتێل گەڕانەوە، دیسان خالید ئامۆژگاری کرد کە هیچی تێدا نیە با وێنەیەك بە ڕوخساریەوە بگرێت، کەچی کە ژن دەمارگیری دینی لێیدا بە هیچ کەس چارە ناکرێت، ئەوەش دیاردەیەکە پێویستی بە لێکۆڵینەوە هەیە! شەو لە هوتێل ژنەکە پلانی B بەکارهێنا ودەستی کردە شەونوێژ وپاڕانەوە ودوعا وگۆتی: کورە خالید هەستە ئەی غافیل نوێژ ودوعا بکە بەڵکو خوا سبەینێ دەرگایەکمان لێدەکاتەوە!!!
سبەینێ کە چونە فەرمانگەی پاسپۆرت، ناوی ژنەکەیان بانگ کرد یەکەم کەس، خوا چاوی کۆرە کردبوون پاسپۆرتی نوێیان بە وێنەی نیقابەوە بۆ دەرکردبوو مەدەد یا شێخ مامۆستا مەلا شێرزاد!
کێشەکە ئەوەیە گریمان ئەو چیرۆکە ڕاستیش بێت، ئەوە خوا فەرمانبەرێکی کوێر کرد کە کارێکی وا نایاسایی بکات ئەی لە فرۆکەخانە و دەروازە سنوریەکان چۆن بە وێنەی نیقابەوە دەرباز دەبێت؟!! هەی قوڕت بەسەری خالید! مەگەر مامۆستا مەلا شێرزاد وەڵامی ئەو چیرۆکە ساویلکەیە ونا مەنتیقیە بداتەوە.
٢٠١٣/٨/٦

# ئەگەر مەلا شارستێنی وتاربێژی میانڕەو بێت باشترە وتاردان قەدەغە بکرێت!

لەو گرتە ڤیدیۆیەش کە تەواوکەری خوتبە توندوتیژەکەی تریەتی، مەلا فاتیحی زۆر میانرەو هەر لەسەرەتاوە دەڵێت سفوری دە ١٠ بەڵاو کارەساتی لێدەکەوێتەوە [ڕاستیەکەی دە هێندە بەڵا لە عەقڵیەتی تۆدایە!] و ئەوەی گوێی لە هەڕەشەکانم بێت جارێکی تر بە سەر ڕووتی ناچێتە دەرەوە [قسەکە ئاراستەکراوە بۆ ئافرەتان] یان ڕێگا نادات کچەکەی یان ژنی و خوشکی بە سفوری بچێتە دەرەوە [قسەکە هاندانی پیاوە، ئەو پیاوەی لە سایەی داب ونەریتی دواکەوتوو، ئەگەر بە هیچ نەوێرێت، بە ئاسانی بە ئافرەت دەوێرێت!] بزانە ئەو وتارە تەحریزیە چ توندوتیژیەکی لێ دەکەوێتەوە؟!

مەلا فاتیح شارستێنی ئەوەی سووکایەتیە بە ئافرەتی دەکات، بێ ئەوەی مفتەخۆرانی دەسەڵات و وەزارەتی ئەوقاف و ئەنجوومەنی باڵای خانمان و ڕێکخراوەکانی ئافرەتان لێی بە وەڵام بێن! ئەو تۆمەتە ترسناکانەی مەلا فاتیح شارستێنی دەیداتە پاڵ ئافرەتی سفور، هاندەرێکی ئاشکرای توند وتیژیە بە دژی ئافرەتانی سفور، بۆ داپڵۆساندنیان لەلایەن برا وباوک و مێردەکانیان وتەواوی کۆمەڵگای دواکەوتووی کورد، کە زۆربەیان فەرهەنگیان لە دەمی مەلا داعشیەکانی ئەمسالی مەلا فاتیح شارستێنی و سوسەیی و عەبدولسەمەد و دکتۆر عبدالواحید محمد ومەلا هاوڕێی دەجال شانامەیی و باقی مەلاکانیتر وەردەگرن. ئەو وتارە لە هەر وڵاتێک بوترێت خاوەنەکەی تووشی لێپرسینەوەی دادگا دەبێت. نازانم وەزیری ئەوقاف چەند کەسی پسپۆری هەیە چاودێری ئەو وتارە توندوتیژ ونا شارستانیانە بکات؟! یان وەزارەت بەس پشکی حزبە وکەس پرسینەوەی لێ ناکات هەرچەندە کلۆڵیش بیت؟!

ئێمە چۆن لەو کۆمەڵگایانەی دژایەتی حیجاب دەکرێت رازی نین مافی تاکەکەسیان پێشێل بکرێت بە هەمان جۆر دژی ئەوە جەنگەین، کە مەلا فاتیح شارستێنی جاڕی داوە لە دژی ئافرەتی سفور و تۆقاندنیان و هاندانی کەس وکاریان لە دژیاندا. سەیر لەوەدایە لە کوردستان بە جیا لە زۆربەی وڵاتانی تر جیاکاری ناکرێت دژی ئافرەتی حیجاب پۆش، کەچی مەلا بێ کۆنترۆڵەکان هێشتا ڕازی نین بەو لێبوردەییەی دەسەڵات وکۆمەڵگا، ئەوان هێرش دەکەنە سەر ئافرەتی بێ حیجاب وکافر ومەلعون ومونافیقیان دەکەن، لە پاش ئەو حوکمانە کوشتنی هەر ئافرەتێکی سفور بە دەستی گەوجێکی ئیمانداری فریوخۆر بە دەستی ئەو تەرزە مەلایانە، دەبێتە کارێکی پاڵەوانانە، چونکە تۆ کەسێك دەکوژی کافرە، مەلعونە مونافیقە، جاڕی جەنگی داوە لە دژی خودا! وەك لە وتارەکانی مەلا فاتیح شارستێنی هاتوە!

مەلا فاتیح شارستێنی بە عەقڵیەتێکی نەریتی کوردی و بیابانشینی عەرەبی وەهابی ئەوەی خراپە دژی ئافرەتی دەڵێت وخەڵك وکۆمەڵگایان لێ هان دەدات. لەلای ئەو ئافرەتانی سفور بەپێی دەق و ئەحادیسەکان:

- خراپترینی ئافرەتانی ناو کۆمەڵگاکەمانن " شر نسائکم المتبرجات!"
- دوژمنایەتی خوا دەکەن وئیعلانی جەنگیان کردوە لەگەڵ خوا و پێغەمبەر!
- کافرن، و مەلعونن! العنوهن فانهن ملعونات!
- سفورەکان هەمووی مونافیقن! " شر نسائکم المتبرجات المتخیلات وهن المنافقات"
- سفوربوون یەکسانە بە دزی و داوێن پیسی و هاوبەشی بڕیاردان بۆ خوا! چونکە لەدوای یەك لە حەدیسێکی بێ بنەما هاتوون!
- جیاکاریان لە دژدا دەکات و دەڵێت: کوڕان ئامان خۆت بپارێزە لە ئافرەتێك کە لەعنەتی لێکرابێت! ئافرەتێك کە مونافیقە بێت. ئەگەر ژنت هێنا توخوا ئافرەتی سەر رووت و قاچ ڕووت نەهێنیتەماڵەوە!
- سفووربوونی ئافرەتان هۆی سەرەکی زیادبوونی رێژەی تەڵاقە، ئەوانەی تەڵاق دراون هەمووی مونافیقاتە! دەڵێت: "الحمدلله ٩٩٪ بە شاهێدی دادگاکان سفورن! " نازانم دادگاش ئاماری بڵاوکردۆتەوە، یان مەلا چۆنی زانی رێژەی سفور وموحەجەکان چەند بووە؟!
- ئەوەی خۆداپۆشە کوردێکی ڕەسەنە، ئەوەشی سفورە لە کوردایەتی ومیللەتی خۆمان لایداوە؟!

ئەو مەلایە میانڕەوە هێندە ساویلکانە دەڵێت: "ئەوەی حیجابی لەبەردا نیە هیچ عوزرێکی نییە، چونکە هیچ ماندوو بونێکی تێدا نییە، چونکە هیچ نەخۆشیەك مانعی نییە!"

ئەخر مەلا و قسەکردنیان نەوتوە لەسەر ئەو بابەتە کۆمەڵایەتیە هەستیارانە، دەڵێی لە گوێی گای مێژوو دەژیت، نازانی ئافرەتیش مرۆڤە وهەقی ئازادی هەڵبژاردنی هەیە، دەیەوێت ببیتە حیجاب یان نا؟ نازانێت بەو هاندانەی پیاوە بێ فەرهەنگەکان ماڵەکان دووچاری گەورەترین توندوتیژی و زۆرەملێی دەکاتەوە، نازانێت هەزاران کچ لە ئەساسدا کێشەیان هەیە لەگەل کەسوکاریان کە نایانەوێت حیجاب بە زۆرەملێی بپۆشن! نازانن هەزاران کچ هەن تەمەنای مردنی باوك وبرای خۆ سەپێنەریان دەکەن، کە بەزۆر لەچکیان کردونەتە سەر، دەچێت نمونەی بەر لە سەد ساڵی لادێکانی کوردستانم بۆ دەهێنێتەوە! کورد لەو سەردەمە وا جاهیل ونەزانانە دوای دەیان مەلای وەك تۆ و لە تۆش توندرەو وتەکفیریتر کەوتوون، دەبیت ئەو سەردەمە چۆن بووبن؟ دەشڵێت ڕێژەی تەڵاق بۆ زۆر بووە؟! ڕێژەکە لەبەر هاندانی مەلای وەك ئێوە زۆر بووە بۆ پیاوان لە دژی ئافرەتان و ریزنەگرتنی هەڵبژاردەیان! تەڵاق لەبەر ئەوە زیادی کردوە تۆ ئافرەتی بێ حیجاب بە شەیتان دەکەیت و کافر ومەلعون و مونافیقیان دەکەیت، کە ئەو حوکمە کوێرانەت لە توندڕەوترین مەزهەبی ئیسلامدا نەهاتووە، هەتا لە سعودیەی وەهابی سەلەفیشدا!

ئەوە لینکی ڤیدیۆکەیەتی

https://www.facebook.com/video.hp?v=796605393764296&set=vb.303702429721264&type=2&theater

٢٠١٥/٣/١٩

# حیجاب یەکەمینی یەکەمەکانە!

لە کۆمەڵگا ژەهراوی بووەکان بە فەرهەنگی توندڕەوی دینی، ئافرەت ئاسانترین نێچیر و ئاسانترین ئامانجی ئەو کۆمەڵگا پیاوسالارەیە، کە هەموو تورەیی وخەشم وقینی لە دەرنجامی نوشوستی و بی دەسەلاتی و کەموکورتی ژیان و بێ کاری و جەوروستەمی دەسەلات کە لێی دەکرێت لە ئافرەتدا خاڵی دەکاتەوە! هەتا چەپڕە وبێ دینانی کۆمەڵگاش پەیڕەو لەو ئەتوارەی دژی ئافرەت دەکەن!

لە فیکری دینی بە گشتی و سەلەفی بە تایبەتی، سفور بوون لە نیشانە بچووکەکانی ڕۆژی قیامەتە، لەو ڕێگایەوە پشت بە چەندین قالە و قیلە دەبەستن، کە زادەی عەقڵیەتی بەدەوی دژە ئافرەتی عەرەبن! بەجۆرێک باسی ئافرەت دەکەن، وەك بڵیی سێ چارەگی کێشە ودەردەکانی ئومەتی ئیسلام لەبەر سفوری ئافرەتانە!

ئەو عەقڵیەتە تەهویلیە و زیادەرەویە خورافە ئامێزە هێندە ناسەنگە کێشەکانی لێ تێکەڵاو دەبێت، ونازانێت چۆن ریزبەندی وئەولەویەتی بۆ دابنێت. لای ئەو هەموو کێشەکانی بێکاری و تەندروستی و خۆشگوزەرانی و گەندەڵی و تالانی سەروەتی کۆمەڵگا دەگەڕێتەوە بۆ سفووری ئافرەت.

لە ئێران تیزاب بەو کچانە دادەکرێت کە حیجابەکەیان باش نابەستن بە هاندانی دەزگا ئاسایشەکانی ئێران!

لە شیشان قەدیرۆفی بەکرێ گیراوی ڕووس، کە لەلایەك شەڕی توندرەوانی دینی شیشان دەکات، کەچی پشتگیری لە هێرش کردنە سەر بێ حیجابەکان دەکات بە تۆپەڵە بۆیاغ!

لەکوردستان مەلا شارستینی وغەیری ئەو وا ئافرەتی بێ حیجاب دەتۆقینن، بە سەدان تۆمەتی کوفر ونیفاق وهاوتای داوێن پیسی و لەعنەت لێکراو لە لایەن خواوە تۆمەتبار دەکەن!

مەلا شارستێنی لە جیاتی جەنگ لە دژی گەندەڵی و ناعەدالەتی و کەموو کورتیەکانی تر بکات، کەچی بڕیاری جەنگی داوە دژی ئافرەتی کوردی بێ سەرپۆش.

مەلا شارستێنی دەبوایە خۆی وتارێکی دابا لەسەر ئەو جاش ومستەشارانەی کە کاتی خۆی ئەنفالیان کردوە دژی ژن ومنداڵ وپیری کورد، لە جیاتی ئەوە خۆی لە مزگەوتی یەکێك لە گەورە جاشانی ئەنفالچی وتارەکانی دەدات!

بەس بە ئافرەت دەوێرن، چونکە کۆمەڵگا سەقەتەکەمان نا مرۆڤانە دەڕواننە ئافرەت کە نیوەی تەواوکەری مرۆڤایەتین!

شارستێنی دەڵێت ئەو ئافرەتەی خۆی دانەپۆشێت ونەبێتە موحەجەبە ئیعلانی حەربی لەگەڵ خوا کردوە!! چونکە خوا دەڵێت خۆت داپۆشە ئەو دەڵێت خۆم داناپۆشم! ئەو مەلا ساویلکەیە تەقلیدییە هەتا ئاگادار نیە بە غەریزەی حەزکردنی ئافرەت لە جوانی! هەتا نازانێت چەندە بریارێکی قورسە بۆ

ئافرەتێکی خاوەن کەسایەتی بەهێز، نەك مەڕومالاَّتەکان، بڕیاری حیجابکردنی بدات!
ئەوە عەقڵی مرۆڤێکی خوایی وژیر نییە، کە بازبدات بەسەر هەموو کارەساتە گەورەوکانی کۆمەڵگا لە تالاَّنی ودزی وگەندەڵی و ناعەدالەت بەلاَّم دنیا لەو حیجابە کۆبکاتەوە؟! ئەوە هەستی پیاوسالارانەیە هانی دەدات چاوپۆشی لەو هەموو خەراپەکاری وگەندەڵی وخیانەت و داوێن پیسی و دزی وتالاَّنە بکات ئاوڕداتەوە بۆ لاوازترین ئەڵقەی کۆمەڵگای داپڵۆسێنەر، کە ئافرەتە! من نازانم ئەگەر خۆداپۆشینی ئافرەت هێندە گرنگ با، بۆ ئافرەتە کۆیلەکان قەدەغە دەکران لە خۆداپۆشین لە سەردەمی پەیامدا، نەوەك خەڵك حیسابی  ئافرەتی ئازادیان بۆ بکات؟! بۆ پیاو حەزی بۆ ئافرەتی کۆیلە ناجوڵێت؟! بۆ کۆیلەکانی کچانی فارس و کورد و ڕۆم و چەرکس و قیبت و گورجستان چما زۆر لە کچانی جەزیرەی عەرەبی جوانتر نەبوون؟!
مەسەلەی نەهێشتنی سەرداپۆشینی ئافرەتی کۆیلە زۆر کۆنە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئاشورییەکان، کە ئەو ئافرەتە کۆیلەیەی حیجابی کردبا جەڵدەی لێدەدرا! لەوێوەش پەڕیەوە ناو فقهی ئیسلام، هەتا ڕیوایاتێکی زۆر هەیە دەڵێن حەزرەتی عومەر توڕە دەبوو لەو ئافرەتە کۆیلانەی سەرپۆشیان دەکرد چونکە خۆیان بە ئافرەتی ئازاد دەچواند!!
کەی ئەوە شێواز و ئەتواری مەلایەکە خۆی پی میانڕەوبێت، کە وەك ڕوکنێکی ئیمان وئیسلام باسی سەرپۆش بکات؟! چۆن دەتوانیت بڵێیت ئەو ئافرەتەی خۆی دانەپۆشێت ئیعلانی حەربی کردوە لەگەڵ خوا و پێغەمبەر؟!
چۆن هەتا بالاَّپۆشی بەراورد دەکرێت لەگەڵ نوێژ وڕۆژوو کە ئەوانە لە ئەرکانەکانی ئیسلامن، بەلاَّم حیجاب چەند ئایەتێکی ناموحکەمی لەسەر هاتووە، هەتا تەفسیری جۆراوجۆریش هەڵدەگرێت؟!
سەیر لەوەدایە هەندێك سفوری دەبەنگیش توشی ستۆکهۆڵم سیندرۆم بوون، بەرگری لەو پیاوە دەکەن کە کافر و مەلعون و مونافیقیان دەکات!
لە کۆمەڵگای دواکەوتوو کێشەکانی هەژاری، و بێکاری وگەندەڵی، و پەروەردەوفێرکردن، و بیمەی تەندروستی، و مافەکانی مرۆڤ، و نیشتەجێ و ژێرخانی ولاَّت هەمووی پشتگوێ دەخرێت، حیجاب وهیستریای حیجاب دەبێتە یەکەمی یەکەمەکان!

ئەوە لینکی ڤیدیۆکەیەتی:
https://www.facebook.com/video.php?v=796605393764296&set=vb.303702429721264&type=2&theater
٢٠١٥/١١/٤

# لە بەرەکاتەکانی مەلا عەلی وەسفەیەك بۆ مەرگ!!

قەد بە بیرم دانەدەهات، ڕۆژێک لە ناو ئەو هەموو بابەتە گرنگانەی لە دەوروبەرمان کە ڕوو دەدەن، لەسەر مەلایەک بنوسم کە بەلای زۆر کەس، لە ئاستی جیا جیاشەوە پیاوێکی خواییە ویارمەتی خەڵک دەدات ودەردەکانیان تیمار دەکات. ئەوەی زیاتر کاری کردۆتە سەر خەڵک، لە کەسایەتی مەلا عەلی ئەو تەوازوعە لە ڕادە بەدەرەیە کە نیشانی دەدات، ئەوەش جۆرێکە لە تەکنیکی خۆستایش کردنی پێچەوانە، دەڵێن ئیمامی غەزالی لە کێبێکیدا دەڵێت:"زۆر کەس لە ڕێگای نوندنی شکست نەفسیەوە دەیەوێت خۆی بەرزکاتەوە" مەلا عەلی کەلەکێ هیچ بۆنە ومووناسەبەیەک نیە نەڵێت:"من کورە کەرناسم...کورە ئەمن چ سەگەکم خوا شیفا دەدات، هتد!" یان مەسەلەی پارە وەرنەگرتنە کە، ئەوەش ڕاست نیە لە زۆر کەسی باوەڕپێکراوم بیستوە کە داوای پارەی کردوە بۆی بخەنە ژێر دۆشەگەکە، یان قازانجی خۆی لەو کاسێت وسیدی ومیدیا پلەیەرانە وەردەگریت کە خۆی دەیفرۆشێت...

من هەقم لەوە نیە خەڵکی تا چ ڕادەیەک بڕوای بە چارەسەرەکانی مەلا عەلییە، هەرچەندە من بڕوام بەو جۆرە چارەسەرانە نیە، وپێم خورافاتێکی بە دین داپۆشراوە! کە تەنها ڕەواجی لە نێو کۆمەڵگا دواکەوتو ونیمچە دواکەوتوەکان هەیە، هەرچەندە جاروبار کەسانی رۆشنبیریش دەکەونە ژێر کاریگەریان، ئەوەش یەکێک بوو لەو هۆیانەی کە هانی دام ئەو بابەتە بنوسم. لە کۆمەڵگا دواکەوتو ونیمچە دواکەوتوەکان، هەموو چارەسەریەکان خۆی لە ڕەشکە وهەنگوین وگوێ گرتن لە کاسێتەکانی قورئان، ودوعا دەبینێتەوە. کۆمەڵێک زانای سعودی هەتا ڕەخنەیەکی زۆریان لەو چارەسەرە هەیە کە پێیدەڵێن ( الطب النبوی) چونکە ماقوڵ نیە هەموو نەخۆشیەک بە ڕەشکە وهەنگوین یان هەنگوین وڕەشکە عیلاج بکرێت! وڕەشکە ببێتە چارەسەری هەموو دەردێک جگە لە مەرگ!

توێژینە نوێیەکان سەلماندویانە، کە ڕەشکە هیچ توخمێکی سروشتی فەوقە لعادەی تێدانیە، بەڵکو وەک هەر توخمێکی تری سروشتی، تا ڕادەیەک سودی تێدایە ،بۆ بە هێز کردنی سیستمی مەناعەت لە لەشدا، بەڵام زۆر لە ڕووەکەکانی سروشت بە قەد ڕەشکە سودیان تێدایە یان زیاتریش! وهیچ حەدیسێکیشیان بۆ هەڵنەبەستراوە. وادیارە ئەوەی ئەو حەدیسانەی لەسەر ڕەشکە دانراوە، لە ژێر کاریگەری ژیار ومیللەتانی تر دانراوە، چونکە ڕەشکە لە ژیاری یۆنانی وڕۆمانیش، وەک چارەسەر بەکار هاتوە، ومێژویەکی کۆنتریشی هەیە لە بەکارهێنانی وەک دەرمان.

یانی ڕەشکە بە بۆنەی حەدیسی پێغەمبەرەوە، بە خەڵک نەناسراوە، بەڵکو لەو باوەڕە داین کە لە ڕێگای حەدیسەوە وەک ئامرازێکی میدیای کۆن بە ئومەتی ئیسلامدا ناسراوە.

ئەوەی لە هەموان زیاتر هانی دام، ئەو وتارە لە بارەی مەلا عەلی بنوسم، بەو زوانە کەسێکی نزیکم، کە ئەویش کەوتبوە ژێر کاریگەری ئەو پڕوپاگەندە خۆڕاییەی، کە خەڵکێکی سادە وساویلکە (جاروبار

زاناش) بە نیەتێکی پاک بۆ مەلا عەلی دەیکەن! چوبوە لای مەلا عەلی بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێک، ئەویش بۆ ئەوەی بلیمەتی وجیاوازی خۆی بسەلمێنێت، لە جیاتی عیلاجە باوەکەی ڕەشکە وهەنگوین یان هەنگوین وڕەشکە!! وەسفەیەکی تری عیلاجی بۆ دانابوو، بریتی بوو لە خواردنی دوو هێلکەی دەلەمە بۆ ماوەی چل ویەک ڕۆژ!! واتە 82 هێلکە ونزیکەی سێ تەبەق هێلکە؟! ئەگەر هەر هێلکەیەک 250 بۆ 300 ملیگرام کۆلسترۆلی تێدا بێت، یانی 20500 بیست هەزار وپێنج سەد یان 24600 میلیگرام کۆلسترۆل بۆ کەسێکی پیری سەروی 60 ساڵ بنوسیت؟! بۆ هێلکە؟! بۆ دەلەمە؟! بۆ چل ویەک ڕۆژ؟! وەڵامی ئەو پرسیارانە تەنها لە عەقڵیەتی نازانستی وپڕ خورافاتی مەلا عەلی دەست دەکەوێت!

کەس هەیە بۆ ئافرەتێکی تەمەن سەروی شێست ساڵەوە، ئەو وەسفەیە بنووسێت، کە پڕاوپڕە لە کۆلیسترۆل، ولەوانەیە نەگاتە ڕۆژی پازدەهەم وجەڵتە لێیبدات؟! دەبێت ئە وەسفەیە مەرگ ئامێزەی، بۆ چەند کەسی تری بەسەزمان وساویلکە نوسیبێت وبوبێتە هۆی کوشتنی؟! ئەگەر حوکمەت وئاسایشیش تەنگی پێ هەڵدەچنن، وقەدەغەی دەکەن لەو ساختە بازییە، ئەوە کەسانێک هێندە بۆی بە پەرۆش دەبن، وادەزانن شەڕی کافر وئیسلام هەڵایساوە! ئەو کەسەی کە بەبێ هیچ شارەزایەکی زانستی پزیشکی، دەستی داوەتە چارەسەری خەڵک پێویستە سزا بدرێت وئەگەر وازیشی نەهێنا بگیرێت، چونکە حوکمەت بەرپرسارە لە پاراستنی گیانی خەڵک ونا بێت ڕێگا بە کەسانێکی نوقوم بووی ناو وەهم وخەرافات بدات یاری بە چارەنوس وگیانی خەڵکی بکات. خۆزگە ئەو دیاردەیە بنبڕ دەکرا وماموستایانی ئاینی بەر لە هەر کەسێکەوە دژایەتی ئەو دیاردە دزێوەیان دەکرد کە ئاین وەک ئامرازێک بەکار دەهێنێت!!

تەمووزی ٢٠٠٨

# بەرگری سەلەفیەکان لە بازرگانی مەلا عەلی

لەبابەتێك کە سەلەفیەکی ناودار نوسیویەتی لەسەر مەلا علی کەلەك و خواردنەوەی میزو چەند سەرنج و تێبینێك. ئەو کابرایە زۆر بە شێوەیەکی سەیر، کەوتۆتە هەڤدژی وقسەی بێ سەروبەر، نوسینێك سەرەڕای کورتی پڕاوپڕە لە هەڵە وموغالەتات. لەوە دەچێت ئەو سەلەفیە ئیمانی پتەوی سەلەفیەتی کەمێك لاواز بوو بێت، کاتێك چەندین دەقی نەبەوی و سەلەفی ساڵح دەهێنێتەوە، کە دەسەلمێنن میزی مرۆڤ رجس وپیسیە، کەچی بەرگری لە خواردنەوەی دەکات، چونکە وڵاتانی پێشکەوتوو دانیان پێداهێناوە! وەك دەڵێت:

“قَـالَ الزُّهْـرِيّ: « لاَ يَحِـلُّ شُـرْبُ بَـوْلِ النَّـاسِ لِشِـدَّةٍ تَنْـزِلُ، لأَنَّـهُ رِجْـسٌ، قَـالَ اللَّهُ تَعَالَـى: {أُحِـلَّ لَكُـمُ الطَّيِّبَـاتُ} [المائـدة: ٤] وَقَـالَ ابْـنُ مَسْـعُودٍ، فِـى السَّـكَرِ: «إِنَّ اللَّهَ لَـمْ يَجْعَـلْ شِـفَاءَكُمْ فِيمَـا حَـرَّمَ عَلَيْكُـمْ» صحيح البخاري ((١١٠ /٧ ئیمامی زەهەبی دەفەرمێ حەڵاڵ نییە خواردنەوەی میز بۆچارەی نەخۆشی لە بەر ئەوەی (ریجسە) عبداللە کوری مەسعود یش دەفەرمێ خوای پەروەردگار شیفای ئێوەی لەوانە دانەناوە کەلێی حەرامکردون." ئەی باشە بەپێی مەنهەجی سەلەف مرۆڤ چۆن بەرگری لە تەرحێك دەکات کە دەیەوێت شتێکی رجس وپیس بکاتە شیفا؟!! ئەوە ڕای سەرتاسەری فیرەق ومەزاهیبی ئیسلامیشە، کەچی ئەو هەموو بەڵگانە ئارامی نابەخشێتە کاك سەرباز ودەچێتە ناو بەڵام وبرِوبیانوو هێنان.

سەیر لەوەیە هەر لەپاش ئەو دەقانە، ئەو سەلەفیە تەنها غەم ونیگەرانی ئەوەیە، مەلا عەلی ئەو کارە قێزەونە بەناوی طبي نبوي بکات! دەبێت بە ناوی زانست بیکات!لای ئەو سەلەفیە پێشکەوتووە گرنگ نییە مەلا عەلی درۆیەکی هەلبەستوە، بە زمانی پیغەمبەر، گوایە وتویەتی میزی حوشتر ومیزی مرۆڤێیشی بە دەرمان داناوە! مەلا عەلی ودوو حدیسی بە بەرچاومانەوە دروست دەکات دەڵێت :پێغەمبەر وتویەتی: بول الابل شفاء لكل مرض!!! حدیسی وانیە هەتا لە موضوعاتیش !!دەڵێت: پێغەمبەر وتویەتی: بول الابل شفاء لكل داء الا الموت !! ئەوەشی لەسەر قیاسی حبە السوداء دروستی کردوە!!

لە پێناو میزخواردنەوە، دەیان فەرمودەی بوخاری ومسلم وقسەی سەدان فەقیھ و قسەی زوهری وابن مسعود وزەهەبی پێشێل دەکات، کە میزیان پێ پیس ورجسە، لەجیاتی بەسکردن بەو هەموو بەڵگانە، کە بەڵگەی دەق بۆ سەلەفی وەك ئاوە بۆ ماسی، وفەرمودەیەکی زەعیفیش، بە هەموو عەقڵی فەیلەسوفانی جیهان ناگۆڕنەوە، کەچی دێت زۆر ناشیانە، دەکەوێتە داوی فیلمەکانی یوتیوب ودەڵێت گوایە "هیچ گومان لەوەدانیە ئەلمانیا دەولەتێکی پێشکەوتوە لە هەموو بوارەکان، بەلام شتێك هەیە لایان پێی دەڵێن (Urin-Therapie) چارە بەمیز) هەروەها کتێبێکیش هەیە بەو ناوەو دەفرۆشرێ و نوسەرەکەی باس لە کاریگەری (میزخواردنەوە) دەکات بۆ چارە سەر، خەڵکێک هەیە تاوەکو ئێستا دەیخۆنەوە”.

جارێ مەسەلەی خواردنەوەی میز لە پزیشکایەتی زانستی نیە، تەنها لە طبی بدیلە alternative medicine دا هاتوە ورەگی هەیە لە چەند کلتور وئاییینیکی گەلان وەك هیندۆسی، بەلام بە پێی پێنج

سەرچاوەی زانستی هیچ بەڵگەیەکی زانستی نیە لەسەر بەکارهێنانی میزی چارەسەرنەکراوuntreated urine! واتە وەك مەلا عەلی لە میزڵدانەوە بۆ ناو دەم! میزی چارەسەرنەکراو، ئەو میزە خاوەیە کە لە مرۆڤ دەرهاتوە، وهیچ پرۆسێسێکی زانستی پاك کردنەوەی بەسەردا نەکراوە.

میزی چارەسەرکراو، واتە پاك کراوە وتعقیمکراو لە هەندێك بەرهەم بەکاردێت وەك میزی ژنی سکپڕ کە ڕادەی هۆرمۆنی ئیسترۆجین لە میزی زۆرە بۆ بەرهەمهێنانی ئەو هۆرمۆنە گرنگە بەکار دەهێنرێت.

کاکی سەلەفی زۆر ناڕەحەتە چونکە هەلیان کوتاوەتە سەر مەلا عەلی کەلەك ودەشڵێت مەسەلەی میزخواردنەوە :" ئەو قسانەی (مەلا علی کەلەك) هەلقولاوی هیچ مەدرەسەو قوتابخانەیەکی ئاینی نیە و هەروەها نیشانەی (تەخەلوف و دوا کەوتنیش) نیە لەبەر ئەوەی میز خواردنەوە نەك ملا علی بەلکو زۆرێك لە گەلانی ئەوروپی هەر لەکۆنەوە تاوەکو ئیستا باسیان کردوەو باسی دەکەن و وەکو دەرمان بەکاریان هێناوە و بەکاری دەهێنن". "ئەوەی مەبەستمە ئەو بابەتە تەنها لەکۆمەلگای کوردەواری ئیمەو تەنها لەلای (ملا علی کەلەك) باسی لێوە ناکرێ بەلکو لەدەولەتە زۆر پێشکەوتوەکانی ئەوروپاش باسی لێوەدەکرێ".

باشە هەی بلیمەت شینەکەی تۆ بۆچیە تیناگەین، دەیان دەق دەهێنیتەوە کە میز رجسە وپۆخڵە، لای ئێوە هەموو برایەتیەك لەگەڵ مەزاهیبی تر بە قوربانی دەقێك دەکەن، کەچی هاتووی وا بە هەق وناهەق، بەرگری لەو کارە قێزەونەی مەلا عەلی دەکەیت، ئەگەر خەمی خەڵکت نیە کە نیشتانە، هەرنەبێ خەمی ئەو دەقانەت بێت کە کەسێك پێشێلی دەکات وبەناوی طبي نبوي بازرگانی پێوە دەکات!.

باشە لە خۆت نەپرسیوە مەلا عەلی چۆن ئەو میزانە بەکار دەهێنێت؟! وەك ئەڵمانیا وتاقیگە زانستیەکان چارەسەر دەکات یان وەك خۆی باسی دەکات لە میزڵدان وبۆ هەڵقوڕاندن؟! نازانی هەزارەها میکرۆب وئەمیبای پیس لە بۆڕی میزدایە وئەو میزە چ مەترسیەکە بۆ تەندروستی ئەگەر بەو ڕێگایە سەرەتاییەی مەلا عەلی بەکار بێت؟!

دوایێ کاکی سەلەفی گۆشتی بەرازیش، کە رجسە، لە ئەڵمانیا دەخورێت کە وڵاتێکی پیشکەوتوە، لای تۆ ئێستا کیشەی نەماوە چونکە ئەوروپا لای رجس نییە؟! من هەست دەکەم لە ناخیدا بەرگری لە میزێکی تر دەکات، کە بە پێی حەدیس چارەسەرە! ئەویش میزی حوشترە، بۆیەش لە دوورەوە بەرگری لە میزی مرۆڤی پیس ورجس دەکات، وەك ئامادەییەك بۆ برەوپێدانی میزی حوشتر، چونکە خەڵك هەرخەریکی داهێنانن، دەست وپەلی دەستکرد دروست دەکەن، کە بە مێشك کاردەکات، دەرزی دروست دەکەن نیوسەعات ئۆکسجین دەداتە مرۆڤ، وکامێرای چاو دروست دەکەن لەگەڵ دەمارەکانی مێشك دەیبەستنەوە! ئێمەی موسڵمانیش ئیبتیلا بووین بە مەلا عەلی، وسەلەفیەکانی سعودیە وعەرەب بەگشتی، وکۆپیکەرانی وەك مەلا عەلی و سەلەفیەکانیتر، کە لەباسی رەشکە وهەنگوین ومیزی حوشتر زیاتر هیچ نازانن. سەیر لەوەدایە شێخە سەلەفیە گەورەکان کە نەخۆش دەکەون هەموو بەرەو خۆرئاوا ڕادەکەن بۆ چارەسەر، طبي بەناو نەبەویش، بەس بۆ هەژار وغەریب حاڵەکانە!.

٢٠١٤/١/١

# لەبارەی حیجامە وحیجامەچی!

لە وەڵامی مەلا عەلی کەڵەك دەربارەی توبی نەبەوەی، لەباسی حیجامەدا، کەڵەشاخ نووسیبووم"ئەو حیجامەیە سەرتاسەری لەسەر بنچینەی زاراوەیەکی چەوت وچەواشەی (خوێنی پیس) الدم الفاسد بنیات نراوە، ئەوەش تەنها بۆ فریودانی کەسانێکی ساویلکەیە چونکە ئەو زاراوەیە سەرەڕای ترسناکی هیچ بنچینەیەکی زانستیشی نییە، چونکە هیچ شتێک نیە بەناوی (خوێنی پیس) و (خوێنی پاک) لە لەشی ئادەمیزاددا"

کابرایەکی حیجامەچی بۆ گرنگی دان بە باتەکەی دەڵێت حیجامە گوایە لە ڕادیۆی BBC باسی سەردانی کۆمەڵێک پزیشکی بەریتانی، وخانەوادەی شانشینی بەریتانی کردوە بۆ سوریا، بە مەبەستی ئەنجامدانی حیجامە، بۆ چارەسەری چەند نەخۆشیەک! یان دەڵێت:"ئێستا حیجامە لە وڵاتانی ئەمریکا وبەریتانیا وروسیا وچین وکۆریا ویابان، بۆتە دیاردەیەکی زانستی پزیشکی سەرکەوتوو! وبۆتە مایەی چارەسەرکردنی چەندەها نەخۆشی، بەشایەدی چەندەها پزیشکی بیانی لەوانە: پزیشکی فەرەنسی کانتیل.."

جارێ من سەروبەری ئینتەرنێت گەڕام، ئەو هەواڵەی ڕادیۆی BBC م بەرچاو نەکەوت! جگە لەو هەواڵەنەی کە لە چەند ڕۆژنامەیەکی عەرەبی، بە تایبەتی سوری وێنەیان بڵاوکرابویەوە، سەرەڕای ڕۆژنامەی زەمان نەبێت، کە زۆربەیان لە سایتی حیجامەچیەکان نوسرابون وبڵاوکرابوونەوە! هەتا ناوی ئەو دکتۆرە فەرەنسیەش تەنها لە سایتی سەرقافڵەی حیجامە چیەکان سوریا وجیهان (محمد امین شیخو) هاتبوو! ئینجا بابڵێین ئەو هەواڵەی ڕادیۆی BBC یش ڕاست بێت، ئایا هەر دیاردەیەک، ئەگەر ببێتە دیاردەیەکی پزیشکی وزانستی لە ڕۆژنامە وڕادیۆدا بڵاوبکرێتەوە، ئەو شەرعیەتە زانستیەی پێدەدرێت؟! یان دەبێت لە گۆڤارە زانستیە موعتەبەرەکان وسەرچاوە زانستییە باوەڕپێکراوەکان بڵاوبکرێتەوە؟! ئایە ئەگەر وەفدێکی پزیشکی بەریتانی سەردانی سوریای کردبێت، بۆ فێربوونی نهێنی پڕ لە تەلیسمی حیجامە، مانای ئەوەیە ئەو چارەسەرە سەرکەوتو زانستیە؟! ئەخر سوریا خۆی چییە، تا خەڵک بێت زانستی لێوە فێر بێت؟! ئەی بۆچی نەخۆشە سوریەکان وسعودیەکان وخەلیجیەکان بە گشتی لە موقتەدیرەکان، هەمووی لە ئەوروپا بە گشتی وبەریتانیا بە تایبەتی عیلاج دەکرێن، ئەگەر ئەو حیجامەیە چارەسەری حەفتا دەردان دەکات؟!

خەڵکی ئەو وڵاتە خۆرئاواییانە لە نێو توێژینەوە ئەنسرۆپۆلۆژیەکانیان لەمەڕ گروپ وخێڵە سەرەتاییەکان، لە ئەفریقیاش چارەسەریە سەرەتاییەکانیان دەخەنە ژێر لێکۆڵینەوە وسەرنجدان بەڵکو سودێکی دەبێت بۆ پزیشکایەتی ئەلتەرناتیڤ یان طب البدیل. بەڕاستی پێم سەیرە کە ئەو حیجامەچییە ناوی ئەو هەموو وڵاتانەی جیهان دەهێنێت گوایە حیجامە تێیدا بۆتە دیاردەیەکی زانستی پزیشکی سەرکەوتوو!! یەعنی

هەر مفتەخۆرێک بە ناوی خادیمی پزیشکی پێغەمبەرایەتی، هاتوو دوکانێکی لە ئەمریکا وروسیا وژاپۆن کردەوە بۆ حیجامەکردن، دەکرێت بەو ڕەهاییە بڵێین، حیجامە لە زانکۆ پزیشکیەکانی ئەو وڵاتانە تەبەنا دەکرێت؟! ئەوە چۆن تێگەیشتنێک وچۆن مەنتقێکە؟!

ئینجا وەک پیشەیەکی هەمیشەیی، هەر مەلایەکی سەلەفی دەق پەرستی سەنەد دۆست ونەیار بە مەتن وعەقڵ، ئەسەف دەکێشێت بۆ منێکی موسڵمان کە (ڕەخنە لە کارێک دەگرێ کە پێغەمبەرەکەی کردویەتی)! ئەو وادەزانێ، هەرکەسەی گوتی پێغەمبەر وای گوتوە دەبێت یەکسەر بڵێین ئامین! کاکە گیان من وەک تۆ وشێوازە سەلەفیە سەقەتەکان ناڕوانمە فەرمودەکان، چ لە ڕووی سەنەدەوە چ لە ڕووی مەتنەوە، چونکە تۆش دەزانی ئەو حیجامەیە لە بنەڕەتدا داهێنانێکی ئیسلام وپێغەمبەر نەبوە، بەڵکو هەزارەها ساڵ پێش ئیسلام یۆنانیەکان وچینیەکان وژاپۆنیەکان وهەتا میسریە کۆنەکان وئاشوریەکان حیجامەیان کردوە.

هەر وەک خۆشت ئاماژەت پێکردوە، ئەی بۆ دەبێت ئەمڕۆ ببێتە سونەتی پێغەمبەر نازانم، نەک هەر حیجامە بەڵکو ڕەشکە وداغکردن وجن لە جەستە دەرکردن، وچەندین چارەسەری تریش لە بنەڕەتدا داهێنانی پێغەمبەر نەبونە، بەڵکو چارەسەرە باوەکانی ئەو سەردەمە بوە. پێغەمبەریش لە چوارچێوەی ئەو سەردەمە ژیاوە، هەر ئەو عیلاج وچارەسەریانەی دوبارە کردۆتەوە کە باو بوونە، هەر بۆیەش زانایەکی سەلەفی گەورەی وەک د. محمد سليمان الاشقر، لە فەتواکەی دەڵێت کە بەشێکی زۆرم لێی نەقل کردوە: کە پێویستە ئەو چارەسەریانە بخرێنە ژێر تاقیکردنەوە لە زانستگاکان نەک مزگەوت ودوکانی عەتارەکان.

ئەو حیجامە چییە هەڕەشەیەکی سەلەفیانەشمان لێدەکات، کە پێویستە وەک موسڵمانێک بڕوا بەو چەند فەرمودەیە بهێنم، کە لەبارەی حیجامەوە هاتوون چونکە "فەرمودەکان سەحیحن...فەرمودەی سەحیحیش گەر موسڵمان بڕوای پێ نەبێ لە بازنەی ئیسلام دەردەچێت"!!

وادیارە ئەو برادەرە هەر ئەو بەشەی لەو وتارەکانی منی خوێندۆتەوە، کە دەربارەی حیجامە هاتوە، دەنا دەیزانی خوێندنەوەی ئێمە بۆ چەمکی فەرمودەی سەحیح وناسەحیح چیە؟! ئینجا من مولزەم نیم بەو چەمکە سەلەفیە سەتحیە، لە فەرمودەی سەحیح وناسەحیح تێبگەم. هەر لە بەشی یەکەمی وتاری پزیشکایەتی پێغەمبەر دا هاتوە:" لێرەدا پرسیارێک سەر بەرز دەکاتەوە ئەویش ئەوەیە: ئایە هەر فەرمودەیەک (هەتا ڕاستیش بێت) لە کاروباری گشتی دونیادا، وپزیشکی بە شێوەیەکی تایبەتیدا، دەبێتە حوجەت، وپێویستە وەک وەحی مامەڵەی لەتەکدا بکرێت؟ موفتی ود. محمد سليمان الاشقر کە زانایەکی سەلەفی ویەکێکە لە سەخت گیرەکان لە لێکۆڵینەوەیەکدا بە ناوی (الاحتجاج بالأحاديث النبوية في المسائل الطبية) دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە وتە وکردەی دونیایی پێغەمبەر تەشریع نیە، ئەو ڕەوانە کراوە بۆ ئەوەی خەڵکی فێری شەرع بکات، نەک پزیشکی وکاری تری دونیایی، وبۆی هەیە لەو کاروبارانە هەڵە بکات وەک هەر مرۆڤێکی تر، ئەوەش لە پایەی ئەو کەمناکاتەوە، وبۆیە گوتە وکردارەکانی دەربارەی شتی پزیشکی ڕووت بە حوجەت نایەتە حسێب کردن، ونابێتە واجیب

لە پەیڕەوکردنیدا، چونکە لەسەر ئەزموونی شەخسی بنیات نراوە نەک وەحی." ئەگەر ئەوە مەفهومی زانایەکی ناوداری سەلەفی وعەرەب بێت، دەبێت بۆ ئەو مەلا حیجامەچییە ڕوبەرەکە وا لە من وخەڵک تەسک بکاتەوە؟! من ناشیەکی تازەی بواری خوێندنەوە نیم، تا ئەو کابرایە بە قسە سواوەکانی نامیلکە لوس وپوسوکانی سعودیە وخەلیج ڕازیم بکات، هەڕەشەم لێبکات و وفێری چۆنیەتی نوسینم بکات. منیش لە وەڵامدا پێت دەڵێم، ئەگەر هێندە سوری لەسەر فەرمودەی سەحیح وتا لە بازنەی ئیسلام دەرنەچیت، دەبێ باوەڕ بەو فەرمودەیەی سەحیحی بوخاریش بکەیت: (من تصبح بسبع تمرات عجوة لم یضره سم ولا سحر) برۆ پاش عەوت دەنک خورما ژەهر بخۆرەوە! هەروەها بڕوا بەو فەرمودەیە سەحیحەش بکەیت کە دەڵێ: (لا عدوی ولا طیرة و..) یانی بچیتە ناو نەخۆشە پەتاییەکان ونەترسیت لێیانی بگریتەوە!! دەی ئەگەر باوەڕی یەقینیت بەو فەرمودانەیە بە کردار جێبەجێیان کە، بەڵام بەر لەوە لە بیر نەکەیت وەسیەتیش بکەیت. ئەمەو چەندین کارەساتی تر کە بەناوی فەرمودەی سەحیح بەسەرماندا سەپێنراوە.

مانگی ٨ ی ٢٠٠٨

# کێ باری مەلا عەلی کەڵەکێ دەبا!

ئەو پیاوە چەند تێی ڕادەمینێم کاسبکارێکی زۆر چاك و وریایە، لە هەر بەرنامەیەك داوەت دەکرێت سێ چارەگی وەختی بەرنامە بە سوێند خواردن و قورئان خوێندن، و بەقوربانی چاوە ڕەش و زەردەکانت بم، وبەرگری لە خۆکردن دەکوژێت..

میکانیزمی زۆر سەیر بەکار دەهێنێت بینەرێکی ساویلکەی زۆر دەخاتە ژێر کاریگەری خۆی وەك:

- متمانە بە خۆ بوون لە باسکردنی چارەسەرەکانی.
- ئاسانگیری کردن لە چارەسەرەکانی.
- خۆ بێ فیز نیشاندان [مەلا عەلی زۆر هیچە، هەر هیچ نییە! عەمری مەلا عەلی نەمینێت! دەمووچاوی دەرێی مەکینەی فەلافلییە!]
- دانانی مەرجی قورس و کاتی درێژ بۆ چارەسەرەکانی تا لە ئەنجامی چارەسەرەکانی ڕزگاری بێت.
- گۆتنەوەی کە پارە وەر ناگرێت کەچی کە خۆم لە هەولێر بووم زۆر دەمێکە لێکۆڵینەوەی مەیدانیم بۆی کرد دەرکەوت کە بەشی شێری هەیە لەو دوکانەی کە نەخۆشەکانی بۆ ئەوێ ڕەوانە دەکات.
- سەروگوێلاک ماچ کردنی نەخۆشەکە!
- فریودانی خەڵك و تەڵەکچیەتی کردن، وەک بەو دواییە تەڵەکەچیەتێکی گەورەی مەلا عەلی کەڵەکچی ئاشکرا بووا!! ئەویش بەکار هێنانی ئامێری تەزووی کارەبای یاری سێکسی **sex toy** بۆ ڕاتەکانی نەخۆشەکانی تا بڵێن جنۆکەیان تێدایە!!!
- خۆ نیشاندان کە گوایە بۆ فەقیر و هەژاران دەیکات و دەبێت ئەوەی ناوی ناوە نەخۆشخانە لە هەموو جیهان بڵاوبێتەوە!

ئەو بەرنامەی شەقام کە نەخۆشەکەی بۆ هێنا و نەیتوانی بجوکترین چارەسەری بۆ بکات، سەلماندی کە هیچ لەبارە، کە بیانووی بەرۆژوو نەبوونی هێنایەوە، پێشکەشکار گوتی پێشتریش هێناویانە بۆلای تۆ کە بەڕەسمی کاتی دەوام و چارەسەر بوە، یانی دەبێت بەڕۆژووش بێت ئەو کاتە!کێشەکە ئەوەیە هەموو کەرتەکانی ژیان پڕ لە ئاشوب و کێشەیە، مەلا عەلی کەلەکیش بەشێکە لەو وەزعە گەندەڵە گشتیە. هیوادارم خەڵکەکە تۆزێك سوودیان لەو بەرنامەیە وەرگرتبێت بۆ ناسینی ئەو دەجالەی توبی نەبەوی.

٢٠١٦/٣/٢٧

# گەشتێك بەناو كتێبی [ئەشكەنجە و زیندان]
# خوێندنەوەیەك لە فیكری مامۆستا عەلی باپیر

یەكەم

بەرلەوەی بچمە ناو باسەكەم دەمەوێ هەموو لایەك بزانێت كە من هەردەم هەڵوێستم دەرهەق مامۆستا عەلی باپیر پۆزەتیڤ بوون، ئەگەرچی سەرنج و ڕەخنەیەكی زۆریشم هەبووە لەسەر نووسینەكانی. وەك بەڵگەیەكیش بۆ ئەو هەڵوێستانە ، زۆر بە شانازییەوە دەڵێم كە من بەشدار بووم لەو خۆپیشاندانەی بەردەم باڵوێزخانەی ئەمریكا بۆ ئازادكردنی بێ قەید و شەرتی مامۆستا عەلی باپیر، هەروەها لە میدیاكانیش شتم نووسیوە و بەشداری بەرنامەی تەلەفزیۆنیم كردوە هەر لەو پێناوە. بێگومان من مامۆستا عەلی باپیر لە نزیكەوە ناناسم، ئەگەرچی زۆر شتم دەربارەی گوێ لێ دەبێت لەوانەی لە نزیكەوە هەڵسوكەوتیان هەیە لەگەڵی، زۆر لەو شتە نێگەتیڤانەی كە گوێم لێدەبوون هەر قسەی بێ بەڵگە بوون تا چاوم بەو كتێبەی [ئەشكەنجە وزیندان] كەوت بەو دواییە وبە وردی خوێندمەوە، وپوختەیەكیشم لێی وەرگێڕایە سەر عەرەبی بۆ ڕۆژنامەی [الشرق الاوسط]ی لەندەنی. من مامۆستا عەلی باپیر زۆر دەمێكە دەناسم وەك نووسەر لەوەتی سەردەمی كتێبی [ئیسلام و ڕێچكان] دەتوانم بڵێم زۆربەی نووسینەكانیشم خوێندۆتەوە لەو ڕۆژەوە، بێگومان سەرنجێكی زۆریشم لا كۆبۆتەوە لە خوێندنەوەی كتێبەكانی ، بەلام لەبەر هەر هۆیەك بوو بێت، پرایەرەتی و یەكەمێتیم نەكردۆتە وەڵامدانەوەی ئەو. ئێستاش لەپاش ئەو هەموو ناسۆریەی زیندان و فشاری هێزە دەسەڵاتدارە بەناو دیموكراسیەكان حەزم لێ نەبوو وەڵامی مامۆستا عەلی باپیر بدەمەوە، بەڵام ئەوەی لەو كتێبە [ئەشكەنجە وزیندان] خوێندمەوە شتێكن نەدەكرا هەروا بەسەری تێپەڕین، چونكە ئەگەر وەڵام نەدرێتەوە لەلایەن كەسانێكی بێلایەن و خەمخۆری ئەو گۆڕەپانەی كوردستان و نزیك لەو نێوەندەی كە مامۆستا عەلی باپیرتێیدایە، سوودی نابێت ئەگەر هەموو نەیارانی مامۆستا عەلی باپیر وەڵامی دەنەوە.

لەوانەیە ئەوەی زیاتر هانیدابم بۆ ئەو وەڵامە ئەوە بێت كە یەكەم جارە مامۆستا عەلی باپیر دەربارەی ژیانی تایبەتی وبیروڕا و هەڵسوكەوتی خۆی شتێك بەو تەفسیلە بڵاوكاتەوە. بۆیە شتەكان زەقتربوون و پێویستیان بە هەڵوێستێكی زەق و ڕوون هەبوو بە تایبەتی كە هەوادارانی مامۆستا عەلی باپیر لە كوردستان كەم نین بە ژمارە، و ئەوانەی گوێی لێدەگرن ئەگەرچی لە ئاستێكی دیاریكراو دان لە نێوە گۆڕەپانی ئیسلامی، بەڵام زۆر بە دەمارگرژیەوە گوێی بۆ دەگرن. من لە بیرمە كە چۆن كەسانێك قسەكانی ئەویان وەك خۆی دەگووت ودەگووتەوە، وەك دەڵێن بە نوقتە و فاریزە دەیانگواستەوە، خۆشم لە سەردەمی دەركردنی كتێبی [ئیسلام و ڕێچكان] بەپێی ئاستی فەرهەنگی ئەو كاتەم هێندە پێی سەرسام بووم وامدەزانی لە دوای قورئان و حەدیس ئەو كتێبە دێت!

مەبەستم ئەوەیە نووسینەکانی مامۆستا عەلی باپیر جۆرە عەقڵیەتێك دەدوێنێت کە تەنها سەرسامە وموتەلەقیە، توانای بیرکردنەوە و لێکدانەوە و ساغکردنەوەی سنووردارە، بێگومان گرنگە بەرچاوی ئەو چینە خەڵکەش کەمێك ڕۆشن کەینەوە، هیچیتر لە هەڵوێستی موتەلەقی وەرگر و سەرسام نەمێنێتەوە. ئێستا با بێینە سەر باسکردنی سەرنجەکانم کە بەوپەڕی دڵسۆزیەوە دەیانخەمە بەردەم خودی مامۆستا عەلی باپیر و هەموو خوێنەرێکی کورد، کە ئاواتی تەبایی و برایەتی هەموو لایەنێکی کوردە، و دژی ناکۆکی و دووبەرەکێ یە لە ژێر هەر ناوێك بێت.

## پەیوەندی لەگەڵ پیاوانی ڕژێم

پێموابێ مامۆستا عەلی باپیر وا ناسراوە کە لەوەتی هەبووە لە دژی ڕژێمی بەعس بووە و دژایەتی ئەو بۆ ئەو ڕژێمەش ئاسان نییە حاشا لێکردنی، بەخت یاری نەبووە کە لەگەڵ سەرانی ڕژێم لە یەك گرتووخانە زیندانی بکرێت. بەڕاستی زەحمەتە هەڵسوکەوت کردن لەو جیهانە بەرتەنگە لەگەڵ ئەو دڕندە ئادەمیانەی کە دەیانبینین چۆن هەڵسوکەوت دەکەن لە کاتی دادگاییەکانی سەدام و هاوەڵانی. بەڵام مامۆستا عەلی باپیر کەسێکی ئاسایی نییە، لەگەڵ چەند بەعسیەکی ئاسایی زیندانی کرا بێ، بۆیە دەبوایە ڕەچاوی ئەو هەل ومەرجە مێژووییەی کردبا و هەوڵیدابا هەڵسوکەوتی لەگەڵیاندا نەگەیشتبایە ئەو ئاستەی هەموو کوردێکی پێ ئیستیفزاز بێت. لەوانەیە ئەو هەڵوێستانە بۆ هەر کەسێکی ئاسایی، ئاسایی بان، بەڵام بۆ ڕابەرێکی ئیسلامی و کورد هەرگیز ئاسایی نین. کاتی خۆی بەر لە ئازادبوونی بەرگوێم کەوت کە لە زیندان چاوی بە پیاوانی ڕژێم کەوتووە، و بەرخوردی لەگەڵیاندا هەبووە، زۆر بە پەرۆش بووم بۆ زانینی تەواوی هەواڵەکە، بەڵام کە چیرۆک وهەواڵەکەم لەو کتێبە خوێندەوە تووشی شۆك هاتم!

هەڵوێستی مامۆستا عەلی باپیر لەگەڵ پیاوانی ڕژێم لە هەڵوێستی دژی داگیرکردنی عێراق لەلایەن ئەمریکاوە سەرچاوە دەگرێت، کە دەڵێت " بەڵێ ئێمە پێمان ناخۆش بوو ئەمریکا بێتە عێراقەوە، وڵاتێکی کافر بێتە ناو خاکی ئیسلامەوە! ڕاستە کە مامۆستا عەلی باپیر پێ خۆشبوونی خۆی بە ڕووخانی ڕژیم ناشارێتەوە، و دەڵیت دەکرا ڕژێم بڕوخێنرێت بەبێ داگیرکردنی ئەمریکا! من گومانم هەیە کە ئۆپۆزسیۆنی عێراقی توانای ڕووخانی ڕژێمی هەبووایە، چونکە ڕژێم بۆ لێدان و زاڵبوون بەسەر میللەتی عێراقدا هەردەم سەرکەوتوو بوو، هەموو هەوڵەکان بۆ ڕووخاندنیشی لەلایەن خەڵکەوە بەوپەڕی لێزانی و دڕندەیی و ئاسانیەوە پوچەڵی دەکردنەوە. ئینجا ئەگەر عەرەبێکی ناوەڕاستی عێراق بەهرەمەند لە وجودی ئەو ڕژێمە ئەو قسانە بکات، هێشتا بیانووێکی بە دەستە، بەڵام تۆ وەك کوردێکی ئیسلامی ئۆپۆزسیۆن دەبێت زیانت چی بێت لە ڕووخاندنی ئەو ڕژیمە بە دەستی ئەمریکا؟! یان ئەو قسانە تەنها دووبارەکردنەوەی پرووپاگەندەی میدیای عەرەبی و ئیسلامییە؟! ئینجا کەی دونیای سەردەم بەو جۆرە دابەش دەکرێت [وڵاتێکی کافر بێتە ناو خاکی ئیسلامەوە!!] ل ٢٧، تەنها ئاماژە دەکەین بە ژمارەی لاپەڕە لە کتێبی [ئەشکەنجە وزیندان].

ئەمە دەقاودەق دوو فوستاتەکەی [ڕایەخەکەی] ئیمان و کوفری ئوسامە بن لادنە! ئێمە بێگومان هەواداری داگیرکاری ئەمریکا نین بۆ هیچ وڵاتێکی ئیسلامی و غەیرە ئیسلامی، بەڵام ئەگەر داگیرکردنێك ڕووخانی ئەو ڕژێمە بنج داکووتاوە و دژە گەلەکەمی لێ بکەوێتەوە، تەخت و بەخت تێکشکانی بەعسی لێبکەوێتەوە، هەڵبژاردنی ئازادی لێبکەوێتەوە، گەورەبوونی پایە و پێگەی کوردی لێبکەوێتەوە لە عێراق و جیهاندا، بۆ دەبێت من دژی ئەو داگیرکردنە بم؟! ئێمە هەموو کەرامەت و ئاخ و شەرەف وچارەنووسمان بەدەست ئەو ڕژێمە پێشێل و داگیرکرابوو، بۆ دەبێت داگیرکەرێکی تکریتی چاکتر بێت لە داگیرکەرێکی ئەمریکی؟! خۆ هەر نەبێت ئەو ئەمریکیە کەمێك شارستانیتر ڕەفتار دەکات لەو تکریتیە شۆڤێنییە دڵ پڕ لە قینە؟! خوا دەزانێت کە من لەسەر ئاستی کەسێتی هیچ سودێکم لە داگیرکردنی ئەمریکی نەبینیوە، بەڵام دەڵێم ئەزیەت وئازاری سوپای داگیرکەری ئەمریکی [کافر] لە چاو ئەشکەنجە بێ وێنەکانی ڕژێمی بەعسی [موسڵمان] یاری منداڵانە. لە بیرمە کاتی خۆی کە سەدام کوێتی داگیر کرد، ئەمیری کوێت کە عەرەبیشە، لە چاوپێکەوتنێکدا کە هەرچەندە عەرەب و موسڵمانیشە، لە وەڵامی: چۆن دەتانەوێت بە پاڵپشتی ئەمریکا کوێت ڕزگار کەن؟ وتی ئێمە ئامادەین بە پاڵپشتی شەیتانیش کوێت لەو داگیرکەرە دڕندەیە ڕزگارکەین! ئەوە لە کاتێکدا هەموو ئەشکەنجە و ئازاری کوێتیەکان بە قەد ئازار ومەینەتی مانگێکی کورد نەبوو بە دەست ڕژێمی بەعسەوە. سەیرم پێ دێ کە مامۆستا عەلی باپیر ئەو کارەی ئەمریکا " بە پێچەوانەی دیموکراسی و مافی مرۆڤ و پابەندی بە ڕێککەوتننامە نێو دەوڵەتییەکان ناوزەد دەکات. ل ٧١، ئەو قسەیە لە عبدالباری عطوان و مستەفا بەکری و معن بشور و خیرالدین حسیب دەوەشێتەوە، بەڵام نەدەبووایە بە خەیاڵی مامۆستا عەلی باپیر دا گوزەریان کردبا.

## دووەم

لە هەمووی خۆشتر مامۆستا عەلی باپیر کۆپی هەمان مەقولاتی میدیای عەرەبی دەکاتەوە کاتێك ڕەخنە دەگرێت لە هەڵوەشاندنەوەی دەزگاکانی [ڕاگەیاندن و ئەمن و موخابەرات و عسکەری و مەدەنی...] ئێمە ببووینە پەند و عیبرەتی زەمانە بە دەستی دەزگاکانی ئەمن و موخابەرات و سووپا، دەزگاکانی ڕاگەیاندنی بەعسیش گۆرانی دەچڕی بەدیار مەرگەساتەکانمانەوە، و هەقیقەتەکانی ئاوەژوو دەکردەوە، کەچی تۆ لە خەمی هەڵوەشاندنەوەیانیت! خۆزگە لەو بوارە پەندت لە ڕابەری شۆڕشی ئیسلامی ئێرانی خومەینی وەردەگرت، کە نەك دەزگاکانی شاهەنشاهی هەڵوەشاندەوە بەڵکو دەیویست ساختمانەکانی ئەو دەزگایانەش بڕووخێنێت و بیخاتە دەریاوە، چونکە شووم و نەفرەتلێکراو بوون بە ڕای ئەو!!

بەڕای زۆربەی خەڵکی عێراق پیاوانی ئەو دەزگایانەی ئەمن و موخابەرات و تا ڕادەیەکیش عەسکەری دەبوایە بدرێنە دادگا لە بری ئەو هەموو تاوانە ناوێزانەی کە ئەنجامیان دەدا لە دژی خەڵکی بێتاوانی عێراق بە گشتی و خەڵکی کورد بە تایبەتی. لەو پەیوەندیەی لەگەڵ سەرانی ڕژێمی پێشوو، جێی ئەسەفە کە مامۆستا عەلی باپیر ئەوپەڕی میهرەبانی و بەزەیی و سک پێسووتان دەنوێنێت بەرامبەریان

کە دەڵێت: " وتم وەڵڵا هیچ ئیشم بە ئێوە نییە، بەڵێ ڕقم لە کردەوەکانتانە، بەڵام وەکو بەنی ئادەم، وەکو مرۆڤ بەزەییم پێتان دێتەوە" ل ٢٣١

مامۆستا عەلی باپیر کاتێك سەرانی ڕژێمی پێشوو لێی تووڕە دەبن لەبەر زەربی سفرکردنی کردەوەکانی پێشوویان دەڵێت: " من لە ڕووی دڵسۆزیشەوە ئەو شتانەتان پێ دەڵێم، بۆ ئەوەی کە لەسەری بوون، چیدی لەسەری نەچن، بە خۆتاندا بچنەوە، ئەگەرنا وەکو چارەنووسی دونیاشتان وادەبێ، دەڵێم لانی کەم گەر دونیاشتان چوو، با قیامەتەکەتان هەبێت، خۆ من دڵسۆزتانم" ل ٢٥٥

دڵسۆزیەکەی مامۆستا عەلی باپیر بۆ سەرانی ڕژێمی پێشوو هێندە بووە کە خۆشیان دانی پێدا دەهێنن " وامانزانی هەر سەلامان لێ ناکەی، بۆمان دەرکەوتووە تۆ خۆ بەکەمزانی، ئینجا دڵسۆزمانی و پەرۆشی قیامەتی ئێمەیت، و ئینجا ئەو شتە کۆنانەی کە پێشتر ئێمە هەمانبووە، لە گەڵمان لێك نادەیتەوە" ل ٢٧٩ هەروەک خۆشی دەڵێت: " چونکە من ئیمامیشیان بووم و پێشنوێژیم بۆ دەکردن، بانگم بۆ دەدان، دیارە من هەر ئەوە نەبووم وەکو نەیارێکی فیکری، ئەوان بە چاوی ئیمامەتی و پێشەوایەتی تەماشایان دەکردم، وەکو بڵێی بەرپرسی دونیا ودینیان بم، بۆ هەموو شتی دەهاتنەوە لای من، پرسیاریان دەکرد، داوای هاوکارییان دەکرد و دەیانگووت: ئاشتمان کەوە، ئامۆژگاریمان بکە" ل ٢٥٥.

لە شوێنێکی تر دەڵێت: " بە تایبەتی من ڕەفتار و مامەڵەشم لە گەڵیاندا، ڕەفتار ومامەڵەیەکی چاکەکارانە بوو، لە خوا بەزیاد بێت من زۆر چاکەم بۆیان لە دەست دەهات، پێنج فەرزە بانگم بۆ دەدان، ئەو کاتانەی کە بواریان دەدا بچینە دەر بۆ نوێژەکان، نوێژی بە کۆمەڵم بۆ دەکردن، دوای عەسران ئامۆژگارییم دەکردن، لەو دوا دواییە سێ چوار نوێژی هەینیم بۆ کردن، نوێژی جەژنەکانم بۆ دەکردن، یەکێکیان مردبا، نوێژمان لەسەر دەکرد، پاشان پرسیاری شەرعییان لە من دەکرد، جا غەیری ئەوانەش من ئەگەر خواردنێکی زیادەم بۆ هاتبایە، جار جار لە ماڵەوە هەندێ شیرینی و شتم بۆ دەهات، یان بەرگ و پۆشاکێکی زیادەم هەبوایە، دەمدانێ، ئەوانەیان کە نەخۆش بووایە دوعایەکم بۆ دەخوێندن، سەلامێکم لێ دەکردن.." ل ٢٧٨.

دیارە مامۆستا عەلی باپیر زۆر بە ویژدانێکی ئاسوودەوە باسی ڕۆڵی کاریگەری خۆی دەکات لە ڕزگارکردنی قیامەتی ئەو ئەهریمەنە دڕندانە، خەمی ئەوەیەتی وەك دونیایان چووە قیامەتیان نەچێت! بەڕێزم ئەو پیرە پیاوانەی سەرانی ڕژێمی پێشوو دونیای ملیۆنەهای وەک من و تۆ و پیر ولاو و منداڵ و نێر ومێی خەڵکی عێراق و کوردستانیان تێکدا، ئەوە نییە لەو وڵاتە دەوڵەمەندە خەڵکەکەی وەك هەژارترین خەڵکی دنیا دەژین، دیوتە وڵاتێکی نەوتی وا وەك کاولگە خۆی نیشان بدات؟!

ئەوان لە هیچیان کەم نەبووە، وەك پاشایان ژیانیان بەڕێ دەکرد، هەردەم لە کەیف و سەفای خۆیان دابوون، بۆ دەبێت دونیایان چوو بێت؟ ڕاستیەکەی ئەوان تەنها براوەی دونیا بوون تا بە دیدارت شاد بوون، کەچی تۆ هەوڵی ئەوەت دا قیامەتیشیان بۆ مسۆگەر کەیت، ئینجا وەرە لەو بەهەشتە پاك و خۆشە سەلام لە سەدام و عەلی حەسەن مەجید و تەها یاسین ڕەمەزان و عەبد حەموود و هەموو سەرانی ڕژێمی پێشوو بکەیت! ئەوە ئەگەر لەبەر قەرەباڵغی پیاوانی بەعس لە بە هەشت جێیەکمان دەست

کەوێت! هەتا کۆمەڵی خاچی سوریش سەرسوڕمانی خۆیان نیشانداوە لەو پەیوەندییە نائاساییەی مامۆستا عەلی باپیر و سەرانی ڕژێمی پێشوو، دەیانگووت:" چۆن دەتوانی لەگەڵیان دابنیشی و قسە بکەیت؟ وتم بۆ ناتوانم؟ خۆ پێغەمبەر [د.خ] لەگەڵ ئەبو جەهل قسەی کردوە، موسا لەگەڵ فیرعەون قسەی کردووە، نەمن لە موسا چاکترم، نە ئەوان لە فیرعەون و ئەبو جەهل خراپترن، ئێستا بە تایبەتی هەموو لێقەوماون وەکو یەکن، ئەگەر کاتی خۆشی فیرعەون و ئەبو جەهل بوو بن، ئێستا هەموو لێقەوماون. بەزەییم پیایاندا دێتەوە... وتم وەکو مرۆڤێك بەزەییم پیایاندا دێتەوە و مامەڵەیان لەگەڵ دەکەم، چونکە دەمەوێ سوودیان پێ بگەیەنم و لەو زەلکاوەی تێیدان – واتە زەلکاوی گومرایی – دەریان بێنم" ل ٢٥٧.

بەڕاستی ئەو پیاوانە لە فیرعەون و ئەبو جەهل یش خراپتر بوون، دووبارەکردنەوی ئەو مەقولاتە توراسیانە وەك [نەمن لە موسا چاکترم، نە ئەوان لە فیرعەون و ئەبو جەهل خراپترن] هیچ لەو هەقیقەتە ناگۆڕێت کە ئەو دڕندانە لە فیرعەونیش خراپتر بوون، خۆ فیرعەون کیمیاوی نەبوو، تۆپ وتەیارە و ناپاڵمی نەبوو! ئینجا من یەك هەڵوێستی پێغەمبەر [د.خ] دەخەمەوە یادی عەلی باپیر: کاتێك وەحشی بکوژی حەمزە ویستی ببێتە موسڵمان لە ڕزگارکردنی مەککەدا، تەنها لەبەرئەوەی حەمزەی مامی پێغەمبەری کوشتبوو، پاش گێڕانەوەی ڕوداوی کوشتنی حەمزە لای پێغەمبەر، پێغەمبەر پێی گووت: هەی تیاچیت لەبەرچاوم ون بە، با نەتبینم، منیش لە مەولا خۆم لە پێغەمبەر [د.خ] لا دەدا تا نەمبینێ، تا ئەمری خوای کرد" سیرە ابن هشام، ج الثاني. ئەوە دەقی ڕوداوەکەیە وەك لە سیرەی ئیبن هشام دا هاتووە:

[ وحشي بين يدي الرسول يسلم ] فلما قال لي ذلك ، خرجت حتى قدمت على رسول الله صلى الله عليه وسلم المدينة ، فلم يرعه إلا بي قائما على رأسه أتشهد بشهادة الحق ؛ فلما رآني قال : أوحشي ؟ قلت : نعم يا رسول الله . قال : اقعد فحدثني كيف قتلت حمزة قال : فحدثته كما حدثتكما ، فلما فرغت من حديثي قال : ويحك غيب عني وجهك ، فلا أرينك . قال : فكنت أتنكب رسول الله صلى الله عليه وسلم حيث كان لئلا يراني ، حتى قبضه الله صلى الله عليه وسلم.

[ خلع وحشي من الديوان ] قال ابن هشام :فبلغني أن وحشيا لم يزل يحد في الخمر حتى خلع من الديوان ، فكان عمر بن الخطاب يقول : قد علمت أن الله تعالى لم يكن ليدع قاتل حمزة. السيرة النبوية (ابن هشام) مؤسسة علوم القرآن، عدد الأجزاء: جزءان

سێیەم

بروانن وەحشی پاش موسڵمانبوونیشی و کوشتنی موسەیلەمەی کەزابیش لە شەڕەکانی هەڵگەڕاوەکان هێشتا بەو شێوەیە نێگەتیڤە لەلایەن دادپەروەرترین خەلیفەی ئیسلام عومەری کوڕی خەتاب، وا خراپ باس دەکرێت، بەس لەبەرئەوەی حەزرەتی حەمزەی کوشتووە، نەک لەبەر ئارەق خواردنەوەی، چونکە

حەزرەتی عومەر لەگەڵ گوناهی گەورەتریش هەڵویستی نەرمتری نواندوە! ئیبنو هیشام دەڵێت پێم گەیشتووە کەوا وەحشی بە بەردەوامی سزای خواردنەوەی عەرەقی لێ دەدرا، هەتا ناوی لە لیستی مووچەوەرگرانی دیوان کوژێندرایەوە، عومەری کوڕی خەتاب دەیگووت: دەمزانی خوای گەورە واز لە بکوژی حەمزە ناهێنێت"! وەك بڵێی خواش بە تۆبەی وەحشی داماوی کۆیلە ڕازی نەبوو بێت!!، ئەوەش بێگومان دوورە لەو بەزەییە بێ سنوورەی خوا کە لە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر باس دەکرێت.
ئەوە پیغەمبەرە بەو هەموو ڕوحی بەخشش ومیهرەبانی و ڕەحمەتون لیلعالەمینە ئەو هەڵوێستە وەردەگرێت لە دژی بکوژی مامی، هەرچەندە کابرا موسڵمانیش بوو، کۆیلەش بوو کارەکەیان پێ کردبوو. کەچی جەنابی مامۆستا عەلی باپیر، بەو هەموو بەزەیی و مرۆڤایەتییەوە هەڵسوکەوت دەکات لەگەڵ بکوژی سەدان هەزار ژن و پیاو و منداڵ و پیر وجحێڵی میللەتەکەی. خۆ ئەگەر ڕاستیت دەوێت وەحشی زیاتر شایەنی بەزەیی وسک پێ سوتانەوە بوو، چونکە ئەو تەنها کۆیلەیەك بوو و بەس، بەڵام سەدام و پیاوانی هەموو عێڕاقیان کردبووە کۆیلەی خۆیان.
خۆ وەحشیش لە فیرعەون و ئەبو جەهل خراپتر نەبوو؟! دەبوایە تۆ بەلایەنی کەم حەزت بە چارەیان نەبووایە، وەك چۆن پێغەمبەر [د.خ] حەزی بە چارەی وەحشی نەبوو، پاش موسڵمان بوونیشی، نەك دوعایان بۆ بخوێنی گەر نەخۆش بوون، ئاشتیان کەیتەوە گەر نێوانیان تێك چوو، خواردن وشیرینی و پۆشاکی خۆتیان پێ بدەیت، هەموو خەمێکت رزگارکردنی قیامەتی ئەو دڕندانە بێت کە دونیا و قیامەتی ملیۆنەها کورد وعێڕاقیان فەوتاندبوو.!
من تێناگەم لەو میسالیەتە بڵێی کوشتنی ئەو هەموو خەڵکە بێ تاوانەی میللەتەکەمان و خاپوورکردنی کوردستان هێندە مامۆستا عەلی باپیری نەبزواندبێ کە نەفرەت لەوانە بکات و ئاواتی دۆزەخیان بۆ بخوازێ، لە جیاتی خستنەگەڕی هەموو تواناى بۆ ڕزگارکردنی قیامەتییان؟! ئەی ئێمەی ئیماندارانی بێ دەسەڵات هیوامان بەچی بێت بۆ سزادانی جەللادەکان، ئەگەر لە دنیا هیچمان پێ نەکرا لە گەڵیان، تۆش بێیتوو قیامەتیان ڕزگار بکەیت لە وەقتی زایەع؟! ئەی جگە لە سزای دۆزەخ هیوامان بە چ سزایەك بێت؟! من باوەڕناکەم خوا و پێغەمبەر و خەڵك بەو هەڵوێستە نقووم بووەی ناو ئایدیالیزمیەتە ڕازی بن جگە لە چەند ئەندامێکی موتیعی کۆمەڵ نەبێت!

## داگیرکردنی کافران بۆ خاکی موسڵمان!

بەڕاستی مەسەلەی داگیرکردنی کافر بۆ دەوڵەتێکی موسڵمان، تێڕوانینێکی زۆر سادەیە بۆ مەسەلەیەکی زۆر ئاڵۆز خۆزگە کارەکە لێرەوە بوەستبا، بەڵکو دەپەڕێتەوە بۆ بە ئیسلامکردنی خودی ئەو تاغوتەی کە هەموو کوردی بە کافر دەزانی و ئەنفالی لەسەر ئیجرا کردن ، بڕوانە لەو بارەیەوە مامۆستا عەلی باپیر چی دەڵێت: " هەرچەندە ئێوەش زیندانی بوون لەوێ، ئایا پێتان خۆش بوو کە سەددام لەوێیە لە زینداندا؟ وەڵلا پێم خۆش بوو وەك بیرم لە حاڵی میللەتی کورد و عێڕاق و ئەو هەموو ستەم و زۆرانەی دەکردەوە کە ڕژیمی بەعس بە سەرۆکایەتی سەددام بەسەری هێناوە، بەڵام لە سەرێکی کەوە بەڕاستی

پێم ناخۆش بوو، چونکە دەمەوێت هیچ شتێك نەڵێم پێچەوانەی قەناعەتی خۆم بێت، پێم ناخۆش بوو کەسێك کە لەسەر موسڵمانان حساب دەکرێ، سەرۆکی وڵاتێکە کە موسڵمانانی تێدا نیشتەجێن، بکەوێتە بەردەستی دەوڵەتێکی کافر. ل ٢٥٩

یانی هەرلەبەر ئەوەی پێی ناخۆش بوو چونکە سەددام لەسەر موسڵمانان حساب دەکرێ؟ یان لەبەرئەوەی سەرۆکی وڵاتێکە موسڵمانانی تێدا نیشتەجێیە؟! بەڕاستی ئەوە مەنتیقێکی سەیرە، چونکە ئەگەر وابێت دەبێت ئەو دکتاتۆرانەی جیهانی ئیسلام و عەرەب لەبەرئەوەی سەرۆکی وڵاتانێکن کە موسڵمانانی تێدا نیشتەجێن یان لەبەر ئەوەی لەسەر موسڵمانان مەحسوبن، دەبێت چاکتر بن لەو سەرۆکە [کافرانەی] کە وڵاتەکانیان بەوپەڕی دادپەروەری و دیموکراسی بەڕێوە دەبەن؟! دەبێت بەشار ئەسەد و ئەحمەدی نەژاد و سلێمان دیمرێل لە ماندێلا باشتر بن؟! من پێموایە سەرۆکێکی مەسیحی وەك ماندێلا سەدان هەزار جار چاکترە لەو دیکتاتۆرانی بە حسێب موسڵمانن!

لە کاتێکدا سەرانی ڕژێمی پێشوو پێیان وابوو" " وامانزانی هەر سەلاممان لێ ناکەی، بۆمان دەرکەوتووە تۆ خۆ بەکەمزانی، ئینجا دڵسۆزمانی و پەرۆشی قیامەتی ئێمەیت، و ئینجا ئەو شتە کۆنانەی کە پێشتر ئێمە هەمانبووە، لە گەڵمان لێك نادەیتەوە" ل ٢٧٩. مامۆستا عەلی باپیر لە وەڵامیاندا وا بە خەستی چۆتە ناو ڕۆڵی هیدایەت دەری سەرانی ڕژێمی پێشوو وەك بڵێیت مەهدیەکە و خوا بۆ ئەوانی ڕەوانە کردبێت "

وتم وەڵڵاهی ئێستا لێتان قەوماوە، من بەبێ شەهامەتی دەزانم ئەتۆ کەوتویت پێ لەقەت پێدادەم ، وتم بەنی ئادەمیشی، جا کە تۆ دونیاکەشت چووە، بۆ قیامەتەکەشت بچێ، بەڵێ من بەزەییم پێتاندا دێت، بە تایبەتیش کە بۆ خۆتان ئامادەیی دەردەبڕن و دەڵێن پێمان خۆشە لە ئیسلام تێبگەین و بگەڕێینەوە لای خوا و چاك بین.." ل ٢٧٩

## موریدە بەعسیەکان

لە هەمووی سەیرتر مامۆستا عەلی باپیر ئەو پیاوانەی بەعسی بە موریدی خۆی دەزانێ! لە وەڵامی ئەوانە کێ بوون؟ واتە ئەوانەی مامۆستا عەلی باپیر باسی تاعەت و عیبادەتیان و تەوبە و گەڕانەوەیان دەکات، دەڵێت: " وەڵلا پێم خۆش نییە ناوی کەس بەرم لە موریدەکانی خۆم، پێم خۆش نییە ناویان بەرم!! ل ٢٧٧.

نیشانەی سەرسوڕمانەکەش هەر لە ئەسڵی دەقەکەی ناو کتێبەکەیە. وادیارە کاك هاوژین عومەریش، کە هەست دەکەم موحاویرێکی باشە، بەڵام جاروبار جورئەتی بە دواداچوونی لە ئاستی پێویست کەمترە، ئەویش ئەو تەرزە قسەیەی بۆ هەرس نەکراوە. ئەوەتا لە تەوەرەی شەشەم سەرنجی مامۆستا عەلی باپیر بۆ دیاردەیەکی زۆر باو ڕادەکێشێت، کە کە ئەویش دیاردەی خۆ هەڵدانە باوەشی ئیسلامیەکانە لەلایەن نەتەوەپەرست و بەعسیەکانی عەرەب لە دوای شکستهێنانیان، کەچی مامۆستا عەلی باپیر سورە لەسەر ئەوەی تەنها گوێ بۆخۆی ڕادێرێ، پاکانە بۆ ئەو ئیسلامیەتەی بەعسیەکان دەکات

وبیانوویان بۆ دەهێنێتەوە. کاک هاوژین عومەر دەپرسێت: " ئایا ئەمە ئیشکالێك دەرناخات سەبارەت بە نەتەوەپەرست و ڕەگەزپەرستە عەرەبەکان، دیاردەیەك هەیە لە جیهانی عەرەبییدا ، کە ئەوان دوای شکستیان ، خۆیان هەڵداوەتە باوەشی ئیسلامییەکانەوە، خۆ پیشاندان بە سیمای ئیسلامییەوە بۆ ئەوەی ئێستا کە ڕەوتی ئیسلامی لە نەشونما دایە، ئەوان خۆیان ون کەن تیایاندا، یا عاتیفەی ئەو خەڵکانە بوروژێنن؟ ئەو ڕیشەش ئاماژەیەکی نهێنی بێت بۆ ئەوە؟

- ڕەنگە شتی وا هەبێت، بەس کاک هاوژین لەوێ ئیسلامیبوون لە هەموو شتێ مەترسیدارتر بوو، لەوێ کەسێك سیمای ئیسلامی پێوەبا، یان بۆنی ئیسلامیبوونی لێهاتبا، ئەمریکیەکان لە هەموو کەس بە خەتەرتریان دەزانی، لەبەر ئەوە باوەڕناکەم کابرا لەوێ شتێکی وا بکات بە مەترسیدار بێتە بەرچاو.." ل ٢٩٢

## چوارەم

کەوابووئەو ڕیشەی سەددام و عەبد حەمود و ئەوانیتر دەبێت هەقیقەت بێت بۆ فریودانی ئەو گۆڕەپانە ئیسلامییە غەوغائیە نەبێت، سەددام ئەو بەزمەی دیانەتبازیەی بەر لە ڕوخانیشی دەست پێکردبوو، فەرمانی ڕاشکاویش لە قیادەی بەعسیەکان هەیە لە پێش ڕووخان و پاش ڕووخانیش کە تا بۆیان بکرێ بە خیتابێکی ئیسلامی خەڵکی عێراق و جیهانی عەرەب بدوێنن، سادەترین خوێندەوار ئەو هەقیقەتە دەزانێت، کەچی مامۆستا عەلی باپیر نکوڵی لێدەکات! بەڵکو ئەو جۆرە بیرکردنەوە خەریکە ببێتە دیاردەیەك لە سەرتاسەری جیهان، هەتا ستالین بەو هەموو ئیلحادەوە لە گەرمە گەرمی جەنگی دووەمی جیهانیدا دیانەتبازی ریاکارانەی دەکرد لەگەڵ کلێسای ڕووسی!

هەر لەو تەوەرەیە پاش ئەوەی مامۆستا عەلی باپیر لە وەڵامی پرسیارێکدا سەبارەت بە یەک گەیشتنەوە لەگەڵ ئەو پیاوە بەعسیانەی سەرانی ڕژێمی پێشوودا، دەڵێت: "بەڵێ تێیاندا [سەرانی ڕژێمی پێشوو] هەیە حەزدەکەم ببینمەوە، کە بە پێویستیان نازانم ناوەکانیان بڵێم، لەوانەی کە پێموابوو زۆر کەوتوونەتە ژێر کاریگەری من، پێموایە دەتوانن سوود بگەیەنن، چونکە عەشایەر و خەڵکیان هەبووە... هەندێکیان هەبوو بانگی دەکرد: شێخ، من نازانم حیزبەکەت ناوی چییە، بەڵام کە بەربووم، دێمە ناو حزبەکەی جەنابتەوە، وتم باشە، با بزانین داخۆ چۆن دەبێت" ل ٢٩٦

کاک هاوژین زەنگی مەترسی لێدەدات بۆ مامۆستا عەلی باپیر دەربارەی ئەو خۆشباوەڕیە بەو بەعسیە کولاوانەی ناو سیاسەت و نیفاقبازی، و ئاکامی نێگەتیڤی ئەو جۆرە لێدوانانە لەسەر سومعەی ئەمیر و کۆمەڵەکەی و ئیسلامیەکانی کوردستان بە گشتی، بەڵام ئەو هەر سوور دەبێت لەسەر هەڵوێستەکەی، ئەو شێلگیریەی مامۆستاش زیاتر گوزارشت لە بروا نەبوون بە ڕاوێژ و ڕاپەسندی دەکات. پرسیارەکە دەڵێت مامۆستا، ئامادەییت تێدایە بیانبینیت دوای ئازادبوونیان؟ هاوڕێیەتیان لەگەڵ دروست دەکەیت؟ هەروەها وەکو بەڵێنیان داوە، ئەگەر ئامادەییان دەربڕی لەناو کۆمەڵی ئیسلامییدا کاربکەن، ئامادەیتان

دەبێ وەریان بگرن؟ ئەگەر ئەوە گونجاو شتەکە سەری گرت، پێتان وانییە کاریگەری بۆ سومعەی جەنابتان و بۆ سومعەی کۆمەڵی ئیسلامیدا دەبێت؟
وەڵام: وەڵلا من پێموایە خەڵك دەبێ شانازی بەوەوە بکات، کە کۆمەڵی ئیسلامی بتوانێ خەڵکێکی حزبی بەعس مێشك بشواتەوە و لە چڵك و چەپەڵی بەعسیایەتی پاکی بکاتەوە و بە ئیسلام پڕی کاو و بیکاتە ئەندامێکی بە کەڵك بۆ کۆمەڵگە، دەبێ خەڵك شانازی بەوەوە بکات، ئێمە کاریگەری وامان بێت، تا ئێستا هەر ئەوان خەڵکیان لە ئێمە کوشتووە، یان هەڵخەڵەتاندووە، یان کردوویانن بە سیخوڕ، ئێمە بتوانین ئەوان بەڕاستە شەقامی ئیسلامدا بێنین و وایان لێ بکەین دان بەو مافانەی ئێمەدا بنێن کە شەریعەتی خوای دادگەر پێی داوین، ئەوە بۆ میللەتی کورد دەبێتە خاڵی هێز، بۆ میللەتەکەشمان و بۆ کاری ئیسلامیش دەبێتە خاڵی هێز.
کابرا تا دوێنێ بەعسی بووە و تا دوێنێ میللەتی کوردی بەوە زانیوە کە هاوڵاتی پلە دوو و سێ بووە و ئێستا دان بەوەدا بنێ کە کورد قەوارەی هەبێ و بوونی هەبێ، چونکە من لەو بارەوە قسەم لەگەڵدا کردوون، واتە ئەو کەسە کە بە مەنهەجی ئیسلام ڕازی بێ، دەبێ بە هەموو ئەو شتانە ڕازی بێت کە ئیسلام بڕیاری لەسەر دەدات، نا، من گوێ نادەمە ئەوە، چونکە ئەو مرۆڤانەی کە لەسەر زەویدان خوای پەروەردگار هەموویانی بۆ بەندایەتی خۆی دروست کردووە، ئێمەش هەتا بتوانین مرۆڤێکی لار ڕاست بکەینەوە و بیکەینە بەندەیەکی باشی خوا، بە کەڵکی خۆشی و وڵاتەکەشی بێت، بێگومان ئەوە خاڵی بە هێزە بۆ ئێمە، خاڵی لاوازی نییە تا پێمان شەرم بێت"
جارێ دەبێ لە مامۆستا عەلی باپیر مسۆگەر و مەعلوم بێت کە هیچ کوردێکی دڵسۆز بە عەلمانی و ئیسلامییەوە شانازی بەوە ناکات، چەند بەعسیەکی دۆڕاوی مێژوو بێنە سەر ڕێگای ئیسلام، ئەگەرچی من لە بنەڕەتدا گوومانم هەیە ئەو دەعبا دڕندانە ببنە [ئەندامێکی بە کەڵك بۆ کۆمەڵگە] ئینجا پێمان ناڵێی تازە سوودی چییە لەوپەڕی زەلیلیان دان بە مافەکانی کورد بێنن؟! خۆ وەك خۆت دەڵێی " تا ئێستا هەر ئەوان خەڵکیان لە ئێمە کوشتووە، یان هەڵخەڵەتاندووە، یان کردوویانن بە سیخوڕ" ئێستا کە خوا ئەمریکای موسەخەر کرد بۆ ڕووخانی ئەو ڕژێمە دڕەندەیە، و هەموویانی وەك کەو لە قەفەس کرد و زەلیل و شاربەدەر و وڵاتبەدەر بوون، ئێستا دەتەوێ دڵمان خۆش بێت کە دان بە مافەکانی کورد دەنێن؟! ئەوە چ خاڵێکی بەهێزە بۆ میللەتی کورد یان کاری ئیسلامی؟!
ئینجا زەمانەتی ئەو قسانە چییە هەتا ئەگەر واشبێت، و سوودی هەبێت؟! دەڵێی " چونکە لەو بارەوە قسەم لەگەڵدا کردوون"!! ئەو بەعسە لە لوتکەی دەسەڵاتیان ڕێککەوتنامەی نێودەوڵەتیان لەسەر تەلەفزیۆن دەدڕاند، ئێستا پەیوەستی قسەیەکی ناو زیندان و ئەوپەڕی لاوازیان دەبن؟! باوەڕیش ناکەم تۆشیان قەناعەت پێکردبێت کە دەگەڕێنەوە سەر حوکم. مامۆستا گیان کە دەشڵێی " من گوێ نادەمە ئەوە، چونکە ئەو مرۆڤانەی کە لەسەر زەویدان خوای پەروەردگار هەموویانی بۆ بەندایەتی خۆی دروست کردووە، ئێمەش هەتا بتوانین مرۆڤێکی لار ڕاست بکەینەوە و بیکەینە بەندەیەکی باشی خوا، بە کەڵکی خۆشی و وڵاتەکەشی بێت"

کەس ڕێگای هیدایەتی شەیتانێکی لە وەزنی سەدامیش نەگرتووە، بەڵام تۆ وەك تاکە کەسێك ئەو بڕیارە نادەیت، دەبێ ڕەچاوی بیروڕای کۆمەڵیش بکەیت بە قیادە و بنکەوە، تۆ شێخێکی موتەسەویف و تەنها و گەڕیدە نیت  بە تویێشوویەکەوە، یەکێك گوێ بە شتێك نادات کە تەنها خۆی بەرپرسیار بێت بەرامبەر بڕیار و لێدوانەکانی، چونکە هەر لێدوانێك و ڕەفتارێکی تۆ لەسەر هەموو کۆمەڵی ئیسلامی حسێبە، کە بەو دواییە وا بە چاکی باسی مرۆڤکوژێکی وەك زەرقاوی دەکەیت من باوەڕناکەم هیچ یەکێك لە قیادە و قاعیدەی کۆمەڵ شانازی بە زەرقاوی یان گەڕانەوەی ئەو  بۆرە بەعسیانە بکات، یان ڕازی بێت، بە پەیوەندی لەگەڵ ئەو بەعسیانە، یان بە دیتنی پێشمەرگەیەکی بەعسی ئیسلامی لە ڕێزەکانی کۆمەڵ!!
ڕاستە وەک دەڵێیت: " ئەو مرۆڤانەی کە لەسەر زەویدان خوای پەروەردگار هەموویانی بۆ بەندایەتی خۆی دروست کردووە" بەڵام ئەگەر ڕەحم و بەزایی خوا هێندە بێت تەحەمولی گەڕانەوەی ئەو بە عسیە دڕەندە و نامرۆڤ و خوا نەناسانە بکات، لەگەڵ ئەو هەموو ملیۆنەها تاوانانەی کە ئەنجامیان داوە لە دژی گەلی عێراق بە گشتی و گەلی کورد بە تایبەتی و بە خەستی، ئەوە ماقوڵ نییە داوا لە کورد بکەیت شانازی بکەن بەو دڕندانە، ئەگەر لەسەر دەستی جەنابت تۆبەیەکیان کرد، نەك ئەوە بەڵکو ئەگەر بەرماڵیان بە ئاسماندا سوڕایەوە.
من وەك موسڵمانێك ئامادە نیم لە بەهەشتیش لەگەڵ ئەوانە کۆ ببمەوە، بێگومان ئەگەر خوانەخواستە لەوێ بوون، ومنیش لەوێ بووم ئەوە تەنازول دەکەم بۆ پلەیەکی کەمتر لە بەهەشت، تەنها بۆ ئەوەی نەیانبینم، چونکە دیتنی ئەوان هەڵەبجە و ئەنفال و گوندە ڕوخاوەکان و گۆڕە بە کۆمەڵەکانم بیر دەخاتەوە، بە تایبەتی ئەو گۆڕە بە کۆمەڵەی مندالآنی کورد کە لە موسڵ دۆزرایەوە پڕی بوو لە بووکەڵە و یاری لە تێل دروستکراوی هەرزانبەهای منداڵە بێ نازەکانی کورد! ئەو گۆڕە بەسە بۆ من ئەگەر تەنازولیش بکەم لە بەهەشتەوە بۆ ئاگر، تا ئەو بەعسییە نامرۆڤانە نەبینم!
چۆن دەکرێ یەکێك خاوەنی ئەو هەموو مەرگەساتە بێت بە دەستی ئەو پیاوانە، کەچی وا لەوپەڕی نەرمونیانی و ڕیزەوە هەڵسوکەویان لە گەڵدا بکات، یەکێکی وەك عەلی حەسەن مجیدی کیمیاوی لە چوار شوێندا مامۆستا عەلی باپیر بە [ئەبو حەسەن] بانگی دەکات، کونیەش لای عەرەب بۆ ئەوپەڕی ڕیزە!

پێنجەم

سەتتام ئەلگەعود، سطام الكعود

لە هەمووی سەیرتر مامۆستا عەلی باپیر زۆر بەرگریەکی سەیر لە [سەتتام ئەلگەعود] دەکات، هەر جارەی ناوی بێنێت،  بە شێوەیەکی تۆماتیکی دەڵێ بەعسیش نەبوو، بۆ نمونە: " دکتۆر سەتتام ئەلگەعود، ئەو کە هەر بەعسیش نەبوو، رجل اعمال بوو، زۆر دۆستیشم بوو، پیاوێکی بەڕێز بوو.." ل ١٤٣

" هەروەها دکتۆر سەتتام ئەلگەعود کە ئەو بەعسی نەبوو، ئەوە هەر تۆمەتبار کرابوو..." ل ٢١٨ -٢١٩.
ئەو لە زۆر شوێنیتر بەرگریەکی ڕاستەوخۆ لەو پیاوە دەکات، گوایە بەعسی نەبووە، تەنها پەیوەندی هەبووە بە ڕژێمی پێشوو! دەڵێم بە داخەوە کە مامۆستا عەلی باپیربەبێ ئەوەی ئەو کابرایە بەعسییە بناسێ بەرگری لێ دەکات، بەعسی نەبوونی سەتتام ئەلگەعود کابرایەکم بیر دێنیتەوە کە بەوپەڕی چالاکیەوە بۆ حزبێك کاری دەکرد، بەڵام لە هەموو کۆڕ و بە یەك گەیشتنێك دەڵێت: وەڵڵاهی من حزبی فلان نیم، دەڵێم ئەگەر حزبی و بەعسی نەبوون وەك ئەوەی سەتتام ئەلگەعود بێت، ئەوە کەس حزبی و بەعسی نییە!
سەتتام ئەلگەعود ملیۆنێر و بزنسمانی خانەوادەی سەرۆکی پێشوو و کوڕەکانیەتی، بازرگانی چەکی عێراق بوو تا دواڕۆژ بە نهێنی و ئاشکرا چەکی بۆ ڕژێم دەکڕی، و ئیمپراتۆریەتی داروی سەدام و خانەوادەکەی هەڵدەسوڕێنێت. بەڵکو هەندێك لە ڕاپۆرتەکان دوویاتی دەکەنەوە کەوا سەتتام ئەلگەعود ئەلقەی پەیوەندی دراوی نێوان حکومەتی عێراق و وەزارەتەکانی بوو لەگەڵ کۆمپانیا ئەمریکیەکان.
بێگومان کەس گوێی لە ناوی سەتتام ئەلگەعود نەدەبوو بەر لە ڕووخانی ڕژێم، چونکە تەنها بورغیەکی بێ ئەرزشی ئەو مەکینە زەبەلاحەی ڕژێم بوو، بەڵام هەر لە پاش ڕووخانی ڕژێمی گۆڕ بە گۆڕ هەر لە یەکەم ڕۆژەکانەوە سەتتام ئەلگەعود لە ٢٠٠٣/٤/١١ یەکەم خۆپیشاندانی ساز کرد لە ڕومادی، دوایی لە ٢٠٠٣/٤/١٥ لە گۆڕەپانی فیردەوس، و ئینجا لە ٢٠٠٣/٤/١٧ لە مەنسوڕ خۆپیشاندانی ساز کرد لە دژی داگیرکردنی عێراق، ئینجا هەر لەو ڕۆژگارە [بەرەی نیشتیمانی ڕۆشنبیرانی عێراق] ی دامەزراند کە تەنها واجیهەیەك بوو بۆ ئەو بەعسیانەی کە بە ڕووخانی ڕژێم زەرەرمەند ببوون، تا لە ٢٠٠٣/٤/٢٢ لەلایەن ئەمریکیەکان دەستگیر کرا. لە پاش ئازادکردنی سەتتام ئەلگەعود یەکەم شت کە کردی سەردانی خانەوادەی سەدام بوو بە پێی دەیەها ڕۆژنامە و سایتی عەرەبی و عێراقی، لەو هەواڵە دا هاتووە کەوا سەتتام ئەلگەعود پەیمانی بە خانەوادەی سەدام داوە کە نەهێڵێت بڕیاری لە سێدارەدانی سەدام دەربچێت، و بەرەو دەرەوەی عێراق دەری بکات، هەروەها هەڵمەتێکی بەرفراوانی سیاسی و میدیایی و سەربازی بگرێتە بەر بۆ ئەو مەبەستە، وتی ئەو هەوڵانەش تەنها بەشێکی بچووکی ئەو قەرزانەی سەدامە لە گەردنییدا!
هەر لە ڕۆژی ٢٠٠١/١/٨ لە چاوپێکەوتنێك لەگەڵ تەلەفزیۆنی [العربیة] سەتتام ئەلگەعود لە وەڵامی پرسیارێکی سەعد سیلاوی پێشکەشکار گووتی: من گومانم لە شەڕەفی هەر عەرەبێك هەیە ئەگەر ڕێزی بەرێز سەدام حسێنی سەرۆکی عێراقی لا نەبێت!!" العربیة ٢٠٠٦/١/٨.
هەروەها لە ٢٠٠٦/٢/٢٠ لە ڕۆژنامەی الشرق الاوسط دەڵێت: " بەشداریم کردووە لە قاچاچیەتی بە نەوتی عێراقی و لە پێناو کڕینی دەرمان و خواردەمەنی!! لە کاتێکدا هەموو کەس دەزانێت کە ئەو پارەیە لە تەهریبی نەوت دەست دەکەوت بۆ عودەی و خانەوادەی سەدام بوو. ئەگەر ئەو هەموو خزمەتە بە ڕژێمی بەعس مرۆڤ نەکاتە بەعسی، ئەی بەچی مرۆڤ دەبێتە بەعسی؟! تەنها بە ئیمزایەك؟! خۆ ملیۆنەها کەس ئیمزای بۆ بەعس کردبوو، بەڵام دڵسۆزترینیان بە قەد سەتتام ئەلگەعود خزمەتی ڕژێمی

بەعسیان نەکردووە. ئەوانەی بەو شێوەیە خزمەتی حزبێك دەکەن زۆر گێلن گەر وابزانن لەسەر ئەو حزبە حسێب نابن هەر لەبەرئەوەی ئیمزایان نەکردوە بە ڕەسمی!

سەتتام ئەلگەعود لەوەتی بەربووە بە پێچەوانەی ئەو قسەیەی مامۆستا عەلی باپیر بۆی دەگێڕێتەوە " ئەگەر بەربم، زۆر ڕاشکاوانە دەڵێم کورد مافی خۆیەتی فیدراڵی بوێت، و دەوڵەتی سەربەخۆی بوێت، مافی خۆیەتی، میللەتێکە وەکو باقی ئەم میللەتانە" ل ٢٤٨. لە دوور و نزیك باسی کورد و کێشەی کورد ناکات، دەترسم تۆبە و دینداریەکانیشیان هەر لە ترسی زیندان و مەرگ بوو بێت! هەرچۆنێکی بێت هەر هێندەیان لێ چاوەڕێ دەکرێت، مامۆستا عەلی باپیر لە وەسفی ئەو بەعسیەدا دەڵێت: " پیاوێکی بە شەخسیەت و بە تواناش بوو" ل ٢٤٨

من بڕوا ناکەم یەکێك بەو جۆرە تەقدیسی سەدام بکات و هەڵگری ئەو سیفەتانەش بێت، ئاخر خۆی سەدامی و دروستکراوێکی سەدامییە! تەنها توانایەکیش هەیبێت توانای مالییە، ئەویش هەمووی لە سایەی ڕژێمی عێراق وەلی نیعمەتەکەی پێکی وەناوە. بەڕاستی من گومانم لە شەڕەفی ئەو بەعسیە هەیە، چونکە گومان لە شەڕەفی هەر یەکێك دەکات ڕێزی سەدامی لا نەبێت!

## عیبادات و کەڕامات و شورا

ئەوەی سەرنجمدا لەو کتێبەی مامۆستا عەلی باپیر زۆر بە درێژی باسی هەموو عیبادەتەکانی تێدا کردووە، کە ئەوەش بێگومان لە عورفی ئیسلامەتیدا چاك نییە مرۆڤ زۆر بە تەفسیل باسی عیبادەتەکانی بکات " ڕۆژی وا هەبوو نیوەی قورئان، واتە بە دوو ڕۆژ جارێك، بەڵکو ڕۆژی وا هەبوو کە نزیك دەکەوتەوە لەوەی قورئان هەمووی خەتم بکەم. ئەگەر کەمم خوێندبا، بە سێ ڕۆژ، بە چوار ڕۆژ جارێ قورئانم خەتم دەکرد... دەتوانم بڵێم ئەو ماوەیەی لەوێ بووم سەد وچل جار خەتمم کردوە، دیارە، دیارە دوایی کە دەستم کرد بە نووسین و موتالەعە وئەوانە، ئەندازەی خوێندنی قورئان کەمبوەوە، بەڵام سەد جاری زیاتر لە نوێژ، لە نوێژی فەرز وسونەتدا، لە نوێژی شەو ڕۆژ قورئانم دەخوێند، ، ئەوەی دیکەشی چل جارێك یا کەمتر لە چل جار لە موسحەفدا دەمخوێند.." ل ٣٠٣

"مانگی یەکەم نەمتوانی بەڕۆژوو بم، لەبەر ئەوەی شوێنەواری نارەحەتی و نەخۆشی و ئەوانە لە بەدەنمدا مابوو، نەمتوانی بە ڕۆژوو بم، دوای نزیکەی مانگێ توانیم، ئیدی پێنج شەممە و دوو شەممە بە ڕۆژوو دەبووم، هەندێك جاریش دە ڕۆژ لەسەر یەك، جار هەبوو نۆزدە ڕۆژ لەسەر یەك بە ڕۆژوو دەبووم، بەڵام حەوت مانگی کۆتایی، واتە حەو مانگی پێش ڕزگار بوونم، نزیکەی هەموو لەسەریەك بە ڕۆژوو بووم، ئینجا سەرجەم و کۆی گشتی بە هەردوو مانگی ڕەمەزانەوە کە لەوێ گرتمن، زیاتر لە نیوەی ئەو ڕۆژانە کە لەوێ بووم، بەڕۆژوو بووم، من هەمووی شەش سەد و شەست ڕۆژ مامەوە، بەو شەوەشەوە کە لە بەغدا مامەوە، لە کاتی بردنمەوە تا کاتی هاتنەوە، نیوەی زیاتر بە ڕۆژوو بووم" ل ٣٠٧

من خوانەخواستە گومانم لە هیچ یەکێك لەو قسانەی مامۆستا عەلی باپیر نییە، بەڵام باسکردنی بەو درێژدادڕیە و ژماردنی کاری فریشتەکانی سەرشانە، و ئەگەر بۆ تۆمارکردنی یادگاریش بێت چاك نییە،

نەوەك بچێتە خانەی تر، کە لە وانەیە هەموو عیبادەتەکە بەتاڵ کاتەوە. ئەوانە لە چاو باسکردنی هەندێ کەرامات هەر هیچ نین، چونکە پیاوچاکان بە درێژایی مێژوو زەمی ئەوانەیان کردووە کە باسی عیبادات و کەراماتی خۆیان کردووە، وتوویانە کە پیاوچاکان بە کەرامات دڵخۆش نابن و چاوەڕوانی ناکەن، ژیانیان لەسەر بنچینەی ترس لە خوا و ئاواتی قبوڵکردنی کردەوەکانیان بنیات دەنێن، و هەردەم دەیانگووت: ئیستیقامەت چاکترە لە هەزار کەرامەت. وابزانم حەزرەتی شافیعی دەڵێت: " دەبێت خاوەن کەرامات وەك چۆن ئافرەت پەڕۆی بێ نوێژی خۆی دەشارێتەوە، وا کەراماتی بشارێتەوە!!"
شێخێکیتر دەڵێت: [لیست الكرامة من لوازم المنزلة و علو الدرجة، مشى قوم فوق البحار، و مات عطشا من هو افضل منهم و اقوى ایمانا] واتە: کەرامات لە پێویستیەکانی پلە وپایەی بەرز نییە لا خوا، خەڵکانێك لەسەر دەریاکان دەڕۆیشتن، کەچی کەسانێکی لەوان چاکتر و باوەڕ بەهێزتر لەبەر تینوویی مردن!
بەڕاستی من حەزم نەدەکرد لەسەر ئەو بابەتە قسەم کردبا، چونکە بواری من نییە، نە حەزم بە کەراماتە و نە هێندە باوەڕم پێی هەیە، نە حەز بە باس وخوازیشی دەکەم، لێرەدا باسی چەند نموونەیەك لەو کەراماتانەی مامۆستا عەلی باپیر دەکەین کە خۆی باسی کردوە لەو کتێبەی [ئەشکەنجە وزیندان]:
هەندێك لەو شتانە لەوانەیە پێویستی گێڕانەوەی ڕووداوەکان وایان فەرز کردبێت بگێڕدرێنەوە وەك دابەزینی حاڵەتی ئارامی سەکینە لە کاتی ناڕەحەتی و ئەشکەنجەداندا، بەڵام هەندێکی تریان نەدەبوایە باسبکرێن بەو جۆرە، وەك ئەو پرتەقاڵەی کە مامۆستا عەلی باپیر پێیی وایە خودا وەك کەرامەت بۆی ناردووە، یان دڵی کافرێکی نەرمکردووە، لەو بارەیەوە دەڵێت:جا ڕۆژێك من پاسەوانێکم بینی ئەو پرتەقاڵەی پێبوو، تۆزێک دڵم بۆی چوو، ئەو ڕۆژە بە ڕۆژووش بووم، دوایی هاتمەوە ژووری، تۆزێك خەوتم، ڕۆژ بوو دوایی خەبەرم بوەوە، پرتەقاڵێکی گەورە لەسەر قەراخی پەنجەرە تەختەکە دانرابوو، من وامزانی پرتەقالیان بەسەر دابەش کردووین، دوایی لێم پرسین وتم: ئەرێ ئێوەش پرتەقاڵیان دانێ؟! وتیان: پرتەقاڵی چی؟ نەوەڵڵا کەس وەری نەگرتووە بۆ؟ وتم: وەڵڵا پرتەقالێکیان لەسەر پەنجەرەکەی من داناوە، بەهەرحاڵ خوای پەروەردگار دڵی یەکێ لەو کافرانەی نەرمکردووە! یانخۆی لە ڕێی فریشتەیەکەوە پرتەقاڵێکی تایبەتی لەوێ داناوە، بۆ خوای پەروەردگار هەموو شتێ ئاسانە" ل ٣١١-٣١٢

## شەشەم

## خەونە ناوازەکانی مامۆستا عەلی باپیر

ئینجا خەونی ئەو دوو مەلائیکەتەی کە " یەك سەتڵ نووریان پێدا کردم "خەوی دیکەشم دەبینی بە ماڵەوە، یان بە هاوزیندانەکانەوە، ئەگەر یەکێکیان نوێژی نەکردبا، ئەو بەیانییە دەهاتە خەونم و دەیان گووت " :فلان کەس نوێژی نەکردووە" یان ئەگەر ڕەشەبا و گەردەلولێك سبەینێ هەڵیکردبا، یان

دووسبەی، پێشتر پێشانیان دەدام، یان مەحکەمە کردنەکەم، پێش ئەوەی دادگاییم بکەن، لە خەومدا پێشانیان دەدام، کە ئەو دادگاییە دەبێت، هەروەها زۆر شتی دیکە پێشتر بە خەون پیشانیان دەدام، کە ئەوە دەبیَ، یان جاری وا هەبوو دەخرایە دڵمەوە کە ئەو شتە دەبێت فیعلەن بەو شیوەیە دەبوو، ئەوە بەشێك بوو لەوانەی بگونجێت باسی بکەین." ل ٣٣٢- ٣٣٣

لە هەمووی سەرنج ڕاکێشتر لەو کەراماتانە خەونی ئەو برادەرانەیە کە نوێژیان دەچوو، کە ئەوە سەرەڕای ئیحراجیەکی زۆر، بێگومان ئامرازێکە بۆ کۆنترۆلکردنی ئەندامان لە لایەنی جەستەیی و ڕۆحی، هەتا ئەو نهێنیانەی کە لە نێوان خۆیان و خواشیان ڕوو دەدات بۆ ئەمیرەکەیان کەشفی حیجابیان دەکرێت.

## لە دایك بوون بە براگەورەیی!

بەڕای من ئەو خەونە هێما و دەلالەتێکی زۆر هەڵدەگرن، ئەگەر گوزارش لە شتێك بکەن، ئەوە گوزارش لەو ڕووحیەتە ڕەهبەرییەی مامۆستا عەلی باپیر دەکات کە دەڵێت لە ڕۆژگاری منداڵەتیەوە ڕۆڵی برا گەورە و ڕدێن سپیاتی بینیوە، خۆی لەو بارەیەوە دەڵێت: "ئەمجا خوای گەورەش بارەکەی بۆ من وا هەڵخستووە، هەر کە گچکەش بووم، منداڵیش بووم، لە گەڕەکیَ کە تیپی تۆپێنەیان پێکدەهێنا، منیان دەکردە برا گەورە، هەر کە پێشڕا گەیشتووم، ئەوە برای وەکو مامۆستا حەسەن بابەکر کە بە تەمەن لە من گەورەتر بووە، لە گەڵیاندا بووم، خوای گەورە بارەکەی بۆ من وا هەڵخستووە، کە من ئەوان ئاڕاستە کەم و ئەوانە، ئەو برایانە کە لە من گەورەتر بوون، ڕەنگە لە منیش شارەزاتر بووبن، بەڵام بەهەرحاڵ خوای بەرز بارەکەی وا بۆ من هەڵخستبوو، واتە لە سەرەتاوە وەزعەکەم وابووە، زیاتر ڕۆڵی برا گەورەیی و ئاڕاستەکار و ئەوانە ببینم.." ل ١٠٢ – ١٠٣

وادیارە ئەو نەزعەیەی براگەورەییە هەر لە منداڵییەوە لەگەڵ مامۆستا عەلی باپیر نەشونمای کردووە، بۆیە خۆی هێندە لیَ گەورە دەبێت تا ئەو ڕادەیەی سوکە تەوهینێکیش بە سەرکردایەتی کۆمەڵی ئیسلامی دەکات، هەروەك لەو دەقەی پێشوو ناوی کەسانێکیشی هێنا، بەڵام دوایی لەوەش تێدەپەڕێنێت کاتێك داوا لە سەرکردایەتی کۆمەڵ دەکات بۆ ئاستی ئەو واتە مامۆستا عەلی باپیر بەرزبنەوە و قسەی ئەو ئیجرا بکەن، نەك ئەوان علی باپیر دابەزێنن بۆ ئاستی خۆیان!! نەك ئەوە بەڵکو بە سەریحی عیبارەت دەڵێت: " من وام هەستکردووە کە کۆمەڵی ئیسلامی بە هی خۆم دەزانم ... هەمووی یەکە و منیش هی هەموویم و هەمووشی بەهی خۆم دەزانم و لە خزمەتی هەمووشیدام تا هەبم و تا کۆمەڵی ئیسلامی من بە چاوساخ و ئەمیری خۆی بزانێت..." ل ٣٦٠. یانی خزمەتی مامۆستا عەلی باپیر بەوان شەرتێکی موتەلازیمە لەگەڵ بە براگەورە ناسینی لەلایەن کۆمەڵەوە، چونکە کۆمەڵ بە هی خۆی دەزانێت!

ئـەوە لـە کاتێکـدا هەمـوو دنیـا بـەرەو دامەزراوەیـی و حوکمـی دامەزراوەیـی هەنـگاو دەنێـن، زۆربـەی حزبەکانـی ناوچـە لـە شـەرمی گۆڕانکارییـە ڕیگوڕیشـەییەکان لـە بـواری سیاسـەت و کاری بەڕێوەبردنـی حزبی ، دەیانەوێت هەڵبژاردنی ناوخۆیی حیزبی بکەن، بڕیار بکەنە ئەرکێکی بە کۆمەڵ ، کەچی تازە بە تازە مامۆستا عەلی باپیر دەیەوێت ئەوەی بیڵێت کەس نەڵێت لەل ، ناڕەزایی و گفتوگۆی لەگەڵ نـەکات، چونکە بە قەولی خۆی "ئەو دەبێت شتێکی لەوان زیاتر بێت، بۆیە کراوەتە ئەمیر، نەك لەبەر ئەوەی ئەوان ئەویان بە ئەمیر هەڵبژاردووە!

لەو بارەیەوە دەڵێت: " لەبەر ئەوە ئێمە زۆر گرنگیمان بە ڕاوێژ و بە شورا و بە پرسوڕا بەیەکترکردن و بەیەکتر ئیقناعکردن و ئەوانە داوە بەڵام بە دڵنیاییەوە، من دەمەوێ شتێ کە لە قۆناغ و هەلومەرجێکی نائاساییدا شل کراوەتەوە، توندی بکەمەوە... بەڵام واش چاوەڕێ ناکەم هەموو ئەندامانی سەرکردایەتی کۆمەڵی ئیسلامی لە ئاستی بەندەدا بن، چونکە وەکو جارێك پێیانم گووت: ئەگەر هەرچی من دەیڵێم و لە توانامدا هەیە، ئێوەش لە تواناتاندا بێت و ئێوەش وا بڵێن بەو شێوەیە بن، ئەی بۆچی من برا گەورەتانم؟ دیارە دەبێ من هێندێ شتی زیادەم پێ بێ، جا دەبێ سەرکردایەتی کۆمەڵی ئیسلامی هەوڵ بدات خۆی بێنێتە ئاستی من، نەك من نزم کاتەوە بۆ ئاستی خۆی" !! ل ٣٦٠-٣٦١. بڵێی مامۆستا عەلی باپیر ئاستی سەرکردایەتی کۆمەڵی ئیسلامی هێندە پێ نزم بێت، شەرمی پێ بێت، جارێك لە ڕایەك لە ڕایەکانی پەشیمان بێتەوە، و دابەزێت بۆ ئاستی ئەوان؟! سەرکردایەتی لاواز و نزم — لەگەڵ ئەوپەڕی ڕیزم بۆ ئەندامانی سەرکردایەتی کۆمەڵی ئیسلامی — مەتڵەبی هەموو دیکتاتۆر و ڕاپەسەندێکە، چونکە ئەوانە هەردەم خۆیان بەوانە دەورە دەدەن کە توانای گفتوگۆکردن و بیرکردنەوە و داهێنانیان نییە.

## عەلی باپیر دەڵێت خودی پێغەمبەریش پشتگیریم دەکات!

کارەکە بەوە ناوەستێت کە ئەمیر [هێندێ شتی زیادەی پێیە] بەڵکو شەرعیەت دەداتە ئەو تاك ڕەوییە بە [ فەرموودەیەکی پێغەمبەر!!] کە نە لە بوخاری وموسلیم دا هاتووە، نە هەتا لە [کنز العمال] و [اللآلئ المصنوعة في الأحاديث الموضوعة] دا هاتووە، بەڵکو لە خەونێکی پێغەمبەر [د.خ [پێیگووتوە، کە ڕازییە بەو ڕاپەسەندییەی عەلی باپیر، لەکاتێکدا پێغەمبەر خۆی پرس و ڕایەکی زۆری بە هاوەڵانی دەکرد، [ما رأيت احدا اكثر مشورة لاصحابه من رسول الله] [کەسم نەدیوە لە پێغەمبەر زیاتر ڕاوێژ بە هاوەڵانی بکات] رواه الترمذي.

گوێبگرە بۆ ئەو [فەرموودەیەی] مامۆستا عەلی باپیر دەڵێت: "ئەوە ڕەنگە ئامۆژگاری پێغەمبەریش [د.خ[ بێ بۆ من کە فەرموویەتی: خوای پەروەردگار بە هۆی ئەو ناڕەحەتی و تاقیکردنەوانەوە تۆی گەورە کردووە، ئاگات لێ بێ خەڵكێك بچووکت نەکاتەوە" !!!." ل٣٦٠-٣٦١

کەواتە با کۆمەڵی ئیسلامی بە قیادە و قاعیدەوە هەوڵبدات خۆی بێنێتە ئاستی ئەمیرەکەی، چونکە خوا و پێغەمبەریش هاو سەنگەر و پشت وپەنای ئەون لەبەر ئەو هەموو " ناڕەحەتی و تاقیکردنەوانەوە" کە

دووچاری هاتووە!

دیسان دەڵێت:

" لە ڕاستیشدا ئەوە یەكەم جاریشە ئەو تەعبیرە بەكار دێنم، من خۆم لە هیچ كەس بە زیاد نازانم، ڕەنگە لە هەمووان گوناهبارتر بم، چونكە بارم قورسترە، بەڵام بەڕاستی ئەوەش دەزانم كە من هێندێ شتم پێیە، خەڵك هەمووی پێی نییە، لە بواری فیكری و ڕووحی و ئیمانی و پشت بە خوا بەستن" ل ٣٦١

جارێ خەون ئەگەر بە پێغەمبەرەوەش ببینیت، كە دەڵێن ڕاستە، هیچ حوكمێكی شەرعی لەسەر بنیات نانرێت، ئەگەر یەخبارەی [الاحاد] لەلای زۆربەی زانایانی ئومەتی ئیسلام كاری پێ نەكرێت، تەنها لە كردەوەی چاك [فضائل الاعمال] نەبێت، ئەو ئاحادە هی پیغەمبەریش بێت، پێمناڵێی چۆن خەونی ئاحادی هەر كەسێك وەردەگیرێت؟! هەروەك گووتمان ئیدیعای دیتنی پێغەمبەر ڕاستیش بێت، هیچ حوكمێكی شەرعی لەسەر بنیات نانرێت، ئەی ئەگەر ئیدیعایەكە لە خەونی كەسێكەوە بێت بۆ خۆی؟! بەڕاستی ئەو ئیدیعایە شتێكی ترسناكە بۆ دوارۆژی كۆمەڵی ئیسلامی و هەموو هێزە ئیسلامییە سیاسییەكان، چونكە داب ونەریتی تیوری تێۆكراسی و هەقی ئیلاهی زیندوو دەكاتەوە، ئەو تێڕوانینە هەمان تێڕوانینی [الالحكام السلطانیة] ی سوڵتانەكانە، بەپێی ئەو تیۆرانە سوڵتان یان براگەورە، یان ئەمیر خاوەنی هەموو دەسەڵاتێكی دینی و دنیاییە، ئەو دەسەڵاتەشی لە خواوە پێدراوە [لە ڕێگای خەونێك بە پێغەمبەرەوە، لەو نموونەیە] ، ئەوە لەكاتێكدا خوا ئەمر بە پێغەمبەر دەكات كە ڕاوێژ بكات و پرس وڕا بە هاوەڵەكانی بكات : [وشاورهم في الامر، فاذا عزمت فتوكل على الله] ال عمران ١٥٩ ئەوە پێغەمبەرە و پشت ئەستوور بووە بە وەحی، پێی شەرم نەبووە سوود لە ڕای ئەعرابیەكی دەشتەكیش وەربگرێت، كەچی مامۆستا عەلی باپیر داوا دەكات لە كێ؟! لە قیادە، نەك قاعیدەی بەستەزمانی عەوام بەزاراوەی ئیسلامی سوڵتانی، بەرز بنەوە بۆ ئاستی بەرزی ئەو، نەك مامۆستا عەلی باپیر دابەزێنن بۆ ئاستی نزمی خۆیان!!

بەڕاستی كەمێك تەوازووعی هەقیقی زۆ چاكترە لەو عوجب و خۆ بە گەورەزانیە و ڕاپەسندییە، چونكە هەموو قەولێك قابیلی گفتوگۆ و قبوڵ و ڕەتكردنەوەیە، ئەو پرسیارە بەناوبانگ گرنگە و بلیمەتەی هاوەڵانی پێغەمبەر لەبیر نەكەین، كە هەردەم لە پێغەمبەریان دەپرسی:" ا هوالوحي، ام الرأي و المشورة؟"

ئەوە چەند لایەنێك بوو لە كتێبەكەی مامۆستا عەلی باپیر، لەوانەیە شتی تریشی تێدا بن، هیوادارم بە سنگێكی فراوان لێم وەرگرێت، ئیتر بابەس بێت ئەوان هەر شتمان بۆ بنووسن، ئێمەش بەبێ بچووكترین لێكدانەوە وەریبگرین، ڕۆژی قائد الاوحد و قائد الملهم و قائد الضرورة بەسەرچووە... هیوادارم سوود لەو سەرنجانەم وەرگرێت.

٢٠٠٦/٨/٨

# وەڵامی وەڵامێکی بائیسی دەرەوەی کۆنتێکست!

هەرچەندە چەندین برادەر ودۆستی نزیکم پێیان چاکتر بوو وەڵامی ئەو نوسینە نەدەمەوە کە لە ژێر ناونیشانی (لە پشت پەردەی ڕەشەوە سەیرکردن، یان خوێندنەوەی فیکری مامۆستا عەلی باپیر) کە لە هەردوو ژمارەی 253 و 254 هەفتەنامەی میدیا بڵاوکرایەوە. بەڵام لەبەر چەند هۆیەک بڕیارمدا وەڵامی دەمەوە:

یەکەم: ئەو وتارە هەرچەندە لە زۆربەی باسەکانی وتارە ڕەخنەییەکەی من ڕایکردوە، بەڵام لەو ڕێیەوە تووشی ساتمەی زۆر گەورە بوە، وچەندین مەفهومە غەڵەت وسەقەتی ئیسلامی وگروپە ئیسلامیەکانی خستۆتە ڕوو.

دووەم: من باوەڕ ناکەم ئەو وەڵامە بەبێ ئاگاداری مامۆستا عەلی باپیر نووسرابێت، لە سۆنگەی ئەوەوە کە ناوبراو (عەبدوڵڵا ڕسول) وەك زانیومە ئەندامێکی حیمایەی مامۆستایە، وئەگەر بە لاشەش بێت زۆر لێی نزیکە، دەبێت مامۆستا ئاگاداری ناوەرۆکیشی بوبێت!

سێیەم: بۆ ئەوەی نەوەک کەسانێکی ساویلکە، وگۆشکراو بەو جۆرە خیتابە توندڕۆ وبازاڕییە، وا تێبگەن ئەو وڕێنانەی لە نوسینی ناوبراودا هاتوە قابیلی وەڵامدانەوە نین. چونکە چینێکی بەرفراوان لەناو حزب وگرووپە ئیسلامیەکان، کاتێک شتێک دەنوسرێت نایخوێننەوە، تەنها لەسەر سیقەی فلان وعەلان پۆلینی دەکەن کە یارە یان نەیار، باشە یان خراپ، کە یەکێکیش لە حزب وەڵامی دەداتەوە دیسان نایخوێنیتەوە، بەس پێی دەڵێن "وەڵڵا دەمکوتی کردوە!!" هەتا ئەگەر وەڵامەکەش لە وەڵامەکەی ناوبراو بە (عەبدوڵڵا ڕسول) لاوازتر وبێ تامتر وبێ زەوقتریش بێت.

ئەوەی سەیر بوو کە بەشی یەکەمی نووسینەکەی (عەبدوڵڵا ڕسول)م خوێدەوە زگم بە خوێنەرانی ڕۆژنامەی میدیا سوتا، کەلەسەری نوسرابوو بەشی یەکەم!! ئەخر چۆلەکە خۆی چیە تا چەلاوی هەبێت؟!! ئەو شەڕنامەیە کەی نووسینە تا بەشی دووەمیشی هەبێت؟!

لەڕاستیدا ئەو بەناو نووسینە، تەنها بۆ قسەی ناشرین وهەلەق ومەلەق نووسراوە، وپڕیەتی لە قسەی سوک وبازاڕی کە زیاتر لە قسەی تازە تۆبەکارێکی کاڵفام دەچێت، زیاتر لەوەی لە قسەی ئیسلامییەک کە شەو وڕۆژ دەرسی ئەخلاق بە گوێی خەڵک دادەدات. جێگای داخە کە ئەو جۆرە خیتاب ودەربڕینە لە ئەنجامی پەروەردەی ئەمیری کۆمەڵ بێت، چونکە وەک ئاماژەم پێکرد ئەو جۆرە نووسینە تەنها بۆ دیفاع کردن لە ئەمیری عام نووسراوە، وبەبێ ئاگاداری ئەویش نەبوە، نووسەرەکەشی لە هەرە نزیکەکانی خۆیەتی (ئەندامێکی حیمایەیە) لەڕاستیدا نەیوێراوە لەو سەردەمی بەسەرچوونەی نازناو وناوی نهێنی یەش ناوی خۆی بنوسێت.

بێگومان من ناویشی دەزانم، بەڵام ناوی هەڵنادەم، نەوەک زەندەقی بچێ، وادیارە وادەزانێت لەگەڵ

دەسەڵاتدارێکی زۆر گەورە وبەهێز کەوتۆتە دەمەقاڵێ، نەک لەگەڵ نووسەرێکی بێ لایەن، کە لە قەڵەمەکەی بەولاوە هیچ هێزێکی تر شک نابا! ئەو برادەرە لەوە دەچێ لەجیاتی کاری چەک، بە نەزانی کاری قەڵەمیان پێسپاردبێ، ئەویش بەڕاست وچۆپ بەناو کەوتوە، لەقسەی قۆڕ وسوک وتیۆری پیلانگێڕی وبەشەخسی کردنی بابەتەکە هیچی تری نەنووسیوە.

ئەوەشی زیاتر بۆی سەلماندم کە ئەو ڕەوشتەی لەو سەرچاوە هەڵدەقوڵێ، توندو تیژی قسەکانیەتی، بەرامبەر بە کوردێک وموسڵمانێک، ودیفاع کردنیەتی لە بەعسییەکان، وەک چۆن دیفاع لە سەتتام ئەلگەعود دەکات، وپاکانە بۆ ئەمیرەکەی دەهێنێتەوە گوایە مامۆستا سەبارەت بەڕابردووی سەتتام هیچ بەڵگەیەکی لەبەر دەستدا نەبوە!!! ئەی خۆ پاش بەربوونی چاکتر نەبوو هەندێک زانیاری لەسەر پەیدا بکات، پێش ئەوەی چاوپێکەوتنە تەلەفزیۆنەکانی بکات، وبەرلەوەی ئەو بیزاعە فاسیدەمان پێ بفرۆشێت؟! وادیارە دونیا لای تۆ وئەو، هەر دونیا گەورەکەی جارانە، ئەوەتا نیە کاکی حیمایەش هەمان هەڵەی ئەمیرەکەی دووبارە دەکاتەوە، وپاکانە بۆ ئەو بەعسییە دەکات، گوایە ئەمریکاش ئازادی کردوە لەبەر بەعسی نەبوونی.

ئەمریکا دەیان بەعسی تریشی ئازاد کردووە، کە ئازادیشی کردوون لەبەر بەعسی نەبوونیان نەبووە، بەڵکو لەبەر نەخشی سیاسی خۆی بووە. لە هەمووی سەیرتر بەو پەڕی متمانە بەخۆییەوە دەڵێت ئەو قسانەی من کردووم دەربارەی سەتتام "سەبارەت بە چاوپێکەوتنەکانی لە کەناڵی ئەلعەربیە ورۆژنامەی شەرق ئەلئەوسەت، من گومانم هەیە، لەو قسانە، چونکە ئاماژەت بە سەرچاوەی قسەکانی نەکردوە!!" توخوا جەهلی مورەکەب لەوە مورەکەبترتان بیستوە؟! ئەوە من بە رۆژ وبە مانگ وبە ساڵ ئاماژەم بە سەرچاوەکان کردوە لە پەراوێزیش ئەو سەرچاوانە بەو جۆرە دیاری کراون:

(العربیە الاحد 8 ینایر 2006م، 10 ربیع الثانی 1427 هـ /20/2/2006 رۆژنامەی (الشرق الاوسط)).

دەزانی برالە شتێک هەیە لە ئینتەرنێت پێی دەڵێن (گوگل) ئەگەر بەکارت هێنابا ئەو سەرچاوانەت دەدۆزیەوە. خۆ دەتوانی کەمێک لە ئینتەرنێت بگەڕابایت بەرلەوەی نکولی لەو ڕاستیانە بکەیت لە پێناو بەعسیەک، دەڵێی پیشەت بۆتە بەرگری کردن لە بەعسیەکان!!

ئینجا ئەو جۆرە رۆشنبیرییەی کە ئەو قەڵەم کوێرە نیشانی دەدات، ئێستاکە لە نێوەندی ڕۆشنبیری عەرەبی وعێراقی پێی دەڵێن (رۆشنبیری نایب عەریف) (ثقافە نائب عریف) کە بریتیە لە ماستاو کردن وکلکە قیتێ ودیفاع کردن لە خودی سەرکردە وڕەهبەر وقارەمان وئەمیری عام بە هەق وناهەق. ئەو نایب عەریفانەش هەردەم ئاپۆرەیان بەستوە لە دەوری سەرکردەکان، کوردستانیش چاکترین نمونەیە، ئەوە نیە ئەوانەی لە رۆژگاری سەخت بەعسی بوون وخزمەتیان بەو ڕژێمە دەکرد، وتاریان لەسەر سەرۆکی فەرماندە دەنووسی، ئەمڕۆ زۆربەی شوێنە حەساسەکانی حوکمەتیان داگیر کردووە، هەتا ڕوخساری دزێویان تەلەفزیۆنەکانیشیان ڕەش کردوتەوە، خەڵکانی دڵسۆزیش بە خۆیان ویادگاری خەباتەکانیان لە کونجێک دانیشتوون تەنها خەم لە وەزعەکە دەخۆن!!

## نموونەی قسان!

ئەوە چەند نموونەیەکی قسەکانی ناوبراو (عەبدوڵڵا ڕەسولە): "ئەدی چۆن وا بەو هەناسە سواریەوە کەوتویە پەلە قاژەوە... دەتەوێت زۆر بە ئاسانی خۆتمان لێ بکەیت بە پاڵەوانی مەیدان!" ، "وەک بەرزەکی بانان بۆی دەرچی؟!"، "زۆر خراپ لینگە وقوچ حاڵی کراوی" ، "دیارە تۆ لینگا وقوچ حالی بووی" "ئەوە بوختانێکە وتەنها هەڵبەستراوی خۆتە دەتەوێت شەیتانی بکەیت لە نێوان قیادەی کۆمەڵ وئەمیردا" توخوا ئەوە قسەی یەکێکە تۆزقاڵێک ڕەوشتی ئیسلامی هەبێت؟! "کاکی بەڕێز رەخنەکانت ئەوەندە سەرپێیانەن هەر دەبێ فاتیحایان بۆ بخوێندرێت" نەم زانیوە فاتیحە بۆ ڕەخنە بخوێنن؟!! یان دەڵێ"لە بێخەبەران کەشکەک سەڵاوات" زانیومە سەڵاوات بۆ پێغەمبەر لێدەدرێ نەک بۆ کەشکەک؟! یان دەڵێت:" جا نازانم ئەو پێوەرەت لە کوێ هێناوە؟ هی هەریرە یان لەندەن"

یان دەڵێت: چی دیش حوکمی کوێرانە وزاڵمانە بەسەر ئێمەدا فەرز مەکە وئاستی زانیاری تۆش باش دەزانین وبەوەی کە لە لەندەن دەژیت خۆت لێ نەگۆڕێ(!!!) چونکە ئەمڕۆ زۆر شوان وگاوانی کورد هەن کە ئێستا لە بەریتانیا دەژین!! ." ڕاست دەکەی منیش دەزانم ئەو حزبانە پڕاو پڕن لە عەبقەری وبلیمەتی وەک تۆ! ئەوەیە (تەبعی شەکرباری) نزیکترین کەسی مامۆستا عەلی باپیر!! ئینجا ئاستی زانیاری چی ولە چی لە زانستی نیکاح وتەڵاق ونەواقیزی وزوو، یان زانستی خوا عەقڵێکت داتێ تا پێی بەڕێوەچن؟!! من چ لەو زانستی (قال وقیل)ە بکەم ئەگەر نەزانم دونیا چۆن بەڕێوە دەچێ، وچۆن دەبێ ڕەفتاری لە گەڵدا بکەم؟! لە جەیاتی شورا وڕاوێژ وئازادی وهەڵبژاردن ودەزگاسازی حوکم، خەڵکی گیرۆدەی خەون وخەیاڵات بکەم!

## تیۆری پیلانگێڕی

ئەوەی پێویستە ئاماژەی پێ بکرێت ئەو تیۆری پیلانگێڕییەیە کە مێشکی زۆربەی هەرە زۆری ئیسلامیەکانی جیهانیشی پێ ئاخنراوە، زیاتریش لای ئەندامانی پلە سێ وچوارەکان ڕەنگدەداتەوە، چونکە لە ڕوانگەی ئەوانە شتێک نیە ناوی ڕەخنە بێت بەڵکو ڕەخنە مانای جوێنە، شەڕە، پیلانگێڕانە، خاوەنەکەشی یان دەبێت سەر بە حیزبێکی، یان لایەنێکی نەیار بێت، یان لەوەش گەورەتر سەر بە دوژمنانی ئیسلام بێت: ئەوە نیە ئەو نایب عەریفە قەڵەم کوێرە بێ ئەوەی لە سیاقی قسەکانم تێبگات کەمن دەڵێم "ئەگەر بەدەست خۆم بوایە کتێبی (ئەشکەنجە وزیندان) م وەرنەدەگێڕایە سەر عەرەبی" هاتووە لەو سەرە داوە چەندین تەوەرەی لێدروست کردوە، بێ ئەوەی بزانێت تەوەرە چییە، بەڵام هەروا گوێی لێبوە لە نووسین تەوەرە هەیە، بۆیە هاتوە لە جیاتی وەڵامی قسەکانی من بداتەوە، هەر ئحم وکۆکەیەکی کردۆتە تەوەرەیەک بۆ درێژکردنەوەی نووسینە بائیسەکەی!!

من دەبێت داوای لێبوردن لە ڕۆژنامەی میدیاش بکەم، کە وەک هەقی وەڵامدانەوە دەبوایە ئەو نوسینە درێژو بێ ناوەرۆکەی (عەبدولڵا ڕەسول) بڵاوبکەنەوە، گومانم نییە ئەگەر بابەتەکە لە وەڵامی بابەتێکی

هەستیار نەبایە، دەبوایە شوێنی ئەو جوێننامەیە تەنەکەی خۆڵی ژێر مێزی سەرنووسەری میدیا بوایە.
وەک رونکردنەوەیەک بۆ ئەوانەی لایان گرنگە ڕاستیەکانیان بۆ دەرکەوێت، ئەو قسەیەی من " بەلام ئەگەر بەدەستی خۆم بوایە ئەو کتێبەم نەدەخستە بەر دەستی خوێنەرانی عەرەب لەبەر ئەو هۆیانەی کە لەو رەخنە وتارە باسیان دەکەم"
یەکەم من دەمێک بوو گوێم لەو بەزمەی عەلی باپیر وپیاوانی رژێم ببوو، حەزیشم دەکرد بیخوێنمەوە، تەوقوعیشم دەکرد مامۆستا لەوپەڕی ئیسلامەتی وکوردایەتی هەڵسوکەوتی لەگەڵدا کردبن، نەک ببێتە شەفاعەتخواز ورزگارکەری قیامەتیان، ئینجا کە بەرپرسێکی ناسراوی کۆمەڵی ئیسلامی داوای لێکردم بۆ رۆژنامەی (ئەلشەرق ولئەوسەت) پوختەیەکی لێوەرگێڕمە سەر عەرەبی، داوایەکەم قبوڵ کرد بەبێ دڵ لە دڵ دان، خۆ رۆمانێکی سەلمان رۆشدی نەبوو تا هەڵوەستەی لێبکەم، وەعدیشم دا بە زوترین کات کارەکەم ئەنجام بدەم، وقسەشم کرد لەگەڵ بەرپرسێکی رۆژنامەی ناوبراو. ئینجا کە خوێندمەوە وتوشی شۆک هاتم، نەمتوانی لە پەیمانی خۆشم پەشیمان ببمەوە، چونکە ئەو پەیمانەم دابوو، بۆیە بە ناچاری ئەو کارەم کرد، نەک لەبەر پارە، ویان لەبەر ئەوەی لایەنێک بە زۆر پێیان کردبم" من ئەو کەسە نیم بە پارە یان بە زۆر کارم پێ بکەن، من ئامادەم موباهەلە لە گەل خۆت وهەموو ئەو ساویلکانەش بکەم کە ئەو فیکرە عەبقەریەیان خستۆتە دڵتەوە، خۆمن خاوەنی حیزب وپێشمەرگە وبارەگا ودەزگای ڕاگەیاندن نیم، تا هێندە پێویستم بە پارە بێت، وبە هەموو ڕێگایەک هەوڵی پەیاکردنی بدەم؟! ئەوانەی زانیاریشت لێوەرگرتوون لەسەر من دەتتوانی ئەو زانیاریەش وەرگریت کەمن تا ئێستا خاوەنی خانوێکیش نیم، لەوانەشە زانیبێشت ئەگینا خوا دەزانی چ هەرایەکت لەسەر دەنایەوە! ئەوەشی ماڵی لە شوشە بێت بەرد لە خەڵک ناگرێت.!
لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە ئەو برادەرە نایب عەریفە بە شێوەیەکی موخابەراتی بۆگەن چەند زانیاریەکی لەسەر من کۆکردوتەوە، کە سوپاس بۆ خوا هیچ لاپەرەیەک نیە لە ژیانم شەرمەزاریم پێی بێت، ناشمەوێت وەکو خەڵک باسی (بطولات)ی خۆم بکەم، ئەگینا ئەوەی لەگەڵ من لە خوێندندا بوە دەزانێت من چۆن بەربەرەکانێی بەعسیەکانم دەکرد، ئینجا ئەو زانیاریانە بەو پەڕی بێ ئەدەبیەوە بەکاریان دەهێنێ: بۆ نموونە، کە من هەرگیز لە دوور ونزیک باسی شەهادەی خۆم نەکردوە کەچی ئەو برادەرە هاتوە ئەو زانیاریە تایبەتییەی کردۆتە تەوەرەیەک (بێ ئەوەی بزانێت تەوەرە یانی چی) وباسی کڕینی شەهادەی ماستەر وتەزویر کردنی دەکات وچەندین ورێنەی تر، وابزانم خۆی عوقدەی شەهادە نزمی هەیە، دەڵێن لە عەسکەریش نایب عەریفەکان زۆر ئەزیەتی خاوەن شەهادەکان دەدەن لەبەر عوقدەی شەشی سەرەتایی خۆیان!!

## هاودژی لە خودی عەقلدا!

لە تەوەرەیەکی تردا (بێئەوەی بزانێت تەوەرە یانی چی وچۆن دیاری دەکرێت) دەڵێت دژایەتی هەیە لە نێو ئەو دوو قسەیەی من:

" بێگومان من مامۆستا عەلی باپیر لە نزیکەوە ناناسم" و " من مامۆستا عەلی باپیر زۆر دەمێکە دەناسم وەک نووسەر" هەتا بە قرتاندنیشیان ئەو دوو ڕستەیە دوو مانای جیاوازیان هەیە، ئەگەرچی ئەو نایب عەریفە زۆر بێ شەرمانە بەشی دووەمی ڕستەی دووەمی قرتاندوە کە دەڵێم: "لەوەتی سەردەمی کتێبی (ئیسلام وڕێچکان) دەتوانم بڵێم زۆربەی نووسینەکانیشم خوێندۆتەوە لەو ڕۆژەوە"
ڕستەی یەکەم دەڵێت: " من مامۆستا عەلی باپیر لە نزیکەوە ناناسم" بە شێوەیەکی شەخسی، ڕستەی دووەم دەڵێت:" من مامۆستا عەلی باپیر زۆر دەمێکە دەناسم وەک نووسەر" واتە لە ڕێگای کتێبەکانیەوە، وەک چۆن فاروق رەفیق وبەختیار عەلی وعەباس عەقاد ونەجیب مەحفوز ومحەمەد عەممارە وبوتی وجەمال بەننا ومحمد عابد الجابری وچەندانی تر دەناسم وەک نووسەر. ئەوەی لە جیاوازی ئەو دوو ڕستەیە تێنەگات پێویستی بە کۆرسێکی (مەحول ئومیە) هەیە!!

## ئەمریکا: شەڕێکی بەسەر دابڕاو!

لە چەند (تەوەرەیەکی) تردا بێ ئەوەی من دیفاع لە ئەمریکا بکەم ئەو برادەرە سێ چوار تەوەرەی (چۆمسکیانەی) دروستکردوە لە ڕەخنەی ئەمریکا تەنها لەبەر ئەو قسەیەی من:"بۆ دەبێت داگیرکەرێکی تکریتی چاکتر بێت لە داگیرکەرێکی ئەمریکی؟! خۆ هەر نەبێت ئەو ئەمریکییە کەمێک شارستانی تر رەفتار دەکات لەو تکریتییە لادێیە قین لە دڵانە؟! " هەر بە زۆری دەیەوێت بمخاتە بەرەی ئەمریکا، لە ڕاستیشدا ئەو قەڵەم کوێرە لە پێش وپاشی ئەو ڕستەیەی قرتاندوە تا قسەکەی من وا دەرکەوێت کە بەرگریکردنە لە ئەمریکا.
ئەوەش دەقەکەیە وەک خۆی:" ئێمە بێگومان هەواداری داگیرکاری ئەمریکا نین بۆ هیچ وڵاتێکی ئیسلامی وغەیرە ئیسلامی، بەڵام ئەگەر داگیرکردنێک ڕووخانی ئەو ڕژێمە پنج داکوتاوەی دژی گەلەکەمی لێبکەوێتەوە، وتەخت وبەخت تێکشکانی بەعسی لێ بکەوێتەوە، وهەڵبژاردنی ئازادی لێبکەوێتەوە، گەورە بوونی پایە وپێگەی کوردی لێبکەوێتەوە لە عێراق وجیهاندا. بۆ دەبێت من دژی ئەو داگیرکردنە بم. ئێمە هەموو کەرامەت وئاخ وشەرەف وچارەنووسمان بەدەست ئەو ڕژێمە داگیرکرابوو، بۆ دەبێت داگیرکەرێکی تکریتی چاکتر بێت لە داگیرکەرێکی ئەمریکی؟!
خۆ هەر نەبێت ئەو ئەمریکییە کەمێک شارستانی تر ڕەفتار دەکات لەو تکریتییە لادێیە قین لە دڵانە؟! خوا دەزانێت کە من لەسەر ئاستی کەسێتی تۆزقاڵێک سودم لە داگیرکردنی ئەمریکا نەکردوە" ئەو ساختەکردنە لەو نموونەیە دەچێت کە زوو زوو بە نووسەرە غەیرە ئیسلامیەکان دەڵێن قسەکانیان وەک شێوەی (ولا تقربوا الصلاة) دەڵێن، کەچی خۆشتان هەمان ساختە دەکەن!!

## سووربوون لەسەر هەڵە!

لەتەوەرەیەکی تردا دیفاع لە رەفتاری ئەمیری کۆمەڵ دەکات لەگەڵ پیاوانی ڕژێم ودەڵێت: سەرەتا وام هەستکرد رەخنەکانت لە ژێر قورئان وفەرمودەی پێغەمبەر دەخەیە ڕوو؟!" ئەی ئەو فەرموودەیەی

وەحشی بە فەرمووده حسێب ناكرێت؟ ئینجا باسی پێویستی نەرم ونیانی دەكات لەكاتی بانگەوازیدا، من لاریم لەوە نیە، بەڵام بانگەوازی بۆ كێ بۆ ئەو سەركرده بەعسیانە دەستیان لە خوێنی سەدان هەزار كورد ناوە؟! بڵێی ئێوە وئەمیرەكەتان سنگتان لە سنگی پێغەمبەریش فراوانتر بێ كە تەحەمولی وەحشی نەكرد؟! پێغەمبەر نە ڕێگای هیدایەتی وەحشی گرت ونە هێندەش پەرۆشی بوو شەو رۆژ خەریكی ڕزگاركردنی قیامەتی بێت، نە بۆ جارێكی تر هێشتی چارەی وەحشی ببینێتەوە! چاكتر وایە ڕەخنە لە خۆتان بگرن لەو كارە لە جیاتی پینە وپەڕۆ كردن بۆ هەڵخەڵەتاندنی عەوامەكانتان!

## فەلسەفەی خەونەكان

لە تەوەرەیەكی تردا هاتوە تەفەلسوف دەكات باس وپێناسەی خەون وخورپەمان بۆ دەكات بێ ئەوەی خەونەكانی ئەمیری كۆمەڵی بخاتە ژێر پێوەرەكانی! تۆ ئەو تەفەلسوفە بێتامە بۆ ئێمە مەكە بۆ ئەوەی لە دەرەوەی كۆنتێكست (سیاق) مەژغولمان كەیت، باسی خەونەكانی ئەمیرمان بۆ بكە، ئایا دەشێت بە شەرعیەتی خەونێك شەرعیەتی ناڕەزایی وجیاوازبوون لە خەڵكی قۆرخ بكەیت؟! دەكرێت خەونێك بكرێتە فەرمودەیەك وەك هەر فەرمودەیەكی تری پێغەمبەر (د. خ) باس بكرێت، وداوا لە خەڵك بكەیت كاری پێ بكەن؟!!

## لە قەراغی تەكفیردا!

لە تەوەرەیەك لە تەوەرەكانی كە وەك عەقڵیەتێكی ئیسلامی تەقلیدی وبە بەهرە وەرگرتن لە تڕادیسیۆنی توندڕەوی وتەكفیر، تەلمیحێكی تەكفیری ترسناك بۆ خەڵك دەكات بە گشتی، كاتێك ڕەخنە لەو وتەیەی من دەگرێت كە سەبارەت بە ڕزگاركردنی قیامەتی سەركرده بەعسیەكان ئاڕاستەی مامۆستا عەلی باپیرم كردوە:

"من بڕوا ناكەم ئەو هەڵوێستە نقووم بوەی لە ئایدیەلیزمیەت خوا وپێغەمبەر وخەڵكی لێی ڕازیبێت، جگە لە چەند ئەندامێكی موتیعی كۆمەڵ نەبێت!" ئەو دەڵێت :"كوا بەڵگەكانت كە خوا وپێغەمبەر پێی ڕازی نین؟! پاشان دەڵێ خەڵكی لێی رازی نین. كام خەڵك هی موسڵمانان یان كافر.. جگە لەوەش پێوەر چییە بۆ چاكە وخراپەی كاری ئیسلامی كە رەزامەندی خەڵك بكرێتە پێوەر، تەنها ڕەزامەندی خوا پێوەرە، جا نازانم ئەو پێوەرەت لە كوێ هێناوە؟ هی هەریرە یان لەندەن، خوای گەورە دەفەروێت: [وان تطع اكثر من فی الارض یضلوك عن سبیل الله ان یتبعون الا الظن وان هم الا یخرصون] الانعام – 116."

من نەمزانیوە خەڵكی كوردستان بریتین لە موسڵمان وكافر، بە تایبەتی زۆربەی هەرە زۆری خەڵك خۆی بە موسڵمان دەزانێ، ئەو ئایەتەی هێناویەتەوەش هەموو مەداریسی فكری سەلەفی توندڕۆ وەك ئامانجێكی دووسەرە بە كاری دەهێنن، هەرچەندە ئەو ئایەتە وهاوشێوەی ئەو ئایەتە دەرهەق بە كۆمەڵگای موسڵمان نەهاتوون، سادەترین تەفسیری قورئان دەربارەی ئەو ئایەتە دەڵێت: (وان تطع اكثر

من فی الارض، اي : الكفار) واتە ئەو زۆربەیەی ئاماژەی پێکراوە زۆربەی کافرە، نەک زۆرینە هەردەم لەسەر کوفر بن.

ئەوە تێگەیشتنی یەکەم: لە ڕوانگەی ئەو فەهمە سەقەتانەدا، بەو پەڕی گومان وسوکایەتیەوە سەرنجی کۆمەڵگا ئیسلامیەکان دەدرێت، لە پێناو بەرژەوەندی حوکمی دیکتاتۆرانەی بەناو ئیسلامی. بە پێی ئەو تێگەیشتنە داوای زۆربەی خەڵک هەردەم گومڕایی لێدەکەوێتەوە، بەپێی ئەو فەهمە نەخۆشە سەلەفییە ونەبهانیە ئەو جۆرە تێڕوانینە بوو وایکرد بۆ زیاتر لە 1300 ساڵە دنیا حوکمێکی ئیسلامی دادگەرانە، یان سیستمێکی شارستانی ودادپەروەرانەی ئیسلامی بەخۆوە نەبینێت، ولەبەر بنج داکوتانی ئەو ئافەتە هەتا دیکتاتۆرە قەومی وعەلمانیەکانیش سوودی لێوەر دەگرن بۆ بەردەوامی دان بە حوکمی تاک ڕەوانەی خۆیان. دووەم چەکێکی کاریگەرە بۆ تەکفیر کردنی هەر کەسێک وکۆمەڵێک کە بە حوکمی ئەوان – نەک خوا - ڕازی نەبوو، وگلدانەوەی مافی نەیاریش زۆر ئاسانتر دەکات!!

ئەو برادەرە لەو ڕوانگەوە بەبێ ئەوەی بە خۆی بزانێت هەڵگری ئەو تێڕوانینەیە، خۆیان موسڵمانن ئەوانی دەرەوەش نا!! هەر لەو دەسپێکەوە لەوەسفی کتێبەکەی مامۆستا عەلی باپیر دا دەڵێت: " بەڵکو ڕوداوێکی ڕاستەقینەیە سەدان پەند ودەرسی تێدایە بۆ موسڵمانان وخەڵکانی تریش" هەڵبەتە مەبەستی لە موسڵمانان (ئیسلامیەکانە) چونکە من سەدان جار ئەو دەربڕینەم گوێ لێبووە، وهەڵوێستیشم هەبوە بەرامبەری. کاتی خۆی کەکەسانێکی وام دەدیت باسی یەکێکیان دەکرد، دەیانوت:"فلان موسڵمانە؟!" من بۆم ڕاست دەکردەوە، دەمگووت:"مەڵێ موسڵمانە، بڵێ ئیسلامیە یان نا؟".

## مافی ڕەخنە تەنها بۆ کۆمەڵە!

لە تەوەرەیەک لەو تەوەرە زۆروزەبەندانە ئەو حیمایەیە پێی وایە تەنها دەبێت ئەندامانی کۆمەڵ قسە بکەن ورەخنە بگرن، کە ئەوەش کارێکی زەحمەتە بۆ کەسانێکی ناو کۆمەڵ خۆی لە قەرە بدات بێ ئەوەی ژێر سزا ونانبڕینی ئەمیری کۆمەڵ نەکەوێت.

من ئەو ڕەخنەیەم بۆ هەموو کورد بوو لە نێو ئەوانیش ئەندامەکانی کۆمەڵ، ئەوجا بە دڵتان بێ یان نەبێ ئەوە کاری من نیە، لاشم گرنگ نیە خەڵک بزانێت چەندە دڵسۆزم بۆ گەلەکەم، ئەگەر خوێندنیشم لە زانکۆی سەلاحەدین تەواوکردوە، باوەڕ ناکەم ئەو کارە هیچ عەیب وعارێک بێت! وادیارە ئەو برادەرە دەیەوێت هەموو کەس ببێتە حیمایەی مەنسولەکان؟!

ئینجا ئێمە ئەو بە عسیانەی دەماندیتن لەو زانکۆیە هیچیان لە سەرکردەکانی بەعس نەبوون، پەیوەندیشمان لەگەڵیان لەوپەڕی خراپیدا بوو، دەیان جار چاومان لێ سورکراوەتەوە، وهەڕەشەمان لێکراوە لە لایەن ئەو بەعسیانە. هەردەم تەحەدامان دەکردن لەو هەل ومەرجە نالەبارەش، هیچ ڕۆژێکیش خەمی قیامەتی ئەوانەمان نەبوو، دوعامان بۆ نەدەکردن، بەڵکو لێمان دەکردن، خۆمان لێنەکردبوونە ئیمامی زەمانە.

## نێوانی سەرکردایەتی وئەمیر!

بە زمانێکی بازاڕی ومنداڵ ئاسا ئەو برادەرە دەڵێت: "ئەوە بوختانێکە وتەنها هەڵبەستراوی خۆتە دەتەوێت شەیتانی بکەیت لە نێوان قیادەی کۆمەڵ وئەمیردا" نازانم دەبێت من چ سودێک لە تێکدانی نێوان ئەندامانی سەرکردایەتی کۆمەڵ وئەمیرەکەی بکەم؟! مەگەر تەنها تیۆری موئامەرە ئەو مەتەڵە حەل بکات! نە حزبم هەیە، نە تا ماوم لەو بڕوایەدانیم حزبایەتی بکەم. بەرلەوەی من ئەو ڕەخنانەی ناو ئەو کتێبەم ئاشکرا کردبا دەبوایە ئەندامانی سەرکردایەتی هەر لە چاوپێکەوتنە تەلەفزیۆنیەکانەوە هەڵوێستێکیان وەرگرتبا لە بڵاوکردنەوەی ئەو تەرزە قسانە، کە دیسانەوە دەڵێم سوکایەتیەکی ئاشکرایە بەو سەرکردایەتییە، دەبێت هەڵوێستێکیان هەبوایە لە ئاستیدا، ئینجا من ئاگادارم کە چەند کەسێک لەو سەرکردایەتیە هاوڕای من بوونە لەو ڕەخنانە، بەڵام وادیارە کاریزمای مامۆستا عەلی باپیر هێندە بە هێزە ناوێرن بە ڕووی دابدەن! ئەی سەید قوتبیش پاش گیران ولە سێدارەدانی نەبوە تابۆیەکی موقەدەس کە کەم کەس جورئەتی ڕەخنە دەکات لە بیروڕاکانی!

ئینشاڵڵا کۆمەڵ هەر یەکگرتوو دەبێت، ئەگەر ئەوان بەوەزعی خۆیان ڕازیبن من چیم داوە لەو دوورە گێچەڵیان پێ دەکەم!

## نهێنی ڕەخنە لەو سەردەمەدا

بەڕاستی ئەو برادەرە ئەمیر وخەونەکانی ئەمیر زۆر بچوک دەکاتەوە کاتێک دەڵێ:

" مامۆستا شتی بۆ تۆ نەنوسیوە، تۆش ئەندامی کۆمەڵ نیت ورۆژێک لە ڕۆژان لەگەڵ کۆمەڵدا کارت نەکردووە! ئێمەش ئەندامانی کۆمەڵ وەکیلی وەکو تۆمان قبول نییە وبە نوێنەرایەتی ووەکیلایەتی ئێمە قسە مەکە..."

چونکە ئەگەر مامۆستا عەلی باپیر نوسینەکانی بەس بۆ کۆمەڵیەکان بنووسێ، ئەی بۆ ئەو کتێبانەی مامۆستا باپیر تەنها لە نێو بارەگاکانی خۆتان بڵاوناکەنەوە، ولەسەریان نانوسن (للتداول الحزبی فقط)؟ تا ئێمەی غەیرە کۆمەڵیش وەڵامی نەدەینەوە. شتێکیش کە پاش بڵاوبوونەوەی نووسینەکەم لەسەر کتێبی (ئەشکەنجە وزیندان) چەند کەسێک پێیان وتم، ئەوەیە کە دەبوایە ئەو ڕەخنانە بە نهێنی بە مامۆستا عەلی باپیر وترابا لە ڕێگای ئیمێل یان نامەیەک، ئەو برادەرەش هەمان شت دەڵێت:"پێش ئەوەی ئەم ڕەخنەنامەیە بڵاوبکەیتەوە، ئەگەر دڵسۆزی دەبوایە بە شێوەی نامەی تایبەت ئاڕاستەی مامۆستات کردبا، چونکە شەرع بەو شێوەیە ڕێگامان پێ نادات ئامۆژگاریی هیچ کەسێک بکەین"

جارێ ئەو شێوازەی ڕەخنە کە باسی دەکەیت هیچ پەیوەندی بە شەرعەوە نیە، نازانم لە ئەخبارە توراسیەکان وئەدەبیاتی (الاحکام السلطانیە) زیاتر کەی شەرع باسی وایکردوە، ئەی ئافرەتێک لەسەر مینبەر ڕەخنەی لە عومەری کوڕی خەتاب نەگرت؟! بەڕاستی من بڕوام بەو شێوازە تەقلیدی ونهێنییەی ڕەخنە نییە، چونکە دەمێکە بێ هودەیی خۆی ئیسپات کردووە، ئەوەی ئاگاداریشم ئەوەیە دەیان جار

مامۆستا عەلی باپیر وکەسانی تریش بە نهێنی ئامۆژگاری کراون بەڵام سوودێکی وای نەبووە، چونکە هیچ گۆڕانێکی ئەوتۆ لە ڕەفتاری ڕەخنە لێگیراو بەدی نەکراوە. بۆیە دەبێت ئەو قۆناغە بەجێ بێڵین، لە ڕەخنەی نهێنی، وپێویستە هەموو کۆمەڵگاکەمان فێری ڕەخنە گرتن بکەین. ئەو کۆمەڵگا بەهێزانەی ڕۆژئاوا بە ڕەخنەی ئاشکراو چاونەترسی لە ڕەخنگرتنەوە وایان کردووە وەزیرەکان وسەرۆک وەزیران و سەرۆکیش لە ترسی جەماوەرە زیندوەکە بلەرزن، نەک جەماوەر بە ناو هاتنی وەزیر ومەسوول وسەرۆک ترسی لێ بنیشێت!!

دووەم من ڕەخنەم لە ڕەفتارێکی شەخسی مامۆستا عەلی باپیر نەگرتووە، هەتا بە نهێنی پێی بڵێم، بەڵکو ڕەخنەکانی من ئاڕاستەی کتێبێکی ئاشکرای کتێبخانەکانی کوردستان کراوە، بەرلەوەی لە دوو تویێی کتێبیش بڵاوبکرێتەوە، لە شێوەی چاوپێکەوتن لە تەلەفزیۆنی کۆمەڵ بڵاوبۆتەوە، ئینجا بە ئەلقە لە ڕۆژنامەی کۆمەڵیش بڵاوبۆتەوە، ئێستا لەسەر ماڵپەڕی کۆمەڵیشە لە ئینتەرنێت!

چاوەڕوانی ئەوە بووم وەک چۆن عومەری کوڕی خەتتاب لەسەر مینبەرەوە (نەک بە نهێنی) وتی "عومەر هەڵەی کرد وئەو ئافرەتە ڕاست دەکات" وەک چۆن هەر باسی فلان پیاو چاک وفلان سەلەفی سالح گوتویەتی: (رحم الله من اهدى الي عيوبى) واتە (ڕەحمەتی خوا لەو کەسەی ئاماژە بۆ عەیبەکانم دەکات) وادیارە ئەو قسانە تەنها بۆ هەڵخەڵەتاندنی منداڵەکانی مزگەوتەکانە، ئەگینا چی دەبوو ئەگەر مامۆستا عەلی باپیر دانی بەو هەڵانە نابایە کە خستمە ڕوو لە وتارەکەی پێشوو، ئەگەریش هەڵەم هەبوایە بۆمی دەستنیشان کردبا، یان کە بڕیاری وەڵامدانەوەی دەدا یەکێکی شیاوی بۆ ئەو کارە دەستنیشان کردبا، نەک نایب عەریفێکی کلۆڵی وا کە پێی وایە قەڵەم وچەک یەک وەزیفەیان هەیە!! وەک چۆن دیکتاتۆری پێشوو دەیووت: "قەلەم وچەک یەک دەمیان هەیە"

# عەلی باپیر و هەڵاوسانی منی باڵای!

بەڕاستی جێگای ئەسەفە کەسێکی وەك مامۆستا مەسعود عەبدولخالیق ئەگەر بیەوێت رەخنەیەک یان سەرنجێك بخاتە ڕوو دەربارەی هەر لایەنێکی دەسەڵات یان ئۆپۆزسیۆن، لەجیاتی دەستخۆشی ونرخاندنی سەرنجەکانی پەلاماری ناڕەوا بدرێت بۆ سەر کەسایەتی بەر لەوەی لە بیروڕاکانی بکۆڵرێتەوە یان وەڵامێکی دۆستانەی بدرێتەوە. لەوەش ئەسەفتر ئەوەیە کە کەسانێکی سەر بە لایەنە ئیسلامیەکان ئەو رەفتارە دزێوە بگرنە بەر بەرامبەری، لە کاتێکدا پەرۆشی کاک مەسعود بۆ ئەو لایەنانە جێگای گومان نییە، بەڵکو خەڵکانی دەرەوەی بازنەی ئیسلامیەکان بە ئیسلامیەکی تۆخی دەزانن.

ئەو کۆمێنتە بێ سەلیقە و بێ زەوقانەی لە دژی کاک مەسعود دەنوسرێت گوایە دژی ئیسلام وئیسلامیەکانە یان علمانیە یان یەکێتییە هەمووی دەچێتە خانەی جەهل و دەمارگرژی وپەروەردە نەکردنەوە. کە دەڵێین پەروەردە مەبەستم لە پەروەردەی سیاسی ورەخنە بیە .کەسێك تەنها فێر بکرێت گوێ بگرێت بۆ ئەمیر یا سەرۆکەکەی ورێگای پێ نەدرێت ڕایەکی جیاواز بخاتە ڕووی ئەمیر و پێشەواکەی دەبێت هەر بەو ئاڕاستەیە بیر بکاتەوە، کە هەموو کەسێك هەڵەیە، گومڕایە، نەزانە، بێ دینە، علمانیە تا دەگاتە دژە ئیسلام ئەگەر بە حزبەکەی ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامی ئەوی گوت هەڵەیت لەو کارە ولەو گوتارە.

بەڕای ئێمە هەموو شتێك لە سەرچاوەوە چارەسەر دەکرێت کە سەرچاوە سەقەت بوو ئاڕاستەی قاعیدەش سەقەت دەبێت، کە سەرچاوە لێڵ بوو هەرگیز جۆگەلەو و لقەکان سازگار نابن. کێشەی عەلی باپیر لەگەڵ ڕاپەسەندی ]اعتداد بالرأي] وگوێ لەکەس نەگرتن وهەڵاوسانی [منی باڵای] زۆر کەڤنارە، وادەزانێت ئەگەر دانی نا بە هەڵەبوونی لە ڕایەکی خۆی یان هەڵوێستێکی خۆی واتە دابەزین وخۆ بچوک کردنەوەیە. کەچی پێغەمبەر و خەلیفەکانی چەندین جار وازیان لەڕای خۆیان هێناوە چوونە سەر ڕای کەسانی تر، هەتا حەزرەتی عومەر بۆ ڕای ئافرەتێك ڕای خۆی گۆڕی لەسەر مینبەردا.

قورئان هەر هانی شوراکردن و (وشاورهم في الامر) حەدیسیش هەموو دەزانین کە کەس لە پێغەمبەر زیاتر پرسوڕای بە هاوەڵەکانی نەکردوە، وچیرۆکی پرسوڕاکانی زۆر لەوە بەناوبانگترە کە سەرلەنوێ باسی کەین. عەلی باپیر وەك چۆن دڵسۆز وزاناشی لێ دەبێتە دوژمن ولە ڕێگای شوێن کەوتە ساویلکە وسەرسامەکانی دەیان وەڵام و تاوانی ئەخاتە پاڵ وجوێن وگومان ئاڕاستەی ڕەخنە لێگرەکانی دەکات، لە بەرامبەردا کەسانێك کە گوێڕایەڵی ڕەهای ئەو بوون یان تەسلیم بە ئەو بوون بێ چەند وچوون، ئامادەیە بیکاتە موریدی خۆی با موریدەکان سەرانی بەعسی پێشووش بێت وەك لە کتێبی: (ئەشکەنجە و زیندان) دا پاش ئەوەی باسی ئەو سەرکردە دۆڕاوانە دەکات وخۆی بە فریادرەسیان دەزانێت لە دۆزەخی رۆژی قیامەت "من لە ڕووی دڵسۆزیشەوە ئەو شتانەتان پێدەڵێم، بۆ ئەوەی لەسەری بوون چیدی

لەسەری نەچن،...دەڵێم لانی كەم گەر دونیاشتان چوو، با قیامەتەكەتان هەبێت، خۆ من دڵسۆزتانم"ل ٢٥٥ خۆی لێ ببوە پێشەوای ئەو دۆڕاوانە "چونكە من ئیمامیشیان بووم وپێشنوێژم بۆ دەكردن، بانگم بۆ دەدان، دیارە من هەر ئەوە نەبووم وەكو نەیارێكی فیكری، ئەوان بە چاوی پێشەوایەتی تەماشایان دەكردم، وەكو بڵێی بەرپرسی دونیا ودینیان بم.." ل ٢٥٥

هەتا كۆمەڵی خاچی سوریش سەرسوڕمانی خۆیان لەو پەیوەندییە نا ئاساییە دەردەبرێ وپێیان دەگووت:" چۆن دەتوانی لە گەڵیان دانیشی و قسە بكەیت؟!!!" ل ٢٥٧. لە پاداشتی ئەو دەروێشیەتەیان بۆ عەلی باپیر، شێخ عەلی باپیر سەرانی ڕژێم دەكاتە موریدەكانی خۆی!، كاتێ پرسیاری لێدەكەن دەربارەی ئەو سەرانەی بەعس كێن كە باسی تەوبە وعیبادەت وتاعەتیان دەكەیت بە سەرسامیەوە، بەوپەڕی سادەییەوە دەڵێت:"وەڵلا پێم خۆش نییە ناوی كەس بەرم، موریدەكانی خۆم پێم خۆش نییە ناویان بەرم!!" سەرانی بەعس بە موریدی خۆی حساب دەكات، نیشانەی سەر سوڕمانەكە لەلایەن ئەنجامدەری چاوپێكەوتنەكانی كتێبەكە دانراوە!!!

كاك مەسعود عەبدولخالیق ڕەخنە لە رەفتاری ئۆپۆزسیۆنی عەلی باپیر دەگرێت وەك سەلەفیە بێ حەوسەلەكان باسی عەقیدە ونەورۆز ولە پەرلەمان بوون ولادانی عەقیدی ناكات، بەڵكو باسی هەڵەیی لە سیاسەت كردن دەكات كە لەوە دەچێت تا ئێستا عەلی باپیر جیای نەكاتەوە لە كاری بانگەوازخوازی، ئەخر ناكرێت ناو لە خۆت بنێی ئۆپۆزسیۆن وەك ئینگلیز دەڵێت هەر لینگێكت لە سەربازگەیەك بێت has a foot in both camps لە گۆشتی دەسەڵات و چەلاوی ئۆپۆزسیۆن یش بخۆیت. دەسەڵات نابێت بەهیچ جۆرێك هەست بە خاوی ئۆپۆزسیۆن بكات لە سەرنجدانی ورد ودرشتی كارەكانی، چەمكی عەلی باپیر بۆ ئۆپۆزسیۆن بوون، بە سەردانی نهێنی وپرۆژەی شەخسی وناوبژیوان لە نیوان دەسەڵات و ئۆپۆزسیۆن!! ئەو جۆرە تێگەیشتنە موستەهەقترە پێی بگوترێت تێگەیشتنی [لینگە وقوچە] لە ئۆپۆزسیۆن بوون، نەك بە سەرنجەكانی كاك مەسعود عەبدولخالیق بگوترێت.

ئەو كەسەی هەر لە منداڵیەوە پێی وابێت خوا ڕۆڵی براگەورەیی وئاڕاستەكاری پێ بەخشیوە وكردۆتە قەدەری وەك خۆی دەڵێت:" خوای گەورەش بارەكەی بۆ من وا هەڵخستوە، هەر كە گچكەش بووم، منداڵیش بووم، لە گەڕەكێ كە تیپی تۆپێنەیان پێكدەهێنا، منیان دەكردە برا گەورە، هەر كە پێشڕا گەیشتووم، ئەوە برای وەكو حەسەن بابەكر كە بەتەمەن لە من گەورەتر بووە، لە گەڵیاندا بووم، خوای گەورە بارەكەی بۆ من وا هەڵخستوە، كە من ئەوان ئاڕاستە كەم وئەوانە، ئەو برایانە كە لە من گەورەتر بوون، ڕەنگە لە منیش شارەزاتر بوو بن، بەڵام بە هەر حاڵ خوای بەرز بارەكەی وا بۆ من هەڵخستبوو، واتە هەر لە سەرەتاوە وەزعەكەم وا بووە، زیاتر ڕۆڵی برا گەورەیی وئاڕاستەكار و ئەوانە ببینم"..

ل١٠٢ – ١٠٣ زۆر زەحمەتە [منی باڵای هەڵاوساوی] ڕێگەی پێ بدات یەكێكی تر ئاراستەی بكات یان گوێ لە ڕەخنەی كەسێك بگرێت، ئەو جۆرە دەرونە هەڵاوساوانە بەس چاوەڕێی ستایش ودەست خۆشی وبالروح بالدم دەكەن.

ئەوەی باسی حزبەکەی بکات وەک چۆن کەسێك باسی دوکانێکی یان کۆمپانیایەکی خۆی دەکات زەحمەتە شەریکێك لەو مولکایەتیە تایبەتیە بۆ خۆی بدۆزێتەوە، وەك دەڵێت: " من وام هەست کردوە کە کۆمەڵی ئیسلامی بەهی خۆم دەزانم... هەمووی یەکە ومنیش هی هەموویم وهەمووشی بە هی خۆم دەزانم و لە خزمەتی هەمووشیدام تا هەبم وتا کۆمەڵی ئیسلامی من بە چاوساخ وئەمیری خۆی بزانێت، من بە برا گەورەی خۆی بزانێت.." ل ٣٦٠

ئەوەی داوا لە سەرکردایەتی حزبەکەی بکات نەك قاعیدەی فەقیر وعەوام بەرزببنەوە بۆ ئاستی عەلی باپیر، نەك ئەوان ئەو دابەزێنن بۆ ئاستی نزمی خۆیان، چۆن ڕێگا بە ڕەخنە لێگرتنی دەدات، لەو بارەیەوە دەڵێت:"...بەڵام واش چاوەڕێ ناکەم هەموو ئەندامانی سەرکردایەتی کۆمەڵی ئیسلامی لە ئاستی بەندەدا بن، چونکە جارێك پێیانم گوت :ئەگەر هەرچی من دەیڵێم ولە توانامدا هەیە، ئێوەش وابڵێن بەو شێوەیە بن، ئەی بۆچی من برا گەورەتانم؟ دیارە دەبێ من هەندێ شتی زیادەم پێ بێ، جا دەبێ سەرکردایەتی کۆمەڵی ئیسلامی هەوڵ بدات خۆی بێنێتە ئاستی من، نەك من نزم کاتەوە بۆ ئاستی خۆی"!!! ل ٣٦٠-٣٦١

ئەوەی پێی وابێت، چەند هۆیەکی غەیبی و تەلیسماوی هەبێت کە ئەو ئیمتیازەی پێ دەدات شتێکی زیادەی پێ بێت لە بواری فیکری وڕوحی وئیمانی وپشت بە خوا بەستن، وەك دەڵێت: " دیارە دەبێ من هەندێ شتی زیادەم پێ بێ" یان وەك دەڵێت: " بەڵام بەڕاستی ئەوەش دەزانم کە من هێندێ شتم پێیە، خەڵک هەمووی پێی نییە، لە بواری فیکری وڕوحی وئیمانی وپشت بە خوا بەستن" ل٣٦١، چۆن گوێ دەگرێ بۆ ئەوانەی ئەو شتانەیان پێ نییە؟ ئەگەر هەر باسی لە بواری ڕوحی وئیمانی وپشت بە خوا بەستنیش کردبا کارەکە ئاسایی بوو، لەوانەیە بەچاوپۆشینەوە بۆمان قوتدرابا بەڵام کارەساتەکە باسی بواری فیکری یش دەکات، کە بێگومان لەو بوارە هێشتا زۆری ماوە بڵێ خاوەن کەسایەتیەکی فیکری وموفەکیر بێت.

لە هەمووی ترسناکتر ئەوەی وابزانێت بە پێی قسەی پێغەمبەر [د.خ] ئەو گەورەیە، بەپێی خەون وخەیاڵاتی یان زیندە خەونەکانی، چۆن ڕێگا دەدات ڕەخنەی لێ بگیرێت لەلای ئەوانەی موئەیەد نین بەو ئیلهاماتە ئیلاهیانە وفیوزاتە ڕەحمانیانە! ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامی لە ئیدیعایەکی زۆر غەریبدا پاساوی زەرورەتی گوێڕایەڵی کردنی خەڵک بۆ ئەو گوایە لە قسە وئامۆژگاری پێغەمبەرەوە [د.خ] هاتوە کە دەڵێ:"ئەوە ڕەنگە ئامۆژگاری پێغەمبەریش بێ بۆ من کە فەرموویەتی: خوای پەروەردگار بە هۆی ئەو ناڕەحەتی وتاقیکردنەوانەوە تۆی گەورە کردوە، ئاگات لێ بێ خەڵکێك بچووکت نەکاتەوە" ل٣٦١، نازانم رواە کێ یان کێ ڕیوایەتی کردوە؟! ئەگەر بە ناڕەحەتی وتاقیکردنەوە با، دەبوایە سەید قوتب ببێتە ئەو مەهدیە مونتەزیرەی کە شیعە وسونە چاوەڕوانی دەکەن بە پەرۆشیەوە. کەوابوو کێشەکە لە ڕەخنە زانستیەکانی کاک مەسعود عەبدولخالیق دا نییە هێندەی لە عەلی باپیر وهەڵاوسانی منی باڵایەتی.

یەک شەممە, ٠٢ ئەیلول ٢٠١٢ ٠٣:٠٠

# ئامۆژگاری نامەیەك بۆ مامۆستا کرێکار لە عەبدێکی فەقیر و زەئیلەوە!

پێشەکی پیرۆزبایی ئازاد بوونت لێدەکەم، بەڕاستی ئەوەی جارێك تۆی دیبێت بەر لە تێوەگلانت بەو تەفکیرە سەلەفیە، قوتبیە، قاعیدیە، هەرگیز چاوەڕوانی ئەو سەرەنجامەتی لێ نەدەکرد! کەسێکی ڕۆشنبیری، خوێنەواری، موتەلیعی، شاعیری، کوردپەروەری بێ فەرق وجیاوازی نێوان شارەکان، هەست ناسکی، ڕێزگر لە ئافرەت، لە هەمووی گرنگتر مەجلیس خۆشی، نوکتەچی، وەك تۆ ئەرز وئاسمان دوورە لە ڕادیتنی تەبەنا کردنی ئەو جیهان بینیە ئیسلامیە عەرەبیەی کە زادەی عەقڵیەتێکی بەدەوی، سەحرانشینی، تەسکی، فیقهی و نەریتە کۆنەکانی عەرەبە، دژە بە هەموو بەهاکانی مرۆڤایەتی، پێشی وایە لە هەموو مرۆڤایەتی پاك وبی گەردترە!

چونکە تۆ سەرسامی بە سەید قوتب، کە هەتا منداڵەکانت بە ناوی خۆیی و بەرهەمەکانی کردوە، و کردوتن بە دیلی سەرسامی خۆت بەو بیرمەندە ئیسلامیە، کە من پێموایە کارێکی زیادەڕەویت کردوە، وڕەچاوی هەستی منداڵەکانیشت نەکردوە لەوەدا، چونکە حەدیس لەسەر ئەوەش هەیە کە ناوی چاك لە منداڵەکانتان بنێن، وچاکترین ناویش بەپێی حەدیس عبدالله و عبدالرحمن ە،عَنْ ابْـنِ عُمَـرَ رضـی الله عنهمـا قَـال : قَـال رَسُـولُ اللَّهِ صَلَّـی اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ : ( إِنَّ أَحَـبَّ أَسْـمَائِكُمْ إِلَى اللَّهِ عَبْـدُ اللَّهِ ، وَعَبْـدُ الرَّحْمَـنِ ) . : رواه مسلم.

عومەری کوڕی خەتاب یش کاتێ گەنجێك پرسیار لێکرد هەقی منداڵ لەسەر باوك ودایکی چیە؟ فەرمووی: دایکێکی باشی بۆ هەڵبژێرێت، و ناوێکی باشی لێ بنێت، وفێری قورئانیشی بکات. [أن ينتقی أمه، ويحسن اسمه، ويعلمه الكتاب] سەید قوتب بەرلەوەی بکەوێتە ژێر کاریگەری ئەبو ئەعلای مەودودی و ئەدەبیاتی ئیخوان بە گشتی، یەکێك بوو لە گەورەترین ڕەخنەگری ئەدەبی لە میسر، سەرەڕای سروشتی دینداری لەسەر چەندین ڕۆمانی نەجیب مەحفوز نووسیویەتی، کە دووان لەوانە [اولاد حارتنا ] و [خان الخليلی] هەرای زۆری نایەوە گوایە پڕن لە کوفر، سەید قوتب ڕۆمانی خان خەلیلی "خان الخليلی" نەجیب مەحفوزی لە نووسینەکەیدا زۆر ستایش کردوە هەرچەندە لەو ڕۆمانە لەسەر زمانی کەسایەتیەکان قسەی زۆر ترسناك و دژی دینی تێدا کراوە، بۆ نمونە لەسەر زمانی کەسایەتی احمد راشد کە پارێزەرە هاتووە: "هەروەك چۆن دینەکان ڕزگاریان کردین لە وەسەنیەت، پێویستە زانست ڕزگارمان بکات لە دینەکان"

"فكما انقذتنا الديانات من الوثنيه ينبغی أن ينقذنا العلم من الديانات " هەروەها دەڵێت: زانایانی هاوچەرخ دەزانن ئەتۆم چی تێدایە، ودەشزانن لە دوای سیستمی خۆری ئێمە ملیۆنەها سیستمی خۆری

تر هەیە، کەوابوو کوا خوا لە کوێیە؟! " العلماء المعاصرين يعلمون بما في الذره من عناصر، وبما وراء عالمنا الشمسي من ملايين العوالم، فأين الله ؟"، هەر ئەوەش نا دەربارەی ڕۆمانی [اولاد حارتنا ] کە میانڕەوەکانیش نەجیب مەحفوزیان تەکفیر کرد لە سەری، وخەریك بوو بە کوشتی بدەن بە دەستی نەزانێك، دەڵێت: ئەو ڕۆمانە ئەفسانەیەکی ئەدەبییە موستەهەقی ئەوەیە قوتابی قوتابخانەکان بیخوێنن“ ! إنها أسطورة أدبيه تستحق انها تدرس لتلاميذ المدارس" سەید قوتب سەرەرای دینداریەکی سروشتی تێدا بوو، بەڵام تا نەچووە ناو ئیخوان و نەکەوتە ژێر کاریگەری چوار زاراوەکەی [المصطلحات الاربعة] ی ابو الاعلی المودودی ، ئەو بیروڕایە توندانەی تەبەننا نەکرد. بڵێی سەید قوتب ژیان بواری پێدابایە، پاش قۆناغی نووسینی معالم في الطريق جارێکی تر خان الخليلي بخوێندبایەوە، نەجیب مەحفوزی تەکفیر بکردبا؟!

چونکە نەجیب مەحفوز پاش ئەوەی سەید قوتب بوو بە ئیخوان و زیندانی کرا، سەردانی سەید قوتبی کردوە وەك لە کتێبی [المرايا [باسی دەکات و پێی دەڵێت:

-‘جێگای داخە کە تۆ وازت لە ڕەخنەی ئەدەبی هێنا.

بە دەم پێکەنینەوە گووتی:

-ئەی لەو ئاواتخوازیە جاهیلیانە‘ ! هەتا ڕەخنەگرێکی وا گەورەی ئەدەبی لە ماوەیەکی وا کورتدا وا بگۆڕێت! ئەوە نیشانەی سروشتێکی توندڕەوانەی هەڵەشەییانەیە. وسەید قوتب سروشتی وا حەدی وتوندڕەو بووە، لە وتارێکی تری تایبەتدا بە درێژی باسی ئەو سروشتە توندڕەوەی دەکەم لە هەر دەورانێکدا! لە دواییدا پاش نزیکەی شەست ساڵ یەکێکی پەروەردەکراو لەسەر بیروڕا توندەکانی سەید قوتب چەقویەک لە ملی نەجیب مەحفوز دەدات لەسەر ئەو اولاد حارتنا، کە سەید لە بەراییدا ستایشی کردبوو!!

من گومانم لەوە نیە کە سەید قوتب ئەگەر مەرگ بواری دابا دوور نەبوو بەو عەقڵیەتە بلیمەتەی، بەو مەوسوعیەتەی، پاش دیتنی کارە درندەکان و کارەساتاویەکانی گرووپە جیهادیە سەلەفیە قوتبیەکان، حاشای لەو بیوبۆچانانە دەکرد وەك شێخ محمد الغزالی کە بە پێچەوانەی سەید قوتب بوو، لە گەنجی هێرشی کردە سەر ڕۆمانی اولاد حارتنا، کە چووە ناو تەمەن و ئەزموون ڕۆژ بەرۆژ میانڕەوتر دەبوو، کە هێرش کرایە سەر نەجیب مەحفوز لەسەر ئەو ڕۆمانەی کای خۆی هێرشی کردبوە سەر وبە کوفری دانا بوو، ئەوجارەیان شێخ محمد الغزالی بەخۆی سەردانی نەجیب مەحفوزی کرد لە نەخۆشخانە، وبە توندترین شێوە هێرشی کردە سەر شێخ عبدالحميد كشك، کە پڕ جەماوەرترین شێخی میسر بوو، سەبارەت بە نووسینی کتێبێکی دنەدەری تەحریزی لە دژی نەجیب مەحفوز بە ناوی " كلمتي في الرد على نجيب محفوظ "

هەموو شێخ و پیاوە دینیەکانی کە دژی نەجیب مەحفوز قسەیان کردبوو وبە جاهیل و نەخۆش ناوی بردن! مامۆستا کرێکار تۆ ئەگەر لە خۆرهەڵات بایت، لە پاکستان یان ئەفغانستان یان کوردستانیش، تا ئێستا بەو بیرکردنەوەوە شتێکت بەسەر هاتبوو، نەك لەبەر ئەوەی دنیا هەمووی دژی ئیسلامە،

بەڵکو لەبەرئەوەی ئەو جیهانبینیە تایبەتیەی ئێوە بۆ ئیسلام بواری هاوژیانی لەگەڵ کەس ناهێڵێتەوە، نە کافران و نە موسڵمانانی دەرەوەی بازنەی خۆتان!

تۆ زۆر لەوە عاقڵتری هێشتا هەر لە قۆناغی بیری پڕ حەماسەتی گەنجانەی سەید قوتب چەق بەستوو بیت، کە گومانم نییە سەید قوتب تەمەن بواری دابا لەو قۆناغە میسالیە پڕ لە خەونی ئاڵا و والآ نە دەمایەوە پاش دیتنی ئەو دەرەنجامە کارەسات ئامێزانەی جیهادیەکان بە ناوی سەلەفی ساڵح و سەید قوتب! سەید قوتب لە زۆربەی کتێبەکانی بیرۆکەیەک دەڵێت ودەڵێتەوە و جەختی لەسەر دەکاتەوە "کە ئێمەی موسڵمان هیچ پەیامێکی زانستمان پێ نییە پێشکەشی جیهانی بکەین، چونکە لەو بوارەدا پێشمان کەوتوون و هەر واش بە بە جێماوی دەمێنینەوە هەرچەندە هەوڵمان دا، ، بەڵام پەیامی ئیسلام و یەکتا پەرستی خوا و بەها بەرزەکانی ئیسلاممان هەیە پێشکەشی کەین"

منیش لەگەڵ نیوەی یەکەمی قسەکەی سەید قوتب م کە " هیچ پەیامێکی زانستمان پێ نییە پێشکەشی جیهانی بکەین" بەڵام کارەسات لەوەدایە بەشی دووەمی قسەکەشی کە بریتیە لە پێشکەش کردنی " پەیامی ئیسلام و یەکتا پەرستی خوا و بەها بەرزەکانی ئیسلام" نەهاتە دی، وبەڵکو ئەو پەیامە گۆڕا بۆ سەرچاوەی نیگەرانی و شوهرەت بەدی موسڵمان، ومالوێرانی، ومرۆڤ کوژی و دڕندایەتی ناوەوەی جیهانی ئیسلام و دەرەوەش! ئیسلامێکیان پێشکەش خەڵک کرد کە پڕاوپڕە لە سەربڕینی وەحشیانەی کە بۆ ئاژەڵێش گوناهە بەو شێوەیە بە کۆمەڵ خەڵك بە نۆرە سەربڕیت! ئیسلامێك کە هەموو دنیا باسی پیرۆزکردنی ئازادیەکان دەکات، کەچی ئەو ئاوات دەخوازێت بە گەڕانەوەی سەردەمی کۆیلایەتی و سبایا و جاریەچیەتی!

ئیسلامێك خەڵک پاش دیتنی هەزار ڕەحمەت بۆ فاشیزم و گۆڕی مۆسۆلینی دەنێرێت! ئیسلامێك هەر خەریکی تەکفیر وتەفسیق و ڕەجمکردن و کوشتن و دەستبڕینی خەڵکە! قەت بە عەقڵم داناچێت کەسێك لە بلیمەتی و ڕۆشنبیری و هەست ناسکی سەید قوتب دابێت، ئەگەر بژیا با ئەو کارەساتانەی بدیبا ڕازیبا پێی، گوومانم نییە کە سەید قوتب لە شێخ محمد الغزالی حەکیمتر دەبوو.

قەت بە عەقڵم داناچێت کەسێکی لە بلیمەتی و ڕۆشنبیری و هەست ناسکی کرێکار بێت، هەر بەردەوام بیت لەسەر بیرکردنەوە بە هەمان شێوەی بیرکردنەوەی سەید قوتب لە قۆناغی لاوێتی وحەماسەت وپاش ئەشکەنجە دا! هیچیتر هەڵمەخەڵەتێ بە دەست لە پشتدانی میدیای جەزیرە وعەرەبی کە پێیان خۆشە لەسەر سکرینەکانیان درووود بۆ شێخ ئوسامە بن لادن و زەواهیری و خەلیفە بەغدادی بنێریت! خەڵکێکی زۆر تەمەنای مەرگ و ناڕەحەتیت دەکەن، لەبەر کار وقسەکانت لە ڕابردوودا، کە دەتوت بە تەور لە ملیان دەن ئەگەر کوفرێکیان کرد! کەسێکی زۆریش خۆشیان دەوێیت لەو وێنەیەی ئێستادا، کەسێکی جیهادی، سەلەفی، قوتبی، عروبی قاعیدی! من لەگەڵ هیچ لەو دوو گروپە نیم هیوادارم وەك جەماعەی ئیسلامی میسر موراجەعاتێك بکەیتەوە بەخۆتداچیتەوە، ئەو ڕیش وهەیئەتەت چاك کەیتەوە، نەفرەت لەو هەموو تاوانە بکە کە بە ناوی ئیسلام دەکرێت لە جیهان و کوردستان بەتایبەتی کە لەبەردەم دڕندەترین هێرشی تیرۆرستی دایە، دوور لە پاکانەکانی عەقلیەتی فاشیستانەی عەرەبی

ئیسلامی، تۆ دەبوایە تیۆرستێکی ڕیفۆرمخوازی ئیسلام بایت لە ئاستی غەنووشی و د. عدنان ئیبراهیم، نەك جیهان بە تیرۆرستێکی شوێن کەوتەی فاشیسترین نوسخەی ئیسلامی سەلەفی جیهادیت ناوزەد بکات.

من لە ڕیز و تەقدیرم بۆت ئەو چەند وشەیەم بۆ نووسیت، متمانەم بە عەقڵ و ئیحساسی مرۆڤانەت هەیە، هیوادارم ئەو قۆناغە تێپەڕێنیت، بە بیرێکی نوێی و بەخۆداچوونەوەیەکی واقیعیانە بگەڕێیتەوە گۆڕەپانی فیکر وسیاسەت، ئەگەر نا هەر نەگەڕێیتەوە باشترە، ئەو چەند کاتەی ماوتە بۆ ئاسوودەیی خێزانە بەڕێزەکەتانی تایبەت کە.

٢٠١٥/١/٢٧

# کەس چاوەڕێی فەتوای مەلا کرێکار ناکات تا پێیان بڵێ داعش چین

مەلا کرێکار و فەتحێکی تری ئیعلامی! چاوپێکەوتنەکەی جەزیرەی فەتحێکی ئاسان بوو چونکە، جەزیرە خۆی لەو بازنەیە دەخولێتەوە، بۆیە هونەری تێدا نەبوو بەڵام کاتێ تەلەفزیۆنێکی کوردی میللەتێکی لە حاڵەتی شەردا کە پێویستی کرد بچێتە چاوپێکەوتنی کەسێك چەند ڕۆژێکە ئەوەی خراپە بە کوردی گووت و بچوکترین هەڵوێست نەبوو بێت لەسەر کورد، وپێشمەرگەش سارد بکاتەوە و گاڵتە بە قوربانیدانیان بکات، لێرەدا دەبوایە ئەو کەسەی دەینێرن زۆر بە عینایەت هەڵبژێردرابا، بەڕاستی کە گوناهن ئەو تەلەفزیۆنانە، هەتا ئێستا فێر نەبوون کە گفتوگۆ هونەرە، زانستە، تەکنیکە NRT !گوایە لە باشترین تەلەفزیۆنەکانیشە ئینجا وادەزانێت، ئەگەر گەنجێکی قۆزت نارد بە مایکێکەوە وبە چەند پرسیارێکی حازرەوە ئیتر تەواو چاوپێکەوتنێکی باشی لێ بەرهەم دێ!!

نازانن بۆ چاوپێکەتن لەگەڵ مەلا کرێکار، کەسێکی دەوێت خاوەن باگراوندێکی مەعریفی وئیسلامی و سیاسی باش، ئاگاداری بەڵگە و دژە بەڵگەکان بیت، تا بتوانێت لە ئاست قسە وبیرکردنەوە و ئارگیومێنت وبەڵگەکانی ئەو بێت، نەك نەزانیت ناوی محمد المقدسي یش بخوێنیتەوە، نەك نەتوانیت کون وکەلەبەر وقسە هاقدژەکانی مەلا کرێکار بدۆزیتەوە، وکە دەیان پرسیاری شەرم ئاوەر و موحریجی بۆ دروست کات، تا بیهێنێتەوە بۆ سەر ئەرزی واقیع! هەستم دەکرد کابرای پێشکەشکار وەك نێچیرێک ڕای دەکرد تا زوو دەربازی بێت لەو بەرنامەیە؟!

ئینجا کە دەیەوێت وەك ڕاشد الغنوشی بگەڕێتەوە !! مەلا کرێکار دەیەوێت وەك ڕاشد الغنوشی بگەڕێتەوە کەچی وەك زەواهیری بیر بکاتەوە!! راشد الغنوشی لە زۆربەی کەسایەتی و سیاسیە سێکیولارەکان دیموکراتی ترە، بە بەڵگەی ئەوەی زیاتر لە نیوەی خەڵکی تونسی لەگەڵدا بوو، بەڵام زۆر بە دیموکراتیانە دەسەڵاتی بەجێ هێشت، تۆ ١٠٪ ئەو خەڵکەت لەگەڵ بێت هەڕەشە نەك لە کورد، بەڵکو لە ئەوروپاش دەکەیت! دیارە داعش [دولة الخلافة] تەنها بە وەفد و قاسیدی عەمەلی دەناسرێت؟! یانی ئەو هەموو سەربڕین و وێرانکاریە و ١٠٠٠ پێشمەرگەی شەهید هێشتا نایان ناسێنێت؟!

کاتی خۆشی کە باسی صدام مان دەکرد، عەرەبەکان وایان دەگووت، بیانووی دیکەیان پێ دەگرتین، و دەیانگووت: کێ دەڵێت صدام وای کردوە، کێ دەڵێت ئەو بوو کیمیاوی لێدان؟!!! دوایێ وەرە پێمان بڵێ کە حەزرەتی محەمەد ئەسحابەکانی ئاڕاستە کرد بۆ حەبەشە بۆ کۆچ کردن، بەر لەو فەرمانە وەفد و قاسیدی ناردبوو؟! یان تەنها ناوبانگی پیاوچاکی نەجاشی گەیستبووە مەکە؟! باشە خۆ بەدشۆرەتی داعش گەیشتۆتە هەر سەرتاسەری دنیا، هیچی خراپ ونا ئینسانی نەماوە نەیکەن، هێشتا دووڵی نایاننناسیت؟ خەڵك خەریکە لە ئیسلام دڕدۆنگ دەبێت سەبارەت بە داعش!! شێخ ڕەزای تاڵەبانی باشی فەرمووە :عومەرم دی عومەری پێشووتریش وابێ گەردنی شیعە دوو سەد دەفعە لە سەب ئازابێ

ئەمڕۆ زمان حاڵی کورد وەك شیعرەکەی شێخ ڕەزا دەڵێت: ئیسلام و خەلافەت وموجاهیدانمان دی، ئەگەر ئەوانەی پێشووش وابێ، گەردنی ڕەخنەگران وتانە لێدەران وگومان لێکەران لە ئیسلام سەد دەفعە ئازابێ! نیوەی کورد لە ڕقی داعشی بۆگەن وخوێڕی ومرۆ کوژی، کافر بە خوا و بە ئادەمیزاد خەریکە ڕقی لە خودی ئیسلام دەبێتەوە، لەبەر خۆ پەردەپۆش کردنیان بە ئاینی ئیسلام و بەکارهێنانی دەقگەلێکی زۆر و زەوەند لە سەرچاوەکانی ئیسلامدا، بە تایبەت لە دەقەکانی حەدیس، وهەندێکیشیان لە قورئان بە تەئویلاتی تایبەتی خۆیانەوە، تا بە دەردی مەرامەکانیان بخوات! جا خەڵك لە دژی داعش ڕقی هێندە بڕ بکات بیر لە کاردانەوە بکات لە دژی ئیسلام، دەبێت مەلا کرێکارێك چ ئەرزشێکی هەبێت پاش ئەو قسە سووك وبێ ناوەرۆکانەی کە بۆ بەرژەوەندی داعش کردنی، تا هیچیتر خەڵك گرنگی وبایەخی پێ بدات؟!

پاش تاوانبارکردنی کورد بە بەرپاکردنی شەڕ لە دژی داعش! پاش ناوهێنانی کەللەپووتە سەربڕەکانی داعش بە موجاهید !پاش ناوهێنانی خەلیفەکە بەعسیەکەی موسڵ، بە دکتۆر ابوبکر البغدادي ودەوڵەتەکەی بە دەوڵەتی خەلافەت! پاش سووکایەتی کردن بە خەبات وجیهادی پێشمەرگە دژی ئەو تیرۆرستانە! دەڵێیت ئەو شەڕە شەڕی کورد نیە! باشە تۆ خۆت دەڵێی پاش ئەوەی سەرۆک بارزانی باسی سەربەخۆیی کرد ئاوا داعشیان پیوە ناین، باشە دەبێت داعش شەڕی کێ بکات؟! شەڕی کۆنە بەعسی، یان شەڕی قەتەر وتورکیا، یان شەڕی ئێران، یا ئەمریکا؟! پاش هەڕەشە کردن لە کورد بە پێنج شەش هەزار داعشی خۆت لە کوردستان و لەگەڵ ٦٠٠ کەسیش لە ئەوروپا!!

ئەو ژمارانە لە قسەی مەلایەك دەچێت کاتی خۆی لە سەردەمی بەعس، هەندێ زاق وزیقی کرد، کە پێیان وتبوو بەسە ئیتر ئیحترامی خۆت بگرە دەنا واو و وات لێ دەکەین! یەکێك گووتی مامۆستا بۆ ناجیتە دەرەوە؟! گووتی: ئەگەر ئەمن بچمە دەرەوە دە پازدە هەزار کەسم لەگەڵ دێنە دەرەوە! کە ڕۆیشتیش بەس خۆی دەرچوو! خەڵکێك ئەوە کاردانەوەی بێت بەرامبەر هەتا موقەدەساتی کە داعشی خوێڕی گومانی لەویش خست لای کەسانێکی زۆر بەداخەوە! دەبێت مەلا کرێکار چ قودسیەتێکی هەبێت پاش ئەوەی بەرەی دوژمنانی گەلی هەڵبژارد؟ ئەگەر کەمێك گوێی لەو جوێنانە بێت کە پێی دەدرێت لە ژێر کۆمێنەکاندا دەزانێت نرخی گەیشتۆتە کوێ لای کۆمەڵگەی کوردی بەو هەڵوێستانەی، چونکە ئەگەر ئەو داعش ناناسێت و ناتوانێت بڕیاری لەسەر بدات، ئەوە خەڵکی ئاسایی و کوردپەروەر و موسڵمانی نا داعشی، هەموویان داعش دەناسن هەتا بە حزبە ئیسلامیە مەدەنیەکانی بەشداربووی پرۆسەی سیاسیشەوە! هەموویان دەزانن: ئەو داعشانە نە موسڵمانن، نە ئینسانن! بەڵاو قوزەڵقورتن بەسەر ئیسلام و مرۆڤایەتیەوە، لە مێژوودا وێنەیان نەبووە لە نامرۆیی و بێ ڕەحمی و قەسوەت وگاڵتەکەر بە خوێنی ئادەمیزاددا، دەزانن هەتا خەواریجی فەقیر لە چاو ئەوان فەیلەسوفی دیموکراتیەتن! کەسیش چاوەڕێی فەتوای مەلا کرێکار و میزانی جەرح وتەعدیلی ئەو ناکات تا پێیان بڵێ داعش چین!

٢٠١٥/٢/١٣

# سەرنجەکانم لەسەر چاوپێکەوتنەکەی ماموستا کرێکار لەگەڵ جەزیرە

سەرنجی یەکەم:

پاش دیتنی چاوپێکەوتنەکەی کرێکار لە گەڵ الجزیرة بە تەواوی بێ ئومێد بووم لە هیچ جۆرە بە خۆدا چوونەوەیەکی، من لە وتارەکەم بە ناونیشانی : ئامۆژگاری نامەیەك بۆ مامۆستا کرێکار... زۆر بە دڵسۆزیەوە هەوڵی پێگووتنی چەند ئامۆژگاریەکم دا بە مامۆستا کرێکار، کە پێموابێت کەم لەوانەی دەیناسن بەو ڕاشکاوییە پێی بڵێن. یەکێ لەو خاڵە گرنگانەی کە لە وتارە ئامۆژگاری نامەکەم، کە بەر لە چەند ڕۆژێك بڵاوم کردەوە هاتبوو ":هیچیتر هەڵمەخەڵەتێ بە دەست لە پشتدانی میدیای جەزیرە ومیدیا عەرەبیەکان، کە پێیان خۆشە لەسەر سکرینەکانیان دروود بۆ شێخ ئوسامە بن لادن و زەواهیری و خەلیفە بەغدادی بنێریت!" وەک دەبینن بە تایبەتی باسی جزیرەم کردبوو تا فریوی ئەوان نەخوات، بەڵام ئەو پیاوە کێشەی دەروونی هەیە لەگەڵ کامێرا و مینبەر و مایك، کە کەوتە ڕوو بە لەگەڵ هەر کامێکیان، هاوسەنگی تێك دەچێت، ئەو قسەیە دەکات کە شوێن کەوتوانی پێیان خۆش بێت، لەو چاوپێکەوتنە وتاری ئەو ئاڕاستەی جیهادیە توندڕەوەکانی دەوڵەتی داعشی خەلافەت کراوە، زۆر بە ڕاشکاوی بەرگری و هاوسۆزی و ڕەوایەتی پێدان نیشان دەدات، بەو تیرۆرستانەی دەوڵەتی داعشی.

ئەو زمانەی لەو چاوپێکەوتنە بەکاری هێنا تا سەرئێسقان هەڤدژ و یاریکردن لەسەر دوو پەت و چەواشەکارە. سەرەتا بەرگری لە خۆی دەکات کە هیچی لەسەر نییە و وازی لێ ناهێنن و کەیسی مولوفەقی بۆ دروست دەکەن بۆ ١٣ ساڵی ڕەبەق، وگوایە بەس لەو ساڵی دوایی ٥ ملیۆن دۆلاریان لە کەیسی کریکار خەرج کردوە بێ سوود! دەڵێت بۆیە یەخەی منیان گرتووە، چونکە من کوردم وکەس نیە بەرگریم لێ بکات، و دەوڵەتێك لە پشتمەوە نییە! ئەو ڕەخنەیەی جەنابت دەیگری لە دەوڵەتی نەرویج لە سەرێکیتر ستایشە! تەنها بۆ ١٣ مانگ ٥ ملیۆن دۆلار سەرف کەن لەسەر دۆزینەوەی بەڵگەی ڕاست ودروستی تاوانی تۆ، بەو وەزعە ئابووریە خراپەی سەرتاسەری ئەوروپا، ئەوە بەڵگەی هەق دۆستی و ڕەوشت بەرزی و یاسادۆستی و مرۆڤایەتی خۆیانە. خوا دەزانێت لەوەتی بە تۆوە خەریکن چەند سەد ملیۆنیان سەرف کردبێت .ئەگەر تۆ گیراوی ئەو دەوڵەتە خەلافەتەی کە تۆ بە ئەوپەڕی ئاوات و خواست وخەونی خۆت و موسڵمانانی دەبینیت، بایت، پێنج دۆلاریشیان لێ سەرف نەدەکردی بۆ ئەوەی بە گوللەی بدەن بۆ کوشتنت، بەڵکو بە چەقۆ سەریان دەبڕیت وتەواو! نە دادگایی ونە سەرف کردنی پێنج ملیۆن دۆلار لە وەرگێڕانی کاسێتەکانی تۆیان سەرف نەدەکرد. تۆ بەو هەموو ڕابردووە جیهادیەتەوە گیراویت و وتارت هیچ ڕۆژێك جیانەکردۆتەوە لە وتاری قاعیدە وئەنساری ئیسلام و هەرە توندڕەوەکانی دنیای ئیسلام، هێشتا گلەیی لە بەختی خۆشت وعەدالەتی نەرویج یش دەکەیت، ئەی بۆ ئامۆژگاریەکی دەوڵەتی داعشی مونتەهای خەونی موسڵمانان ناکەیت کە بۆچی کارمەندی ڕێکخراوە خێرخوازەکان

بەبێ گوناه سەردەبڕێت و داوای ملیۆنەها دۆلار دەکەن لەبری خوێنیان؟! دواترینیان ئەو دوو ژاپۆنیە بێ بەختە بوون کە وەك مریشك سەریان بڕین؟!

سەرنجی دووەم:

مامۆستا کرێکار تەکنیکێکی هەیە لە زۆر وتار و چاوپێکەوتن و کۆڕدا بەکاری دەهێنیت، ئەویش ستایشی خۆ کردنە کە ئەوە هەندێکیانە: من ٦٠٠ کاسێتی دەرسی دینیم هەیە و ١٠٠ یان بە تەنها بۆ بەلاغەتی قورئان تەرخان کراوە! باسکردنی بابەتی قەبە بەبێ بۆنە وەک تیۆری ابراهیم ماسلو و پێویستیە فیزیکیەکان و مەعنەویەکانی مرۆڤ.. یان بە دەوی خۆی دەڵیت من کەسێکی ڕۆشنبیری وموفەکیریکی موسڵمانم! ستایشی خۆی دەکات کە لەوەتی لە نەرویجە ئەزیەتی هاوسێکانیشی نەداوە! بێگومان لە ئەوروپا کەس ناتوانێت ئەزیەتی هاوسێی بدات، هەتا ئەگەر بشیەوێت! چونکە هەر زوو بە زوو دەریدەکەن لە ماڵەکەی.

لەوانەیە مامۆستا کرێکار ماڵی لە موسڵ با، لەبەرچاوی داوای جزیە لە هاوسێ مەسیحیەکانی کرابا بە فەرمان و تەکلیفی دەوڵەتی داعشی. لە هەمووی سەیرترئەو پیاوە زۆر بە سەرسامیەوە ستایشی کۆمەڵگای ئەوروپی نەرویجی دەکات، کە کۆمەڵگایەکی " کراوە و ڕۆشنبیر و هێمنە. باشە برا کە تۆ ستایشی ئەو کۆمەڵگایە دەکەیت بەو سیفەتانەوە، بۆچی هەموو ژیانت و کاتت و ئاسوودەت و ماڵ ومنداڵت خستۆتە خەونی دەوڵەتێکی فاشستی تیۆکراتی وەک دەوڵەتی خەلافەتی داعشی؟! یان کرانەوە و ڕۆشنبیری و هێمنی بەس شایەنی نەرویجیەکان و ئەوروپیەکانە؟! ئەگەر کرانەوە و ڕۆشنبیری و هێمنی ئەو کۆمەڵگایە نەبا، ئەوانیش بە گیانی دینی خاچپەرستی کۆن مامەڵەیان کردبایت،وەک چۆن جیهادیە سەلەفیەکان بە گیانە دینیە کۆنە مامەڵەی خەڵک دەکەن، دەمێك بوو سەریان پەل دابوویت و ماڵ ومنداڵیان بەدبەخت کردبوویت.

ستایشی دوو مولحید دەکەیت کە یارمەتیت دەدەن لە سەرەتای کێشەکانتەوە لەگەل دەوڵەتی نەرویجدا، ئەی بۆ دەوڵەتی خیلافەی ئاوات وخەونی تۆ تا بە مولحید رادەگات، هەزاران موسڵمان دەکوژێت؟! توخواکەی شەرم لەو ئیمانە ناکەیت کە بە قەد ئەو ئیلحادەی کە شەو ڕۆژ تۆ و هاوبۆجوونەکانت نەفرەتی لیدەکەن ئینسان و بەسۆز و ڕەحم و بە مروەت نەبێت؟! ئەگەر ئەو دوو مولحیدە لە دەوڵەتە خەلافەتیە خەون و خواستی موسڵمانان با چیان لێدەکردن؟ دوو ئیمان داری وەک تۆ بەرگرییان لێدەکردن؟! ئەوە چ ئیزدیواجیەتێکە ستایشی کرانەوە و ڕۆشنبیری و هێمنی کۆمەڵگای ئەوروپی بکەیت کەچی بانگەوازی بکەیت بۆ دەوڵەتی تەوحید وجهادی داعشی لە جیهانی ئیسلامیدا؟!

سەرنجی سێیەم:

دەڵێیت لە پاکستان زۆر مورتاح بووم، و مووچەت پێنج بەقەد دکتۆرێکی پزیشکێکی پاکستانی بوو، کەچی لە نەرویج کەس ناڵێت کەرت بە چەند! هەر لە وەزعی پاکستان بڕوانیت، کە برادەرانێکی سەردەمی

جیهادی ناموبارەکی ئەفغانی، کە دەرهاوێشتەی هەقیقی یەك دنیا تیرۆرست بوو، ناوی دەنێن بە پیسستان، و بەراوردی بکە بە وەزعی نەرویج، دەزانیت بۆ دەبێت کەسێکی هەموو کارەکەی وتنەوەی زانستی قال و حدثنا و وتی وتی بێت، پێنج بە قەد پزیشکێك مووچە وەرگرێت! بێگوومان لە جەهلستان جەهل برەوی زۆرە، لە ولاتی زانست و ژیاریشدا تەنها زانستی سوودمەند بە مرۆڤەکان برەوی هەیە، هەر بۆیەش ئەو بەهەشتەیان لەسەر دنیا بۆخۆیان دروست کردوە، ئێمەش دە بە قەد ئەوان سەروەت وسامانمان هەیە، کەچی دۆزەخێکمان بۆ خۆمان وبۆ خەڵك دروست کردوە بە زیندووکردنەوەی تەقالیدی عەبس وزوبیان جاهیلی بە ناوی ئیسلامدا.

دەڵێیت قەومیەکان وسۆشیالیستەکان و لیبرالیەکان و سێکیولارەکان فەشەل ونوشستیان هێنا لە گەڕاندنەوەمان بۆ مرۆڤ بوون وبەشەریەتی خۆمان، ئاواتەخوازی ئەوەی ئەوانە لێی سەرنەکەوتن، دەوڵەتی خەلیفەی بەغدادی بەعسی ڕەگ مرۆڤ بوونمان بۆ بهێنێتەوە؟! لەگەڵ پەیدابوونی ئەوانە مرۆڤ شەرم لە خۆی دەکات کە کەسانێکی وا دڕندە و بە سووک سەیرکەری مرۆڤ سەر بە کیشوەرەکەی ئەو بن! شکۆی مرۆڤ بە سەربڕینی و سوتاندنی وبەردباران کردنی ودەستبرینی دێتەوە؟! بە زیندووکردنەوەی هەموو ڕیوایاتە قێزەونەکانی بەناو سەلەفی ساڵح شکۆی مرۆڤ دەگەڕێتەوە؟! ڕاستە ئەوانەی باستکردن فەشەلیان هێنا لە پاراستنی کەرامەتی مرۆڤ و دەوڵەت قەمعی و داپلۆسێنەر بوون، بەلام دە ئەوەندەی تریش خراپ بن و نا مرۆڤ بن، ناگەن بە خراپی و نا مرۆڤی یەك ڕۆژی قاعیدە و داعش و نوسرە و هەموو دۆستەکانی ترت.

## سەرنجی چوارەم وکۆتایی:

من وام رادەدیت لێت، پاش ئازاد بوونت، هەر هیچ نەبا قسەیەکت دژی ئەو شەڕفرۆشتنەی داعش بە کورد کردبا، نەك وەك عەرەبێکی رەگەزپەرست هێشتا کوردت تاوانبار کردبا بە شەڕ فرۆشتن بە داعش بە دنەدانی خۆرئاوا و ئێران! هەموو چاودێریک دەزانیت کە کورد کاتێ داعشی خوێڕی شەڕی مالیکی شیعەی دەکرد، پێشمەرگە کوردەکان لەسەر هێڵی سنور چاك وچۆنی، و قسەیان لەگەڵ چەکدارانی داعش دەکرد. تا ئەو هێزەی کە هەڵیان دەسوڕێنێت فەرمانی پێکردن وەك بەراز ملیان بەرەو کوردستان وەسوڕێنن، هەر بە تەواوی شیعەیان لە بیر کرد، کە دەستدرێژی زۆریشیان کردۆتە سەر دایك و خوشکانیان! ئەو عەرەبە سوونیە شۆڤێنستانە لە بیریان چوو تا ئێستاش زیاتر لە ملیۆنیکیان لە کوردستان داڵدە دراون، و کورد هەردەم پەناگە بووە بۆ سەرکردەو وبنکردەیان.

سەرەڕای ئەو هەموو راستیەش قسەی عەرەبە شۆڤێنستەکان دووبارە دەکەیتەوە؟! گوایە ئەوە شەڕی کورد نیە تا بیکات؟! بە داعش بڵێ ئەوە شەڕی ئێوە نیە، بە ئاغاکانتان بڵێن بۆچی دەبێت شەڕی میللەتێك بکەین کە بەوپەڕی سینگفراوانی وتەسامحی ساویلکانە باوەشیان بۆمان کردۆتەوە، لە بازارەکانیش لەبەر خاتری ئێمە گۆرانی عەرەبی لێ دەدەن؟! لە جیاتی شەڕ بکەن لە دژی ئەوانەی دەیانکوژن و دەیانبڕن و دەستدرێژی دەکەنە سەر ناموسی ژن و بەڵکو پیاوەکانیشیان، دێن شەڕی

نەتەوەیەکی زامداری ئەنفال وهەڵەبجە و شەڕەکانیتری عەرەبی سوونەی شۆڤێنی دەکەن؟!
دیارە تۆ مادام دژی یەکێتی و پارتیت، پێت ئاساییە هەموو کوردستان بکەوێتە ژێر دەستی داعش، تا کچانی کورد وەك یەزیدیەکان بکەنە کەنیزەکی خۆیان؟! ئەوەیە شانازی کردنت بە باپیرەت سەلاحەدینی ئەیوبی، کە لە میهرەبانیدا هەموو مەسیحیەکانی سەردەمی خاچ پەرستیشی سەرسام کردبوو بە خۆی؟! لە جیاتی ئیدانەی ئەو هەموو کوشتارەی دەوڵەتی تیرۆرستی خەلافەت بکەیت لە دژی کورد، لە جیاتی ئامۆژگاری گەنجە فریوخواردەکانی کورد بکەیت شەڕ دژی میللەتە زامدارەکەیان نەکەن ونەبنە جاشی داعش، دەچیت ستایشی دەوڵەتی خەلافەت دەکەیت کە بەڕای تۆ تەئسیلی شەرعی بۆ کراوە و پشت دەبەستێتە سەر کیتاب وسوونە!
بەراستی زۆر باش وەسفی حاڵی خۆت کردوە لەو قسەیەی کە عەرەب بە گاڵتەیەکی نیمچە سەرسامیەوە وەسفی عینادی کوردی پێ دەکەن، دەڵێن: کە کورد گووتی نا یانی نا! دیارە تۆ وەك ستایشی خۆت بەکاری دەهینیت، ولەوە دەچێت لە بەرامبەر ئەو هەموو ئامۆژگاریانەی کە کراویت و دەکرێیت بڕیارت داوە بڵێیت: نا! ئێمەش دەڵێین: نا، نا! وادیارە تۆ دوا دەرفەتت لەدەست خۆتدا بۆ تەسالوح کردن لەگەڵ خۆت ومیللەت وخەڵکدا! من پێموایە تۆ یاریەکەی خۆرئاوات لە دڵدا خۆش هاتووە، میدیا و ناوبانگ و ماف پارێزرا و دەوڵەتی یاسا و کۆمەڵگایەکی کراوە و رۆشنبیر و هێمن، باوەڕناکەم نەزانیت ئەگەر بێیتەوە هیچ لەو شتانە چاوەڕێت ناکەن جگە لە پێچەوانەکەی نەبێت! وەك ئۆجەلان هەڕاج دەکرێیت! بۆیەش وا هەموو داوەکانی پەیوەندی خۆت لەگەڵ ئەو ئەگەرە دەپچڕێنیت شەعرەی معاویەش ناهێڵیتەوە!

٢٠١٥/٢/٥

سەرچاوە:

https://www.youtube.com/watch?v=LCW5iyJqtsA&app=desktop

# کتێب کەڵەکە کردن!
# لیستی کتێبەکانی مەلا کرێکار!

کتێب نووسین لای کەسانێك لە کۆمەڵگا نیمچە خوێندەوارەکان بۆتە پیشە، وچاکترین چەکە بۆ فریودانی خەڵکی ئاسایی و کۆلکە خوێندەوار و نەخوێندەواران. وای لێهاتووە چۆن بازرگانەکان وخەڵکی بە گشتی لە کۆڕ و دانیشتنەکانیان هەر باس باسی دەفتەری دۆلارە، ئاوا ئەوانیش شانازی بە ژمارەی کتێبەکانیان دەکەن! کە دێیت سەیری کتێبەکانی دەکەیت هەمووی جوینەوە و کۆپی پەیستی ئەم وئەوە، جاروبار تەنها وەرگێڕانە، کەچی ناوی لێناوە کتێب و شانازی پێوە دەکات و جاروبار چاپی دووەم وسێیەمیشی بۆ دەکرێت لەناو قەومی نەخوێندەواردا.

ئەو بوارانەی من خوێندنەوەم تێیدا کردوە، ئەگەر هەڵپەی کتێب بەرهەم هێنان بام، ئێستا بەلایەنی کەمەوە ٣٠ کتێبم لەو بازاڕەدا دەبوو! من بەر لە ڕوخانی بلۆکی سۆشیالستی کتێبێکی ڕەخنەیی زیاتر لە دوو سەد لاپەڕەم نووسیبوو لەسەر فەلسەفەی ماتریالیزمی دیالەکتیکی کە زادەی خوێندنەوەی زیاتر لە سی چل کتێبی ئەو بوارە بوو، کەمێك هەوڵم دا بۆ چاپکردنی دوایی کە نەمتوانی ئەرکە مادییەکەی بگرمە ئەستۆ وازم لێی هێنا، لە ماڵەوە بێ ناز کەوت لە ئەرشیفم، بلۆکی سۆشیالستیش رووخا کتێبەکەی من ڕووناکی نەدیت! لە دوای ئەوەشدا سەرەڕای ئەوەی نووسینم لە بواری توندڕەوی وسەلەفیزم، وفێمینیزم و خۆرئاوا ناسی و کوردایەتی وسیاسەت، لەبەر دووریم لە وڵات و نەبوونی خەمخۆران بەرهەمێکی زۆرم کە لە دەیان کتێب زیاتر دەبێت، لە سایتەکان و پێگەکانی ئینتەرنێت بڵاو بوونەتەوە، هەرباشە ئینتەرنیت وفەیسبووکیشیان داهێنا کە تەنها مینبەری کەسانێکی بێ پشتیوان و سەربەخۆن لە بیروباوەڕدا، دەنا بۆ هەتا هەتایی جوهد وتوانا وکۆششمان لەناو دەچوو.

ئەو قسەیە دەکەم بەبۆنەی بینینی لیستێك لەو کتێبانەی کە مەلا کرێکار لە زیندان نووسیویەتی کە ٦٥٠٠ لاپەڕن!! وەك خاوەنی ئەکاوەنتەکە دەڵێت: (زیاتر لە دوو هەزار لاپەڕەش هێشتا لای موخابەراتی نەرویجییە..!) من لە سۆنگەی ئەو موبالەغات و ستایشە زیادەڕۆییەی مەلا کرێکار وەک ڕۆشنبیرێك چاوەڕوانی ناونیشانی زۆر گەورەم دەکرد لە لیستی ئەو کتێبانە، بەڵام کە سەیری لیستەکەم کرد تووشی شۆك هاتم! بڵێی ئێمەش وەك ئەو عەوامە فریوی ڕۆشنبیریەتی ئەو پیاوەمان خوارد بێت؟! با چاوێك بە ناونیشانەکان بخشێنین:

سێزدە ١٣ کتێبی [٢٤٥٤] لاپەڕەی نووسیوە لەسەر نوێژ و زەکات و ڕۆژوو و حەج و نوێژی جەنازە و نوێژی جومعەو جەماعەت، و نوێژە سوونەتەکان، زەواج و تەڵاق و جیهاد و خۆراك و خواردنەوە و پۆشاك و جوانی!

١٤ کتێبی[١٧٢٠ لاپەڕە] ی نووسیوە لەسەر زانستە شەرعیەکانی وەك حوکمی و چۆنیەتی وەرگرتنی

زانستی شەرعی و ئادابی فێرخوازیی ئەمیرێتی و بەیعەت زەمینەی رابوون شەرحی ١٥ فەرمووده چوار روکنەکە دەوڵەتی ئیسلامیی قیەمی ئیسلامی پێنج روکنەکە بۆ دەسپێکی زانین و قورئان حەقیقەتێکی رەهایە، قیەمی ئیسلامی، ووشەکانی قورئان و فەرموودەوانیی، و ئادابی فەتوا و تەفسیر. یانی تا ئێستا ٤٢٧٤ لاپەڕەی هەر لە ناونیشانە کلاسیکیەکانی فیقهی ئیسلامی و زانستە شەرعیەکانە، نازانم چ داهێنانێکی تێدایە نووسین لە بارەی نوێژ و رۆژی و زەکات و فەتوا و ئەو شتانە، یان هەر کات کوشتنە و تەواو؟! دەبوایە لەو زیندانیە درێژە بە بیرکردنەوە و تێڕامانی وا گەیشتبا نەخشەڕیی ڕزگارکردنی خۆیی وگەنجانی دینداری کورد وموسڵمانانی دانابا، نەك لەگەڵ ئازادبوونی پشتگیری لە وەحشیەت گەلێکی وەك داعش بکات؟!

هەندێك لەو ناونیشانانە دەکرا بەر لەبەربوونی لە زیندان چاوەڕوانی بابەتێکی جیاوازی لێکرابایە وەك: دیدو رێ، و زەمینەی رابوون، و بژاری دەروون، ئەعرابێتی و دیدی مەلەکووتی، بەڵام پاش بەربوون و لە گوێگرتن لە چاوپێکەوتنەکانی، دەگەیتە ئەو دەرەنجامە تاڵەی کە مەلا کرێکاریش حەزی کتێب زۆری و بۆری جولاوە، تا ڕادەی وەك کابرایەکی [گردعازەبانی] هەبوو دەستی بۆ هەموو بابەتێك و زمانێک دەبرد بۆ فێرکردنی خەڵك، ڕۆژێك کتێبێکی دەردەکرد بە ناوی: چۆن فێری زمانی ئینگلیزی دەبیت، نازانم لە چەند ڕۆژ! بۆ بەیانی: چۆن فێری زمانی هیندی دەبیت، تورکی و فارسی هەتا دوایی، دوایێ زانیم کە خۆی هیچ لەو زمانانەش نازانێت! مەلا کرێکار لە نێوە لیستی کتێبەکانیدا هاتووە:

فێربوونی زمانی ئینگلیزیی! من ماستەرم هەیە لەو زمانە و ئیشرافی ماستەریشم کردوە لە زانکۆکانی بەریتانیا بیرم لەو ناونیشانە نەکردۆتەوە، دەبێت ئینگلیزیەکەی مەلا کرێکار چۆن بێت، کە من جاروبار گوێم لێیبوە کە لە ڤیدیۆکانی یەک دوو ڕستە قسە دەکات،ئاستی زانینی ئینگلیزی زۆر لە ژێر مام ناوەندیشە، دەبێت چۆن رووی بێت خەڵک فێری ئینگلیزی بکات؟! لەوەش کارەساتتر، ئەوەی من ئاگاداربم هەموو دادگاییەکانی بە وەرگێڕەوە دەکات کەچی گردعازەبانی ئاسا کتێبێکی نووسیوە بە ناونیشانی: فێربوونی زمانی نەرویجی!!! خۆزگە تەنها کتێبێکی نووسیبا لەسەر چۆنیەتی ڕزگاربوونی خۆیی و ئیسلام و موسڵمانان لەو تەنگژەیە قووڵەی توندڕەوی و خوێن بە هەدەرچوون وماڵوێرانی و سەرلێ شێواویەی کە تێیکەوتوون، بە دەست سەرشێتەکانی قاعیدە وئەنسار و نوسرە و بوکۆحەرام و داعش، ڤیرسیا لە فێربوونی نویژ و ڕۆژو وئادابی فەتوا و فێربوونی زمانی ئینگلیزیی و نەرویجی!!

٢٠١٥/٢/٢٦

لیستی کتێبەکان لەو سەرچاوەیە وەرگیراوە:

https://www.facebook.com/FatihKrekar/photos/a.285430204855410.66989.28541602152349 theater&5/1041228755942214/?type=1

# ئیسلام بەدەست موسڵمانە دۆڕاوەکان دەناڵێنی یان بە دەست مەلا و بانگخوازە توندڕەووەکان و شەیتانە کەڕەکان؟!

دەزانم ناوی میانرەویت بەدوی خۆت کەوتاندوە، و فرت بە میانڕەوی نیە، وەك کەناڵی دیموکراسی هەولێر کە دەڵێن تەنها داعشیەکانی دژی دیموکراسیەت وتاری لێ دەدەن! و لەو ڕێگایەوە سەدان و هەزاران ساویلکەی دیندار و سافیلکەت فریو داوە. دەزانم لە سایەی کەشیدەکەتەوە دەزگایەکی گەورە بە ناوی خێرخوازی بۆ مەرامی توندڕەوی ویارمەتی بڵاوکردنەوە فیکری توندرەو بەکار دەهێنیت. دەزانم دەیان و سەدان منداڵە هەژار لەو دەزگایە لەلایەن سەلەفیەکانی وەك سەرباز ومەلا ئیسماعیل سوسەیی فێری توندڕەوی و ڕقی نیشتیمان دەکرێن.
هەر ئەوەش ئەو مەتەڵەمان بۆ هەڵدەهێنێ کە تۆی میانرەو بۆ پەست بوویت بە کتێبێك لەسەر داعش و داعشبیرە هاوڕێکانت نووسراوە؟! دەچیت فشاری مەلاکان کۆ دەکەیتەوە بۆ قەدەغەکردنی کتێبێك کە بە دوور ونزیك بەلای تۆ تێنەپەڕیوە، چونکە هێشتا نۆرەت نەهاتبوو چاوپۆشیمان لێدەکردی! ئەگەر توانیت دەزگای ستاندارد بهێنیە ژێر فشاری دەروونی توندڕەو ونەگریسی خۆت و هاوڕێکانت، ئەوە باش بزانە ئەو کتێبەی [داعش] تازە لە دەیان سایتیتر بڵاودەکرێتەوە، هەر ئێستا لە سێ سایتە، و بەو زوانە کتێبیتریشی بەدوا دێت.
ئەوە تەنها لە مێشکی ڕزیوی تۆ و ئەمسالی تۆ، ئیسلام شەو و ڕۆژ موئامەرەی لەسەر دەکریت (بل مکرو اللیل والنهار)، دەنا ڕاستیەکەی ئەوەیە، ئیسلامی سیاسی و جیهادی و بانگخوازی شە وڕۆژ نەفرەت وجوێن و هەڕەشەی جیهاد کردن و میراتگیری زەوی بە گوێی جیهان دادەدات. لە مینبەری هیچ دینێك و لە هیچ بۆنەیەکی دینی گوێم لێ نەبووە لە کۆتایی خوتبە، وەك موسڵمان، هەزار نەفرەت وجوین و دوعای پیرەژنانە دژی مەسیحی وجولەکە و موشریك وهەموو دوژمنانی ئیسلام بکرێت!
هەڵبەتە دوژمنانی ئیسلامیش لەو فەرهەنگە سەقەتە دینیەدا هەموو ناموسڵمانێکە! ئومەتێکی لاواز و دواکەوتوو و خۆ خۆر و بێ ئسوڵ وبێ زانست و بێ هونەر وبێ پرنسیپ، سەرەڕای ئەوەش هەڕەشە لە سەرتاسەری جیهان دەکات! ئەگەر جهیانیش بە ناچاری بەربەرەکانێی کردن، بە کتێبێك، بە بەرنامەیەکی تیڤی، بە فیلمێك، بە کاریکاتێرێك، هاوارتان لێ هەڵدەستێت گوایە خەڵکی جیهان هەمووی دژی ئیسلامن! خەڵکی جیهان زۆر لە ئێوەی موسڵمانی توندڕەو و سەلەفی مەشرەب مرۆڤتر وبە بەزەیی ترن. تەسەور کە ئەو هێزەی لە دەستی ئیسڕائیل دایە، ئەگەر لە دەستی برا موسڵمانە جیهادیە داعشیەکانت با بزانە چۆن ئیسرائیلیان لەسەر نەخشە ڕەش کردبووەوە.
لای تۆ و کەسانی کلاسیکی توندڕەوی پەروەردەکراوی ئیسلامی عەرەبی،ئەگەر یەکیك، هەر کام لە قەناعەتە سەپاو و نەگۆڕە سەلەفیەکانی ئێوەی خستە بەرباس، وەك شێت وهار دەکەونە وێزەی گیانی، بۆیە هەزار ناو و ناتۆرە بۆ ئەو کەسە دروست دەکەن، ئەوکەسە دەبێتە دۆڕاوی گورەبانی سیاسی ، یان بانگخوازی، یان بۆ دنیا وپۆست وادەکات، یا بۆ دەرکەوتن یان هەر نەخۆشی دەروونی هەیە! لای تۆ سوونەت و فیقە و مێژوو موقەدەسن نابێت کەس باسیان بکات. نازانیت سێ بەشی نەهامەتی ئەو

ئومەتە و میللەتە لە ژوور سەری حەدیس وفیقە وتەفسیر دایە. ئەوە نەخۆشیە نەمری ونەگۆڕی بدەیتە ئەو شتانە کە جگە لە خوا هیچ شتیتر نەمر و نەگۆڕ نین.

نمونە بە شارستانی ئیسلامی دەهێنیتەوە و خۆتی پێ بادەدەیت ودەڵێیت "ئەوان لەسەردەمی خویاندا باشترین نمونەیان پیشکەش بەمروڤایەنی کرد ، بەشاهیدی روژ هەلات ناسەکان نەک موسلمانی دۆڕاو )!!!دۆڕاوی ئەوەیە هەردەم ڕۆژهەلاّتناسەکان. بکەیتە شاهێد! دەڵێیت: " ...... ئەوان سەدان زانکۆیان دانا ، مەنهەجی زانکوکانی ئەوروپا دوو سەد سال بوو لەسەر مەنهەجی موسلمانان دەرۆیشتن ..." قوتابخانەی توندڕەوی مەشرەب سەلەفی هەرگیز بۆی نییە شانازی بە شارستانیەک بکات کە هەموو هێما وزانا گەورەکانی وەك ئیبن سینا وفارابی وئیبن الهیثم و ابن رشد، ودەیان وسەدان زانای تری زانستی سروشتی تەکفیر بکات، و کیمیا بە زانستی کوفر وشیرك دابنێت وەك ئیبن تەیمیە وئەوانیتر.

ئەگەر ئێوە ئامادەن فشار دروستکەن بۆ قەدەغەکردنی کتێبی داعش لەسەر سایتێك؛ ئەی چیتان کردوە بۆ ئیدانەکردن و سەرکۆنەکردنی داعش کە نیشتمانی کوردانیان خستۆتە ژێر گەورەترین هەڕەشە،و هەزاران کەسیان کوشتوە و ناموسی هەزاران کوردیان بردوە؟ چتان گوتوە وەك میانرەوێك بەرامبەر ئەو بانگخواز ومەلایانەی هاوڕێت کە بە ئاشکرا بەرەی پێشمەرگە بە کوفر وبەرەی داعش بە ئیمان دادەنێن؟! من مەترسیم بۆسەر ئەو میللەتە یان ئەو مەلا وبانگخوازە داعشبیرانە؟! یان. ئەو منداڵە بەستەزمانانەی ژەهراویان دەکەیت لە دەزگای ڕووناکی بەناو خێرخوازی؟! دەبێت کتێبی من قەدەغە بکریت یان کارەکانی تۆ و وتار وڤیدیۆکانی ئەو داعشبیرانە؟!

کێ ئیسلامی شێواندوە ئێمە یان ئەو داعشانە؟ ئەی چ کارێکتان کردوە بۆ ئەوەی داعش و ئەو بیرەی داعش بەرهەم ئەهێنێت کەسێتیی پێغەمبەریش ناشیرین نەکەن؟ چیتان کردوە بۆ ڕەتدانەوە وهەڵوەشاندنەوەی بەڵگە فیقهی و شەرعیەکانی داعش و بۆ سەرلەنوێ داڕشتنەوەی عەقڵی ئیسلامی تەبا لەگەل سەردەمدا؟ چیتان کردوە بۆ ئەوەی گەنجی کورد نەبێتە داعش و هاوسۆزی داعش و هاوشێوەکانی نەبێت؟ چتان کردوە جگە لە دانانەوەی گەرای داعشیەت لە پەنا کاری خێرخوازی و قەدەغەکردنی کتێبی من، کە ئاگاداری کورد دەکاتەوە لە مەترسی داعش؟!

مەلای میانڕەو ماڵەکەی خۆت بێ کاریتەیە ولاوازە، خوادەزانێت ئێوە لە غیابی نەبوونی دەسەلاّتێکی گێل ودەبەنگ هەزار کاری ناشەرعی بەناوی ئیسلام و خێرخوازی دەکەن، خۆرئاوا زوو زانی ٩٩٪ ئەو دەزگا خێرخوازیانە سەرچاوەی سەرەکی توندڕەوی و تیرۆرن لە جیهانی ئیسلامی، بۆیە هەر زوو بە زوو چاودێری کردن و دایخستن، خوادەزانێ تۆش لەپەنا ئەو دەزگایە خێرخوازیە چی و چیتر دەکەیت. چونکە لە بەرگریت لە بانگخواز ومەلا داعشبیرەکان دەردەکەوێت هەوا و ئارەزووت ڕوەو کێندەرێیە!

ئیسلام بەدەست ئەو موسلمانە ناناڵێنێت کە شوبهەی تیرۆر و شەڕانگێزی و نا ئینسانیەتی لێ دووردەکەوێننەوە، بەڵکو بە دەست مەلا و بانگخوازە توندرەوەکان دەناڵێنێت کە ئیسلامیان هێندە درێو و ناشیرین و شەڕانگێز کردوە خراپتر لە خودی شەیتان ودزێوتریش لەو. ئیسلام بەدەست ئەو بەناو میانرەوانە دەناڵێنیت کە شەڕی میانرەوانی دژی داعش دەکەن و لە ئاست داعش و داعشبیرەکانیش شەیتانی ئەخرەس وکەڕن!!

٢٠١٥/٧/١١

# ئایە هیجرەتی گەنجان حەڕامە وەك مەلا لەتیفی سەلەفی دەڵێت؟!

کێشەی ئەو سەلەفیانە ئەوەیە لە کاتێکدا هەموو دنیات لێ وێران دەکەن و لە هەر جێگایەك بن خەڵك ناچار دەکەن تەنها لەگەڵ بیری مەرگ و مردن و عەزابی قەبر بژین، و جاڕی شەڕکردن دەدەن دژی هەموو نەیارە موسڵمانەکان و غەیری موسڵمانەکانیان، کاتێك خەڵک بەگشتی لە دەستیان ڕادەکەن و سەریان هەڵدەگرن وەك ئەوەی ئێستا دەگوزەرێت لە سوریا، یان لە دژی دەسەڵاتی گەندەڵ گەنجانێکی بەدبەخت و بێ ئایندە ڕێگای ترسناکی دوور و درێژ دەگرنە بەر، تا دەگەنە جێی مەبەست چەندین جار دەگەنە لێواری مەرگ هێشتا لێیان ناگەڕێن لە جیاتی ئاواتی خێریان بۆ بخوازن، دێن دەیان خوتبە و وتاریان بۆ دەدەن بۆ ساردکردنەوەیان و ترساندنیان بە کافر بوون!

نازانم مەلا عەبدولەتیف و سەلەفیەکانیتر ئەو هەموو گەنجەیان بۆچیە لە کوردستان، بەس نییە گۆڕەپانیان بۆ چۆڵ کردوون و ڕۆیشتن سەریان هەڵگرت؟! باشە ئەگەر قسەی سەلەفیەکان هێندە جیدییە، بۆ گەنجێکی زۆری سەلەفی کورد وعەرەب و نەتەوەکانیتریش ئەوروپایان تەنیوەتەوە؟ بۆ دەیەها بانگخواز ومەلای سەلەفی لە نیوان موشریکاندا ئیقامەیان وەرگرتووە؟!

هەمووشی خەریکی ڕاوە پارە ودۆلارن و هەر خەریکی هیدایەتدانی ئافرەتی جوانی ئەورووپین بۆ ئەوەی بیانهێنن!

من زۆرم پێ ناخۆشە ئەو هەموو گەنجانەمان کوردستان بەجێدەهێڵن لەو هەل ومەرجە ناسکە بەڵام هیچ ڕووم نییە داوایان لێبکەم دەرنەچن. چونکە بەدیلم بۆیان نییە، دەسەڵاتێك تا سەرئێسقان کەوتۆتە ناو گەندەڵی و دژی و فەرامۆشکردنی گەنجان، گەنج چی بکات لەوێ؟ یان دەبێت ببێتە چەتەی حزبێکی دەسەڵات، یان چەك هەڵگرێت لە دژی ئەو دەسەڵاتە یانیش بڕوات سەری هەڵگرێت.

مەلا لە تیف لە خوتبەیەکدا ئەو حەدیسە دەهێنێتەوە لە دژی گەنجانی کۆچ کردوو:
فقد روى أبو داود والترمذي والنسائي عن جرير رضي الله عنه أن النبي صلى الله عليه وسلم بعث سارية إلى خثعم، فاعتصم ناس بالسجود فأسرع فيهم القتل، فبلغ ذلك النبي صلى الله عليه وسلم فأمرهم بنصف العقل، وقال " أنا بريء من كل مسلم يقيم بين أظهر المشركين، قالوا: يا رسول الله ولم؟ قال: لا ترايا ناراهما "

دەڵێت: پێغەمبەر سریەکی ناردە سەر هۆزی خەسعەم [بە سەرکردایەتی خالیدی کوری وەلید، وەک لە ریوایاتی تر هاتووە] خەڵکانێك کە لەشکرەکەیان دیت سوژدەیان برد بۆ خۆپاراستن، بەڵام خالید تێیان کەوت بە کوشتن، ئەوەش گەیشتەوە پێغەمبەر د.خ، فەرمانی کرد بە نیوەی خوێنبایی بۆ خاوەن کوژراوەکان وگووتی: من بەریمە لە هەر موسڵمانێك لە نێو موشریکاندا نیشتەجێیە، گووتیان بۆ؟ گووتی: با ئاگرەکانیان لێك دیار نەبن.

جارێ ئەو حەدیسە بە جیاوازی ڕیوایەتەکانی بەپێی سنعەتی ئەهلی حەدیس منقطع وپچراو و مرسل و دەیان کێشە لە مەتن وسەنەدی هەیە.

دووەم هەتا گووتمان ڕاستیش بێت، ئەو حەدیسە لە حالەتی شەڕ وجەنگدا گوتراوە لە نیوان موسلمانان و خەڵکانیتری ناموسڵمان، کاتێ هێرشیان بۆ دەکەن لیکیان جیاناکەنەوە! گووتنی ئەو حەدیسە لەو زروفەدا هیچ پەیوەندی بە واقیعەوە نییە. چونکە نە دەوڵەتی ئیسلامی هەیە لە شەڕدا بێت لەگەڵ ئەوروپا و خۆرئاوا، نە هیچ وڵاتێکی ئیسلامی بە سعودیەوەش لە شەڕدایە دژی خۆرئاوا، تەنها ئەگەر مەلا لەتیف داعشی پێ خەلافەتی شەرعی بێت، چونکە تەنها خزمەت بە پلانی تەقاندنەوەکانی داعش دەکات ئەو قسانە! جا خۆ داعش تا یەکێك لە ئەوروپا دەکوژێت، بە هەزاران کەس لە وڵاتانی ئیسلامی دەکوژێت! یانی خەڵك هەر بۆ حیفز و پاراستنی نەفسی خۆی زۆرچاکترە لە ئەوروپا بێت تا لە سوریا و عێراق و تورکیا و تونس و لیبیا و ئەفغانستان وسۆماڵ ومیسر وهتد.

ئینجا ئەگەر ڕاست دەکەن ئەو هەموو سەلەفیەی سعودیە وخەلیج و میللەتانی تر بگەڕێننەوە بۆ زەوی موبارەکتان، ئینجا داوا لە گەنجانی بەدبەخت بکەن بگەڕێنەوە و هەڕەشەی کافر بوون و بەری بوونی پیغەمبەریان لێ بکەن.

داخی گرانم ئەو وڵاتانەی ئێمە بەدەستی ئەو سەلەفیانە و گەندەڵە بەناو عەلمانیەکان کاول دەکرێت، و گەنجان وخەڵك ناچار دەکەن باربکەن، گەنجی سەلەفیش کەم وادەبێت دەرچێت، یانی شەقام دەکەوێتە دەستی ئەوان، چونکە سەلەفیەکانی ئەوروپا زۆربەیان بە دەستی بانگخوازە سەلەفیەکان و ئینتەرنێت بونەتە سەلەفی، لێرە دەریان دەکەن بە توندوتیژی کرداری وگوتاری، لەوێش لێیان ناگەڕێن هەر خەریکی چرپاندنی وتاری کەڕاهیەتت بە گوێیاندا، ژیانیان لە هەزاران گەنج تێکداوە لەو هەندەرانەش.

ئەوانە چ بەڵایەکن بۆ گیانی بەشەریەت؟!

محەمەد هەریری

٢٠١٥/٩/٨

# هەولێر و دینداری
# مەلا سوسەیی وەك نمونە

بەداخەوە ئەمرۆ دەسەڵاتی کوردی هێندە ڕەزا قورس بووە لەناو خەڵك وای لێهاتوە ئەگەر کارێکی چاکیش بکات کەسانێکی ناحەز بەو دەسەڵاتە ئەگەر ڕەخنەی لێبگرێت یان جوێنیشی پێبدات خەڵک گوێی بۆ رادەگرێت، جا با ئەو رەخنانە هەرچیەک بن و لە دەمی هەر کەسێک بێنە دەر. بۆ نمونە کەسانێک بەناوی ئۆپۆزسیۆن هەندێ جار تەپڵ بۆ خۆفرۆشانیش لێدەدەن تەنها ئەگەر رەخنەیان هەبێت لە دەسەڵاتدا، بۆ نمونە عبد الستار طاهر شریف، من لە منداڵیەوە ناوی ئەو کەسەم دەبیست وەک خۆفرۆشیک و سەرۆکی حزبێکی کارتۆنی، کەچی بەو دوا دوایەی تەمەنی خەریک بوو لێمانی بکەنە گیڤارا!!

هەولێر و دینداری دوانەیەکی سیامین لێک جودابونەوەیان ئەستەمە لەبەر ئەو رۆڵە مێژووییەی هەولێر یاریکردوە لە دین پەروەریدا، بێگومان ئەو ئەدگارەشە زیاتر هەولێری جوانتر و میهرەبانتر و ڕێزدارتر کردوە لای خەڵکی کوردستان و ئەو شارەی وەک ئەشکەوتەکەی هەزار ویەک شەوە لێکردوە ئەوەی بێتە ناوی تیایدا ون دەبێت ودەبێتە خەلکی شارەکە. بەڵام زۆر بەداخەوە ئەو سروشتە دیندارەی هەولێر لەلایەن هەندێ مەلا زۆر بەخراپی ئیستغلال کراوە دێن ودەیانەوێت هەموو بیرورا توند وخورافات وشازەکانی خۆیان بەسەر ئەو شارە بسەپێنن، وەتوانیشیانە برەو بەزۆر بیرورای توند و شاز بدەن و خەلکیش لەبەر متمانەیان بە مەلا و دینداران بێ دڵ لە دڵدان لێیان وەردەگرن، هەر ئەوەش بەداخەوە وایکردوە ئەمرۆ جڵەوی سیاسەتکردن و ئۆپۆزسیۆن بوون بکەوێتە دەستی چەند مەلایەک لە هەولێر، کە وانیشانی خەڵک دەدەن کە توێژی بلیمەتی هەولێر کەسی تێدا نییە لە مەلا بەولاوە.

گومانی تێدا نییە کە مامۆستایانی هەولێر رۆلێکی خێرخوازی چاک دەبینن لە بەرگرتن لە گەندەڵی و پاراستنی بەها بەرزەکانی کۆمەڵی کوردەواری، بەڵام بەداخەوە ئەو مەلایانەشی کە وتاریان هێشتا لە ئاستی گەشەکردنی کۆمەڵگاکە نین ژمارەیان کەم نییە.

بەو دواییە مەلا ئیسماعیل سوسەیی - کەمن لێرەدا تا سەر ئێسقان دژی دەستگیر کردنیم، بەڵام تا سەر ئێسقانیش دژی لێدوانەکانیم- لە وتارێکدا زۆر بە توندی بەرەنگاری هەردو حزبەکەی دەسەلات و پەرلەمان و خودی سەرۆک دەبێتەوە گوایە لەسەر دین و شەرەف و ناموس بە شێوازێکی زۆر عاتیفیانە دەیەوێت وا نیشانی خەلک بدات یاسای ژمارە ٨ سالی ٢٠١١ بەناوی (یاسای بەرەنگاربوونەوەی خێزان لە توندوتیژی لە هەرێمی کوردستان)، دژە شەرەف و ناموس و دینە وەتا یاساکانی بەشێوەیەکی تەمسیلی عەنتیکە نیشانی خەڵکی دەدا و نمونە هێنانەوەکانیشی هەموی لە دژی رەگەزی مێینە بوو و ئەو شێوازەش خۆی لە خۆیدا هاندانی خەڵکانێکی سادە و ساویلکەی مزگەوتەکان بوو بۆ زیاتر

بەکارهێنانی توندوتیژی لەگەڵ رەگەزی مێینە، بۆ نمونە دەیگوت ئەگەر کچەکەم سبەینێ لە پێس چاومان تەلەفۆنی عاشقایەتی کرد دەبی هیچی لێنەکەم و لە حەیفان یان ئینتیحار کەم یان...یان ئەوەندە بە گەرمی دژی قەدەغە کردنی خەتەنەی مێینە بوو دەتگوت دیفاع لە ئایەتێکی ڕاشکاوی قورئان دەکات، لە هەموشیان کارەساتتر بەرگری لە لێدانی ژن دەکرد بە شێوەیەک هەتا زانا و موفەسیرانی بەراییش زاتی ئەوەیان نەکردوە.

لەڕاستیدا دەتوانین بڵێین ئەگەر پەرلەمانی کوردستان لە نێو هەموو کارەکانیدا بە چاک و خەرابیەوە چاکترین کارێک کردبێتی ئەوە یاسای ژمارە ٨ ە،کە ئەگەر نیوەشی بێتە جێبەجێ کردن زۆر لەو کێشە کۆمەڵایەتیانەی کە هەن چارەسەر دەبن کێشەی وەک کوشتنی منداڵێکی وەک ئەیوبی پێنج بەهارە یان کێشەی ئەو کچە بێتاوانەی کە بەناوی شیرین چیرۆکی دڵتەزێنی خۆی لە سایتەکاندا بۆ گێڕاینەوە یان روداوی ئەو گەنجەی سلێمانی کە باوک و دایک و خوشکی خۆی کوشت!! گرفتی مەلا سوسەیی و ئەمسالی ئەو ئەوەیە نازانن بەو ئاراستە کردنەی دژ بە ئافرەتان زۆربەی زۆری ئافرەتان دەکەنە دوژمن و ناحەزی دین و پیاوگەلێکی دینداری فەرهەنگ سنورداریش زیاتر دەکەن بە گژ ئافرەتان کە ئەساسەن دوچاری دزێوترین توندوتیژی جەستەیی و دەروونی دەبنەوە لە کۆمەڵگای کوردیدا.

یاساکە زۆر خالی جوان وبەرزی تێدایە کە مەلا سوسەیی لەسەریان بازیدا و تەنها یەخەی خەتەنە و لێدانی ئافرەت و منداڵانی گرت وەک بڵێی ئیسلام تەنها لێدان و ئیهانەی پێیە بۆ ئافرەتان و منداڵان. گەورە موفەسیرێکی وەک تەبەری لە پێش نزیکەی هەزار ساڵدا کەباسی تەفسیری (وَاللاَّتِـي تَخَافُـونَ نُشُـوزَهُنَّ فَعِظُوهُـنَّ وَاهْجُرُوهُـنَّ فِـي الْمَضَاجِـعِ وَاضْرِبُوهُـنَّ) لەو سەردەمەدا هێندە هەستیارانە ومورِاعات ئاسایانە باسی دەکات دەیان ریوایەت دەهێنێتەوە بۆ بەلاوەکی کردنی لێدانەکە و سەد شەرت و شروتی بۆ دادەنێت ئینجا کە باسی لێدانەکەش دەکات دەیسەلمێنێت کە لێدانەکە بە مانای وشە لێدان نییە بەلکو رەفتارێکی دەرونییە دەنا چۆن لێدان بە سیواکێکی چەند گرامی مانای لێدان دەهێنێتە دی؟!!!

"حدثنا إبراهيم بن سعيد الجوهري، قال: ثنا ابن عيينة، عن ابن جريج، عن عطاء، قال: قلت لابن عباس: ما الضرب غير المبرح؟ قال: بالسواك ونحوه."

لە عەتاوە گوتی پرسیارم لە ابن عباس کرد: لێدانی سوک چییە؟! گوتی: بە سیواک و هاوشێوەکانی..

دەربارەی خەتەنەکردنی مێینەش کە مەلا سوسەیی شەری مان و نەمانی لەسەر دەکرد، ئەوە لە قورئاندا هەر باسیشی لێنەکراوە و لە حەدیسیشدا ئەوەی هاتوە ئاراستەی دەمی لە نێرە، جگە لە چەندین حەدیسی لاوازداو لە سیرەشدا یەک بەڵگە نییە کە پێغەمبەر a هیچ یەکێک لە کچەکانی خەتەنە کردبێت، ئەوەشی دەڵێت پێغەمبەر لە روی نەهاتوە باسی بکات وەک چۆن بەرچاوم کەوتوە، ئەوە ئەو سەختگیرە نە لە ئیسلام و نە لە پێغەمبەر باش تینەگەیشتوە. لەوەش سەیرتر خەتەنەکردنی مێینە لە مەنزڵگای وەحیشدا (دورگەی عەرەب و سعودیەش) بوونی نییە ئەو وڵاتەی کە فقهاکان عمل اهل المدینة (کاری خەلکی مەدینە) بە سەرچاوەیەکی شەریعەت دادەنێن، ئەو هەموو هەقیقەتە پشتگوێ

بخەین هەر لەبەر خاتری قەولێک لە کتێبێکی مەزهەبێکدا و هەموو ئافرەتانمان لە پێناویدا سەقەت بکەین، با ئەو قەولە نەک هی شوێن کەوتەکانی شافیعی بێت با هی خودی شافیعیش بێت؟!

بێگومان خەتەنەکردنی مێینە چەند جۆرێکی هەیە هەرە باشەکەی سەقەتکردنی جەستەی مێینەیە (Female genital Mutilation) بە مانای وشە و دەتوانین سەدان زیانی خەتەنەکردنی مێینە بژمێرین هەتا شێخ یوسفی قەرەزاوی لە سالی ٢٠٠٩ فەتوایەکی دەرکرد بە پشت بەستن بە ئەنجام گەلێکی چەندین توێژینەوەی زانستی کە کەسانی متمانەدار پێی هەستا بوون کەوا خەتەنەکردنی مێینە نە فەرزێکە تا جێبەجێ بکرێت و سەرباری زیان بەخشیشە بە ئێستا و دوارۆژی ئافرەتان.

شێخ قەرەزاوی لە فەتواکەیدا ئاماژەی بەوە کرد کە سکالاْ و دادی ئافرەتانی خەتەنەکراو زۆر بوە ،دەنالێنن بە کاریگەری نێگەتیڤی ئەو خەتەنەکردنە بەسەر ژیانی هاوسەریان بۆیە شێخ یوسفی قەرەزاوی دەگاتە ئەو دەرەنجامەی" بۆیە منیش دەنگم دەخەمە پاڵ ئەوانەی دەڵێن هیچ پاکانەیەک لە گۆڕێدا نییە تا بەردەوام بین لەو عادەتە (واتە خەتەنەکردنی مێینە) لە ئیسلامیشدا هیچ بەڵگەیەکمان نییە نە لە قورئان و نە لە سونە و نە لە ئیجماع و نە لە قیاس ونە لە مەسڵەحەت کە وامان لێبکات دەستبگرین بەو عادەتەوە، بە پێچەوانەوە هەموو بەڵگە شەرعی و واقیعیەکان هانمان دەدات ئەو عادەتە (واتە خەتەنەکردنی مێینە) قەدەغە بکەین، بۆیە من فەتوا دەدەم بە قەدەغە کردنی ئەو عادەتە لە پیناو سەلامەتی ژن و کچانی موسڵمان و منداڵی موسڵمان و پاراستنی لە هەر زیانیک.

"ولذلك أنضم إلى الذين يقولون بأنه ليس هناك أي مبرر لاستمرار هذه العادة ولايوجد عندنا من أدلة في الإسلام: من القرآن ولا من السنة ولا من الإجماع ولا من القياس ولا من المصلحة، لا يوجد عندنا أي دليل يدعونا إلى أن نتمسك بهذه العادة، بل كل الأدلة الشرعية والواقعية تنادينا أن نمنع هذا الأمر... ولهذا أفتي بمنع هذه العادة حرصا على سلامة المرأة المسلمة والفتاة المسلمة، والطفلة المسلمة، وحمايتها من أي أذى"

کەوا بوو قەدەغە کردنەکە لەلایەن گەورەترین فەقیهی هاوچەرخدا هاتوە نەک لە کۆنگرەی جولەکەکان لە پەکین وەک مەلا سوسەیی ئاماژەی پێدەکرد.

خۆزگە ئەو خۆ شین و مۆرکردنەوەی مەلا سوسەیی لە پێناو بابەتێکی گەورەتر و گرنگتر بوایە نەک لە پێناو خەتەنەکردنی مێینە ولێدانی ئافرەت و منداڵاندا، چونکە مردن بۆ مردنیش دەگۆڕێت وەک چۆن گیران بۆ گیرانیش دەگۆرێت.

خۆزگە خەڵکی شارەکەشم دینداریەکی هۆشیارانەتری مومارەسە کردبا نەک هەر رۆژەی مەلایەک فریویاندا.

٢٠١١/٨/٣٠

# ئەلفازە نابیەکانی مەلا عومەری سەلەفی

زۆر دەمێکە ئێمە وخەڵکێکی زۆریش سەرنجی ئەوەمان داوە مەلا عومەری سەلەفی سابقا وچنگیانی حالیا یەک زەرە ئەدەبی حیوار وقسەکردن ڕەچاو ناکات لە لێدوانەکانی، و زۆر بێ پەردە سەدان (الفاظ نابیة) وئەلفازی جینسی بێ پەردە وتا ڕادەی ناوهێنانی ئەندامی زاوزێی دەردەبڕێت لە کۆڕ وبەرنامەی وا کە نە پێویست دەکات بەو ڕوتیە بگوترێت نە شوێنەکە وا دەخوازێت.

کە باسی مەلا عومەر سەلەفی دەبێت باسی گۆڕانیش دەکرێت خەڵکانێک تاوانباری دەکەن بە گۆڕان، گۆڕانیش وەک حالەتێکی مرۆڤانە هیچ تاوانێکی تێدا نییە، بەڵام گۆڕان ئەگەر بە گەشتێکی فیکریدا ڕوبدات وبێ هیچ پاڵنەرێکی مادی وپلە وپایەیی ئەوە پیرۆزە وجێگای ڕێزە، بەڕای من گۆڕانەکەی عومەر سەلەفی تەنها خۆی لە نزیک بوونەوە لە بازنەی دەسەڵات دەبینێتەوە نەک گۆڕانێکی فیکری وڕیشەیی لە فیکری سەلەفیدا، ئەو فیکرەی ئەگەر سەد شۆڕشی فیکریشی تێدا بکرێت هێشتا هێندەی بۆچۆنی سەقەت ونامرۆڤانەی تێدا دەمینێتەوە تا بەشی سەد شۆڕشی تر بکات.

هەرچۆنێکی بێت ئەگەر مەلا عومەری سەلەفی لەو حاڵەشیدا بێت چاکترە لە حاڵەتی پێشووی، چونکە من گومانم نییە کە بە بیروبۆچونەکانی ڕابردووی هەزاران گەنجی کوردی بەرەو ئەو سەلەفیەتە سعودییە سەقەتە بردوە، هەرنەبێ ئێستا لەترسی دەسەڵات وئیمتیازاتەکانی ناوێرێت هەموو شتێک دەربڕێت، دەنا سەلەفیەتی سعودی وخەلیجی وەک ئاژەڵێک دەڕواننە ئافرەت ومافی سەیارە لێخوڕینیشیان پێ ڕەوا نابینن کەچی ئەو مەلا عومەری سەلەفیە لە بەرنامەیەکی کەناڵ ٤ خۆی لێکردبوینە یەکەم داکۆکیکاری مافی ئافرەت، وهێندەی بە شان وباڵای خۆی هەڵدا دەتوت فێمنیستێکی بە سمێڵ وڕیشە! ئینجا بەوەندەش نەدەوەستا زۆر ساویلکانە کەوتبوە داوی پڕوپاگەندەکانی فێمەنیستە کوردەکان گوایە کورد دڕندەترین میللەتن بەرامبەر ئافرەت!! کەچی من وکەسانێکی تریش کاتی خۆی گوێمان لە کەسانێکی دەوروبەری دەبوو کە بە گاڵتە دەیگوت هەرای داکۆکیکاران بۆ (مافی ئافرەتە) (ما فی المرڕە) بە مانا عەرەبیەکەی نەک بۆ خودی ئافرەت!

ڕاستە کتێبەکانی شەرع وفیقە بە ڕاشکاوانە باسە جینسیەکان دەکەن، بەڵام نەک تۆ میوانی دەیان ئافرەتی تازە پێگەیشتو وگۆرانی بێژێکی ئافرەت بیت کەچی بەو پەڕی جورئەتەوە بۆ سەلماندنی شتێک قسەیەکی وا بێ شەرمانە بکەیت گوایە ڕاڤەی حەدیسێک دەکەیت، ئەویش باسی ئەو حەدیسەیە کە ئافرەتێک داوای تەڵاق دەکات لە مێردەکەی لەبەر نەبوونی توانای پیاوەتی پیاوەکە، کەچی مەلا عومەری سەلەفی هاتو زۆر بوێرانە لەبەردەم ئەو هەموو ئافرەتە تازە پێگەیشتوانە دەڵێت: ژنەکە وتی بۆیە داوای تەڵاق دەکەم چونکە بەشم ناکات؟!!! لە هەمووی خۆشتر بەر لە گوتنی ئەو دەربڕینە ناشرینە دەڵێت لە پێناو دینی خوا ئەو قسەیە دەکەم!! ئەگەر لە پێناو خوا بوایە دەیتوانی وەک ئافرەتەکەی حەدیسەکە

گوزاریشی لێبکردایە یان بە شێوەی قورئان کینایەت وئاماژەی پێبکردایە، نەک بەو شێوەیە بازاڕییە وەک بڵێی هەموو کێشەی ئافرەتان لە کوردستان لە ناگونجاوی ئەندامی نێرینەی پیاوان چڕ دەبێتەوە. لەڕاستیشدا ئەو حەدیسەی کە مەلا عومەر باسی کرد دوو حەدیسی بەناوبانگن هیچ کامێکیان واناڵێن بەڵکو مەلا عومەری سەلەفی لێکدانەوەی بێتامانەی خۆی باسکرد نەک دەقی حەدیسەکە. بەڵام ئێمە وخەڵکێکی زۆریش لە کوردستان سەرنجی ئەوەمان داوە کە ئەو پیاوە وەک مەیلی نەخۆشیەکی دەروونی چێژ لە دەربڕینی وشە ودەستەواژەی سێکسی دەکات، تا ڕادەی ئەوەی ناتوانیت سەیری کەیت لە حزوری خێزانی خۆشت چ جای میوانیشت هەبێت و ئافرەتیانیش تێدا بێت. دوو حەدیسەکەش بەو شێوەیە: فی حديث رواه البخاري، قال : «جَاءَتِ امْرَأَةُ ثَابِتِ بْنِ قَيْسِ بْنِ شَمَّاسٍ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ يَا رَسُولَ اللهِ مَا أَنْقِمُ عَلَى ثَابِتٍ فِي دِينٍ وَلَا خُلُقٍ إِلَّا أَنِّي أَخَافُ الْكُفْرَ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَتَرُدِّينَ عَلَيْهِ حَدِيقَتَهُ فَقَالَتْ نَعَمْ فَرَدَّتْ عَلَيْهِ وَأَمَرَهُ فَفَارَقَهَا» وفي روايه : فقال له : " اقبل الحديقه وطلقها تطليقة...... ".

ئەگەر مەلا عومەری سەلەفی مەبەستی ئەو حەدیسە بێت ئەوە هیچ باسی (بەشم ناکات) ناکات، بەڵکو ئافرەتەکە بەو پەڕی ئەدەبەوە دەستەواژەیەکی گشتی بەکار دەهێنێت ودەڵێت: (من هیچ ڕەخنەم لە دین وڕەوشتی نییە بەڵام ڕقم لە کوفرکردنە لە ناو ئیسلامدا!!) ئەوەش ئاماژەیە بۆ بەرگە نەگرتنی ئافرەتەکەیە لە هاوژیانی لەگەڵ پیاوەکەی، دەکرێت ئاماژەکەی سێکسیانەش لێکنەدرێتەوە چونکە ئاماژەیەکی ڕاشکاوانەی تێدا نییە.. ئەگەر باسی حەدیسی دوەمیش دەکات کە دەڵێت: " عن عائشة أنها قالت :جاءَت امرأة رفاعة القُرظي إلى رسول الله صَلَّى الله عليه وسلم فقالت :يا رسول الله، إني كنت عند رفاعة القُرَظِيَ فطلقني فَبَتَّ طلاقي، فتزوجت عبد الرحمن بن الزَّبير، وإنَّ مَا معه مِثْلُ هُدْبة الثوب. فتبسم رسول الله صَلَّى الله عليه وسلم وقال" :أَتُرِيْدِيْنَ أَنْ تَرْجِعِي إِلَى رِفَاعَةَ؟ لاَ، حَتَّى تَذُوقِي عُسَيْلَتَهُ وَيَذُوْقَ عُسَيْلَتَكِ. (*)". لەو حەدیسەش وەک دیارە ئافرەتەکە کینایەت دەکات بۆ لاوازی یان نەبوونی توانای پیاوەتی بە گوزارشی (هدبە الثوب) ماناشی وەک پەڕۆیەکی نەدرواوە، ئینجا دەکرێت ئەو حەدیسە وەک ابن قودامە لە (المغني) ڕاڤەی بۆ بکرێت کە دەڵێت: (إن المرأة إذا كرهت زوجها لخلقه او خلقه او دينه او كبره او ضعفه او نحو ذلك وخشيت الا تؤدي حق الله في طاعته جاز لها ان تخالعه بعوض تفتدي به نفسها منه)

واتە (ئافرەت ئەگەر حەزی لە پیاوەکەی نەکرد لەبەر شێوەی یان ڕەوشتی یان دینی یان تەمەن زۆری یان لاوازی یان هەرشتێکی لەو بابەتە وترسا کە نەتوانێ هەقی خوا جێبەجێ بکات لە بەخشینی مافی پیاوەکە بەسەری دەتوانێت خەلعی بکات بە بەرامبەرێک) ئەو قسەیە جوانە لە کوێ کە لە کتێب نوسراوە وبۆ کەسانێکی کەم وپسپۆر و قسە بێ پەردەکەی مەلا عومەری سەلەفی لە کوێ کە بۆ خەڵکی گشتی دەیکات ولەناو کیژۆڵان!!؟

٢٠١٠/١/٩

# لە چاوەڕێی بلیمەتیەکانی هاوڕێ وڕۆژەکانی دەجال دا!!!

## بەشی یەکەم

من دەمێکە موتابەعەی قسەو گفتوگۆکانی مامۆستا هاوڕێ دەکەم وئەسەف دەکێشم کە ئەو برادەرە چۆتە ناو ئەو ڕۆڵە سادە وئاسان وتلیاک بەخشینەوەیەدا لەکاتێکدا سەدان کێشە وگرفتی زۆر گرنگتر وپێویست تر لە کوردستاندا بوونی هەیە وپێویستی بە سەدان کەسی وەک هاوڕێ هەیە بۆ بەرەنگار بوونەوەیان ودیتنەوەی یان گەڕان بەدوای چارەسەردا. ناسینی من بۆ کاک هاوڕێ دەگەڕێتەوە بۆ سالآنی هەشتا وسەردەمی خوێندنی زانکۆ، کاک هاوڕێ لەو سەردەمە کە جاروبار دەمدیت کەسێکی هەردەم دەم بە خەندە ونوکتەچی وڕوخۆش، بەلآم ئەو کاتە لە بیرمە زۆر بەدوای ئەو بابەتانە دەگەڕا کە وروژێنەر بوون، تەنها عەیبێکی کاک هاوڕێ ئەو کاتە ئەوە بوو وایدەزانی تەنها خۆی شت دەخوێنێتەوە وخەڵکی تر هەمووی حەی ئەڵلا بەدوای ئیسلام کەوتون، بۆیە خوێندنەوەی هەر کتێبێکی نوێ لەلای کاک هاوڕێ حەدەسێک بوو بۆ خۆی.

هەندێ جار کتێبێک سەرلەبەر بیرکردنەوەی دەگۆڕی، بۆ نموونە جارێکیان لە پاش خوێندنەوەی کتیبێکی ئیسلامی میسری وای لێهاتبوو دەچوە هەر کۆڕێک ودانیشتنێک بابەت وروژێنەرەکەی ئەو کتێبەی دەوروژاند بەبێ ئەوەی ئاماژە بە خاوەن بیروڕاکە یان کتێبەکە بکات، کتێبەکە ناوی ( لا نسخ فی القران) بوو لە نوسینی عبدالمتعال الجبری بوو، کاک هاوڕێ هاتە مەجلیسێک منیشی لێبوم هێندەی گوت نەسخ لە قورئان نییە وبەڵگەکانی کتێبەکەی دەهێنایەوە بەبێ هیچ ئاماژەیەک بۆ سەرچاوەکە تا لە ناچاری من لێی بە جواب هاتم وپێیم گوت: کاک هاوڕێ جارێ ئەو قسانە قسەی خۆت نییە وهی عبدالمتعال الجبری یە لە کتێبی ( لا نسخ فی القران) باسی کردوە، هەر کە ئەوەم گوت کاک هاوڕێ توشی شۆک هات وایدەزانی ئەوە تەنها ئەوە کتێب دەخوێنێتەوە وخەڵکی تر دەبێت چاوەڕێی زانیارەکانی ئەو بن بە بەدەم بزەوە پێیان ببەخشێت!

لەوێ کەوتینە گفتوگۆیەکی درێژ وردەکاری زۆربەیم لە بیر نییە ئەوەش هەر پێویست بە باسکردن ناکات چونکە بابەتمان نیە. هاوڕێ ی ئەو ڕۆژگارە هەمان ئەو هاوڕێ یەی جارانە کە حەز لە تیشک وورشەی چراکانی میدیاکان دەکات وحەز دەکات سیمنار وکۆڕ ببەستێت لە بابەتی هێندە بێ کەڵک وماوەرائی کە (لایسمن ولا یغنی من جوع) ئەوەش تەنها جیاوازیەکە بەسەر کاک هاوڕێ دا هاتوە، لە کاتی خۆی عەودالی بابەتی وروژێنەری نەگوتراو وبێدەنگ لێکراو بوو ئەگەری ئەوە هەبوو ئەگەر لەسەری بەردەوام بوایە نوسەرێکی بلیمەتی خاوەن عەقلیەتێکی ڕەخنەیی گەورەی لێدەرچوبا، نەک پاش ئەو هەموو ساڵە بێت وبەیت وبالۆرەی دەجال مان بۆ بهۆنێتەوە بە ناوی ئیعجازی زانستی، ئەخر دەبێت زانینی ژمارەی (ماوەی مانەوەی ڕۆژەکانی دەجال) چ سودێکی هەبێت وچ ئیعجازێکی تێدا بێت،

لە فەرزی باوەڕ کردنمان پێی؟!
بەڵێ کاک هاوڕێ ئێستاش وادەزانی خەڵک لە گوێی گادا نوستون وچاوەڕێی خێری زانیاریەکانی ئەون بەسەریاندا ببیەشێتەوە، بۆیە نوسەری بابەتەکە هەر لەو نوسینەدا لەپاش هێنانەوەی بیروڕای چەندین زانایانی ئیسلام لەسەر بابەتە بلیمەتەکەی وەک ڕای ( ابن ملک و علی القاری و عبد الفتاح ابو غده و سعید النورسی..هتد) هەر لەپاش ئەو ڕایانە دەڵێت: " بە لاّم ماموستا هاوڕێ پێی وایە ...."!! ئینجا " بۆچونێکی نوێی مامۆستا هاوڕێ دەڵیت بە هۆی دوکەڵی ئاسمانەوە" بەڕاستی ئەوە ئاماژە پێکردنێکی سەیرە بەو شێوەیە ناوی خۆت بێنیت وبیخزێنیە ناو ناوەکانی ئەو هەموو زانایە مەوسوعییانەی ئیسلام! سەیرم پێهات بۆیە گەڕامەوە بۆ سەرەتای نوسینەکە کە وێنەی کاک هاوڕێ بەسەرەوە بوو ناونیشان وناوی ئەویشی بەسەر بوو!
ئەخر ئەگەر خۆی بە زانا دەزانێت زانایان دەیانگوت:"یقول العبد الفقیر الی اللە" یان "یقول العبد الحقیر" ئەگەر زۆر بێ فیز با، هەر مام جەلال ی خۆشمان کە باسی خۆی دەکات دەڵێت (بەندەی موخلیستان) هەرچەندە گومانم هەیە لەو نوسینە کە هی خودی کاک هاوڕێ بێت، بەلاّم شێوەی بلاّوکردنەوەکەی بە وێنە وبەناوەوە لەسەروی وتارەکە بواری ئەگەرێکی تر نادات!
٢٠١٠/٤/٢٦ ڕۆژنامەی ستاندەر

# لە چاوەڕێی بلیمەتیەکانی هاوڕێ وڕۆژەکانی دەجال دا!!!

بەشی دووەم

لەو نوسینەی کاک هاوڕێ حەدیسێکی (سەحیحی) موسلیم کراوەتە کۆڵەکەی باسەکە ئەویش حەدیسی ناسراو بە حەدیسی (جەساسە) یە، کە گوایە فاتمەی کچی قەیس ڕیوایەتی کردوە لە پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەر بێت) حەدیسەکە زۆر بە ئاشکرا شوێنەواری هەڵبەستنی پێوە دیارە ولە چوارچێوەی عەقڵیەتێکی چیرۆکخوانی خورافیدا هەڵچنراوە، وئەو جۆرە حەکایەتانە لەو سەردەمەدا ولە هەلومەرجی مێژوویی ئەو کاتەدا قابیلی باوەڕ پێکردن بوون ومۆرکی فەرهەنگی (اهل الکتاب) یشی بە ئاشکرا پێوە دیارە بۆیە زانایەکی ئیسلامی دەڵێت چۆن حەدیسی (ئیسرائیلیات) هەیە بەو شێوەیەش حەدیسی (مەسیحیات) هەیە، وئەو حەدیسەی جەساسەش بە مەسیحیات لە قەڵەم دەدات!! لەبیریشمان نەچێت کە هەموو زانیاریەکەش لە دەمی (تەمیم الداری) وەرگیراوە کە خۆی مەسیحی بوە!

حەدیسەکە ئەگەر لەو کتێبە داماڵین کە بە صحیحی موسلیم ناسراوە وبیخزێنینە هەرکتێبێکی حیکایەت ئاسای وەک کەلیلە ودمنە یان ئیزۆپ یان هەزار ویەک شەوە یان ئەوەی لە ئەدەبی ئینگلیزی پێی دەڵێن fairy tale کە بریتیە لە چیرۆکەکانی جڕوجانەوەر وجادوو کە بۆ منداڵان دەگێڕدرێتەوە وپڕە لە جادوبازی وئاژەڵی خورافی ومەخلوقاتی عەجیب وغەریبی وەک (جەساسە) کەس پێی نازانێت. یان بکرێتە فیلمی کارتۆن منداڵان ئەڵقەیەکی دەرباز ناکەن! کورتەی حەدیسەکەی تمیم الداری گوایە پێغەمبەر خۆی لێی دەگێڕێتەوە ودەڵێت: " کە سواری پاپۆرێکی دەریایی بوە لە گە ل(30) پیاو لە خێڵی (لخم)و(جزام) پاشان بۆماوە ی مانگێک شەپۆلی دەریا هێناونی و بردونی،.... لە پاپۆرەکە دابەزیون، چونەتە دورگەیەک، کە دەعبایەکی توکن بەرەو پیریان هاتوە، پێش و پاشی لێکجیانەدەکرایەوە لە بەرمووی زۆر ،وتمان تۆ چیت؟ ووتی من(جەساسەم) وتمان جساسە چی یە؟ وتی خە ڵکینە بڕۆن بولای ئەو پیاوە لەو دەیرەدا، چونکە زۆر تامەزرۆی هەواڵتانە کە چوینە ناو دەیرەکە سەیردەکەین گەورەترین زەلام کە تا ئێستا بینیبێتمان لە قە بارە دا بە توندترین شێوە کۆت و زنجیر کرابوو، هە ردوو دەستی بەستراوە بە ملی یەوە،وتمان تۆ کێی؟ وتی ئەوا ئێوە من دەبینن ،بە ڵام پێم بڵێن ئێوە کێن؟ وتیان ئیمە خەڵکێکی عەرەبین. ئینجا هەواڵی دار خورماکانی (بیسان) و دەریاچەی (گبریە) و کانیاوی(زغر)ی لێمان پرسی... وتی هەواڵی پیغەمبەرم پێبڵێن چی کرد؟وتمان لە مە ککە دە رچوە و لە مەدینەیە، وتی عە رە بە کان شەڕیان لە گەڵنەکرد؟وتیان بەڵی زاڵ بوو بە سە ر هەموو عەرەبی چواردەوریدا ئەوانیش ملکەچی بوون ،وتی ئە گە ر بە قسە ی من بکەن وشوێنی کەون ئەوە خیری خۆتانی تێدایە ، " ئەوەیە کورتەی وەرگیڕدراوی حەدیسەکە وەک لە وتاری ناوبراودا هاتوە، جارێ حەدیسەکە بە زەقی پێچەوانەی فەرمودەیەکی تری بوخاری وموسلیم دەکات کە دەڵێت: فَقَالَ : (أَرَأَيْتَكُمْ لَيْلَتَكُمْ هَذِهِ ، فَإِنَّ رَأْسَ مِائَةِ سَنَةٍ مِنْهَا لَا يَبْقَى مِمَّنْ هُوَ عَلَى ظَهْرِ الْأَرْضِ أَحَدٌ ) رواه البخاري ومسلم.

واتە: "سەد ساڵ لە دوای ئەو شەوەتاندا کەسێک لەوانەی لەسەر زەوین نامێنێت بە زیندوویی"
ئەو دورگەیەی کە باسی دەکات لە کوێیە، وکەوتۆتە کام جوگرافیای کە بە ئامرازە سەرەتاییەکانی تمیم الداری دۆزراوەتەوە وبە ئامرازە پێشکەوتوەکانی ئەم سەردەمەمان نادۆزرێتەوە؟ ئەی بۆ ڕەخنە لە ئیمامە گومبوەکەی ناو سەردابەکەی شیعەکان بکەین؟!
ئەو دابەیە یان حەیوانە سپۆرتەی کە ناوی (جەساسەیە) چۆن قسە دەکات؟! چۆن ئەو عەرەبیە فەسیحە فێربوە؟! ئەو دەجالە لەو سپۆرترە ئەو هەموو ساڵە چۆن زیندوە بە دەست وپێ بەستراوەیەوە، بۆ هێندە شەریفە تا هانی عەرەب بدات گوێڕایەڵی لە پێغەمبەر بکەن (درودی خوای لەسەر بێت) (اَما إنَ ذاکَ خَیْـرٌ لَهُـم اَنْ یُطیعـوهُ) ئەوە دەجالە یان داعیەی ئیسلامیە؟! ئەو حالەتەش زۆر جار دوبارە دەبێتەوە وەک شەیتانەکەی ئەبو هورەیرە کە لە حەدیسێکی ناسراو دا هاتوە کە لە کاتی دزیکردن دەیگرێت وفێری دوعایەکی گەورەی دەکات تا بەری بدات!! ئینجا ئەو دەجالە غەیبیشی دەزانی کە پرسیارە ساویلکەکانی دەکرد لە بارەی دەریاچەی تەبریە ودارخورمای بیسان وهتد؟!
لە هەموی سەیرتر ئەو هەموو شڵەژانەی کە بەو قسانەوە دیارە کە گوایە قسەکانی پێغەمبەرن (درودی خوای لەسەر بێت)؟! کە لە وتاری مەبەستدا بە هەڵە وەرگێردراوە ئەوە دەقی قسەکانە بە عەرەبی: " اَلا إنَـهُ فـی بَحـر الشَـام او بَحـر الیمیَـنِ، لا بَـل مِـنْ قِبَـلِ المَشـرقِ، مـا هُوَ مِـنْ قِبَـلِ المَشـرقِ، مـا هـو مِـنْ قِبَـلِ المَشـرقِ مـا هُـو، واَوْمَـأ بیـدِهِ إلـی المَشـرقِ." گوایە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) دەڵێ (ئەو دورگەیە لە دەریای شامە یان لە دەریای یەمەنە، نا بەڵکو لەلای رۆژهەڵاتە، نە لە ڕۆژهەڵاتیش نیە، لەوێ نیە، وئاماژەی بۆ ڕۆژهەڵات کرد"!! ماقولە ئەو قسە بێسەروبەرانە قسەی زمان پاراوترینی نێو عەرەب بێت؟! زانایانی ئیسلام پینە وپەڕۆیەکی زۆر بۆ ئەو حەدیسە دەکەن کە بە هیچ پێوەرێک جێگای متمانە نیە.
(ئەبو رەییە) لە کتێبی "أضواء على السنة المحمدية" دەڵێت:" ئەگەر ئیسرائیلیاتەکان ئاینی ئیسلامی پیس کردبێت بە ئیفترایەکانی، مەسیحیاتیش بەشی هەبوو لەو کارە تێکدەرە، ویەکەم کەسیش بەو کارەی مەسیحیاتە هەڵسا بێت (تمیم بن اوس الداری) یە، " ئینجا بە تەوسەوە دەربارەی حەدیسەکەی جەساسە دەڵێت:"بەڵکو زانایانی جوگرافیا بەدوای ئەو دورگەیە دەگەڕێن ولەسەر ئەو زەوییە دەیدۆزنەوە تا ئەو شتە سەیر وعەجیب وغەریبانە دەبینین کە سەروەرمان تمیم الداری باسیان دەکات"!!!
حەدیسێکی زۆر هەیە بەهای زۆر سەلبی بڵاودەکاتەوە لەناو موسڵمانان پێویستە خەڵکی لێ ئاگادار بکرێتەوە، سەرنجێکی کەم بدەرە شەیتان لە قورئاندا چ نەگریسێکە ولە حەدیسدا خەڵکی هاندەدا شوێن پێغەمبەر کەون!
بڕوانە قورئان چۆن کوشتنی یەک کەس وەک کوشتنی هەموو مرۆڤایەتی دەزانێت، کەچی لە حەدیسدا کابرا 99 کەس دەکوژێت وتەواوی دەکات بە 100 کەچی خوا لێی خۆش دەبێت چونکە تۆبەی کردوە ، هەربۆیەش کوشتنی مرۆڤ وا ئاسان وبێ نرخ بوە لە کۆمەڵگاکانی ئیسلامی ولای حزب وگروپە توندڕەوە ئیسلامیەکانیش.
٢٠١٠/٥/٣ ڕۆژنامەی ستاندەر

# بازیانی: ئەردۆگانەکەی کورد لە نوسخە سەلەفیەکەیدا

ماوەیەکە ئەوەی ناوی خۆی ناوە دکتۆر بازیانی، ئەردۆگانیە سەلەفیەکە، کە دکتۆرایەکی موزەیەفی لە دوکانێکی شیعی عیراقی وەرگرتوە بە ناوی الجامعة الاسلامیة العالمیة کە بارەگاکەیان لە لەندەنە کاتی خۆی جارێك سەردانم کردن، ولە یەکەم دیتنمدا زانیم چەند دکتۆرێکی فاشیل وبێ مستەوای شیعەی عێراق کۆبوونەتەوە بەس خەریکی دکتۆرا و ماستەر بەخشینەوەن بەسەر تایفەکەیان، وسەدان وهەزاران دکتۆرای تەپوتۆزیان دروستکردوە، لەسەر شێوازی کۆمەنستەکانی سەردەمی یەکێتی سۆڤیەت، کە بەردەوام دکتۆرایان دەبەخشیەوە بۆ کۆمەنستەکانی ولاتانی عەرەبی وئیسلامی بۆ بەهێزکردنی پایەی کۆمەلایەتی و ئەکادیمیان لە ناو کۆمەڵگاکانیاندا، تا لەو ڕێگاوە کۆمۆنیزم بلاوببێتەوە. چونکە دەزانن گەلانی ساویلکەی جیهانی ئیسلام وعەرەب چەندە لاوازن بەرامبەر ئەو نازناوانە جا با هیچ ناواخنێکیشی نەبێت. هەر بۆیەش ئەمڕۆ لە جیهانی ئیسلامدا لەشکرێك لە خاوەن دکتۆرای بێ ئەرزش بونەتە ماڵ بەسەر کۆمەڵگاکان وکۆی کایەکانی ئەکادیمی وسیاسی وکۆمەلایەتیشیان گەندەڵ کردوە، گرنگ ئەوەیە پێت بڵێن دکتۆر، جا لە مۆزەمبیق هێناوتە یان لە سێبریا یان بە موراسەلە یان ئۆن لاین یان کڕیوتە لە مافیاکانی فرۆشتنی بڕوانامە، گرنگ نیە وەك عەرەب دەڵێت: الامارة ولو علی الحجارة! ئەمێرێتی با لەسەر بەردیش بێت!!

چەند ساڵێکە بازیانی بە کۆمەڵێك ئیدیعایەوە گوایە کتێبەکانی لە زانکۆکانی سعودیە مەنهەجە، کە ئەوە ڕاست نیە وڕاستیش بێت، زیاتر ئیدانەیە بۆ خودی سەلەفیزمی بازیانی نەك ستایشی ئەو بێت. لە هەموو ئیدیعاکانی گاڵتەجارتر خۆلێچواندنیەتی بە ئەردۆگان، وموژدە دەدات بە لە دایکبوونی ئەردۆگانێکی کوردی لە خودی شەخسی خۆیدا! بەڕاستی نوکتەیەکی بێتام وبۆیە، من لە یەکەم ساتی زانینم بەو هەوڵە نەزۆکانە خەریك بوو توشی گەشکەبم لە پای ئەو ئیدیعایە. من لە بیرمە کاتی خۆی کە تەکلیفی نوسینی لێدەکردم بۆ گۆڤاری الهدی، چەندین وتارم بۆ گۆڤارەکە نووسی خۆی لەو پەڕی میانڕەوی نیشان دەدا، پاش ڕاوەستانی گۆڤارەکەی، چەند بابەتێکم بلاوکردەوە لە ڕەخنەی فیکری سەلەفیدا، کە زۆرێك لە مەشرەب سەلەفیەکانی تورە کردبوو.

لە سەردانێکمدا بۆ کوردستان، بازیانی هاتە سەردانم هێندە توڕەبوونی خۆی دەربڕی دەربارەی ڕەخنەکانم لە سەلەفیەت وبەتایبەتی لە ئیبن تەیمیە، هەتا توشی سەرسوڕمانی کردم کە ئەو ماسکە سەلەفیەی نیشانی دام، هەربۆیە من لە ناسینم بۆ ئەو کەسە دەزانم چ گاڵتەجاریەکە کەسێکی سەلەفی لەناخەوە تا سەرئێسقان خۆی بە ئەردۆگان بشوبهێنێت! کێشەکە لەوەدایە خۆ کۆلێش نادەن ئەو جۆرە کەسانە، پاش ئەو فەشەلە گەورەیەی هێنای لە هەڵبژاردنەکەی پەرلەمانی کوردستانی ٢٠١٣ ، چاوەڕوان دەکرا جارێکی تر باسی سیاسەت نەکات، بەو هەموو سەرقاڵیەوەی بە چەندین خێزان

ومنداڵێکی زۆرەوە، خەریکی ماڵ وحاڵی خۆی بێت، بەڵام چونکە ماوەیەك وەزیر بوە وخانەنشینی چاکی دەستکەوتوە، دەزانێت سیاسەت ئەگەر گرتی لە هەموویان ئاسانترە بۆ ژیان، بۆیە هەڵپەی سیاسەت و تەشکیلی جەماعەت وحزبیەتی، بەڵکو یەکێك لەو هەولانە سەردەگرێت. بازیانی ئەردۆگانەکەی کورد، دەبوایە بەلایەنی کەم ژیانی ئەردۆگانی خوێندبایەوە تا بزانێت ئەردۆگان لە چ کێشمەکێشێك بوە لەگەڵ سەلەفیە توندڕەوەکانی ناو حزبەکەی ئەربەکان ودواتریش ناو ئاك پارتی، کە توندترین توندڕەوانیان ناگەنە ئاستی ئەوەی بەرگری لە ابن تیمیە بکەن یان دەستخۆشی لە عەقیدێکی گەندەڵی خانەنشینکراوی وەك سەرباز محەمەدی سەلەفی بکەیت لە هێرشکردنی بۆ سەر عەقڵیەتێکی بلیمەتی وەك دکتۆر عەدنان ئیبراهیم.

کە بێگومان گەورەترین عەقڵیەتی نوێخوازی ئیسلامیە لەو سەردەمەدا، دەیانی وەك سەرباز بە شاگردیشی ناشێن، کەچی هاتوە ئۆخەی دلانێکی نوسیوە بە پێخواسی بەناو بیروڕا جوان ودەگمەنەکانی دکتۆر عدنان دەکەوێت، بازیانیش یان ئەردۆگانەکەی کورد لە نوسخە سەلەفیەکەیدا لە ژێر هەواڵی بە خۆرایی بلاوکردنەوەی ئەڵقەکانی ئۆخەی دلان وەك هەر سەلەفیەکی نەیار بە عەقڵ و بە ئازادی وبە نوێخوازی دەنووسێت: " پیرۆزە خوا گەورە بیکاتە زەخیرەی قیامەت" یانی ڕەتدانەوەی وتە وبیروڕایە جوان و ئاشتیخواز و نوێخوازەکانی د.عدنان کە تەنها دەیەوێت ئیسلام وموسڵمانان دووربن لە تەکفیر و تیرۆر و کوشتنی خەڵك و شەڕی تایفی و دزێوکردنی ئیسلام و دوور خستنەوەی شوبهات وگومان لە پێغەمبەر و زاتی خوا، لەلایەن کەسێکی بێ مستەوای کۆنەپەرستی دەقپەرستی وەك سەرباز سەلەفی، لای دختۆر بازیانی کارێکی هێندە گەورە و پیرۆزە ودوعای بۆ دەکات کە خوای گەورە بیکاتە زەخیرەی قیامەت!!! دەبێت ئەردۆگانی تورکی کە لە ولاتێکدا حوکم دەکات تا سەر ئێسقان کراوەیە بەڕووی دیموکراسیەت ومەدەنیەت وئازادیەکان ڕەئی چۆن بێت دەربارەی د. عدنان، بڵێی ئاگاداری ڕای ئەردۆگانەکەی کورد لە نوسخە سەلەفیەکەیدا بیت؟! تۆ بڵێی ئەگەر پێی بزانێت، لە ڕقی بازیانی واز لە ناوی ئەردۆگانیش نەهێنێت، کە بە زۆر خۆی بەو هەڵواسیوە؟!

٢٠١٤/٦/٨

# چیرۆکی ئەو پەنجا لاپەڕەی ئەحمەد داود ئۆغڵو لە ماستەرنامەکەی بازیانی وەریگرتبوو؟

لە چاوپێکەوتنێکدا کە فرێندێکی فەیسبوکم کاک رزگار رەزا چوچانی لەگەڵیدا کردوە لە ژێر ناونیشانی : [د. محەمەد بازیانی: لەکاتی شەڕی یەکێتی و بزووتنەوە ئەربەکان بە تاڵەبانی گوت بزووتنەوەی ئیسلامی بێکەس نییە] لە ٢٠١٤/٠٢/٢٤ بڵاوکراوەتەوە لە گۆڤاری سڤیل.
باسی ئەو هەموو خۆهەڵکێشانەی ناکەم کە زۆربەی شایەدەکانی مردوون، چونکە خەڵکێك مردووە هەزار ڕیوایاتیان بە دەمی دروست کردوە، بۆیە شایەتدانی مردوو هیچ ئیعتبارێکی نەبووە و نیە. بەڵام ئەوەی کە کاک ڕزگاری توشی جۆرێك لە سەرسوڕمان کردوە ئەوەیە کە بازیانی کێرڤی خۆهەڵکێشانی هێندە بەرزبۆتەوە ئیدیعای ئەوەی دەکات کە بیرمەندێک و وەزیرێکی چالاکی دەرەوەی تورکیا هاتووە گەڕاوە بەناو ئەرشیفی کوردیدا وبەدوای بابەتەکانی بازیانی تا ماستەرنامە چاپ نەکراوەکەی کە من لە چەندین نووسەرم پرسی هەر ناویشیان نەدەزانی، داود ئۆغڵو بە بلیمەتی خۆی گەیشتە ئەو گەنجینەیە فیکریەی بازیانی و پەنجا لاپەڕی لەو ماستەرنامە وەرگرتوە کە ئەوەش بەڕاستی وەك بازیانی دەڵێت درۆیەکی مەحظە!
کاک رزگار رەزا چوچانی لە هایلاتی چاوپێکەوتنەکە ئەو ڕستەیەی هایلایت کردوە:
زیاتر لە ٥٠ لاپەڕەی کتێبەکەی داود ئۆغلۆ لەسەر کورد زۆری هزری بەندەیە!!!
لە پێشەکی چاوپێکەوتنەکەش هەمان شت دووپات دەکاتەوە و دەڵێت:
"د. محەمەد بازیانی، ئەندامی مەکتەبی سیاسیی پێشووی بزووتنەوەی ئیسلامی، باس لەپەیوەندی نێوان بزووتنەوەی ئیسلامی و نەجمەدین ئەربەکان و پادشای سعودیە دەکات، هەروەها باس لەوە دەکات کە لەسەردەمی شەڕی یەکێتی لەگەڵ بزووتنەوەدا نەجمەدین ئەربەکان پەیامێکی بۆ تاڵەبانی ناردووەو پێی گوتوە کە "بزووتنەوە بێ کەس نییەو شەڕکردن لەگەڵیان شەڕکردنە لەگەڵ ئێمە". هەروەها باس لەوەش دەکات کە بەشێك لەکتێبە بەناوبانگەکەی ئۆغلۆ بیرۆکەی ئەوە."
لەناوەوە پرسیارەکەی لێدەکات لەسەر پەیوەندی دادوگەشەپێدان، لە وەڵامەکەیدا خۆی دەکاتە ئەندازیاری ئەو چاکسازیەی لە هەڵوێستی تورکیا ڕویداوە دەرهەق بە دۆزی کورد، بزانە لە خۆگۆڕان مرۆڤ بەرەو چ هەڵدێرێك دەبات، دەڵێت:
"د. محەمەد بازیانی: دادو گەشە ئەمڕۆ لەگەڵ هەموو لایەنەکانی کوردستان، پارتی، یەکێتی، یەکگرتووی ئیسلامی، تەنانەت لەگەڵ لایەنە عیراقیە جوداکان پەیوەندی باشی هەیە. پەیوەندی ئەوان ئێستا سیاسی و ئابووری یە زیاتر، ئێمەش بە حوکمی ئەو پەیوەندییە پێشینییەی ساڵەکانی ١٩٩٢ و پاشتر پەیوەندی عەلاقەیەکی برایانەمان هەیە، کە لە بەرژەوەندی هەردوو لا تەواو بووە، وەك ئەو کرانەوەیەی

کە دەرهەق هەرێمی کوردستان هەیە لە بوارەکانی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی، بەختەوەرم کە لەو رێگایەوە خزمەتی باشم بە کۆمەڵگەی کوردستانی کردبێت، ئەم پەیوەندی و کرانەوەی ئیستا دەیبینم بەدووری نازانم هەندێك لە بیرو هزرەکانی بەندەی تێدایە، وەك ئەوەی لە "العمق الاستراتیجی لترکیا"ی دکتۆر ئەحمەد داود ئۆغلۆ، بەئاشکرا زیاتر لە ٥٠ لاپەڕەی لەسەر کرانەوە بەرەو کوردستان نوسیوە، زۆری هزری بەندەیە.

دیمانەکارەکە پرسیاری لێدەکاتەوە دیارە بە عەقڵی دانەچوە:

سڤیل: لەوەی کە داود ئۆغلۆ سودی لەهزرەکانی تۆ بینیوە. لەنوسینەوەی ستراتیژییەکەی بەئاراستەی کوردستان، پرسی بەبەڕێزتان کردووە؟، یان تەنها وەکو سەرچاوە وەریگرتووە؟

"د. محەمەدبازیانی: بەڕێز دکتۆر داود ئۆغلۆ سوودی بینیوە لەنوسینەکانی بەندە لەڕۆژنامە وگۆڤارەکان و تەنانەت ماستەرنامەکەم، هەروەها لەڕێگای ئەو ئەندام پەرلەمان و ئەندامانەی حیزبی دادو گەشە، کە دۆستی ئێمەن و پرسیاریان لێکردوینە چی بکەین، تاکو پەیوەندییەکانمان لەگەڵ هەرێم چاك بێت و بەسوود و قازانجی هەردوولا تەواو بێت، بەندەش وەك دڵسۆزییەك بۆ گەل و نیشتمانەکەم و کرانەوەیەك، هەرچی بە باشم زانیبێت، پێم گوتونە، زۆر جاریش لەگەڵ بیروبۆچوونی ئەواندا یەك نەبووە، بەڵام پاشان وتویانە قسەی بەڕێزتان و دیدتان چاکتر و واقیعی تر بووە. تەنانەت پێم ووتونە ئەگەر کورد ببێتە دەوڵەتیش، کە مافی خۆیەتی، دەبێت ئیوە مامەڵەی لەگەڵدا بکەن."

یانی ئەحمەد داود ئۆغلۆ بەرلە نوسینی کتێبەکەیدا بەدوای گۆڤارو ڕۆژنامەکان گەڕاوە کە بابەتی بەندەی گەندەی تێدا بووە تا خوا و ڕاستان ماستەرنامەکەی بازیانی یان نیشان داوە، وپەنجا لاپەڕەی سافی وعافی لە هزری بازیانی وەرگرتوە وخزاندویەتە ناو کتێبەکەی : العمق الاستراتیجي: موقع ترکیا ودورها في الساحة الدولیة

ئەو داود ئۆغلۆیەی کە بە ئەندازیاری سیاسەتی دەرەوەی تورکیا دەناسرێت، دەیان کتێبی بە تورکی و ئینگلیزی هەیە، جگە لە سەدان وتاری ئەکادیمی لە گۆڤارە بەناوبانگەکانی جیهانی، سەرەرای ئەوەش تورکیا چەندین قات لە تێکرای وڵاتانی عەرەبی بە کوردستانیشەوە کتێب بەرهەم دەهێنێت، فەقیرەی هیچی دەست نەکەوتوە لە ماستەرنامەکەی بازیانی نەبێت؟!!

ماستەرنامەش ساڵی ٢٠٠٤ وەرگیراوە لە هەمان ئەو دووکانە شیعیەی کە ناویان ناوە زانکۆ، لە هەمووشی سەیرتر، کتێبەکەی داود ئۆغلۆ یەکەم چاپی تورکی لە ساڵی ٢٠٠١ دوو هەزار و یەك دەرچوە، وەك لە پێشەکی کتێبە عەرەبیە وەرگێڕاوەکەدا هاتوە! یانی هێشتا بازیانی ماستەرەکەشی وەرنەگرتوە، ئەی چۆن سوودی لێ وەرگرتوە؟! لەوانەیە بەوە سەری لێشێوابێت کە چاپە عەرەبیەکە لە ساڵی ٢٠١٠ دەرجوە!

سەرەڕای ئەو فەقیرحاڵیەش بازیانی بەمن دەڵێت حەسوودی پێدەبەم و چاوم پێی هەڵنایەت!! ئەخر حەسودی بە چ ببەم بە فەشەلی هەڵبژاردنت، یان بە بلیمەتیت، یان بەو فشە بێ سەروبەرانەت؟! بەخوای عەرەب ڕاستی گوتوە کە دەڵێن: انت في موقف لا تحسد علیە! ئێوە لە هەڵوێستێکدان

ئێرەییـتـان پـێ نابردرێـت.

٢٠١٤/٦/١١

سەرچاوەی چاوپێکەوتنەکە:

http://gasha.co/Detail.aspx?id=1708&LinkID=1#sthash.GC6L95Me.Cw2XznXo.dpbs

کتێبەکەی دواد ئۆغلۆ، لاپەڕە ١١

http://www.islamstory.com/uploads/multimedia/books/ketab0653.pdf

# مونازەرە خەیاڵیەکەی بازیانی !!

بازیانی دەڵێت: "ئێمە دەڵێین : ئەو برادەرە لە ستاندەرد چەند بابەتێکی بڵاو کردەوە لەسەر زانای بەناوبانگ ابن تیمییە، خەڵکێکی زۆری لە موسڵمانانی کوردستان توڕە کرد ، بەندە دیفاعم لە زانایەکی پایە بەرزی وەك ابن تیمییە کردوەو بە هەقم زانیوە، چونکە هەندێك شتی پڕوپوچی دەربارەی ئەم زاتە موبارەکە و ئەم عالمە جەلیلە بڵاوکردبوەو، ١- ئامادەش نەبوو بۆ دەرکەوتنی راستیەکان بەرامبەر کاك دکتور عبدالکریم زاوای مامۆستا سدیق عبدالعزیز رابەری پێشووی بزووتنەوەی ئیسلامی رابوەستێ، کاتێك کاك دکتۆر عبدالکریم ئامادەبوو زانستیانە ئەو بوهتانانەی بۆ ئەو زانا بەرزە دروستکردوە لە مونازەرەیەکی مەحرەمانەی "سەنتەری هدی" بکرێت کە لەو دانیشتنەدا پێشنیارمان کردو ئامۆژگاریمان کرد واز بهێنێت لەم جۆرە ووتارە کە دەبێتە مایەی تەفرەقەی موسڵمانان و خواردنی گۆشتی زانایەکی پایەبەرزی وەك ابن تیمییە کە وەك زانایان دەڵێن گۆشتی زانایان کاتێك بە خراپە باسی بکەیت ژەهراوییە(لحوم العلماو مسمومە)، بە داخەوە ئەو برادەرە محمد هەریری جورئەتی نەبوو ئەو مونازەرەیە بکات.."

منیش دەڵێم بەداخەوە بۆ پیاوێکی سەلەفی ودۆستێکی ابن تیمیە وا بە ئاشکرا درۆ بکات، وەڵڵاهی نە باسی مونازەرەو نە باسی عبدالکریمی کرد، تەنها کەمێك خۆی شین ومۆر کردەوە وەك ئەو قسە عاتیفیانەی گۆشتی زانایان ژەهراوییە! کاتێ لێمپرسی تۆ خۆت وتارەکەت خوێندوتەوە؟! گوتی دیومە، گوتم باشە چی تێدایە کە ڕەخنەت لێی هەیە؟! وەڵڵاهی هیچی پێ نەبوو بیڵێت، چونکە ئەویش بەگەڵ گاڕانی توڕەبوان کەوتبوو بەبێ ئەوەی هیچی خوندبێتەوە. سەیر لەوەدایە دەڵێت: "هەموان دەزانن رۆژێك لە رۆژان "محمد بازیانی" سەلەفی نەبوە.. ئەگەر، بیوتایە "نورجی" بوە واتا قوتابیانی سعید نورسی بووە ، راستی فەرموە ..ئەگەر بیوتایە "ئیخوان موسلیمین" بووە، راستی فەرموە، ئەگەر بیوتایە "بزووتنەوەی ئیسلامی" بووە راستی فەرموە.. !! بەڵام بڵێت: سەلەفییە !! ئەوە درۆیەکی مەحظە."

تۆئەوشەڕە گەرمەی ئیبن تەیمیە ودکتۆر عدنان ئیبراهیم بکەیت، و دەستخۆشی لە ئۆخەی دڵانی سەرباز بکەیت، هیشتا سەلەفی نەبیت، ئەی کە سەلەفی بویت دەبێت چی بکەی؟!! وەڵڵا خۆشە ئەو بەرگری کردنە لە خۆت دەکەی دژی تۆمەتی سەلەفیبوون!! لە هەزار شوێندا شانازیت بەو سەلەفیبوونە کردوە، دیارە لە ژێر فشاری ڕیسوا بوونی سەلەفیەت، تۆ و هەزارانی وەک تۆ ڕۆژێک دێت نکولی لەو سەلەفیبوونە فاشیستیە بکەن، کە بەرهەمەکەی تەنها خوێن وتەکفیر وتەفجیر وتبدیع و تەفسیقە!

بازیانی دەڵێت: دکتۆرایەکەم لە زانکۆ عالەمیەکان وەك مەرجەعێکی سەرەکی دادەنرێت، نەك تەنها لە سعودیە!!!!!

لەو وتارە ساویلکەیەی غەرق بوو لە تیۆری پلانگێڕی، بازیانی بەردەوام دەبێت لەسەر فشە فشەکانی،

ئەوەی بەر لەماوەیەك گووتی: ئەحمەد داود ئۆغلۆ لایەکی کتێبەکەی لە دکتۆرا ناوازەکەی ئەو نقل کردوە!! لە جیاتی شەرم دایگرێت ئیدیعایەکەی بەرفراوانتر کردوە، و سعودیەشی تێپەڕاند بۆ زانکۆ عالەمیەکان!! بازیانی دەڵێت: "دەربارەی کتێبەکانی بەندەش بە تایبەت دکتۆرا نامەکەم.." مفهوم السلم في الفكر الإسلامي .. دراسة تحليلية مقارنة بين الشريعة والقانون" ئەوە قسەی بەندە نیە کە لە زانکۆ عالەمیەکان وەك مەرجەعێکی سەرەکی دادەنرێت، نەك تەنها لە سعودیە بەلکو لە شامیش.. وەك لەم لینکانەدا هاتوە، دەتوانن بۆ پوچەڵکردنی درۆکانی هەریری تەماشای بکەن.. پاشان خۆ من ئەو سایتانە کە سەر بەو زانکۆیانەیە دروستم نەکردوە.. بەڵام ئەو برادەرە حەسوودە چاوی هەڵنایات بە چالاکیەکانی ئێمە و کاری نیە جگە لە کوچەکانی لەندەن و دوکانەکانی دژ بە ئیسلام و موسڵمانان بسوڕێتەوە و شتێکیان بۆ بنوسێتەوەو هەندیك لە بەرامبەردا دۆلاری پێوەرگرێت." دەمزانی دووڕوو و درۆزنە، بەڵام بە خەیاڵم دانەدەچوو هێندە ئەحمەق ودەبەنگیش بێت، باسی ئیتیهاماتەکانی سەردەمی ستالین بکات، کە کاتی خۆی ئەوەی ڕەخنەی لە کۆمەنستەکان گرتبا دەیانگووت: دۆلاری ئەمریکی وەرگرتوە!!

لەو پێناوەدا وەك بەڵگە بۆ سەلماندنی ئەوەی دکتۆرایەکەی نەك تەنها لە سعودیە، بەڵکو لە زانکۆ عالەمیەکان وەك مەرجەعێکی سەرەکی دادەنرێت، پەنای بردۆتە بەر دوو سایتی عەرەبی نا فەرمی ونا ئەکادیمی هێناوە بە بەڵگە، یەکێکیان هی کتێب فرۆشتنە و کتێبەکەی بای سێ دۆلار پێنسێك کەمە $ ٢,٩٩!!! نرخەکەی وەك ناوەرۆکەکەی هەرزان وسووکە. لینکی دووەمی پێگەیەکی عەرەبی ناپرۆفیشناڵی فاشیزمی عەسکەری عەرەبیە، بە ناوی: [البسالة منتدى القوات المسلحة في الوطن العربی.] یانەی هێزە چەکدارەکانی نیشتیمانی عەرەبیە!!! کە عەرزیکی کتێبەکەی تێدایە، لە کاتێکدا کەس ئەو پیگەیە هەر ناناسیت،کاکم وا دەزانیت ئەمازۆنە!

لە لینکی سێیەمدا، سایتێکی تری نافەرمیە ناوی : منتدى كلية الحقوق، یانەی کۆلێژی ماف، لەو سایتە کە ملیۆنەهای لەوە هەیە لەناو ئینتەرنێت، کابرایەکی سوری بەناوی : محمد حلو ، محامي بفرع حلب نوسییەتی: السادة طلاب البحث العلمي نقدم إليكم رسالة دكتوراه هامة ومميزة بعنوان:

" مفهوم السلم في الفكر الإسلامي" دراسة تحليلية مقارنة بين الشريعة والقانون

للباحث محمد سيد نور البازياني، نوقشت الرسالة في: الجامعة العالمية للعلوم الاسلاميةفي المملكة المتحدة لعام ٢٠٠٦"

لەوە دەجیت کابرا شیعی بیت، چونکە زانکۆیەکە دوکانێکی شیعیە، وایزانیبێت بازیانیش شیعەیە بۆیە وا ڕێکلامێکی بچوکی کردوە بۆ کتێبەکە. بازیانی فەقیرحاڵ ئەو لینکانەی سەراوژێر خوێندوتەوە ولێی بۆتە شتێکی زۆر گرنگ گوایە کتێبەکەی یان دکتۆرا نامەکەی لە زانکۆ عالەمیەکان وەك مەرجەعێکی سەرەکی دادەنرێت، نەك تەنها لە سعودیە!!!!!

٢٠١٤/٦/٩

# وتارێکی داعشیی مەلایەکی پەرلەمانتار!

بەداخەوە بۆ هەولێر کە دەیان کەس وەمەلای زمان درێژ وبە شیرەشیری کردە ئەندام پەرلەمان. میللەتێکە هێندە دڵ ساف و ساویلکەن هەر ئەوەی دوو هاواری کرد و دوو قسەی بە دەسەڵات وحوکمەت گووت، ئەوە دەبێتە پیاوی بێ وێنەیان! ئەو هەموو مەلا و بانگخوازانەی هەولێر و کوردستان بە گشتی، ڕەوانەی پەرلەمانی کوردستان و عێراقیان کردن، خۆزگە کە دەگەیشتنە ئەوێش کەمێك چالاك و خاوەن پرۆژە و داهێنان دەبوون، نموونە زۆرە بەڵام با باسی پاڵەوانی مینبەری پڕ جوێن و شیراندنی ئەو جارە بکەین، کە لەسەر حیسابی دەنگەکانی هەولێر چۆتە پەرلەمانی عێراق، هێشتا بۆ دەرمانیش نەمان دیوە لەو پەرلەمانەی بەغدا بشکۆکێت!

مەلا سەلیم شوشکەیی، و مەلا وبانگخوازەکانیتر، کاتێ خەڵکی داماو دەنگیان پێ دەدەن، وادەزانن چۆن لەسەر مینبەر بێ کارەباش بێت، گەڕەکێك بە دەنگ ونەڕە نەڕیان جاڕس دەکەن، بەو جۆرەش لە پەرلەمان بەرگری لە مافەکانی خەڵك دەکەن! نوکتەکی خۆش، دەڵێن ڕۆژنامە نووسێك چویتە لای ئەو مەلا سەلیم شوشکەیی یە بۆ چاوپێکەوتن لەسەر پەیوەندیەکانی عێراق و کوردستان، مەلا فەرموویەتی موقابەلەی سیاسی ناکەم !!باشە ئەگەر تۆ سیاسی نیت و موقابەلەی سیاسی ناکەیت بۆ کورسیەکی سیاسی کوردت گرتوە لەو پەرلەمانە؟! ئەی ئەو مووچە زەبەلاحەت لە پەرلەمان بۆ خوتبە پڕ جوێنەکانت وەردەگریت؟!

با خەڵکی نەزان و ساویلکە باش بزانن، کەسێکی سیاسەتزانی کوردپەروەر دیندار بێت یان نەبێت هەزار قات لەو مەلا بەڵایانە باشتر نوێنەرایەتی خەڵك دەکەن، کە مینبەر بەکار دەهێنن بۆ ناودار کردن وناوزڕاندنی خەڵك و فێرکردنی خەڵك بە ڕەوشتی خراپی دەمپیسی وجوێندان وتوندوتیژی. خۆ ئەگەر موقابەلەکە لەسەر فاروق ڕەفیق بوایە دەتکرد، تا هەزار جوێنی مینبەری ترشی بۆ بنێریت! مەلا سەلیم شوشکەیی لە ڤیدیۆیەکدا بڵاویکردیتەوە بە ناونیشانی: وەڵامێك بۆ فاروق رەفیقی چەواشەکار، وتاری 015/7/24! هەر لە ناونیشانەکەوە دەردەکەوێت کە تۆ چەواشەکاریت، چونکە فاروق ڕەفیق گووتی من باسی نیقاب دەکەم کە مەترسیە بۆ سەر ئەمنی قەومیشمان، کە سەدان داعشی پیاو دەتوانن خۆیانی لە ژێری حەشاردەن.! کەچی تۆ بەس باسی حیجاب دەکەیت! ئەوە چەواشەکاری نییە؟!

لە ڤیدیۆیەکە کە ماوەی تەنها پێنج دەقیقەیە بەقەد دوو مانگی گەڕەکێکی شەعبی مەلا سەلیم شوشکەیی جوێن دەدات بە فاروق ڕەفیق و تەلەفزیۆنەکان ومیدیاش. ئەوە کەمێك لە جوێنیکانیەتی کە هێندە زۆرن لە ژمار نایەن:

قۆڵی سەعاتیان هەڵکردوە زمانیان بستێك دەرکردوە ...وەك سەگ تەنها رشانەوەی هەبێت...کە زمانی دەکاتەوە وەك ئەنعام لە غەیری قسەی پڕوپوچ...ئەو کەسە ئەگەر سەد شەهادەشی هەبێت ابو جهلە و

جاهیلە، ونفامە و نەزانە! ئاژەڵن لە ئاژەڵیش کەمترن عەمری ئەو تەلەفزیۆنانەش نەمێنێت کە ئەو جۆرە کەسە دەهێننە سەر شاشەی تەلەفزیۆن!

چۆن دەبێت رازی بین بەو هەموو کوفرەی دەکرێت بەرامبەر خوا و پێغەمبەر! [هاندانی ساویلکان] پرۆفیسۆری لە حەماقەت... بێ دەماغ....ئەو نەفامە شاگردی شەیتانە...پێشی تۆ زۆر کەس دژایەتی دینیان کرد بەڵام سوك وریسوا بوون...ئەو جۆرە کەسانە لە حیجاب ناترسێن، لە بیروباوەڕەکەی دەترسێن!

ناتوانێت دەستیان پێ گەرم بکاتەوە، ناتوانێت پێیان ڕابوێرێت، بۆیە قسەیان پێ دەڵێ! دەرچوونی ئەو کچە موحەجەبانە باشترین وەڵامە بۆ ئەو زماندرێژانە...ئەو کچانەی موحەجەبەن دەخوێنن خەریکی فەیسبوك و مۆبایل، ستریچ و سەرداهێنانی مۆدیلبازی نین، لەگەڵ کتێبەکەی خۆیان خەریکن، باشترین وەڵام بوو بۆ ئەو نەفامانە کە مزگەوت و قورئان ودین ئەوانە پێ دەگەیێنێت. بەڵام ئەوەی ئێوە ئیدیعای بۆ دەکەن [یانی بێ حیجابەکان] دەبێت هەموویان بە دەوری دوەم وسییەم و ساڵی دووەم سییەم دەرچن! ئەوە پێشەکەوتنە؟!" ئەوانە بەشێکبوون لە جوێنەکانی پێنج دەقیقەی خوتبەکەی!!

جارێ ئەو هەموو جوێنە بەدڕەوشتیە نازانم چۆن لەسەر مینبەری مزگەوتێك دەوترێت کە قورئان دەڵێت: وجادلهم بالتي هي احسن [بە چاکترین شێوە موجادەلەیان لەگەڵ بکە]... وهدوا الى الطيب من القول ]هیدایەتدران بۆ قسەی چاك وباش]..ادعوا الى سبيل ربك بالحكمة و الموعظة الحسنة! [بانگەوازی بکە بۆ ڕێگای خوا بە حیکمەت و وەعزی چاك] نەك بە جوێن و قسەی سوك !پیغەمبەریش لە دەیان فەرمودە باسی زمان پاکی دەکات، کەدەڵێت : :ليس المؤمن بالطعان ولا اللعان ولا الفاحش ولا البذيء [موسڵمان تانەلێدەر و نەفرەتکەر و قسەی سوک و زمان پیس نییە] ئەوە و دەیان حەدیسیتر لەو بارەیەوە هاتووە.

هەقیەتی مەلا سەلیم شوشکەیی مووچەیەکی گەورە وگرانی موفت وەردەگرێت، سافی وعافی، لە بەغدایێ بێ دەنگ وعاقڵ دانیشتوە، ناتوانێت دوو ڕستە بە عەرەبیەکی ڕەوان قسە بکات وپێشنیارێك بکات، تووشی چەپاندن وکەبتی قسە هاتووە، مەجبورە لە سەردانەکانی بۆ بەغدا کەدەگەڕێتەوە، ئەو چەپاندن وکەبتەی لە شێوەی دڕو مرواری لەسەر مینبەرەکەی هەولێری داماو خاڵی کاتەوە، تا توندوتیژی و زمانپیسی زیاتر بێت!

ئینجا کە تۆ ئەندام پەرلەمانی دەبێت خۆت بە نوێنەری هەموو خەڵك بزانیت، دوور نیە نیوەی دەنگی خۆت لە خەڵکی بێ حیجابت هێنا بێت، شورەیی نییە بەوشێوە زەقە تەوهین بە کچانی بێ سەرپۆش بکەیت وبڵێت: " ئەو کچانەی موحەجەبەن دەخوێنن [وەك بێ حیجابەکان] خەریکی فەیسبوك و مۆبایل، ستریچ و سەرداهێنانی مۆدیلبازی نین، لەگەڵ کتێبەکەی خۆیان خەریکن، بەڵام ئەوەی ئێوە ئیدیعای بۆ دەکەن [یانی بێ حیجابەکان] دەبێت هەموویان بە دەوری دوەم وسێیەم و ساڵی دووەم سێیەم دەرچن! ئەوە پێشەکەوتنە؟!" توخوا ئەوە قسەی پیاوێکی عاقڵە زیرەکە، تا قسەی ئەندام پەرلەمانێکی عێراق بێت؟! ئەخر بۆیە عێراق واجوانە! خوا خەڵك و حزبەکەت بگرێت کە بەس لەبەرهێنانی دەنگی ساویلکە

دینیە عاتیفیەکان نمونەی هیچ لەبارنەبووی وەك تۆ دەخەنە پەرلەمان.

لەجیاتی ئەو وتارە پڕ جوێن و هەڕەشە و هاندانی خەڵکەکە بۆ توندوتیژی وزمانپیسی با لە بەغدا چالاکیەکت هەبێت، هەر نەبێت ئەو هەموو ملیۆنەی کە وەردەگریت حەڵاڵی کەیت، خۆ پێم خۆشە لە بەغداشی هەرچەندە خێری پوشکەیەکت بۆ کورد نیە لەوێ، بەڵام هەر نەبێت خەڵك ڕزگاریان دەبێت لە هونەری جوێندان وشیراندنت کە تەنها هونەرە لێی شارەزایت.

٢٠١٥/٧/٢٧

ئەوە لینکی وتارەکەی مەلا سەلیم شوشکەیی یە:

https://www.facebook.com/mamosta.salim12/videos/715779231877758/?comment_id=716160455172969&ref=notif&notif_t=like&__mref=message_bubble

# لادانی سەلیم شوشکەیی نە لەبەر مرۆڤ دۆستی پارتییە ونە لەبەر پیاوچاکی سەلیم شوشکەیی نیە!

ئەو سەلیم شوشکەییە بوو کە هەزاران دەنگی خەڵکی هەولێری کۆکردەوە و کردیە کورسیەکی پەرلەمانی ناچالاکیتری کورد لە بەغدا! جارێك نوسیبووم: " مەلا سەلیم شوشکەیی، و مەلا وبانگخوازەکانیتر، کاتێ خەڵکی داماو دەنگیان پێ دەدەن، وادەزانن چۆن لەسەر مینبەر بێ کارەباش بێت، گەڕەکێك بە دەنگ ونەڕە نەڕیان جارِس دەکەن، بەو جۆرەش لە پەرلەمان بەرگری لە مافەکانی خەڵك دەکەن! نوکتەکی خۆش، دەڵێن ڕۆژنامە نووسێك چویتە لای ئەو مەلا سەلیم شوشکەیی یە بۆ چاوپێکەوتن لەسەر پەیوەندیەکانی عێراق و کوردستان، مەلا فەرموویەتی موقابەلەی سیاسی ناکەم!!

باشە ئەگەر تۆ سیاسی نیت و موقابەلەی سیاسی ناکەیت بۆ کورسیەکی سیاسی کوردت گرتوە لەو پەرلەمانە؟! ئەی ئەو مووچە زەبەلاحەت لە پەرلەمان بۆ خوتبە پڕ جوێنەکانت وەردەگریت؟! با خەڵکی نەزان و ساویلکە باش بزانن، کەسێکی سیاسەتزانی کوردپەروەر دیندار بێت یان نەبێت هەزار قات لەو مەلا بەلاّیانە باشتر نوێنەرایەتی خەڵك دەکەن، کە مینبەر بەکار دەهێنن بۆ لەکەدارکردن وناوزڕاندنی خەڵك و فێرکردنی خەڵك بە ڕەوشتی خراپی دەمپیسی وجوێندان وتوندوتیژی. خۆ ئەگەر موقابەلەکە لەسەر فاروق ڕەفیق بوایە دەتکرد، تا هەزار جوێنی مینبەری ترشی بۆ بنێریت!

پارتیش هەتا لە مانگی هەنگوینی بوو لەگەڵ کۆمەڵ کێشەی یاسایی نەبوو لەگەڵ پەرلەمانتاری و وتار خوێنی سەلیم شوشکەیی، بەڵام کە پەیوەندیە دۆستایەتیەکە کۆتایی هات ئیتر ئەویش زانی کە یاسایەک هەیە ناهێڵێت یەکێك ئەندام پەرلەمان بێت و وەزیفەیەکیتریشی هەبێت! ئەوەیە هۆکارەکە، نەك هۆکاری دەنگی جیاواز وەك سۆران عومەر لافی پێ لێدەدا، دەنگی جیاوازی چی لە مەلا شوشکەیی دەردەچێت؟! چما لە بەغدا کەس گوێی لە دەنگی بووە؟! لە هەولێر ئازایە هاوارکات بەلاّم نەك دژی گەندەڵی وناعەدالەتی و داعش، بەڵکو دژی ڕۆشنبیرێکی وەك فاروق ڕەفیق کە یەك عارەبانە جوێنی پێ دەدات لە وتارێکی ئەو ساڵەیدا.

٢٠١٦/١/٢

# تێڕوانینی سووك بەرامبەر ئافرەت
# لە فەرهەنگی سووك سەرچاوە دەگرێت

من لە دەیان ڤیدیۆدا سوکایەتیکردنی ئەو دکتۆر عبدالواحیدەم بەرگوێ کەوتووە دژی ئافرەت، بەڵام من نازانم ئەو پارچە ڤیدیۆیانە بکرتێنم وەك پارچە نوسین، ئەوەی ئەو ڤیدیۆیە هاوپێچەی بەرهەم هێناوە دەستی خۆش بێت، بەڵام زۆر زۆرتری ماوە لە سوکایەتیەکانی بۆ ئەوەی بخرێنە سەر ئەو ڤیدیۆیە.
گوێی بۆ بگرە بزانە چۆن بە ئافرەت دەڵێت بەلەبەرکردنی جل وبەرگێك سووك و سەلیم دەبیت!
ببینە چۆن خەون بە ژنانی سەردەمی [سێ جار بیست و دە] ی نەخوێندەوار دەبینێت، کە لە شەرمی پیاو نەوێرن ئاویش بە ئاشکرا بخۆنەوە! چونکە لای ئەو دکتۆرە بلیمەتە، لە بنەڕەتدا ئافرەت بۆ ئەوە نەکراوە پێ بنیتە دەرەوە، و دەڵێت تۆ بۆ دەرەوە نەکراویت، یانی دەبێت هەموو ژیانی لەناو قەبری ماڵە باوک و ماڵە مێرد بەسەر ببات!
ئەو ژنەی وانەبێت ئەوە جاهیلە، زاراوەی جاهیل ئیسلامیەکان بۆ هەموو موسڵمانێکی غەیری ئیسلامی بەکاری دەهێنن لە نێوان خۆیاندا، کە بەرامبەری زاراوەی موسڵمانە، دەڵێن فلان موسڵمانە؟ دەڵێت: نا جاهیلە! یان بەڵێ موسڵمانە! بۆ کچ و ژنی سفوریش بەکاری دەهێنن، هەر ئافرەتێك بەس سەرپۆشی نەبوو ئەوە جاهیلە لە تێڕوانینی ئەو عەقڵیەتە بەدەویەی عەرەبی، ئینجا با مەدام کۆری یش بیت!
ئەو دکتۆرە بلیمەتە لە ڕووی دەروونیە لەوە دەچێت هێشتا ئارەزووی ئافرەتکردنی نەشکا بێت بە چوار یان سێ ژن علی اصح الروایات! دەڵێت دەچیە بازاڕ چاوت بە ئافرەتی سفور و جوان و وروژێنەر دەکەوێت: منیش ئافرەتێکم بەستۆتەوە لە ماڵەوە کە دەچمەوە گیانی هەمووی بۆنی چەوری و مەتبەخی لێ دێت؟!
ببینە چۆن دەڵێت منیش ئافرەتێکم بەستۆتەوە، وەك چۆن وشترێك یان بزنێك دەبەستیتەوە لە ماڵەوە!
ئەو گوزارش لەو ڕێزە ساختەیە دەکات بۆ ئافرەت، کە ئیسلامیەکان شەو و ڕۆژ بەسەری دا هەڵدەڵێن!
ببینە ئەو هاڤدژیەی؟! لەلایەك ئافرەت بۆ دەرەوە دروست نەکراوە، کە لە ماڵەوەش بوو دەبێت تەنها خەریکی چێشت و خاوێنکردنەوە بێت، هێشتا سەرکۆنەی بکەیت چونکە بۆنی مەتبەخی لێ دێت! باشە تۆ دەتەوێ لە ماڵەوە دانیشێت دکتۆرا بخوێنێت؟!
ئەوە تۆی ئەو ڕۆڵەت بۆ دیاری کردوە، و پێت ناخۆشە بێتە دەرەوە و بخوێنێت و چاوی بکرێتەوە، نەوەك لێت یاخی بێت بەپێی دەستوری کۆنی دێرینی باوکسالاری، کە هەردەم بە چاوی پڕ گومان و پارەنۆیدی دەڕواننە ڕەگەزی مێ!
سوکایەتی ئەو پیاوە بەڕادەیەك دەگات دەیەوێت گوایە نوکتەی خۆش بکات نازانیت چۆن هەزاران ئافرەت زامدار دەکات، و دەڵێت ئافرەتێك لە مامۆستایەك، مەبەستی مەلایەك دەپرسیت شەو دەخەوم

عەیبم نییە بەیانیان کە لە خەو هەڵدەستم دەموچاوم تەڕە! دیارە ئافرەت دەبێت پرسیاری پزیشکیش لە مەلا بکات؟! ئینجا لە وەڵامدا دەڵێت: بۆی مەگەڕێ ئەوە پیاوەکەتە کە لە ئینتەرنێت ئافرەتێکی جوان دەبینێت و بەراوردی دەکات لەگەڵ تۆ تفت لێ دەکات! ببینە نوکتەی وا سووکت گوێ لێبوە لە بـــانگخوازێکی بە حیساب دینی؟! ئەو بلیمەتە لە جیاتی بڵێت پیاوان، بە کارەکتەرەکانی ئینتەرنیت فریو مەخۆن کە بە هەزار مکیاژ و نەشتەرگەری جوانکاری و فێڵی کامیرا وا دەردەکەون، و کەسایەتی واقیعی نین! کەچی بە پێچەوانەوە کێشەکە دەورووژێنێت زیاتر، چونکە هەر ژن لە واقیعدا جیایە لە ئینتەرنێت!

باشە ئەو بلیمەتە لە خۆی ناپرسێت، بێگومان ناپرسێت چونکە لای ئەو ژن دەبێت شەرم لە ئاو خواردنەوەش بکات لە پێش پیاو! ئەگەر ئافرەتێك ئەو هەموو پیاوە مۆدێل و جوانانەی ئینتەرنێت بە ماسولکە و لەش ولاری وەرزشوان و قەد و باڵای بەرز و چاوی شین و سەوز و جوان دەبینێت، ناکرێت هەر بۆ نوکتە بیر لەوە بکاتەوە پیاوەکەی لە پەنجەرە فڕێ داتە خوارەوە؟! ئەوەی ژن وپیاو دەبەستێتەوە زۆر لەوە گەورەترە وەك پیاوی منداڵ سیفەت، کە ژنێکی تری کەمێك جوانتر دیت حەز بکەیت وەك ئەو منداڵە لەعابەکەت بگۆڕیتەوە! یان ئافرەت هەر ڕۆژەی بەدوای پیاوێك بکەوێت چونکە لە مێردەکەی جوانترە! ئەوەش تەنها بە خۆشەویستی و متمانەی دوو سەرە دروست دەبێت، نەك بەو نوکتە بێ تام و پڕ لە سوکایەتیانە بە ئافرەت.

بەداخەوە زۆر لە ئیسلامیەکان نمونەیەکی زۆر خراپیان پێشکەش کردوە لە بواری ڕەفتارکردن لەگەڵ ئافرەت وەك قەوارەیەکی مرۆیی ڕێزدار و خاوەن ماف، بەڕاستی زۆر فەشەلیان هێناوە لە ڕاگرتنی ڕێز و قەدر و هەستی ئادەمیانەی ئافرەت، ڕێزی ئەو ئیسلامیانە بۆ ئافرەت وەك ڕێز و حورمەتی ئەو مەلایەیە کە پاش ئەوەی جوێن بارانت دەکات، لە کۆتاییدا دەڵێت :لەگەڵ ڕێز و حورمەتما.

سەرچاوە: https://www.youtube.com/watch?v=Uj26BCoO5Cg

سێ شەممە, ٢٠ تشرینی یەکەم ٢٠١٥ ٢٢:٣٢

# ئیسلامی بوونیش خیانەتە
# لە جەستە و ڕووحی کوردبوون دختۆر عبدالواحید!

دکتۆرە بلیمەتەکە لە وتەیەکی نانەستەقدا دەڵێت: هەروەك چۆن شەرمە مرۆڤێکی کورد بەعسی بێت، ئاواش شەرمە موسڵمانێك عەلمانی بێت! چونکە بەعسی بوون خیانەتە لە کوردبوون، وعەلمانی بوونیش خیانەتە لە موسڵمان بوون!

لەو وتە کورتەدا دکتۆر عبدالواحید چەندین هەڵەی فیکری و مەنهەجی دەکات. چونکە یەکەم هەر بەعسی بوون بۆ کورد شەرم نییە، بەڵکو ئەردۆگانیبوون و وەهابی بوون و سەلەفی بوونیش شەرمتریشە بۆ کورد، کە هەموویان لەسەر بنچینەی زەوتکردنی کورد بوونت هەڵچنراون. بە دەگمەن کەسێکی ئیخوانی و نا ئیخوانی ئەردۆگانی نابینیتەوە کوردێکی باش بێت. موستەحیلە وەهابیەکی سەلەفی بدۆزیتەوە دوو لە سەدا خەیاڵی بۆ کورد ئیش بکات. هەر ئیسلامی بوون بە گشتی خیانەتێکە لە کوردبوون، چونکە ئیسلامیەکان نەیانتوانیوە نمونەیەکی ئیسلامی تەبا بە کوردبوون و نا وابەستە بە فۆرمێکی عەرەبی و تورکی و فارسی دابهێنن. بۆیە ئەگەر بەعسی بوون بە پاڵنەری ترس و هێز و زۆرەملێیی لەلایەن. کورد دەکرا، ئەوە زیانەکانیشی بەس مادی بوون، کارە قێزەونەکانی بەعسیە کوردەکان ستەم کردن و ڕاپۆرت لێدان و پیاو کوشتن و فشار خستنە سەر کورد بوون. خەڵکی زۆربەی دەیکورهاندن و خۆشیان هەستی شورەیی وخیانەت وەك ملوانکەیەك بوو بە ملیانەوە، لە خەویش لێیان جیانەدەبوەوە. بەڵام زیانەکانی ئیسلامی بوون بە فۆرمی عەرەبی و تورکی و فارسی، زیانەکانی بەر ڕوحی نەتەوە و کوردبوون دەکەوێت زیاتر نەك هەر جەستە.

چونکە لە ژێر پەردەی دیندا باشترین خزمەت و جاشایەتی بە فۆرمی ئیسلامیبوونی عەرەب و تورك و فارس دەکەن. لەو فۆرمە ئیسلامیە ناکوردیانە زمانی کوردی و ناوەکانی کوردی و داب و نەریتی کورد و خەونە مێژوویەکانی کورد و میزاجی کوردەواری هەمووی دەبنە قوربانی، زمان و کلتور و داب ونەریت و ناو و میزاجی نامۆ بە کورد. بە پێچەوانەی جاشەکانی بەعس کە بۆ پارە فشار و ستەمیان لە کورد دەکرد، ئیسلامیە کوردەکان خۆبەخشانە و هەر لە ڕاهی خوادا زۆر بە حەماسەتەوە ڕوحی نەتەوەیی و کوردبوون تێك دەشکێنن و توانیتیان نەوەیەکی کوردی بێ یادەوەری و بێ ڕووحی کوردبوون و بێ هەستکردن. بە کوردبوون دروست بکەن، ئامادەن میللەتی خۆیان بسڕنەوە لە پێناو وەهمەکانی ئیسلامی سیاسی.

گومانم نییە دکتۆر عبدالواحید و هاوڕێکانی تەنها لە کتێبە پووچەکانی سەلەفیەکان و ئیسلامیەکان کە لەسەریان نووسراوە: یهدی و لا یباع، فێری عەلمانیەت بووە. چونکە حاڵی ئەو وڵاتانەی عەلمانی و دیموکراسین پێکەوە دەبینین، کە چ بە هەشتێکیان لەسەر دنیا دروستکردوە، و چ عەدالەتێکی تێدایە

کە هیچ دینێك بە ئیسلامیشەوە نەیتوانیوە دادپەروەیەکی وەك ئەو سیستمە عەلمانیانە دروست بکات.
سیستمێك بچوکترین فەرق و جیاوازی لە نێوان هەڵگری دین و بیروباوەڕە جیاکان ناکات، جێگای توندڕەوترین دیندار و بێدینترین نادینی لێ دەبێتەوە.
حاڵی حوکمی ئیسلامی سیاسییش دەبینین لە سعودیە و ئەفغانستان و ئێران و تورکیا و داعشی موسڵ و ڕەقە و سۆماڵ و بوکۆ حەرام کە چەند دڕندە و مرۆکوژن، چۆن مرۆڤ لەسەر جیاوازی دینیان و بیروباوەڕ تەفروتونا دەکەن.
کەوابوو عەلمانیبوون خیانەتە لە توندڕەوی وتیرۆرستی و دواکەوتوویی و مرۆکوژی و ئیسلامیزم نەك خیانەت بێت لە موسڵمان بوون و کوردبوون . بەڕای من ئیسلامی بوون بەو فۆرمە بێگانانە خیانەتە لە موسڵمان بوون و کوردبوون .
کورد سەرەڕای دەرد و کێشەکانی لەگەڵ دوژمنانی ناوچەکە، تەنها خاڵێکی جوانی تێدا بێت ئەو ئاڕاستەیە عەلمانیەیە، کە هاوسۆزی دنیای پێشکەوتووی بۆ خۆی کێش کردوە. ئەگەر کۆمەڵگای کوردی لە ژێر دەستی دکتۆر عبدالواحید و دکتۆر قەرەداغی و دکتۆر عبداللطیف و مەلا سەمەد و سوسەیی و کێ و کێ بوایە، ئێستا کوردستان ویلایەتێکی بن دەستی داعش بوو بە ئەمیرایەتی دکتۆر عبدالواحید .
کەوابوو :
هەروەك چۆن شەرمە کورد بەعسی بێت، ئاواش شەرمە کورد ئیسلامی تورکی و عەرەبی بێت، چونکە بەعسی بوون خیانەتە بە جەستەی کورد، ئیسلامی بوونیش خیانەتە لە جەستە و ڕووحی کوردبوون.
٢٠١٦/٦/٦

# کوڕە ناوێری باسی بکەیت دەڵێن دکتۆرێکی چاکە؟!

هەر باسی عبدالواحید بکەیت، سەد کەس دەڵێن دکتۆریکی باشە و بە خۆڕایی چارەسەری هەژاران دەکات و لەو قسانە! من گومانم نییە ئەو کارانەش هەر بۆ ڕاکێشانی خەڵکە بۆ ناو مێگەلی توندڕەوی، هەتا واش بێت ئەگەر جەستیەک چارەسەر بکات بە خۆڕایی، ئەوە هەزاران جەستە و مێشک ژەهراوی دەکات بە ئایدیا توندڕەوەکانی..

کاتێ عەبدولواحید ئەو ڕوئیا توندوتیژانەی دەخاتە ڕوو لە دژی خەڵکانێکی عەلمانی و یەزیدی ومەسیحیەکانی و غەیری ئەوانیش بە ئاشکرا بێگومان زیان لە ڕیزی کورد دەدات بەرامبەر دوژمن! دەسەڵاتی کوردی تەنها شانازیەکی هەبێت لە جیهاندا ئەو لێبوردەییە بەرامبەر فرە نەتەوەو فرە ئاینەکان، عبدالواحید دەیەوێت وەك وڵاتانیتر بێت دژی غەیرە موسڵمان بێت بە ڕیوایەتگەلێك، کە داعشیش پشت بەو ڕیوایەتانە دەبەستێت بۆ ئەنجامدانی تاوانەکانی.

ئەو سووک سەیرکردنی ئافرەت بە جۆرەها تەکنیکی دینی، کاتێ هانی باوکەکان دەدات کچانیان لە قوتابخانە بێنەدەرێ وزوو بیاندەن بە شوو، وەك دایك وداپیرەکانیان، کاتێك داوا دەکات لە باوکان و پیاوان هەموو ئامرازێکی پێشکەوتووی تەکنۆلۆژی لە کچانیان قەدەغە بکەن لە ئینتەرنێت و مۆبایل و هتد..یانی بە عەقڵیەتی زیندانیکەر مامەڵەی ئافرەتەکانمان بکەین، نەك عەقڵیەتی پەروەردەیی و ڕاستگۆیی و ئاڵوگۆڕی متمانە !بێگومان ژیانی زۆر لە کچانمان دەکاتە دۆزەخ بەدەستی باوک و برا و مێردەوە بەو هاندانە.

کاتێ هانی باوکان دەدات تاکو منداڵیان تەنها فێری عەرەبی بکەن ، و قێزەون کردنی فێربوونی زمانی ئینگلیزی، یانی نەوەیەکی نەزان و تەنها شارەزا بەدینێکی تایبەت بەرهەم بهێنین، کوردستان بکەینە شاری قومی موقەدەسە هەمووی ببنە مەلا! ئەوە زیان لە ئایندەی کۆمەڵ ومنداڵەکان دەدات. کاتێ بەها سەلەفیە دواکەوتوەکان زیندوو دەکاتەوە لە حەرامکردنی وێنەکێشان و یاری و نیقاب پۆشین و حەرامکردنی هەموو خۆشیەکی بەری، بێگومان مەترسیە بۆ کۆمەڵگای هاوچەرخ. کاتێك داوا لە باوکان ودایکان دەکات دانیشن وەك قورئان منداڵانیان فێری وانەی جیهاد وغەزاکانی ئیسلام بکەن، بێگومان نەوەیەکی شەڕانگێز وتوندوتیژ بەرهەم دەهێنێت. بێگومان هەر عەبدلواحید نیە لەو مەیدانە، لەویش ترسناکتر هەیە، مەترسیەکەش هێندە لە قسەکان نییە، ئەوەندەی لە ساویلکەیی دینی خەڵکی کوردستانە کە زۆر کوێرانە بە گوێی قسەی مەلا و بانگخوازەکان دەکەن.

میللەت پرێس ٢٠١٦/٤/٦

# ئەوە ڕونكردنەوە نیە دكتۆر عبدالواحید
# ئەوە بە چۆك داهاتنە بەرامبەر ویستی خەڵك!

سەرسامەكانی عبدالواحید سەرەڕای ئەو هەموو قسە ڕوون وئاشكرایانەی لە دژی سەنگەری پێشمەرگە و نیشتیمان و هاولاتیانی دین و رۆڵەكانی تری كوردستان بە كوردیەكی ڕەوان كردنی ، هێشتا بەرگریەكی سەختیان لێ دەكرد كە گوایە ئێمە و خەڵك لێی تێناگەین، دەنا ئەو باسی شتی وای نەكردوە!

بەلام شوكر بۆ خوا كوردستان سەرەڕای ژەهراوی بوونیشی بە ئایدیای مەلا وبانگەوازە داعشی وسەلەفیەكان، بەلام بای ئەوەی خێری تێدا ماوە كە هینی ڕەش وسپی لێك جیاكەنەوە! پاش هەڵمەتی ڕیسواكردنی ئەو لێدوانانەی دژ بە كورد و پێشمەرگە و سەنگەری پیرۆزیان، وشوبهاندنیان بە سەنگەری كوفر، وتەكفیر كردنی سەركردەكانی كورد بە تێكڕا، ماعەدا ئیسلامیەكان هەڵبەتە! ئەو ویست وهۆشیاریەی خەڵك چۆكی بەو دكتۆرە خۆپەسندە دادا، وبە ناچاری ئەمڕۆ لە ٢٠١٥/٣/٢٢ [ڕونكردنەوەیک لە (د.عبدالواحد محمد )] ی نوسیوە، كە سەرتاپای پینە وپەڕۆكردنی لیدوانە ناماقوڵەكانیەتی. دیارە ئاڕاستەی "گشت دام و دەزاگاكان و كە ناڵەكانی ڕاگەیاندن . برا پێشمەرگەكانمان لە سەنگەرەكانی بەرگری دا كەس و كاری سەر بەرزی شەهیدان" ی كردوە!

كام شەهید تۆ نەتوت ناوی شەهید لەچێگەی خۆی نیە بۆ ئەوانەی لەو سەنگەرە دەجەنگێن؟ " زۆرم پێ سەیرە ئەبینم خەڵكێك زۆر بەسادەیی ناوی "شەهید" بۆ كۆمەڵێك شوێن بەكار ئەهێنن كە لایق نیە بۆی" لە خاڵی یەكەم دەبێتە دڵسۆزی كورد پاش ستایشی پێشمەرگە:

"بە درێژایی مێژووی كورد ، پیشمەرگە زاراوەیەک بوە جێگەی شانازی هەمو كورد بوە بە بیرە جیاوازەكانیەوە وە هەر ئەوان خاوەنی شەرەفی ڕاپەڕین و ئازاد بونی گەلی كوردن و ئەركێكی شەرعیان ئەنجام داوە ، بەلام بەداخەوە ئەوەی پێشمەرگە لەسەر خاك دەستی كەوتوە لەسەر مێزی گفتوگۆ بازرگانەكان و بەرپرسەكان دۆڕاندویانە."

ئەگەر جەنگی پێشەمەرگە لەسەر خاك هێندە گرنگە و جاهیلیەت نیە ئەی ئەوە قسەی كێیە؟ ئەوە دەقی قسەكانت نیە: " ئەوەی كە ئەمڕۆ لەسەر ئەساسی خاك دروست ئەبێ؛ باطیلە، ئەوەی لەسەر ئەساسی نەتەوە دروست ئەبێ؛ باطیلە. ئەوەی لەسەر ئەساسی عەلەم دروست ئەبێ؛ باطیلە. ئەوەی لەسەر ئەساسی عەشیرەت دروست ئەبێ؛ باطیلە""

یانی كێشەی تۆ دۆڕاندنی دەسكەوتەكانە لەسەر مێزی گفتوگۆ؟ تۆ لە كاتێكدا داعش تیرۆرستی بۆ دێت لە هەموو دنیا، دەتەوێ بەرەی كوردیش پارچە پارچە بكەیت، ودەڵێیت: "" ئەی تۆ چۆن ئەچیتە ناو سوپایەكی كوفرەوە كە عەلەمەكەی لەوپەڕی شیوعی و بێدینەوە تیایەتی تا ئەوپەڕی نەصرانی و ماسۆنیەت؟ نازانیت ئەم عەلەمە چیە، نازانیت ئەم كۆمەڵە چیە، نازانیت ئەم سەنگەرە چیە. پەنا ئەگرم

بە خوا لەوەی لە سەنگەرێکی ئاوادا بمرین و لە شوێنێکی ئاوایا گیانمان بسپێرێ."

ئەوە چ پاشگەزبوونەوەیەکە وات لێدەکات وا پێچەوانەی قسە قەڵەوەکانی خۆت بکەیت وا نکوڵیان لێبکەیت؟!

ئینجا لە خاڵی دواییدا دەڵێت:

" ئەم وتارە هی ساڵی پارە و ئێستا نیە و بڵاوکردنەوەی لە ئێستادا بە شێکە لە چەواشەکاری ڕای گشتی و شێواندنی ڕاستیەکان. " ساڵی پارە کەی؟ مانگی ۱۲ و ۱۱ ش ساڵی پارە، هەموو ئاماژەکان دەڵێن هی مانگی ۱۱ ی ۲۰۱٤ یە، یانی لە گەرمەی شەڕی داعشدا لە دژی کوردستان! هەتا ئەگەر زۆر کۆنتریش بێت هیچ لەو وتارە فکری وعەقیدەییەی وەلا وبەڕای سەلەفی کەم ناکاتەوە! تۆ بەو پێشمەرگانە ناڵێیت: "" تۆ بە چ ڕویەکەوە ئەچیتەوە بەر دەستی خوا و ئەڵێیت: خوایە! لەپێناوی خاکێکا گیانم بەخشی؟! خاکێ دیفاعی لێ ئەکرێ و شەڕی لەسەر ئەکرێ کە بەرنامەی خوای تیا بێ، ڕێبازی خوای تیا بێ، پەیامی خوای تیا بێ. دیفاع لە بەرنامەکە ئەکەیت کە لەسەر ئەو خاکە تەتبیق ئەکرێ، لەبەر خوا."

ئینجا لە خاڵی سێیەم دەڵێت:

"ئەم وتارە نزیکەی کاتژمێرێکە ، بەڵام بە داخەوە چەند کۆپلەیەکی پچڕ پچڕی لێ بڵاو کراوەتەوە کە ئەویش بە مەبەستەوەیە ئەگەر هەموو وتارەکە وەک خۆی بڵاو بکرێتەوە ئەوە هەموو ڕاستییەکان وەک خۆی دەردەکەوێت. " قەسەم بە قورئان ئەگەر هەموو وتارەکە بڵاوبکرێتەوە وەك من گوێم لێی بووە، دەبێت هەر ئەو ئێوارەیە بەرەو سنورەکان داعش بە ڕێ بکرێیت! ماشەڵڵای لێبێت باقی وتارەکەی عەقڵ وعیرفانی لی دەچۆڕێت!

لە خاڵی چوارەم دەڵێت:

"بە درێژایی وتارەکە من ناوی پیشمەرگەم بە هیچ شتێک نەوتوە و هەڵوێستیشم وایە کە هەر پیشمەرەگەیەکی باوەڕدار لە پێناوی ئاین و خاک و ئابڕودا بکوژرێ شەهیدە. "

کە شەرمە یەک سەعات باسی پێشمەرگە بکەیت، دوایی بڵێی ناوم نەهێناون! تۆ نەك هەر ناویان دەهێنیت بەڵکو هەموو باسەکەت بۆ سپیکردنەوەی ڕووی داعشە، وبە ئیدانەکردنی پێشمەرگە نا موسڵمانەکانی وەك ئێزدی و مەسیحی و کاکەیی، کاتێ تۆ دەیکەیتە دوو بەرەی هەق و باتڵ کە دەڵێیت:

" کاتێک دو جەیش بەرامبەری یەکتری ئەوەستن؛ ئەگەر ئێمە لە تەرەفی بەرامبەر [مەبەستی داعشە] گومانمان هەبێت کە ئایا بۆ خوا نین یان بۆ خوان . کە ئەوە ئەمێنێتەوە بازاڕی خوا .، کە وەکو شەخصی خۆمان قەناعەتمان پێی نیە- هێشتا باوەڕی پێ نیە؟! - ؛ بەڵام خۆ سەنگەرێکی تر کە بەرامبەری وەستاوەتەوە [مەبەستی هێزی پێشمەرگەی کوردستانە] هیچ گومانمان لێی نیە کە قیاداتی ئەسڵەن ڕۆژێک لە ڕۆژان لە نوێژ وعیبادەتدا نەبینراون، لە عەمرەیا نەبینراون، ڕۆژێک لە ڕۆژان ناوی خوا . وەکو عورفێک نەبێ . بە دەمیانا نەهاتوە."

ئەی فەتوای ئیبن بازی گەورە کاهینی سەلەفیەت ناهێنیتەوە کە دەڵێیت لێیان پرسیوە "جائیزە

گوێڕایەڵیمان بۆ دەسەڵاتێک هەبێت کە بەرنامەیەکی عەلمانیی هەبێت؟"، ئەویش وتویەتی: "هەر بەوەی بەرنامەی عەلمانیی هەیە؛ تەکفیر ئەکرێ، ئەوەیش پێی نەڵێ کافر؛ گومان لە ئیمانی ئەکرێ."

مەڵێ وام نەگووتوە و مەبەستم وا نەبوە، چونکە ئەوە سەردەمی قال وقیلەی بەدەم نییە، بە کەیفی خۆت دەستکاری بکەیت ونکوڵی لێ بکەیت، بڵێ هەڵەم کردوە لەو بیروباوەڕە داعشیانە، بڵێ تۆبەم کرد لەو قسە بێ مستەوایانەی دژی پارێزەری خاك میللەت کردمن، بڵێ ئەو وەلا وبەڕایە کاری بەو سەردەمە نەماوە، مرۆڤ لە مەودوا دەبێت لەسەر ئاستی هاولاتی بوون مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، نەك چەمکێکی وەك وەلا وبەڕای کە نێوەی جیهانی ئیسلامی وێران کردوە، نیوەکەی تریش بەڕێوەیە!

قسەی زۆرتریش هەڵدەگرێت، بەلام با ئەوەندە بەس بێت جارێ، بۆ ڕەواندنەوەی ڕوونکردنەوە چەواسەکاریەکەت!

٢٠١٥/٣/٢٢

# مونازەرەی بۆچیە، بێ مونازەرەش کەوتووە!

کەسانێکی سەرسام بە مەلا و بانگخواز دکتۆر عبدالواحید ماوەیەکە بە نهێنی وئاشکرا نامەم بۆ دەنووسن دەڵێن: ئەگەر تۆ هێندە خۆت پێ زانایە وەرە مونازەرەیەکی ئاشکرا بکە لەگەڵ دکتۆر عبدالواحید بزانە چیت پێ دەکات؟!

ئەو برادەرانە وادیارە بەو مونازەرانەی سەر داروێنیزم و ئیسپاتی وجودی خوا بوغرا بوون، کە کەسانێکی بێ سەروبەر و نا پسپۆر چوونە ناو ئەو باسانەوە.

من سەیرم پێ دێت لە جیاتی ئەوەی لەسەرخۆ گوێ بگرن بزانن خەڵك چی دەڵێت لەسەر ئەفکارە بێ سەروبەرەکانی دکتۆر عبدالواحید وهەڵە زەقەکانی ببینن، پێیان خۆشە لە دوو سەعات بگەنە هەق وهەقیقەت کە وەک شەڕە کەڵەشێری لێدێت، کە تەنها لەبەرزکردنەوەی ئاستی حەماسەتی جەماوەری هەردوولا زیاتر کەم جار هەقیقەتێك دەردەخات.

من وەك یاری تۆپی پێ و بۆکسێن ناڕوانم لە مونازەرە و ململانێی فیکری، ساغبوونەوەی فیکری نیوان دوو کەسی جیاواز پێویستی بە دەیەها سەعاتی بەردەوام هەیە باشترە وەك زنجیرەی دراما خەڵك سەیری کەن پاش تۆمارکردنی و تەواوبوونی.

من زۆر دوورم لە کوردستان لە ڕووی جوگرافیەوە، هێندە حەزیشم بە دەرکەوتن نیە لە شاشەی تەلەفزیۆن ، وەك مەلا وبانگخوازەکانی ئەو سەردەمە، کە زۆرترین کاتی میدیاکانیان داگیرکردوە، بێ ئەوەی کەس هەست بە مەترسی ئەو تەوژمە ترسناکەی کە دروست دەبێت لە سایەی ئەو هەموو کات و وتارە! من زیاتر کەسێکی لێکۆڵەر و نووسەرم. ئەگەر هاتوو مونازەرەشم کرد لەگەڵ دکتۆر عبدالواحید، ناچم لەگەڵی باسی ئیمان بەخوا و داروێنزم و زانستی پزیشکی بکەم، چونکە بابەتی من نین.

من باسی ئەو قەناعاتە مەترسیدارانەی دەکەم لە دژی نیشتیمان ومیللەت و پێشمەرگە و کوردستانیان! من ئەو ڕوئیا توندوتیژەی دەخەمە ڕوو کە دەربارەی یەزیدی ومەسیحیەکانی و غەیری ئەوانیش بە ئاشکرا دەریدەبرێت!

من باسی سووک سەیرکردنی ئەو دەکەم بۆ ئافرەت، کە هانی باوکەکان دەدات کچانیان لە قوتابخانە دەرکەن وزوو بیاندەن بە شوو، وەك دایی وداپیرەکانیان، وەك بە کچانی کۆڕێك دەڵێت: دەبیت کچانێکی وەك ئێوە خاوەنی چەندین منداڵ بن! باسی ئەوەی لەگەڵ دەکەم کە داوا دەکات لە باوکان و پیاوان هەموو ئامرازێکی پێشکەوتووی تەکنۆلۆجی لە کچانمان قەدەغە بکەن لە ئینتەرنێت و مۆبایل و هتد.. یانی بە عەقڵیەتی زیندانیکەر مامەڵەی ئافرەتەکانمان بکەین، نەك عەقڵیەتی پەروەردەیی و ڕاستگۆیی ومتمانەی ئاڵوگۆڕ!

من باسی قەدەغەکردنی فێربوونی زمانی ئینگلیزی لەگەڵ دەکەم، لە کاتێکدا خۆی بادەدا وفەخر بە

ئینگلیزی زانینەوە دەکات خۆی!

مـن باسـی زیندووکردنـەوەی ئـەو بەهـا سـەلەفیانەی لەگـەڵ دەکـەم لـە حەرامکردنـی وێنەکێشـان و یـاری و هەمـوو خۆشـیەکی بـەری.

مـن باسـی ئـەوەی لەگـەڵ دەکـەم چـۆن داوا لـە بـاوکان ودایـکان دەکـەیت دانیشـن وەك قورئـان منداڵان فێری وانـەی غـەزاکان بکەن؟!

من خاڵە هاوبەشـەکانی نیوان وتاری ئەو و وتاری داعشـی بۆ دەخەمە ڕوو کە دەڵێیت دوو لەتی سێوێکن!

لەنـاو میللەتانـی هۆشـیاردا پیاوێـك بـەو هەمـوو بیروبـاوەڕ سـەقەتەوە، پـاش نووسـینی پەشـیماننامەکەی بـە پێچەوانـەی قسـەکانی پێشـووی، بێ مونـازەرەش دەکـەوێت، بـەڵام سـەرسـامبووانی لـە نیمچـە خوێنـدەوارەکان بـەس دڵیـان بـە مونـازەرە ئـاو دەخواتـەوە، وادەزانـن نهێنـی ئـەو پیـاوە بـەس ئـەو کاتـە دەردەکەوێـت وەک گورگەکـەی عەزیـز نەسـین!

# لە چەواشەکاریەکانی دکتۆر عەبدلواحیدی سەلەفی
# ئینگلیزی زمانی بێ ئەخلاقیە و عەرەبی زمانی ئەخلاقە!

ژیان لای ئەو دیندارە سێ سەرینیە یانی بەس عیبادەت و نوێژ و ڕۆژو، و سەرجێیی تاکە موتعەیەکە لای ئەو، بۆیە هەر کات بەسەربردنێکی خۆش لای ئەو دیندارە غەزەبانە یانی گوناە و کات بە فیرۆدان و غەزەبی خوایە ! ئەو نەزانە نازانێت پێغەمبەر د.خ خۆی حەزی بە یاریکردن بوو لەگەل حەزرەتی عائیشە غاردانێی دەکرد! نازانی خەڵك هێندە حەزی لە چیرۆك و بەسەرهات بوو لە سەردەمی عومەر و پاش سەردەمی ئەو هەزاران چیرۆك خوێن [القصاصون] چیرۆکیان بۆ خەڵك دەگێڕایەوە وخەڵکیش لە وەعزی مزگەوتەکان گەرمتر پێشوازی لێ دەکردن. چونکە ناکرێت ژیان هەر بە مەوعیزەی دینیەوە پڕ بکرێتەوە [ان القلوب اذا کلت عمیت] دڵەکان کە ماندوو بوون کوێر دەبن! یانی تێلای عومەر بۆ ماوەیەکیش خەڵکی بێ بەش کردبێت لەو خۆشیە، لە پاش عومەر یان هەر لە ژیانی خۆشی بە دزیەوە، نەیتوانیوە خەڵك قەدەغە بکات لێی.

ژیان هەر نوێژ وتەسبیحات و کڕنۆس وسوژدە نییە، ژیان بەوەوە خۆشە بڕوانیە فیلمێك، زنجیرەیەك، بەرنامەیەك، فیلمێکی دۆکیومنتی، لەگەڵ دوو سێ برادەر دانیشیت بەس قسە بکەن، بەبێ غەیبەت بێگومان! کتێبێکی نوکتە بخوێنیتەوە ، یان بڕوانیە فیلمێکی کۆمێدی ، یان فیلمێکی عادل ئیمام ، یا بچیتە شانۆیەك بەس بۆ پیکەنین، پێکەنین وبەس.

لە هەمووی سەیرتر ئەو دکتۆرە غەزەبە شانازی بەوە دەکات کە کاتی خۆی لە تێستێکی زمانی ئینگلیزی زانکۆیەکی بەریتانی سەرکەوتووە، بۆ نەخوێندەوارە سەرسامەکانی باس دەکات، کەچی بە خەڵك دەڵێت ئینگلیزی زمانی بی ئەخلاقیە و عەرەبی زمانی ئەخلاقە.

ئەو دکتۆرە بێ دەماغە دەبێت بزانێت کە ئینگلیزی زمانی زانست و ئەدەب و هونەر و تەکنۆلۆژیایە، نەك بێ ئەخلاقی! عەرەبی ڕاستە زمانی دین و قوڕئانە، بەڵام لە ٢٢ولاتی عەرەبی یەکێکیان بە قەد مالیزیا و تورکیا سوودیان لە دین وەرنەگرتووە، سەرەڕای تێگەیشتنی زمانی عەرەبی و قورئان.

## منداڵان فێری شەڕو شۆڕی غەزاکان کەن وەك قورئان

کە دەڵێین ئەو دکتۆرە غەزەبە بەرهەمی هەمان کارخانەی داعشەو هەڵگری هەمان ئایدیا و بۆچوونەکانە، خەڵك وادەزانن ئێمە ئیفترای پێ دەکەین، ببینە چۆن لە جیاتی بڵێت منداڵانمان با پەروەردە بکەین لەسەر بەها جوان و مەدەنیەکان و شارستانیەکانی وەك ڕەحم وبەزەیی و ڕێزی یەکتر گرتن و ئاژەڵدۆستی و پاك وخاوێنی و مرۆڤ دۆستی، نیشتیمان پەروەری، دەیەوێت منداڵەکانمان پەروەردە بکەین لەسەر شەڕوشۆڕ و مەغازی، کە کتێبەکانی مەغازی پڕاوپڕن لە درۆ وتەهویل وموبالەغات

وتاوانی گەورەی خوێن ڕشتنی خەڵك بە ناهەق، کە نەک لە پێغەمبەر [د.خ] ناوەشێتەوە، بەڵکو لە هۆلاکۆش دوورە! نەك ئەوە بەڵکوو خاوەنی کتێبەکانی المغازی وەک ابن اسحاق و الواقدي و ابن سعد بە خراپترین شێوە ڕەخنە کراون وبەدرۆزن لە قەڵەم دراون، انس بن مالك دەربارەی سەرچاوەی سەرەکی کتێبی غەزاکان ابن اسحاق دەڵێت: (دجال من الدجاجلة) جادووکەرێکە لە جادووکەرەکان! کەچی کاك دکتۆر بە گریانەوە لە خەڵك دەپاڕێتەوە فێری منداڵان بکرێت ومێشکیان بە دەستی ئەو دەجەلە بشۆردرێت.

عەولواحید دەڵێت بەپێی ئەو ڕیوایەتە سەعد دەڵێت ئەوە شەڕەف و شانازی ئێمەیە منداڵەکان وەك قورئان فێرمان دەکردن! دەبێت ئەو منداڵانەی لەسەر شەڕ ومەغازی پەروەردە بکرێت، چ خاوەن دەرونێکی جەنگاوەری لێ دەربچێت؟! عەبدولواحید کاری داعشیەکان و دەستە خوشکانیان زۆر ئاسان دەکات، و لەجیاتی گرووپە داعشیەکان پێوەیان خەریك بن مێشکیان بشۆنەوە، باوك ودایکی کڵۆڵ لەماڵەوە منداڵەکەی ئامادە کات بۆ شەڕو شۆڕ و سەربڕین وسوتاندنی مرۆڤ و خۆ تەقاندنەوە، کە زۆربەیان لە کتێبەکانی مەغازی هاتووە! دکتۆری جەستە و پەتای مێشك پێی باشترە منداڵەکانمان لەناو جەوی شەڕ وشۆڕ و خوێن بن باشترە لەوەی حەزیان لە یاری تۆپی پێ بێت یان هەر وەرزشێکی تر، چونکە لای فەرهەنگی ئیسلامی تۆپی پێ پرۆتۆکۆلاتی حەکیمەکانی جولەکە دایانهێناوە، پیلانێکە دژی ڕەوشت وئەخلاق ودین.

سەتحیەت وبێ مستەوایی عەبدولواحید لەوە دەردەکەوێت کە ڕاستە قاتێکی شیکی [عەلمانی] لەبەرە و بۆینباغێکی [بیدعەیی] بەستووە، بەڵام تەنها دۆڵێکی بەتاڵی زایەڵەی کەللە پووتەکانی سعودیە وخەلیجە وەك ئەوان دەڵێت نابێت منداڵەکانمان تەماشای کارتۆنی مشك و پشیلە بکات وەڵلا بۆ؟ چونکە مشك بەپێی ڕیوایەتە خورافیەکان لە فەواسیقە! یانی عەبدولواحیدیش فەتوای تەکفیری میکی ماوسی دا.

باشە منداڵ یاری نەکات، وحەز لە تۆپی پی نەکات، هیچ وەرزشێك نەکات، تەماشای کارتۆن نەکات، ئەی باشە چی بکات، بەس دەرسی غەزاکان بخوێنێت؟! دەبێت ئەو منداڵانەی لە سایەی ئەو عەقڵیەتە پەروەردە بن چ مەلا شوانێك وزەرقاویەك و بەغدادیەکیان لێ دەربچێت.

# عبدالواحید سوکایەتی بە ئافرەت دەکات بەڕێز وحورمەتەوە!

# نەورۆز و مەلا سەمەد

لە نێو جیهانی ئیسلامدا ولە ناو گۆڕەپانی ئەوانەی کاری دینداری ئیسلامی دەکەن دوو عەقڵیەتی سەرەکی بەدیدەکرێت، یەکێکیان میانڕەو وگونجاو لەگەڵ عەقڵ ومەنتقدا، دوەمیان: تونڕەو وشەڕانگێژ بەبەردەوامی دژی هەموو شتە ژیربێژیەکان دەوەستنەوە بەناوی سەلەفیەت وگەڕانەوە بۆ سەردەمی زێڕینی سەلەفی صالح، من لەو وتارە دوەمیانم مەبەستە.

عەقڵیەتێکی توندڕەوانەی، چاویلکە ڕەش، دەق پەرستی وحەرفی، پێی وایە هەر کارێك پێغەمبەر و هاوەڵانی وشوێن کەوتەکانیان نەیان کردبێت، نابێت بکرێت، لە کاتێکدا ئەو کورت بینانە سەدان وهەزاران کار دەکەن ڕۆژانە بەبێ ئەوەی پێغەمبەر و هاوەڵانی وشوێن کەوتەکانیان کردبێتیان، ئەو عەقڵیەتە لە ناو نێوەندی سونە مەزهەبدا خاوەنی نەشازترین وبەرزترین ودزێوترین دەنگە، پێکەوەش لەگەڵ نیوەکەیتری عەقڵیەتی توندڕەوی شیعی خاوەنی گەورەترین کارەساتن کە بەڕێوەیە ولەو ڕۆژگارە سەرەتاکانی بەدیدەکەین لەو شەرە گەورە وبەرفراوانەی نێوان شیعە و سونەدا بە زمان وقەڵەم وتیڤی وکەناڵی ئاسمانی وئینتەرنێت وچەندین هۆی تر. مایەی گاڵتەجارییە کە ئەو دوو لایەنە شەڕانگێژە یەکێکیان نەورۆز تەحریم دەکات کە سەلەفیەکانن، کەچی شیعەکان رۆژەکە وا تەقدیس دەکەن لەڕادەبەدەر!

لە نێو نێوەندی سونیدا، ئەو برادەرانە کە ناو لە خۆیان دەنێن سەلەفی بە چاوی پڕ گومانەوە لە خەڵکانی دەوروبەریان دەڕوانن، وهەموو جوڵە وکردارێک پەیوەندیشی بە ئایین نەبێت دەیئاینێنن، وەک ئەو بابەتانە:

- دەستپێشخەریکردن لە سەلام بۆ نا موسڵمان حەرامە! ئەگەر لە ڕێگایەکدا دەڕۆیشتن کابرای نا موسڵمان ناچار بکە لە پەنا دیوارەکان بڕوات تۆ لە نێو سینگی ڕێگاکە بڕۆ!! بڕوانە ئەو دەروونە عەنتەرە بەناو دینەوە!

- حەرامە پیرۆزبایی جەژنی سەری ساڵ لە مەسیحیەکان بکەیت!! بڕوانە ئەو دەروونە پڕ لە حقدە کە هیچ حیسابێك بۆ هاونیشتیمانی ناکات!

- مەولودکردن بۆ پێغەمبەر بیدعەیە! هینەکەیان گەیشتە پێغەمبەریش!

- ژن نابێت بە تەنها سەفەر بکات ئەگەر لەسەروی پەنجا ساڵیش بێت، دەبێت مەحرەمی لەگەڵدا بێت.! چونکە چەمکی سەفەر هەر بە پێودانگی کتێبە کۆنە فیقهیەکانە کە بە حوشتر وولاغ سەفەریان دەکرد. بڕوانە ئەو عەقڵە چەق بەستوە!

- ژن نابێت سەیارە لێخوڕێت حەرامە، بۆ؟ نەوەک لە بیابانێك سەیارەکە بوەستێت، وپیاو خراپێکی لێ پەیدا بێت!! بڕوانە ئەو دەروونە نەخۆشە!

- بیدعەچی [هەڵبەتە بە مەفهومی خۆیان] نابێت برادەراتی بکەیت، سەردانی بکەیت، سەلامی لێبکەیت

وژن وژنخوازی لەگەڵدا بكەیت، ئەگەر مردیش نابێت بچیتە مەراسیمی ناشتنەكەی! بڕوانە ئەو دەروونە پڕ لە ڕق وكێمە لەسەر خودی موسڵمان، جا قوڕبەسەری ناموسڵمان!

ئەوە وگەلێك قسە وكاری منداڵكارانە كە هیچ سەنگی نییە لە واقیعدا.

بەو دوایە پاش ئەوەی ماندوو بوون لە قسەكردن لەسەر سەری ساڵ وجەژنی خۆشەویستی و دایک ونیشتیمان ودرەخت وجەژنی لەدایک بوونی پێغەمبەر [ص] بایان دایەوە سەر نەورۆز، ئەو نەورۆزەی كە لەوەتی كورد هەیە ئاهەنگی تێدا دەگێڕێت، ئەو بێ ئیش وكەللە بۆشانە دەیانەوێت بە تازەكی لە خەڵكی كوردی حەرام بكەن ودەیانەوێت كوردیش ڕوانگە ڕەنگینەكەی وەک سروشتە ڕەنگینەكەی بگۆڕێتەوە بە ڕوانگە خێڵەكیەكەی سەلەفیەتی دەوارنشینی فیقهی بەدەویەت وهەمان ڕوانگە ڕەشەكەی ئەوان بكاتە تارمایی سەر چاوانی. قسەكانی مەلا سەمەد وئەوانی تر دەقاودەق لە سایتی سەلەفیەكانی خەلیج گواستراوەتەوە بۆ نمونە بڕوانە ئەو بابەتە : [حكم الاحتفال بعيد النيروز] لەو لینكە: http://islamqa.info/ar/ref/101404 دەبینیت كە تەنها وەرگێڕدراوەتە سەر كوردی.

لە ڕووی مێژووییەوە قسەی زۆر جیاواز هەیە لەسەر ئەسڵی نەورۆز وهی كێیە وچۆن دروست بوە، زەحمەتە هیچ كامێكیان ساغ بێتەوە، بەڵام من كارم بە مێژوو نیە نەورۆز هی قیبتیەكانە یان هی دوژمنانی كوردە ئەوانەی ئیمپراتۆریەتی میدیایان ڕوخاند، یان كاوەی ئاسنگەر هەقیقی بوە یان ئەفسانە، یان زوحاك ئەسڵی هەیە یان ئەفسانەیەكی فیردەوسییە..هتد، بەڵام ئەوەی من دەیزانم ئەوەیە و بە پێی ئەو لێكۆڵینەوانەی لەو بوارەدا كراون نەورۆز پێشینەیەكی دووردرێژی هەیە و كۆنترین جەژنی مرۆڤە لە سەر زەوی. ، كۆنترین مرۆڤەكانی سەر گۆی زەوی كە لە ئەشكەوتەكاندا ژیاون، ڕۆژی یەكەمی بەهاریان كردووە بە جەژن. نەورۆز ئەوەندەی مێژوو ئاگادارە لەوەتی كورد و مرۆڤ هەیە ئاهەنگی بۆ دەگێڕدرێت. لە پاش هاتنی ئیسلامیشدا كورد ونەتەوە ئیسلامەكانی تر هەموو كاروبارێكی پێچەوانە بە ئایینی پیرۆزی ئیسلامیان خۆویستانە فەرامۆش كرد ئەگەر دژایەتی كردبێت لەگەڵ عەقیدەی ئیسلامی، بەڵام زانا وداناكانی ئیسلامی كورد، كە زۆر ژیرتر بوون لەو كۆلكە سەلەفیە شەڕانگێژانەی ئەو ڕۆژگارە پڕ لە بەدبەختیەی كورد، هەر زوو هەستیان بەو جیاوازیە كرد لە نێوان بۆنەی ئایینی وبۆنە وكایەی نیشتیمانی یان بۆنەی سروشتی وبەدرێژایی تەمەنی ئیسلامیش یادی ئەو بۆنەیە كراوەتەوە لە نێو كوردا ونەورۆزیش لە هەموو دەقە كۆنە كوردیەكان ئاماژەی پێكراوە، ولەلایەن سەدان شاعیری كوردی موسڵمانی پایە بەرزی وەک ئەحمەدی خانی وجزەیری ونالی وحاجی قادر ومەحوی ئاماژەی پڕ لە جوانی بە نەورۆز كراوە لە كاتێكدا پەنجەی هەریەک لەو شاعیرە موسڵمانانەی كورد هەزار كۆلكە سەلەفی وەک مەلا گەرمیانی و مەلا سەمەدە توندڕەوەكان دەهێنێت، كە دەیانەوێت یادەوەری كورد وێران كەن وكۆنەست وهەستی خۆشی منالی وگەنجی كورد بسڕنەوە.

مەلا سەمەد دەڵێت نەورۆز حەرامە، چونكە پێغەمبەر وسەحابە نەیان كردیە، ئەخر پێغەمبەر وسەحابە كە عەرەب وقوڕەیشی بوون لە كوێ ئاگاداری نەورۆز بوون تا بیكەن یان نەیكەن.

نەكیرەیەكی بی مەعریفەی تر دەڵێت: " بەشداری كردن لە [نەورۆز] تیایدا لاسایی كردنەوەیەكی كوێرانەیە و هیچ بەڵگەیەكی لەسەر نی یە، پێغەمبەری خوایش صلی الله علیە وسلم ئاگاداری

کردووینەتەوە لەوەی کوێرانە لاسای گاوڕ و خاچ پەرستان و ئاگر پەرستان نەکەینەوە ...."
ئەو بیرکۆڵە دەڵێی باسی [ڤالنتاین] دەکات وکورد دوێنی فێری لاساییکردنەوەی نەورۆز بوە، نازانێت زۆربەی زۆری بەڵگەکان ئاماژە دەکەن بە کوردی بوونی نەورۆز لە بنەڕەتدا، ئینجا سەیر لەوەدایە تەنها دوازدە وڵاتی ئیسلامی بەڕەسمی ئاهەنگ دەگێڕن لە نەورۆزدا، خاچ پەرستی چی و ئاگرپەرستی چی، ئەو قسانە بکە نوشتەیەك وبیخە ناو ئاو وبیخۆرەوە بەڵکو مەنتقی خواروخێچتان کەمێك ڕاست دەبێتەوە.
دەقێك هەیە کە حەزرەتی عەلی کە ناسراوە بە حیکمەت پەسنی نەورۆزی کردوە، کەچی سەلەفیەکان ئەویش بەلێکدانەوەی سەقەت دەشێوێنن:
( أتى علي –رضی الله عنه- بهدیه النیروز فقال ما هذه؟ قالوا یا أمیر المؤمنین هذا یوم النیروز قال فاصنعوا کل یوم فیروز) واتە : ( دیاریەکیان هێنا بۆ ئیمامی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) بە بۆنەی نەورۆزەوە، عەلی فەرمووی ئەم دیاریە چیە؟ ووتیان میری ئیمانداران ئەوڕۆ ڕۆژی نەورۆزە، ئیمامیش فەرمووی هەموو ڕۆژێك بکەن بە [نەورۆز] فەیروز)
برادەرێکی سەلەفی کە تەرجەمەی ڕەشەبای سعودیە دەکات بە کوردی دەڵێت: لە وەڵامی ئەم جۆرە کەسانەی کە دەڵێن حەزرەتی عەلی پەسنی نەورۆزی کردوە "(شێخ سەفەر ئەلحەوالی) دەفەرموێت : ( ئیمامی عەلی ڕازی نەبوو تەنها ئیقرار بە ناوەکەیشیان بکات چی جای ئەوەی یادی بکاتەوە و خواردنیان بخوات، ئیمامی عەلی هەر حەزی نەکرد بڵێت نەورۆز بەڵکو فەرمووی فەیروز،)"
ناڵێ عەرەب بە سروشت نازانن ناوی غەیرە عەرەبی وەك خۆی گۆ بکەن وبەڕای من کۆڵەوارترین میللەتی دونیان لە بەدگۆکردنی ناوی میللەتانی تر، ئەو [نەورۆزە یان نورۆز] لە هەموو سەرچاوە ئیسلامیەکان پێی دەڵێن [النیروز]!!! یان هەر کاتی خۆی یەک کورد بە خزمەت پێغەمبەر گەیشتبوو ناوی [گاوان] بوە فەقیرە، کەچی هەموو سەرچاوەکان پێی دەڵێن [جابان]، هەرچەندە ئەو دەقە ئاشکرایە کە حەزرەتی عەلی هیچ ناڕەزایەکی دەرنەبڕیوە بەرامبەر نەورۆز وهیوادار بوە هەموو ڕۆژێك نەورۆز بێت بۆ ئەوەی خەڵک دڵخۆش بێت کەچی ئەو زانا سەلەفیە پێی وایە تەنانەت عەلی " حەزی نەکرد بڵێت نەورۆز بەڵکو فەرمووی فەیروز " ئەخر فەیروز مانای چییە؟ وچ ڕەبتێکی بە نەورۆزە، منیش دەڵێم کە کوردم وهەرچەندە سەلەفیەکانی کورد قسەی سعودیەکانیان لا گرنگترە: یان وەک گوتم حەزرەتی عەلی نەیزانیوە ناوەکە بە جوانی گۆ بکات، یانیش ئەوەی نوسیویەتیەوە هەڵەی تێدا کردوە.
ئەو جۆرە قسە نەشازانە پەیوەندیان بە گشتی مەلا وزانایینی کورد نییە، بەڵکو تەنها گوزارش دەکات لە کەمینەیەکی سەلەفی پیشەیان هەر تێکدانە، بەڵام سەدان مەلا سەمەد ونازانم کێ گەرمیانی ناتوانن قەناعەت بەو خەڵکە بکەن بەپێی فیقهی بەدەویەتی بەناو سەلەفیەت بڕۆن بەڕێوە، کورد لە بنەڕەتدا حەزی بە توندڕەوی نییە، وپێویستی بە فەتوای سعودی نییە تا فێری دینداری بێت بۆیە چاکترە خۆیان لەو باسە هەستیارانە نەدەن چونکە هێندە ئێسکیان سوک نییە تا قورستری کەن.
٢٠١٢/٣/٢٢

# مێسەجەکانی دڵشاد کەلاری
# لە چوارچێوەی خیتابێکی سواو وبەسەرچوودا!!

یەکێ لەکارە نا پرۆفیشنەڵەکانی میدیای کوردی ئەوەیە کە گوێ بە بابەتی نوسەران وهەستیاری کات نادەن، خۆی پێویستە کە یەکێک بابەتێک بۆ رۆژنامەیەک یان سایتێک دەنێرێت بەلای کەمەوە پاش رۆژێک کورتە وەڵامێکی بۆ بنێردرێت سەبارەت بڵاوکردنەوەی بابەتەکەی یان نا، بۆ ئەوەی کاتی بابەتەکە بەسەر نەچێ ولە شوێنێکی تر بڵاویکاتەوە، هەرچەندە لە ڕووی ئەخلاقی پیشەییەوە دەبێت (ئاوێنە) وهەموو ئەو بڵاوکراوانەی کەناویان لە خۆیان ناوە ئازاد کە بابەتێک لەلای ئەوان بڵاودەبێتەوە وەڵامی بابەتەکەش هەر لای ئەوان بڵاوببێتەوە نەک بەو گیانی نابەرپرسیاریەتە ڕەفتار بکەن، ئەوە هەر ڕەوشتی ئاوێنە نیە وهاوڵاتیش هەمان بەدخوویی هەیە وتەنها قۆرخ کراوە بۆ پێڕێکی سلێمانی وتاک وتەرایەکی دەرەوەی ئەوێ، ئاوێنە لە کێشەی (شوان محمد و دەزگاکەی شێرکۆ بێکەسیش) دزێوترین وهەلپەرسترین هەڵوێستی نیشاندا بە بڵاونەکردنەوەی نوسین ووەڵامەکانی تری کان (شوان محمد) لێرەشدا ئاوێنە لەبارەی نوسینەکەی دڵشاد گەرمیانی (کەلاری) سابقا وەک دەزگا بەدناوەکانی رۆژهەڵات دەکات کە تەنها ڕووی دزێوی ئیسلام وموسڵمانەکان نیشان دەدات وگوێ بە خیتابی موعتەدیل وژیاری موسڵمانان نادات.

بابەتەکە:

کاک دڵشاد گەرمیانی یان (دڵشاد کەلاری) ناوێکی دیاری گۆڕەپانی ئیسلامی چەکدارە وناسراوە بە هەڵوێستە توندەکانی وبەدەست خۆمان نیە هەرکە ناوی دڵشاد کەلاری دەبیستم شەڕەکەی بزوتنەوە ویەکێتیم بەبیردەهێنێتەوە کە لە کەلار ڕویدا و بە شایەدی خەڵکی بزوتنەوەش لەسەر قازێک بوو، وچەندین کەسیشی بوە قوربانی، بەڵێ قازێک یانی (وەزە) بە عەرەبی!! لەو وتارەدا کاک دڵشاد کەلاری چەندین مێسەج دەنێرێتە ئەم لاو ئەو لا لە وتارێک کە لە ڕۆژی ٢٠١٠/٧/٨ لە سایتی ئاوینەدا بڵاوبوەوە. مێسەجی یەکەم سەرزەنشتی سەرانی کۆمەڵی ئیسلامی دەکات کە چۆن ئەویان فەرامۆش کردوە لە ئێران وهیچ هەڵوێستێکیان نییە بۆ دەربازکردنی لەو مەنفایە ناچارییەی کە تێیدا دەگوزەرێنێت لە ژێر ڕەحمەتی ئێرانی شیعە، ئینجا تەسەور بکە دەبێت سەلەفیەکی ناوداری وەک دڵشاد کەلاری کە بێگومان شیعەی پێ کافرە بەپێی دەقەکانی سەلەفیەت چۆنی دەگوزەرێنێت لە ژێر دەستی ئێرانێکی شیعە کە هەر سەلەفیەک لە ڕوانگەیانەوە یەزیدێکە بۆ خۆی ئەگەر خراپتریش نەبێت! وادیارە کاک دڵشاد چاکی بۆ چووە کاتێک ئەو بێ بەهایەی کاڵاکەی خۆی دەگێڕێتەوە بۆ بنەماکانی سیاسەت کاتێک دەڵێت: " ئاشکرایە لەبازاری سیاسەتدا، هیچ کاڵایەک خاوەنی نرخی راستەقینەی خۆی نیە، چونکە بەرژەوەندی، نرخەکان دیاری دەکات، لەکوێدا بوو، لەچیدا بوو، کاڵایەکی گرانبەها دەبێ، گرنگ

نیە ناوو ناوەڕۆک چیبێ، بەرژەوەندی دەتوانێ ناوو ناوەڕۆک بگۆڕێ، چۆن بخوازێ بەو شێوەیە ناو دابتاشێ"

بەڕای ئەو سەرانی کۆمەڵ دوای دونیا وبەرژەوەندی دونیا کەوتون ولەو پێناوە ئیسلامیشیان گۆڕیوە بەڕای ئەو : (ئێمەی ئیسلامیش بەداخەوە کاریگەری هێرشو شالاوی بەرژەوەندیمان لەسەرە، گەمارۆی داوین، تەنگی پێهەڵچنیوین، تا ئێستا نەیهێشتووە ئیسلامێکی ڕاستەقینە بەکردەوە لەهەموو بوارەکاندا پیشانی خەڵکی بدەین، وایلێکردوین زۆرێکمان ناتوانین تەنانەت فەرمایشتەکانی خوداو پێغەمبەرەکەی(صلی الله علیە وسلم)وەکو خۆی بەڕوونو ڕاشکاوی بێگۆڕانو دەسکاری ڕابگەیەنین، قسەکانمان ئەوەندە سیاسیو لەپشت پەردەوە دەکەین نەک خەڵکی زۆرجار خۆشمان نازانین دەمانەوێ بڵێین چی؟

کاک دڵشاد کەلاری پێیوایە کەسانێک لەسەر ( حسابی کاری ئیسلامی، خەڵکێکمان قڕە وخەڵکێکمان پڕ، ئەوانەشمان قڕە، حەزمان لەبرنجە...)!

لای دڵشاد کەلاری کارەکەی پەرژەوند خوازی بەوە گەیشتوە کە دەقەکانی قورئان وسونەتی پێغەمبەریش بگۆڕن، ئەوەش تەکفیرکردنێکی ڕاشکاوی تێدایە بۆ سەرانی کاری ئیسلامی بە گشتی وکۆمەڵ بە تایبەتی، ولەسەرێکیترەوە تەکفیرکردنی گۆڕەپانی سیاسیە کاتێک تەشبیهیان دەکات بە یەهود وگاور بەپێی دەقی ئایەتەکەی کە بەبەڵگە هێناویەتی لەو دەقەی خوارەوەدا، لەو بارەیەوە دەڵێت: (بەرژەوەندی بەوەشەوە ناوەستێ دەخوازێ چاوێک بە دەقەکانی قورئانو سونەتیشدا بگێڕین، دەڵێ نابێ باس لەهەندێ ئایەتو فەرمودەش بکرێ،کە دوژمنانی ئیسلام پێی قەڵسنو دڵیان پێی توند دەبێ، نابێ هیچ خەتێکی سوورمان هەبێو خەتی سووری ئەوانیش ببەزێنین، بە دڵنیاییەوە دەڵێم پاش ئەمانەش هەر لێمان ڕازی نابن، وەک خودا دەفەرموێت

(ولنْ تَرْضى عَنْكَ الْيهُودُ ولا النَصارَى حَتَى تَتَبِعَ مِلَتَهُمْ)

مێسەجی دووەم بۆ ئێرانیەکانە تێیدا بەزمانی حاڵ نەک مەقال دەڵێت: ئەوەتە من وەک ئێوە دژی ئەو دەسەڵاتە وئیسلامیانەم کە دەتوانن لەگەڵ ئەمریکا هەڵکەن وهیچ کێشەیەک لە نێوانیاندا نییە، ئەوەتا ئیسلامیە جیهادییەکانیش هاندەدەم بۆ ڕاپەڕین ویاخی بوون لەو سەرکردە ئیسلامیانەی کە بەشداری ژیانی سیاسی هەرێم وعێراق دەکەن ودەبنە ئەندام پەرلەمان وخاوەن هاوپەیمانیەتی لەگەڵ حزبە عەلمانیەکان ودادەنیشن لە پەرلەمانی کوردستان وعێراقیشدا. بێگومان من ناتوانم هەموو ئیسلامیەکانی کورد بۆ ئێوە هاندەم وەک یەکگرتوو وبەشێکی گەورەی کۆمەڵیش، بەڵام هێشتا بای ئەوەندەی تێدا ماوە ئەو جۆرە خیتابەی من ختوکەیان بدات وهەست بەبێ عیزەتی بکەن ویاخی بن وسەرهەڵگرن بۆ لای مەنفاکەی من وپێکەوە بیانکەینە سوتەمەنی شەڕی ئێوە (ئێرانیەکان) و ئەمریکا!!" ئەوە ئێوە بە تۆپ وپلان پشێوی کوردستان دەشێوێنن منیش بە وشە و وتە وهاندان وتەکفیر وبزواندنی هەستی کەسانێکی سادە وساویلکە بە جیهاد وتوندوتیژی ئەو کارەی ئێوە دەکەم!!

مێسەجی سێیەم بۆ ئیسلامیە جیهادیەکانە لەوانەی پێیان وایە ڕزقیان تەنها لەژێر سێبەری شمشێرەکانیان

چنگ دەکەوێت و هێشتا کەڵکەڵەی شەڕانگێژی بەناوی جیهادەوە لە مێشکیان دەخولێتەوە، ودڵشاد کەلاری دەیەوێت هەموو بیردۆزو تیۆرە قوتبیەکانی (سەید قوتب) یان بەبیر بهێنێتەوە لەبارەی بەیەکداچوونی سەربازانی ئیمان وکوفردا بەبێ هیچ ڕەچاوکردنێک بۆ ئەو هەموو گۆڕانکارییە گەورانەی بەسەر بیری ئیسلامی سیاسیدا هاتووە تازە دەیەوێت بیانگێڕێتەوە بۆ خاڵی سفر ودابەشکردنی جیهان لەلایەن ئوسامە بن لادن بۆ ڕایەخی ئیمان وڕایەخی یان فوستاتی کوفر لەوبارەیەوە دەڵێت :( کاری سەرەکی خۆمان لێتێکدەچێ، نابینن دروشممان ئیسلامییە، کردەوەمان عەلمانی، خودا قورئانی بۆ ناردوین وەک تاکە دەستورێکی ژیان دەفەرموێ (إِنِ الْحُكْمُ إِلا لِلّهِ)کە چی بەڵێ بۆ باسێکی تێکلاو لەئیسلامو جاهلی دەکەین) ... (بیروباوەڕیش سەربازەکانی خاوەنی ورەو ڕێزو متمانەو قەناعەتن، خۆڕاگرو کۆڵنەدەرو یەکلان، تەمەندرێژو دامەزراون، کەواتە بیروباوەڕ بەدڵنیاییەوە شەڕدەکات، سەرکەوتنی مسۆگەرە، نە بە سەروەتو سامان سەربازەکانی دەخەڵەتێن، نە بەهێزی زەبەلاحی بێگانەو تۆپو تانکو ئاسایشو هەواڵگری دەفەوتێن، مەگەر ناخی ئادەمیزادی خاوەن بیروباوەڕ هەڵکۆڵرێ، جەرگو هەناوی دەرهێنرێ، مێشکی پانکرێتەوە، ئەوکاتەش بەرژەوەندی دێتەسەر لاشەی مردوو، دڵنیا دەبی کە خاوەن باوەڕان بە باوەڕەوە دەچنە ناوگۆڕ)...

دڵشاد کەلاری لەوە قەڵسە هەموو ئیسلامییەکانی هاوڕێی بەو جۆرە شەڕانگێزییە بیرناکەنەوە، وبەتەوسەوە باسی دیموکراتخوازی ئەوان دەکات، دەیەوێت هەموویان وەک ئەو سەنگەر بگرن وشەڕی کورد وئەمریکا وحکومەتی عێراق بکەن پێکەوە. کاک دڵشاد نازانآ ئەو خیتابە سەید قوتبیە بوو کە هەموو موسڵمانانی جیهانی بەرەو ئەو تەنگژیە گەورەیە برد کە ئێستا تێیکەوتون. کاک دڵشاد کەلاری پێی وایە وەسفەیەکی نوێی هێناوە بۆ گۆڕەپانەکە نازانێت ئیسلامیەکانی کوردستان دەمێکە ئەو وەسفەیە ئینتیحاریەی ئەویان تاقیکردۆتەوە وتێشیدا گەورەترین نوشوستی وزیانیان بەرکەوت، ئەو وەسفەیەی کە بەناوی عیزەت وکرامەت وغیرەت وئەو قسە قەبانە خەڵکی پێ چاوبەست دەکەن ودەیانەوێت بچینە ناو گێژەڵوکەی توندوتیژی وکوشتن وقڕکردنەوە.

هەموو خەمی ئەو برادەرە لە بێ ڕیشی چەند کەسێکی ئیسلامیدا چڕ بۆتەوە گوایە قەشە و مالۆمەکانی جولەکە زیاتر پەیوەستن بەو سونەتەی پێغەمبەرانەوە لەو بارەیەوە دەڵێت: (بەناو مسوڵمانین بە سیما هەندێکمان لەگاورو جولەکە جیا ناکرێینەوە، ڕیش کە سونەتی هەموو پێغەمبەرانە (علیهم الصلاه والسلام)، خەریکە لای هەندێکمان دەبێتە عەیبە!! قەشەو ڕووهبانەکان زیاتر پێیەوە پابەندترن لەخەڵکانێکی ئیسلامی!!)

بەڵام دڵشاد کەلاری لەبیری نەچێت ئەگەر بەو پێودانگە بێت وقەشەو ورۆهبانەکان پابەندبن بە سونەتی ڕیش پەروەردەکردن، ئەوە کارل مارکس وتۆلستۆی و بەرناردشۆ وکاسترۆ وگیڤاراش سەلەفی عەیار بیست ویەکن!!

کاک دڵشاد بەمەزنەی خۆی ئەو ژیانە مەنفایەی ژێر دەستی ئێران پڕاوپڕە لە عیزەت وسەربەرزی وبەرەکەت وئاسووددەیی، بە خیتابێکی سۆزداری عاتیفی بەناڕاستەوخۆ ستایشی خۆیی وهەڵوێستی

دەکات وبەرامبەرەکانیشی لەوانەی جارِی شەرِی سەرتاسەری نادەن لە دژی دەسەلأت وحزبە عەلمانیەکان وئەمریکا وحکومەتی عێراق دەخاتە زبڵدانی مێژوو ودەڵێت:

(دڵنیا دەبی کە خاوەن باوەرِان بە باوەرِەوە دەچنە ناوگۆرِ، زمانحاڵیشیان دەڵێ، بەوەی کە خۆم نەدایە دەس بەرژەوەندیو خیانەتم لەخۆمو خەڵکو بیروباوەرِم نەکرد، ژیانێکی کەمی پرِ عیززەتی بە بەرەکەتم هەڵبژارد، بەویژدانێکی زیندووی ئاسودەوە، سەرم بەرزەو، ژیانیشم مەشخەڵی رِێگای باوەرِدارانە، بەرژەوەندپەرستان ئێوەش هەردەمرن، ئەو رِۆژەش دوورنیە، بکەونە بەر شالأوی رِقو قینی سەدان هەزار بەشخواروو ستەم لێکراو، ناوتان فرِێ بدرێتە ناو زبڵدانی مێژووەوە)

سەیر لەوەدایە کە کاک دڵشاد کەلاری پێیوایە لەو خۆ خستنە ناو باوەشی ئێران وئیتلاعات وقەرارگانی ئێران ژیانێکی پرِ لە شکۆمەندی وسەربەرزانەی هەڵبژاردوە ولە کاتێکدا هەمووماندەزانین هەتا سەرانی قاعیدەش بەبێ نرخ وبەرامبەر لای ئێران داڵدە نەدراون، ئەو هاورِێکانیشی کە لەناوەوە هەزار جار بەقەد ئەو خزمەتی ئیسلام ورِێبازەکەیان دەکەن ورِۆژ بەرِۆژ گەشە دەکەن لەسەر ئاستی بیرکردنەوە وپێکەوە هەڵکردن ئەوا ژیانی سەرشۆرِی وبێ عیزەتیان هەڵبژاردوە، کاک دڵشاد نازانێت ژیان لە کوردستانی خۆمان بە هەموو کەموکورتی وعەیبێکیەوە زۆر سەربەرزترە لە ژیان لە ژێر دەستی قزڵباشە نوێکانی ئێران ! ئەو قزڵباشە شیعە توندرِەوانەی کە دەبوایە کاک دڵشاد خیتابەکەی ئارِاستەی ئەوان کردبایە بۆ رِاگرتنی بۆردمان کردنی کوردستان نەک بۆ پشێوی نانەوە لە بەرژەوەندی ئەواندا، وادیارە کاک دڵشادیش لە بەرژەوەندخوازی بە دوور نییە لە نوسینی ئەو وتارە بۆ بەرژەوەندی قزڵباشەکانی کۆماری ئیسلامی.

سوپاس بۆ خوا کە ئەو خیتابە ونەفەسەی کاک دڵشاد کەلاری دەمێکە بەسەر چوە، دەنا کوردستان یەک پارچە دەبووە ئاژاوە وخۆتەقاندنەوە بە هەموو ئامانج وهەدەفێکی بەهادار وهیچ وپوچ، چونکە خاوەنی ئەو خیتابە سواوە وبەسەرچوە هێندە بێزارن لە لاشە وژیانیان ئەگەر گارِانی دوژمنیش ببینن خۆیانی پیادا دەتەقێننەوە!!

محمد هەریری – لەندەن

٢٠١٠/٧/١٠

# دڵشاد کەلاری وەك قسە کەرێك بەناوی داعش دەدوێت!

لە ڕونکردنەوەیەک لەسەر پەیامەکەی بەڕێز م عەلی باپیر پاش بڵاو بونەوەی ئەو پەیامە(کەمەکتەبی سیاسی لەسەر بڵاوبونەوەی یەک دەنگ نەبوون) دڵشاد کەلاری هۆکاری دواکەوتنەکەی پەیامەکە ڕوون دەکاتەوە کە دیارە لەبەر نەگونجانیەتی لەگەڵ بیروڕای خۆیی و باقی هاوەڵانیەتی لەوانەی ئسوڵ وفروعیان هاوبەشە لەگەڵ داعش و هاوێنەکانی! وامزانی باسی تەریق بوونەوەیان دەکات لەو تاخیر بونە پڕ شەرمەزاریە، لە کاتێکدا هەموو کوردستان بە دیندار و بێ دین دووچاری گەورەترین هێرشی تیرۆریستیی داعش بوەتەوە، هەمووان وەک رۆڵەی دڵسۆزی کورد خوێنیان دەبەخشنە ئەو خاکە، کەچی دڵشاد کەلاری خەمی دڵشکانی داعشیەکانی ناو کۆمەڵ و دەرەوەیەتی، نەک خەمی پاراستنی کوردستانی بێت!!

دڵشاد کەلاری دەڵێت: "دەترسم ئەم پەیامە کۆمەڵی ئیسلامی بکاتە تەرەف لەم شەڕە، منیش بەش بەحاڵی خۆم:ئەم شەڕە لانی کەم بەفیتنەیەک دەزانم ئامادەنیم بەهیچ پاساوێکەوە لەسەر حسابی خەڵکێکی مەزڵومی ئەهلی سونە بچمە بەرەی ئەمریکاو ڕۆژئاواو ئەو وڵاتە ئەقلیمیەی پشتیوانی و پارێزگاری لەو ڕژێمە خوێن ڕێژە تائفیەی عێراق دەکات...؟!

کاک دڵشاد لە بەرامبەر هێرشی چەتە وەحشیەکانی داعش نایەوێت کۆمەڵ ببێتە تەرەف، با هەموو کوردیش تەرەف بێت.، نایەوێت "لەسەر حسابی خەڵکێکی مەزڵومی ئەهلی سونە بچێتە بەرەی ئەمریکاو ڕۆژئاواو!!!

دیارە داعش شەڕی خەڵکی مەزڵومی ئەهلی سونە دەکات.، دیارە داعش نوێنەری عەرەبی سونە دەکات؟! بێ قیمەتەکانی حارث الضاري و بەعسیە پەنهانیەکانیش پێیان شەرمە بڵێن داعش گوزارش دەکات لە خەڵکی مەزڵومی ئەهلی سونەی عەرەب، کە لەوەتی عێراق هەیە زاڵمن، هەر پاش گرتنی موسڵ گەورەترین ئیبادە و ئەنفالیان کرد لە دژی ئەو سەربازانەی کە بەبێ شەر تەسلیم بوون و خەریکی چوونەوەی ماڵی خۆیان بوون! لە بیرتانە کورد تازە لە ئەنفال و هەڵەبجە رزگاری ببوو، سەدان هەزار سەربازی عەرەبی کەوتە بەردەستی لە پاش ڕاپەڕین، کە خەڵکی کوردستان بەوپەڕی مرۆڤایەتیەوە خزمەتیان کردن، کەچی داعش و سوونەی عەرەبی مەزڵووم وەک مەغۆل ئەو سەربازانەیان لەناو بردن وەک لە ڤیدیۆکان دەرکەوتن. ئەگەر داعش هێرشی نەکردبا سەر کوردستان و کورد دەستپێشخەری کردبا بە دووری نازانم دڵشاد و داعش میزاجەکانی تر شەڕی پێشمەرگەیان دەکرد. دوایێ ئەوە ئەمریکایە پشتیوانی لە کورد دەکات، لەپاش هێرشی داعش، نەک کورد چوبێتە شەڕی ئەمریکا.، ئەو سەگوسوارانەی داعش تا لە سوریا بوون کەی کورد وپێشمەرگە پەڕینەونەتەوە بۆ ئەوان .....؟

لە خاڵی دووەم کاک دڵشاد وەک قسەکەری داعش قسە دەکات دەڵێت: "- لەڕوی شەرعیەوە ناتوانم

قەناعەت بە خۆم بکەم و خەڵکی هاندەم بۆ شەڕێک خۆمان خاوەنی بڕیاری سیاسی و سەربازی نەبین و نەشتوانین بە لایەنی بەرانبەر بڵێین موسڵمان نین وێڕای هەموو هەڵەو پەڵەو بێ شەرعی و کەم و کوڕیەکانیان، "داعش لە کاتێکدا هەموو خەڵکانی کوردستان بە ئیسلامی و نا ئیسلامیەوە بە مورتەد و کافر دەزانێت، دڵشاد سەلەفی دڵی نایەت بە داعش بڵێت موسڵمان نین!!! نا قوربان ئەوانە لەسەر ڕێبازە چاکەکەی سەلەفی ساڵحن لەسەربڕین وبەردبارانکردن و جزیە ستاندن و بە کۆیلە بردنی کچانی کوردی یەزیدی دا، چۆن دڵت دێت بە هاودینە داعشیەکانت بڵێیت موسڵمان نین!

ئەگەر دەسەڵاتی کوردی لەو ساتە ناسکانە ڕێگابدات بەو لێدوانە بێ سەروبەرانە و دوژمن بە کوردانە و داعشیانە، کەوابوو پێی سەیر نەبێت داعشیەکان هەموو چالاکی خیانەتکارانەیان جێبەجێبکەن بەبەر چاوی هەموومانەوە!

ئەو جۆرە لێدوانانەی دڵشاد سەلەفی و داعشیەکانی تر پێویستە لێپرسینەوەی یاساییان لەگەڵدا بکرێت، ئەگەر لەبەر خوشک وبرا یەزیدیەکانیش نەبێت، لەبەر هیچ نا لەبەر خوێنی شەهیدانی پێشمەرگە.

خۆزگە دەمزانی علی باپیر چۆن ئەو سەماحەتەی خەلەف کە لەو پەیامە تاخیرەی دای پێ کۆ دەکرێتەوە بەو هەموو داعش میزاجانەی سەلەف؟!.

٢٠١٤/٨/٢٢

# شاعیرێکی ئیسلامی و لۆژیکێکی هیناوی!

ببورن لە بەکارهێنانی ئەو وشانە، کە لەبەر پێویستی بابەتەکەدا نووسراوە.

کەسێکی گوایە شاعیریشـە کورتـە نوسـینێکی نووسـیوە، ڕوداوێکـی خۆشـی شـێخ ڕەزای تاڵەبانـی بیرهێنامـەوە. دەڵێن فەقێیـەك حـەزی شـیعر نووسـینی هەڵدەسـتێ و ڕۆژێك لـە مزگـەوت یەخـەی شـێخ ڕەزا دەگرێـت و دەڵێـت ئـەو شـیعرەم نووسـیوە بەڵکـو سـەیرێکی بکەیـت بزانـی چۆنـم نووسـیوە!

شـێخ ڕەزاش بـە عەکسـی عادەتـی ڕاشـکاوانەی خـۆی دەیەوێـت لـە کۆڵـە خـۆی بکاتـەوە، وادیـارە زۆر جاڕسـکەر بـووە، تەماشـایەکی دەکات و دەڵێـت: باشـە! کابـرای فەقـێ بـەو هەڵسـەنگاندنەی شـێخ ڕەزا نەشـئە دەیگرێـت و دەڵێـت: ئینجـا ئـەوە لـە ئاودەسـت نووسـیمە!

شێخ ڕەزا دەڵێت: بەڵێ بۆنی ئەوەم لێکرد!

ئەو شـاعیرەش سـەرلەبەری کورتـە نوسـینەکەی بۆنـی ئاودەسـتی لـێ دێـت، سـەرەڕای جوێنـی وا: دەڵێـت :

"عەلمانیـەکان بـە درێژایـی تەمەنـی ئیسـلام هـەر وەڕیـون ... بـا هـەر سـیر بخـۆن و زوڕنـا لێدەن...لەژێر سـێبەری هەنـدێ دامـەزراوە و حیـزب و ناپیـاوی خۆفرۆشـەوە... پێیـان بڵێـن ئێـوە بسـتێك پیسـایین بەسـەر ئـەم خەڵکـەوە، بەسـەر ئـەم نیشـتیمانەوە، تکاتـان لـێ ناکەیـن بـڕۆن ملتـان بشـکێنن و ئـەو وڵاتـە هەڵبژێرن کـە ژووری نوسـتنیان کـردووە بـە گووخانـە و عەورەتیـان کـردووە بـە تەنافـا و شـەیتان پێیـان پـێ دەکەنـێ."

ئـەو بـرادەرە چارەسـەرێکی سـەیری پێیـە بـۆ سـزادانی عەلمانیـەکان، کـە لـە هەمـان کاتـدا ئیهانەیـە بـۆ مزگەوتەکانیـش، چونکـە لای ئـەو مزگـەوت بـۆ عەلمانیـەکان و نوێـژ نەکەرەکان تەنهـا شـوێنی [گـوو کردنـە]، نـەک شـوێنی چەندیـن بۆنـەی کۆمەڵایەتـی وەك کەنیسـەکان کـە هەتـا ئاهەنـگ و کـۆڕی ڕۆشـنبیریشـی تێدا دەگێڕدرێـت بـۆ هەمـوو جـۆرە کەسـێك. بۆیـە دەڵێـت:

" ئێـوە هیـچ مەکـەن جگـە لـە یـەك شـت نەبێـت، وەرن هەمووتـان دەرگای مزگەوتیـان لـێ دابخـەن بـەڵام ئـەو کاتانـەی تەنگەتـاو ئەبـن جـا ئـەو کات بـا بیـان بینیـن گـو ئەکـەن بـە خۆیانـا و فریـای تەوالێتەکـەی ماڵەوەیـان ناکـەون، یـان کـە مـردن ئینشـائەڵڵاهو تەعـالا بـا بیـان بـەن لـە مەعبـەد و کۆشـکەکانیان بیانشـۆن و کفنیـان بکـەن...!"

دیـارە لـە وڵاتانـی کـە مزگەوتـی لـێ نییـە خەڵـك لەسـەر شـەقامەکاندا بەخۆیانـدا دەکـەن؟! مردوەکانیـان نانێـژرێن لەسـەر شـەقام دەکـەون؟! لـەو دەروونـە نەخۆشـەی نایەوێـت خێـری ئەوەندەشـی هەبێـت بـۆ خەڵکـی گشـتی، مەسـیحیە خێرخوازەکان سـاڵەهای سـاڵ خزمەتـی خەڵـك دەکـەن بـە خـۆراك و چارەسـەری پزیشـکی و فێرکـردن، هێنـدە زیرەکـن هەتـا بـۆ جارێکیـش هێنـدە ڕاسـتەوخۆ باسـی مەسـیحیەتت بـۆ ناکـەن! لـە بیرمـە هەمـوو ئێـواران لـە یۆنـان وئیتاڵیـا دەهاتـن بـە هـەزاران سـاندویجی حـازرەوە بـە چـا و قـاوەی گەرمـەوە خزمەتـی ڕەش وڕووت وهـەژار وپەناهەندەیـان دەکـردن، کـە زۆربەیـان موسـڵمان بـوون، بەخـوا دەیـان جـار

دەمدیتن بۆ ڕۆژێکیش بە کەسیان نەگووت بۆ نابنە مەسیحی!

ئیسلام لای ئێمە تەنها بۆتە دینی شەڕ وجیهاد وکێشمەکێشی دینی وعەلمانی. ئەوە ئەو ڕوحیەتە جەنگاوەرەی ئیسلامە کە ئیسلامی سیاسی سەلەفی هانی شوێنکەوتوەکانی دەدات لە هەموو فەزیڵەتەکان و لایەنە خێرخوازیەکەی ئیسلام داببڕێن، تەنها بیری جیهاد و بەربەرەکانێی نادینیەکان ونائیسلامیەکان بکەن. ئەو دینە دەبوایە بیکەنە نموونە لە یارمەتیدانی لێقەومان وهەژارانی موسڵمان ناموسڵمان، دەبوایە ببوایە کلتوری هەموو تاکێکی جیهانی ئیسلام بە مولحیدەکانیشەوە، نەك بەکارهێنانی ئاودەستیشیان پێ ڕەوا نەبینیت! کابرای شاعیری یان ماعیری ئیسلامی دەیەوێت دەرگای مزگەوت داخەن بەسەر عەلمانیەکان تا بکەن بە خۆیان! ئەو لۆژیکە گواوییەی!!

٢٠١٥/٧/٢٥

# ئیسلامی سیاسی و
# فیگەرە بیانی و عەرەبەکانی/ سەلەفیەکان و ئەوانیتر

## محەمەدی کوڕی عبدالوهاب وەك بیناغە داڕێژەرێکی داعش

ئەوەی مێژووی کوشت وکوشتار و تەکفیرکردنی وەهابیەت بخوێنێتەوە، زۆر بە ڕوونی بۆی دەردەکەوێت کە داعش تەنها قوتابیەکە لە قوتابخانەکەی وەهابیزم، وەك داعش تەرکیزیان هەر لەسەر کوشت وکوشتاری موسڵمانان بوە بەر لە بێ باوەڕان. وەك داعشیش لەسەر بچوکترین بیانوو موسڵمانانی تریان تەکفیر و تەفسیق کردوە، بەڵام دامەزرێنەری وەهابیزم بەوەندەش نەوەستاوە بەڵکو پەسندی عەرەبە موشریکەکانی بەرایی دەدات بەسەر موسڵمانانی سەردەمی خۆی ودەڵێت شیرکی کافرانی قوڕەیش بچوکتر وسوکتر بوە لە شیرک و کوفری موسڵمانانی سەردەمی خۆی! ئەوەش تەکنیکێکی داعشانەیە وەك دەیبینین..

محمدی کوڕی عبد الوهاب لە زۆر لایەن لە ڕابەرانی سەلەفیەتی بەرایی توندڕەوتر ووشکتر وترسناکتر بیری دەکردەوە، ئەوەش لەبەر چەندین هۆی جیا، لە نێو ئەوانە ئەگەر ئەحمەدی کوڕی حەنبەل وئیبن التیمیە شارستان بوون، نزیکتر بوون لە ئەجوائی ژیاری ئیسلامی ودیتن وتێکەڵبوون لەگەڵ جۆرەها میللەت وئۆل وئاین، بەڵام محمدی کوڕی عبد الوهاب بەدوێکی (دەوارنشینێکی) بیابان بوو، سەرەڕای تەبەنا کردنی فیقهی حەنبەلی، هەموو میزاجی بەدەوی ووشکی بیابان نشینینی خستە سەر ئەو توراسە توند وتیژەی کە تەبەنای کرد بوو.

کە شەڕەکانی سوپای وەهابیەت کە ناسراو بوون بە ئیخوانە وەهابیەکان دەخوێنیتەوە هەست دەکەیت لە شێوازی شەڕ ونەهب وتاڵان وبڕۆیان، تەنها سوپایەکی بەدەوی دڵ ڕەق وبێ ویژدانن لە خەمی غەنیمەت وبە چنگ کەوتنی زۆرترین بڕی غەنیمەت زیاتر خەمی هیچ شتێکیتریان نەبوە. بۆ نموونە مێژوو نوسی دەوڵەتی سعودیەی یەکەم عوسمانی کوڕی بشری نەجدی دانەری کتێبی "عنوان المجد فی تاریخ نجد" دەگێڕێتەوە کە لەشکری وەهابی بە سەرکردایەتی ئیبن سعود قەسابخانەیەکی لە کەربەلا کرد ساڵی 1801 وزۆر بە شانازیەوە باسی دەکات ودەڵێت:

(کەربەلامان گرت وخەڵکەکەیمان کوشت وتاڵان کرد وحەمد وسەنا بۆ خوا وعوزریش ناهێنینەوە وپەشیمان نین، ودەڵێین: کافرەکانی تریش هەمان چارەنوسیان هەیە)

هەر لەو بارەیەوە وله هەمان کتێبدا دەڵێت:"

سعودی کوڕی عبد العزیز کوڕی سعود بەرەو کەربەلا بەڕێکەوت لە مانگی زیلقەعدە، موسڵمانانی کۆکردەوە وبەسەر شوراکانی شار سەرکەوتن وبە زۆرەملێیی چونە ناوی، وزۆربەی خەڵکەکەی ناو بازاڕ وماڵەکانیان کوشت... ئەوەی دەستیان کەوت لە سامان وماڵ وچەک وپۆشاک وڕایەخ وزێڕ وزیو

وقورئانی گرانبەهایان بە تالآن برد کە قابیلی ژماردن نەبوون)
هەر هەمان نوسەر لە مەلحەمەیەکی تردا کە قوربانیەکانی ئەعرابەکانی بەنی خالید بوو وخەریکی ئاودانی ئاژەڵەکانیان بوون لە ساڵی 1207 کۆچیدا دەڵێت: " فنهض علیهم المسلمون فرسانا ورکبانا فلم یثبتوا لهم ساعة واحدة ، فانهزم بنو خالد .. فتبعهم المسلمون فی ساقتهم یقتلون ویغنمون ، واستأصلوا تلك الجموع قتلا ونهبا"
(موسڵمانان بە سوار وپیادە هەڵمەتیان بۆ بردن نەیانتوانی بۆ سەعاتێکیش بەرگری بکەن، بەنی خالید دۆڕان... موسڵمانانیش – سەرنجی بەکارهێنانی ئەو موسڵمانانە بدە – بەدوایانەوە بوون دەیانکوشتن ودەسکەوتەکانیان کۆدەکردەوە، ئەو خەڵکانەیان ڕیشە کێش کرد بە کوشتن وبەتالآن)!!
ئەعراب وبەدوەکان بەر لە ئیسلامەوە تا ئەمڕۆش گیانی تالآن وفەرهود وسەلب ونەهب لە خوێنیان دەسوڕێتەوە، تا ئەمڕۆش ئەو ڕوحیەتە زاڵە بەسەر عەرەب بە شێوەیەکی گشتی، هەر بۆیەش هیچ داوەتێکی ئاینی وفیکری وئایدیۆلۆژی نەیتوانیوە ئەو سروشتە تێکدەرە لە گیانی بەدوەکان ڕیشەکێش بکات، دەبوایە خەلافەتی ئیسلامی زۆر ئاگاداری ئەو ڕوحیەتە بوایە نەک ئەو خەڵکە بێ کۆنترۆڵە بنێرێتە سەر خەڵک بەناوی بڵاوکردنەوەی ئایین، هەتا ابن الخلدون یش ئاماژەیەکی زۆر بۆ ئەو هەقیقەتە دەکات کاتێک ناونیشانی ئەو بەشەی (المقدمە) بەو شێوەیە دەست پێدەکات: (واتە لەبارەی ئەوەی کە عەرەب دەستیان بەسەر هەر وڵاتێک داگرت، هەر زوو بە زوو وێرانی ڕووی تێدەکات، هۆکەشی ئەوەیە کە ئومەتێکی وەحشین وخوی تەوەحوش تیایاندا ڕەگی داکوتاوە تا بۆتە ڕەوشت وسروشتیان، وئەو خوەش لایان شیرینە چونکە ڕەهایان دەکات لە کۆتی حوکم ودوانەکەوتنی سیاسەتی هەڵسوڕاندن، ئەوەش سروشتێکی پێچەوانەی ئاوەدانییە ... سروشتیان بریتیە لە تالآنکردنی ئەوەی لە دەستی خەڵک دایە، ورزقیان لەژێر سێبەری شمشێرەکانیان دایە، هیچ سنوریان نیە لە تالآنکردنی پارە وسامانی خەڵک، بەڵکو هەر چاویان بە بە سامان وکەل وپەلی خەڵک کەوت تالآنی دەکەن، ئەگەر توانیان زاڵ بن بەسەر شوێنێک وفەرمانڕواییان کرد، ئەوە سیاسەتی پاراستنی مولک وسامانی خەڵک نامینێت، وئاوەدانی وێران دەبێت!!!"

- **ستایشی بێ باوەڕان**

با لەو دەقانەوە دەست پێبکەین کە ستایشی بێباوەڕان ومونافیقەکان دەکات، بێگومان ماقوڵ نیە ئەوەی بە خوێنی موسڵمانان تینو ببێت بێتو ستایشی ناموسڵمانان بکات یان زاناکانی ئەهلی ئیسلام تەکفیر بکات وستایشی خو ورەوشتی کافران بکات، بەڵام یەکێک لە خەسڵەتەکانی توند ڕەوی ئەوەیە کە پێوەرەکەی سەقەت دەبێت ، محمدی کوڕی عبد الوهاب مەرامێکی پەنهانی هەبوە لەدوای ستایشکردنی کافر وبێباوەڕەکان ئەویش بۆ ڕزگار بوونی بوو لەو نیگەرانی ودڵەڕاوکێیەی کە لە ناخیدا پەنگی دەخواردەوە لە ئەنجامی تاوانبار کردنی بە ڕشتنی خوێنی موسڵمانان. چاکترین نمونەی نوسینەکانی محمدی کوڕی عبد الوهاب نامیلکەیەکی بچوکی ئەوە بەناوی (کشف الشبهات) چونکە ئەو کتێبە

سەرەڕای قەبارەکەی زۆر گرنگە وبایەخێکی لە ڕادەبەدەری پێدەدرێت لەلایەن لایەنگرانی شێخ وقوتابیانی وئەو دەزگایانەی کە سەرقاڵی بڵاوکردنەوەی دەعوە وفیکری محمدی کوڕی عبد الوهابن، دەیان وسەدان چاپیشی لێ دەرچوە بێ ئەوەی یەکێک لە شوێن کەوتوانی وەهابیەت بۆ تەنها سەرنجێکیشی لەسەر بنوسن کە لە کاتێکدا پڕاوپڕە لە هەڵەی زەقی وەک تەکفیر وحەڵاڵ کردنی خوێنی موسڵمانان بە ناهەق.
هەر لە دەستپێکەوە محمدی کوڕی عبد الوهاب زۆر بە ئاشکرا دەیەوێت بڵێت کە خوا پێغەمبەرەکانی ناردوە بۆ مرۆڤایەتی تا قەدەغەیان کات لە زیادەڕەوی لە پیاو چاکان:
لە لاپەرە 5:

( بزانە ڕەحمەتی خوات لێ بێت، کە یەکتاپەرستی بریتیە لە تەنها پەرستنی خوا، وهەر ئەویش دینی ئەو پێغەمبەرانەیە کە خوا بۆ بەندەانی ناردوون، یەکەمیشیان نوح (سەلامی خوای لێ بێت) کە خوا بۆلای ئومەتەکەی ناردی کاتێک زیادەڕەویان کرد لە پیاوچاکانیان وەد و یەغوس و یەعوق و نەسرا)!!!
ئەوەی زانراوە لە لایەن قوتابیەکی سەرەتاییش کە لە قورئاندا هاتوە کەوا خوا نوحی (سەلامی خوای لێ بێت) بۆلای ئومەتەکەی نارد لەبەر بتپەرستی نەک لەبەر زیادەڕەوی لە ساڵحان. چونکە زۆر بە دەگمەن زیادەڕەوی دەگاتە ئاستی شیرک پەیدا کردن، ئەو قسانەش تەنها ڕێ خۆشکردنێکە بۆ سەلماندنی بیرۆکەی سەرەکی. چونکە نەیارانی محمدی کوڕی عبد الوهاب پێیان دەگوت: ئەوانەی تۆ لە دژیان دەجەنگێیت وتەکفیریان دەکەیت خەڵکێکی موسڵمانن، ولەوانەیە زیادەڕەویەک لە زاتی پیاو چاکان لە لای عەوام وزاناکانیان هەبێت، بەڵام ئەو زیادەڕەویە هەقی ئەوەت پێنادات لە دژیان بجەنگێیت وتەکفیریان بکەیت، لەبەر بە هێزی ئەو ڕەخنەیە ئەویش هەموو کێشەی پێغەمبەران وقەومەکانی کردۆتە کێشەی زیادەڕەوی لە ساڵحان.
هەر بە دوای ئەوەشدا هەموو پەیامەکەی دوا پێغەمبەریش بە شێوەیەکی تر وەسف دەکات، ودەیەوێت لە ئەرکی سەرەکی خۆی لایبدات وەک بڵێی تەنها هاتبێت بۆ شکاندنی وێنەی ساڵحان، وەک لە لاپەڕە 5-6 :

"دوا پێغەمبەر محمد (سەلامی خوای لێ بێت) ئەو وێنە وبوتی ئەو پیاو چاکانەی شکاند، خوا ناردبووی بۆ خەڵکانێک کە خواپەرستیان دەکرد، وحەجیان دەکرد، وێەدەقەیان دەکرد وزیکری خواشیان دەکرد!! بەڵام ئەوان (واتە کافرەکانی قورەیش) چەند مەخلوقاتێکیان دەکردە نێوەند لە نێوان خۆیان وخوادا "
کێشەکەی محمدی کوڕی عبد الوهاب لەگەڵ خەڵک هەمووی لە تەقدیس کردنی پیاو چاکەکان ومەزارەکانیان چڕ دەکرێتەوە، بۆیە محمدی کوڕی عبد الوهاب دەیەوێت ئەو ناوەرۆکە بەسەر پەیامی پێغەمبەریش بسەپێنێ، بۆیە لە بەشی دوەمی ئەو دەقەدا دەڵێت: " بەڵام ئەوان (واتە کافرەکانی قورەیش) چەند مەخلوقاتێکیان دەکردە نێوەند لە نێوان خۆیان وخوادا" واتە تەنها کێشەیەکیان هەبوو بێت ئەو زیادەڕۆییەیان (غلو) بوو لە پیاو چاکەکان، ئەوەش بۆ هەموو کەسێک ئاشکرایە کە ڕاست نیە، نە خواپەرستیان خواپەرستی بوو، نە حەجیان حەج بوو، نە زیکری خواشیان بەڕاستی دەکرد، ئەو پێدا هەڵگوتنەش لە پێناو ڕاستی دەرخەستن نیە، ئەوەندەی لە پێناو شاردنەوەی تاوانێکی گەورەیە،

ئەویش کوشتن وتالآن کردنی موسڵمانانە، هەروەک دوایی پیادەی کرد.
لە ستایشێکی تری بێباوەڕەکانی قوڕەیشدا دەڵێت:
ل7: (موشریکەکان (واتە بێباوەڕەکانی قوڕەیش) شایەتیان دەدا کە بە تەنها خوا خالیقە، وبآ هاوتایە، وهەر ئەو رزق ورۆزی دەرە، ژیان ومردن بە دەستی ئەوە، هەر ئەو هەڵسوڕێنەرە، وهەموو ئاسمانەکان وئەوەی تێشیدان وهەر حەوت ئەرزەکان وئەوانەشی تێشیدان هەمووی بەندەی ئەون ولە ژێر فەرمان وئەمری ئەودان!!)
بڕوانە ئەو ستایشە ئاڵ ووالآیە لەوانەیە بێباوەڕەکانی قوڕەیشەکان خۆیان زیندو بکرێنەوە وبیخوێننەوە باوەڕ ناکەن لەسەر ئەوان نوسراوە، ما قوڵە ئەو هەموو سیفەتە جەوهەرییانەی ئیمانیان تێدا بێت کەچی بەو شێوەیەی پێغەمبەر بەربەرەکانی کردبن؟! من پێموایە ئەگەر ئەو سیفەتانەی محمدی کوڕی عبد الوهاب داویەتە پاڵ بێباوەڕەکانی قوڕەیش ڕاست بان، هەرگیز ئەو هەموو شەڕ وشۆڕەی نەدەویست کەڕویدا.
زانایان دەڵێن ئەو ئایەتانەی کە لە قورئاندا هاتوە باسی ئیمانی بێباوەڕەکانی قوڕەیش دەکات، تەنها بریتیە لە دان هێنانی بێباوەڕان لە بابی (الإفحام والانقطاع) دەمکوتکردن وقسەبڕین، نەک لە بابی قەناعەتەوە، چونکە ئەگەر ڕاستگۆبان باوەڕیان دەهێنا، بۆیە خوا لە قورئاندا فەرمان بە پێغەمبەر دەکات کە پێویستیەتی ئەو دان پێداهێنانە جێبەجێ کەن: (فقل: أفلا تتقون) (قل: أفلا تذكرون)
بەڕاستی ناکرێت تۆ هەموو ئەو ئایەتانە بینیت کە واهیمەی خەڵکی فریودەدات گوایە لە ستایشی بێباوەڕانی قورەیشدا هاتوە وهەموو ئەو ئایاتانەش کە ڕەخنە وسەرکۆنەیە بۆیان پشت گوێی بخەی، کەچی ستایشکردنی موسڵمانانیش فەرامۆش کەیت وتەنها تەرکیز لەسەر هەڵەکانیان بکەیت. ناکرێت ئەو کارە بە وێنەی موسڵمان بکەیت لە پێناو تەکفیر کردن و وجاردانی شەڕ لە دژیان، تا وا لە خەڵک بگەیەنین کە چۆن بێباوەڕەکان (شایەتیان دەدا کە بە تەنها خوا خالیقە، وبێ هاوتایە، وهەر ئەو رزق ورۆزی دەرە، ژیان ومردن بە دەستی ئەوە، هەر ئەو هەڵسوڕێنەرە، وهەموو ئاسمانەکان وئەوەی تێشیدان وهەر حەوت ئەرزەکان وئەوانەشی تێشیدان هەمووی بەندەی ئەون ولە ژێر فەرمان وئەمری ئەودان!!) لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر (د.خ) شەڕی لە دژیاندا جاڕدا، منیش (واتە محمدی کوڕی عبد الوهاب) بە هەمان شێوە شەڕ بەرپا دەکەم لە دژی ئەو (بەناو ) موسڵمانانەی کە (نوێژ دەکەن وحەج دەکەن، وزەکات وێەدەقە دەدەن، وخواپەرستی دەکەن..هتد)
لە وێنەیەکی تری جوانتر لەوانەی پێشو شێخ محمدی کوڕی عبد الوهاب، بە جۆرێک زیادەڕۆیی دەکات لە وەسفی بێباوەڕانی قورەیش، تا ئەو ڕادەیەی سەیرت پێدێت ئەو جەماعەتەی بە درێژایی وپانایی جیهانی ئیسلام لە سەردەمی محمدی کوڕی عبد الوهاب وشوێن کەوتوانی تا ئەو ڕۆژگارە کەس نەماوە لە زانایانی کۆن ونوێ (لە ئەبو حەنیفەوە، وابی حامد الغزالی، وابن حجر العسقلانی وتەبەری وئەفغانی ومحمد عبده وشێخەکانی ئەزهەر وحسن البنا وسید قوتب ومالک بن نبی وسید سابق ومحمد الغزالی وقەرەزاوی وهتد) تەکفیر وتەبدیعی نەکەن، کەچی بەو شێوە سەیرە ستایشی

بێباوەڕانی قورەیش دەکەن، بەڵام ستایشەکە لەبەر چاوی کاڵی ئەوان نییە بەڵکە چەکێکە بۆ لێدانی موسڵمانانی تر وکوشتن وتاڵان کردنیان، ئەم جارە دەربارەیان دەڵێت لە لاپەڕە ٩:

(ئەوان بە شەو ورۆژ هاواری خوایان دەکرد...) ئەگەر ئەو بێ باوەڕانە هێندە خوایی بان لە وانەبوو هاوەڵانی پێغەمبەر ئێرەییان پێ بردبان، ئەگەر ئەو کافرانە بە شەو رۆژ بانگی خوایان کردبێت وئەویان پەرستبێت، ئەوە خوا لە قورئاندا نەیدەگوت": (قل إني نهيت ان اعبد الذين تدعون من دون الله..)... (إن الذين تدعون من دون الله عباد امثالكم..) ، (قالوا ربنا هؤلاء شركاؤنا الذين ندعو من دونك..)

ئینجا لە بارەی ئەو دیاریکردنە وردەی مەرامی پەیامی پێغەمبەر دەڵێت: (وتحققت أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قاتلهم ليكون الدعاء كله لله ، والنذر كله لله والذبح كله لله ، والاستغاثة كلها بالله ، وجميع أنواع العبادات كلها لله. )

لە بەراوردێکی تردا زۆر ڕاشکاوانە پاش بە موشریک کردنی سەرتاسەری موسڵمانان، دێت ودەڵێت شیرکی کۆنەکان زۆر چاکتر وسوکتر بوو لە شیرکی موسڵمانانی سەردەمی کوڕی عبدالوهاب:

فاعلم أن شرك الأولين أخف من شرك أهل زماننا بأمرين:

(بزانە شیرکی بەراییەکان سوکتر بوو لە شیرکی خەڵکی ئەو زەمانە لەبەر دوو خاڵ:

یەکێکیان: لەبەر ئەوەی خەڵکی بەرایی شیرکیان نەدەکرد ونزایان لە فریشتەکان وپیاو چاکان وبتەکان نەدەکرد تەنها لە کاتی ئاسایی وخۆشیدا. بەڵام لە کاتی تەنگەتاوی وناچاری بە دڵسۆزی دوعایان لە خوا دەکرد. وەک خوای پەروەردگار لە قورئان دا دەڵێت: (ئەگەر دوچاری مەترسی بوون لە نێو دەریا تەنها هاوار بۆ خوا دەکەن، کە دەربازی کردن بۆ وشکایی، تەوەلا دەکەن، بەڕاستی ئادەمیزاد بێ ئەمەکە)

دووەمیان: بەراییەکان لەگەڵ خوا دوعا وپاڕانەوەیان لە کەسانی نزیک لە خوا دەکرد وەک پێغەمبەران وپیاو چاکان، یان فریشتە، یان دار وبەرد کە لە خوا عاسێ نین ومل کەچن. بەڵام خەڵکی ئەو زەمانەی ئێمە لەگەڵ خوا دوعا وپاڕانەوە لە فاسیقترین کەس دەکەن)!!

لە بارەی ئەو دوو هۆیەی کە محمدی کوڕی عبد الوهاب موشریکە بەراییەکانی پێ پەسند دەکات بەسەر موسڵمانانی سەردەمی خۆی (یان موشریکەکانی زەمانی خۆی) دەڵێین: جارێ ئەو ئایەتەی کە هێناویەتیەوە تایبەت نیە بە موشریکەکانی بەرایی بەڵکو ئاماژەیەکی ڕەهایە بۆ ئادەمیزاد لە هەر زەمان ومەکانێکدا، واتە مرۆڤ لە تەنگانەدا هەردەم پەنا بۆ هێزێکی گەورەی پەنهانی دەبات کە خوایە.

لەپاش ئەو قسانە محمدی کوڕی عبد الوهاب بەو پەڕی متمانە بە خۆوە دەڵێت:

"إذا تحققت أن الذين قاتلهم رسول الله صلى الله عليه وسلم أصح عقولا، وأخف شركا من هؤلاء"!!

(کەوابوو بۆت بە دیار کەوت کە ئەوانەی پێغەمبەر لە دژیان دەجەنگا (ێ) عاقڵتر بوون وشیرکیشیان خەفیفتر بوو) دوا پرسیار لەو عەقڵیەتە وشک وبێ سەروبەرە ئەوەیە: ئایا هیچ جیاوازیەک هەیە لە نێوان شیرکێک وشیرکێکی تر؟! بە پێی لۆژیکی سەلەفیەت نەخێر هەموو شیرکێک هەر شیرکە)

نەک هەر هێندە بەڵکو محمدی کوڕی عبد الوهاب پێی وایە جاهیلەکانی بەرایی چاکتر لە مانای (لا اله

الا اللـه) تێدەگەیشـتن، پـاش لێکدانەوەیەکـی دورو درێـژ بـۆ وتـەی (لا الـه الا اللـه) دەڵێـت: [ئەگـەر زانیـت نەزانانـی قورەیش ئـەوە دەزانـن، عەجیبـە بـۆ کەسـانیك ئیدیعـای ئیسـلام دەکـەن، لـە کاتێکدا لێکدانـەوەی ئـەو وتەیە نازانێت وەک چۆن نەفامەکانی کافران زانیویانـە، بەڵکو وادەزانـێ ئـەوە تەنها گۆکردنـی پیتەکانە بەبـێ باوەڕی دڵ هیـچ مانایەکی] "فـإذا عرفت أن جهال الكفـار يعرفـون ذلك ، فالعجـب ممـن يدعـي الإسـلام وهـو لا يعرف تفسـير هـذه الكلمـة كمـا عرفـه جهـال الكفـار بـل يظـن أن ذلك هـو التلفـظ بحروفهـا مـن غيـر اعتقـاد القلـب لشـيء مـن المعانـي "

وەك دەبینیـت چـۆن محمـدی کـوڕی عبدالوهـاب و سـوپا پاتاڵچیەکـەی چـۆن پیـش دەرکەوتنـی داعـش، هـەزاران کاری داعشـیان ئەنجـام داوە، دەتوانیـن بڵێیـن لـەو سـەردەمە نوێیـەدا بیناغـە داڕێـژەری داعـش بـوون...

# دامەزرێنەری هەرە گەورەی سەلەفیزم
# ئەحمەدی کوڕی حەنبەل

ئەدەبیاتی سەلەفیەت وبەڵکو ئەدەبیاتی ئەوەی ناوی دەنێن بە ڕابوونی ئیسلامی زۆر بە شێوەیەکی چەواشەکارانە ئەحمەدی کوڕی حەنبەلی وەک قارەمانێکی خۆڕاگری ئەشکەنجەدان وئازادی بیر نیشان دەدا، ئەوەش وەک لە نوسینی تر ئاماژەم پێکردوە نەك تەنها لای سەلەفیەکان، بەڵکو لەسەرتاسەری لایەنەکانی ئەوەی ناوی دەنێن ڕابوونی ئیسلامی ڕوودەدات، لە سۆنگەی بە سەلەفیکردنی لەسەرخۆی زۆربەی عەقڵیەتی دینی مەزهەب و فوقیهەکان.

دەیەها وتار وکتێب وچیرۆکم خوێندۆتەوە لەسەر ئەشکەنجەدانی موعتەزیلەکان بۆ ئەحمەدی کوڕی حەنبەل وخۆڕاگری ئەو لەبەرامبەر ئەو هەموو ئەشکەنجە وفشارەی لەسەری بوو لەو کێشەیەی کە ناوی دەنێن بە میحنەی خەڵقی قورئاندا!!

ئەو کێشەیە (کێشەی خەڵقکردنی قورئان ) دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئومەوییەکان وگوایە یەکەم کەس ئەو باسەی خستبێتە ڕوو جەعدی کوڕی درهەم بوبێت بە پێی کتێبەکانی عیلمی کەلام. دوایی جەعد لەسەر دەستی والی ئومەویی خالیدی کوڕی عەبدوڵلای قەسری بە دڕەندەترین شێوە سەری بڕا لە ڕۆژی جەژن ولەژێر مینبەری مزگەوتدا!!

هەموو زانا ونەزانە سەلەفیەکان بەو پەڕی شانازییەوە باسی ئەو سەربڕینە بەبێ هیچ حورمەت دانانێک بۆ خوێنی موسڵمان لەناو مزگەوتیش ولەڕۆژی جەژنیش!!

هەر ئیبن تەیمیە لە منهاج السنە زیاتر لە سێزدە جار باسی ئەو پاڵەوانیەتە دەکات، کەچی بکوژەکە خۆی خالید القسری هێندە دڕندە ونامرۆڤ بوو نەدەگەیشتە کەوشەکانی زانایەکی وەک جەعدی کوڕی درهەم.

ئەو کێشەیە بە شێوەیەکی زەق وئاشکرا لەسەردەمی خەلیفە مەئموونی عەباسیدا سەری هەڵدا، کاتێک موعتەزیلەکان وتیان قورئانیش خولقێنراوی خوایە وەک هەموو مەخلوقاتەکانی تری بەگیان وبێ گیان. ئەوەش بوە هۆی ئەوەی بەشێک لەزانایانی ئیسلام ڕەتی کەنەوە وەک ئەحمەدی کوڕی حەنبەل وچەندین زانای تر، لە ئەکامدا دەوڵەت ئەو بیروڕایەی تەبەنا کرد وبەسەر هەموو خەڵکی سەپاند.

خەلک بەگشتی زوو چوونە ژێر بار، بەڵام زانایان بەشێکی بە بڕواوە قبوڵیان کرد، بەشێکی تر لە ژێر گوشار وەک التقیە قبوڵیان کرد وەک (یحیی بن معین وابن سعد وابن المدینی) ، ودوابەشیش ڕەتیان کردەوە کە لە نێو ئەوانە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بوو، بەڵام ئیمام ئەحمەد تەنها نەبوو لەو هەڵوێستە بەڵکو کەسانێکی زانا کوژران لەو کێشەیە وەک: ، ابو نصر الخزاعی و ابو نعیم فەزل بن دکنی کەسانێکی

تر لە زیندان سەریان نایەوە وەک:.ئەبو عەمری حارسی وکەسانێکی تر. ناودار بوونی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لەو کێشەیە دەگەڕێتەوە بۆ ڕزگاربوونی بوو بە زیندوویی لەو میحنەتە وگۆڕانی عەقیدەی دەوڵەتی عەباسی لە موعتەزیلەوە بۆ عەقیدەی ئەهلی حەدیس لەسەر دەستی خەلیفە موتەوەکیل.
بێگومان زانایەکی زۆری وەکو ئیمام البخاری وشافیعی وعلی المدینی ویحی بن المعین وچەندین مامۆستا لە مامۆستاکانی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل زۆر بە ئاسانی لەو کێشەیە ڕزگاریان بوو چونکە، هەموو کێشەکە لەفزی بوو، بەڵکو زیاتر لە کێشەیەکی تەرەفی وشەڕلە بەتاڵی دەچوو، ئەگینا کێ لەو ئومەتەی پێویستی بوو بزانێت قورئان مەخلوقە یان مەخلوق نییە؟!!
بێگومان ئەو وێناکردنەی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل وەک قوربانیەک کاری کردۆتە سەر هەموو عەقڵیەتی بەناو ڕابوونی ئیسلامی لە وەرگرتنی هەڵوێستی سەلبی لە هەموو فیکری موعتەزیلی دا کە وەک ئەهریمەنێک نیشانی خەڵک دەدرێن، ئەوەش لە ئەنجامدا بوەتە هۆی دژایەتی کردنێکی سەرتاسەری بۆ هەموو ئاراستەیەکی عەقڵی لەناو ئیسلامدا وزاڵبوونی ئاراستە نا عەقڵییەکان بەسەر موقەدەراتی ڕابوونی ئیسلامی لەسەر ئاستی جیهاندا.

# ئیبن حەنبەل و تەکفیرکردن

ئەو ڕیوایەتانەی کە لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل وە دەگێڕدرێتەوە لە کتێبە عەقایدەیەکانی سەلەفیەکان یان حەنبەلیەکان دەربارەی تەکفیر کردنی موسڵمانانی تر هێندە زۆرە دەگاتە ئاستی متواتر – واتە زۆر ڕاستە وئەستەمە گومانیان لێبکرێت - . ئەوانەش کەمێکن لەو ڕیوایەتانە لە کتێبی طبقات الحنابلە لابن ابی یعلی لەدەمی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەگێڕنەوە: (من زعم ان القرآن مخلوق فهو جهمی کافر ومن زعم ان القرآن کلام الله ووقف ولم یقل لیس بمخلوق فهو اخبث من قول الاول ومن زعم ان الفاظنا به وتلاوتنا له مخلوقه والقرآن کلام الله فهو جهمی ومن لم یکفر هؤلاء القوم کلهم فهو مثلهم)!! طبقات الحنابلە لابن ابی یعلی ٢٩

(ئەوەی گوتی قورئان مەخلوقە ئەوە کافرێکی جەهمییە، ئەوەی تەنها گوتی قورئان کەلامی خوایە ووەستا ونەیوت مەخلوق نییە ئەوە قسەکەی لە قسەی یەکەم پیسترە، ئەوەشی گوتی لەفز وخوێندنەوەمان بۆ قورئان مەخلوقە وقورئانیش کەلامی خوایە: ئەوە جەهمییە، وئەوەشی ئەوانە بەکافر نەکات (تەکفیر نەکات) ئەوە وەک ئەوان کافرە!) ل ١٢٨( ئەوەی گووتی لەفزی بە خوێندنەوەی قورئان مەخلوقە کافرە) ل ١٢٨ (ئەوەی گووتی قورئان مەخلوقە کافرە، ئەوەشی گومانی هەبێت لە کافربوونی ئەویش کافرە) هەروەها دەڵێت: (ئەوەشی گووتی لەفزی بە خوێندنەوەی قورئان مەخلوقە، ئەوە جەهمییە بۆ هەتا هەتایی لەناو ئاگری دۆزەخ دەبێت ئینجا گووتی ئەوە شیرک بڕیاردانە بۆ خوا)

ئەو قەولەش قەولی زۆربەی زانایانی ئیسلامە بە بوخارییەوەش، وهەروەها قەولی زۆربەی هەرە زۆری مەزەبەکانی ترە جگە لە حەنبەلیەکان. کەوابوو بەلایەنی کەم نۆ بەش لە دەبەشی جیهانی ئیسلام کافرن بە قسەی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل!! ئینجا لە هەنگاوێکی تر ئەحمەدی کوڕی حەنبەل فەتوای خوێن ڕشتنی هەموو موسڵمانانی تر دەدات جگە لەوانەی هەمان قەولی حەنبەلیەکان یان سەلەفیەکان دووبارە ناکاتەوە، لێی دەگێڕنەوە دەڵێت:

(جەهمییەکان بوونە سێ دەستە: هەندێکیان گوتیان قورئان کەلامی خوایە ومەخلوقە، دەستەیەکی تر گوتیان: قورئان کەلامی خوایە ووەستا ووەستا ئەوانەش وەستاوە نەفرەتیەکانن!! دەستەیەکی تریشیان گوتی: لەفزی بە خوێندنەوەی قورئان مەخلوقە. هەموو ئەوانە جەهمی کافرن، تۆبە دەدرێن ئەگەر نەیانکرد ئەوە دەکوژرێن) ل ٢٥٣

شتێکی زانراوە کە زانایانی ئیسلام تا پێیان بکرێت خۆیان لە تەکفیرکردنی موعەیەن واتە کەسێکی دیاریکراو دەپارێزن، کەچی لێیدەگێڕنەوە کەوا زانایەکی گەورەی شافیعییەکانی سەردەمی خۆی حوسێن کەرابیسی تەکفیر کردوە بەناو: سمعت أبا عبد الله أحمد بن حنبل یقول الحسین الکرابیسي عندنا کافر) (الحسین الکرابیسي عندنا کافر) طبقات الحنابلة ل ١٢٨

سەیر لەوەدایە ئەو زانا شافیعییە زانایەكی گەورەی جەرح وتەعدیل بوو، وهەتا لەوانە نەبوو كە دەیان وت قورئان مەخلوقە، هەتا ئەگەر لەوانیش بوایە بۆی نییە تەكفیری ئەو كەسانە بكات كەوا دەڵێن.

لە هەمووی سەیرتر یەكێك یان حزبێك یان مەزهەبێك ئەگەر لەهەر كۆمەڵگایەك بكەوێتە كێشە لەگەڵ یەكێكی تر یان حزبێكی تر یان مەزهەبێكی تر، هەوڵ دەدات بەهەر جۆرێك خەڵكێك بۆ خۆی ڕاكێشێت، ئەگەر هەرنەكرا خەڵكێكی زۆر تا پێی بكرێ بێ لایەنیان كات، كەچی وەك بەبەر چاومان كەوت ئەحمەدی كوڕی حەنبەل هەتا هەق بەو كەسانەش نادات كە لەو كێشە بێ تامەی خەلقی قورئان بێ دەنگ بن وهەڵوێست وەرنەگرن، زۆر بە توندی هێرشیان دەكاتە سەر وناویان دەنێت بە وەستاوەكان (الواقفيين) وەك لە نموونەكانی پێشوو دیمان كە دەڵێت: وقالت طائفة: القرآن كلام الله وسكتت وهي الواقفة الملعونة!! ل ١٨ هەر لەو بارەیەوە دەڵێت: (الواقفي لا تشك في كفره) مناقب أحمد لابن الجوزي ل ٢٠٦. واتە گومان لە كافری وەستاوەكان (الواقفی) مەكە.!

كاتی خۆی خەڵكی ئاسایی ئەو قسە توندانەیان دەبیست لە زانایانی حەنبەلیەت بۆیە زۆربەی خەڵكە سادە وساویلكەكان لە ترسی تەكفیر دەچوونە پاڵ ئەو غەوغائیەتەی حەنبەلییە سەلەفیەكان، تا ئەمڕۆش هەر لەو كۆمەڵگایە دواكەوتوو وبێ سەوادانە گەشە دەكەن، وئەو كەسانەشی بۆ خۆیان دەكێشن زۆربەی نیمچە خوێندەوار ونەزانن، بەڵام جار وبار خەڵكانی خوێندەواریش بۆیان كێش دەبێت لەوانەی زیاتر شەهادەی زانستی سرووشتیان هەیە، وكەم روو دەدات خاوەن بڕوانامەی زانستە مرۆییەكانیان فریویان پێ بخۆن.

# هێرش بۆ سەر جەهمیەکان و ئەبو حەنیفە بۆ؟!
# عەبدوڵای کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل...

بەرلەوەی هەر شتێك بڵێین دەربارەی ڕۆڵی عەبدوڵای کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە ژیانی باوکی، دەمەوێت باسی جەهمی و جەهمیەت بکەم بە کورتی، کەدوایی بە درێژی باسی دەکەین، چونکە ناویان زۆر دووبارە بوەوە لەو حەدیسانەی کە ئیمام ئەحمەد خەڵکی تێدا تەکفیر کردوە بەتایبەتی جەهمیەکان! مەبەستی ئیمام ئەحمەد وسەلەفیەت بە گشتی لە جەهمی ئەو کەسانەیە کە شوێنکەوتەی [الجهم بن صفوان] کە لە ساڵی ١٢٨ هیجری پاش بەژداری کردنی لە شۆڕشێك بە ڕابەری الحارث بن سريج التميمي لە دژی دەوڵەتی ئەمەوی. خۆی ئەو ئاڕاستەیە دەبوایە بە ناوی [جعد بن درهم] ی مامۆستای ناونرابا، هەتا هەندێ مێژوونووس ئاماژەیان بۆ [جەعدیەت] کردوە. بەڵام دواجا ئەو ئاڕاستە فیکری وفەلسەفیە دینییە بەناوی جەهمیەتەوە ناونرا!

سەلەفیەکان زۆر بە خراپی باسی جەهمیەکان دەکەن وسەدان درۆ و بوهتانیان دەدەنە پاڵ، و هەتا ئەو کەمە هەقیقەتەش دەربارەیان دەڵێن بە نیوە چڵی دەیڵێن! لە سەرێکیترەوەش زۆربەی هەرە زۆری سەرچاوەکانیان لە نیوبردران! یانی بە کەیفی خۆیان قسەیان لەسەر دەکەن و تۆمەتیان بۆ هەڵدەبەستن، سەرچاوەکانیشیان فەوتاندوە تا بزانین ئەوان چ دەڵێن!

بۆ نمونە ئەوان تۆمەتی پەک خستنی [تعطيلی] سیفاتی خوا دەدەنە پالیان بەبێ ڕوونکردنەوە، کاتێ جەعدی کوڕی درهەم، لەسەر دەستی والیە شەلاتیەکەی ئومەوییەکان خالیدی کوڕی عەبدوڵلای قەسری بە دڕەندەترین شێوە سەری بڕا لە ڕۆژی یەکەمی جەژن ولەژێر مینبەری مزگەوتدا، گووتی: خەڵکینە قوربانیەکانتان سەربڕن، خوالیتانی قبوڵ بکات، من قوربانی بە جەعدی کوڕی درهەم دەدەم، کە دەڵێت: خودا ئیبراهیمی بە خەلیل و هاوڕێ نەکردوە، و قسەشی لەگەڵ موسا نەکردوە! [إنه زعم أن الله لم يتخذ إبراهيم خليلا، ولم يكلم موسى تكليما] ببینە ئەو وەحشیەتە لە ژێر مینبەر سەری زانایەکی وا گەورە سەربڕیت کە مامۆستا و تەربیەتدەری کوڕی خەلیفە بوو و ناسراو بوو بە زوهد و خواپەرستی! ئیبن تەیمیە دەڵێت جەهمیەکان دەڵێن خودا قسەکانی خستە ناو دارێکەوە و لەوێوە دەردەچوون بۆ موسا، ئەوانەش بەو قسەیە کافر دەبن ئەگەر تۆبە نەکەن دەکوژرێن!

ئەو نەفیکردنەی سیفات لەلای جەعدی کوڕی درهەم و جەهمی کوڕی سەفوان وجەهمیەکان بە گشتی لەبەر تەقدیسی لە ڕادەبەدەریان بۆ زاتی خوا و بە پشت بەستن بە ئایەتی [ليس كمثله شئ] هیچ شتێك وەك ئەو نیە، سوور بوون لەسەر دوورخستنەوەی هەموو وێکچوونێکی خودا بە مەخلوقاتی، بەو شێوەیە لێکدانەوەی تایبەتیان هەبوو بۆ سیفاتەکانی خوا، جا پێکابێتیان یان نا ئەوە بابەتێکی ترە،

هەرچەندە تەنزیهو دوورخستنەوەی سیفاتی مادی وەك دەست وچاو و پێ و دانیشتن زۆر باشترە لە بەرجەستەکردنی خوام چونکە بۆچوونکردنی خوا، بە جەستەیەکی گەورە، و دەست وپێ وچاو و دانیشتوو لەسەر عەرش وکورسیەوە، زیاتر لە بۆچوونە سەرەتاییە وەسەنیەکان نزیکە بۆ زاتی خوا.. ماقولە ئەوانە بەو تەنزیهو و تەقدیسی خوایەوە هەزار و سێ سەد ساڵ نەفرەت بکرێن و تەکفیر بکرین و وەك ئاژەڵ سەربرپڕێن!؟ دوایێ زۆربەی تێزەکانی جەهم لە وەڵامی تێگەیشتنی مادیانەی سەلەفی بوو، بە تایبەتی مقاتل بن سلیمان بوو کە موجەسەمەیەکی سەلەفی بوو، تەجسیمیەتی هێندە بڕی کردبوو دەست وپێ وچاو و جەستەی بریار دەدا بۆ خوا!

# تەکفیر و جوێن باران کردنی ئەبو حەنیفە

لە کتێبی (السنه) عەبدوڵای کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل یەک بابی تایبەتی تەرخان کردوە بە ناوی ( ما حفظت عن ابي ومشايخي في ابي حنيفة) کە سەرتاسەری تانە وجوێن وتەکفیر کردنە بۆ ئەبو حەنیفە وهاوەڵانی. کە ئەوەش ناکرێت هەر عەبدوڵای کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بۆ خۆی بە دەمی باوکی هەڵیبەستبێت چونکە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل وادیارە سروشتی زۆر توند وتیژی هەبوبێت، بە ڕادەیەک لە پاش بەربوونی لە زیندان پەیوەندی لەگەڵ کەڵەزانایانی حەدیسی وەکو علی بن المدینی ویحی بن المعین پچڕاند! هەر لەبەر ئەوەی وەک التقیه دانیان بە مەسەلەی خەڵقی قورئاندا هێنا!! تەنها ئەو کتێبەش ئەو بەزمە بە ئەبو حەنیفە ناکات بەڵکو نموونەی ئەو جۆرە کتێبانە لە ئەدەبیاتی سەلەفی زۆرن هەرچەندە نکوڵیش دەکەن، بەڵام ئەو ئینکار کردنەی هیچ سودێکی نیە لەبەرامبەر پشت ڕاستکردنەوەی ئەو خستنە پاڵە لەلایەن زانا گەورەکانیان وەک ( ابی یعلی لە طبقات الحنابلە ، و اللالكائی لە اصول السنه ، کتێبی (المقابلة بين الهدى والضلال) ی عبد الرزاق حمزه، والبیهقی لە کتێبی الاسماء والصفات ، وابن الجوزی لە کتێبی مناقب الامام احمد و لە کتێبی العلل المتناهیە، و ابن تیمیه ، وابن القیم ، وشەرحکەری العقیدە الطحاویە ، والذهبی . نەک هێندە بەڵکو شێخ ابن باز بە سەرچاوەیەکی سەرەکی عەقیدەی سەلەفی دادەنێت.

لەو ڕۆژگارەش کتێب لە دژایەتی وتەکفیری ابو حنیفە بەردەوامە لە دەرچوون. بۆ نموونە کتێبیکی هاوچەرخ بە ناونیشانی [ نشر الصحيفة في ذكر الصحيح من أقوال أئمة الجرح والتعديل في أبي حنيفة] لە نووسینی [الشيخ العلامة مقبل بن هادي الوادعي] کە تایبەتی کردوە بە وەڵامدانەوەی ئەو سەلەفیانەی دەیانەوێت بڵێن ابو حنیفة ش ئیمامێکی بەڕێزی موسڵمانانە، و ئەوانەی قسەیان پیگوتوە یان تەکفیریان کردوە کەمینەیەکی کەمن، و دەمکوتی ئەوانەش دەکات کە هێرش کردنە سەر ئەبو حەنیفە بە هەڵە و نەنگی لە قەڵەم دەدەن!

لە سەر کۆنەی ئەوانە دەڵێت: ئێوە ابو حنیفە باشتر دەناسن لە مالك بن انس و شريك بن عبدالله و النخعي، و يحيى بن سعيد بن القطان، وعبدالله بن يزيد المقرئ، ابن المعين، و سفيان الثوري و سفيان بن عيينة و عبدالله بن المبارك..."

ئینجا باسی هۆکاری ئەو کەسانەش دەکات کە قسەیان پێ نەگوتوە لەترسی ئەوە بوە: " چونکە حەنەفیەکان دەسەڵاتی دادگا وقەزایان بەدەست بووە لە سەردەمانێکی زۆر، زۆر لە ئەهلی عیلم نەیانتوانیوە بە ڕاشکاوی ناوی ابو حنیفە بێنن لە کاتی تانەلێدانی، ئەوەتە البيهقي لە مناقب الشافعي، تانەی ابن ابي حاتم لە ابو حنیفە دەگوازیتەوە، کە ابن ابي حاتم بەڕاشکاوی ناوی ابو حنیفە دەهێنێت، کەچی البيهقي دەڵێت [ابو فلان] و ناوی ابو حنیفە ناهێنێت"!

http://waqfeya.com/book.php?bid=7809

سەرەڕای زۆری بەڵگەکان و قسەکانی سەلەفی ساڵح لەمەر تەکفیرکردنی ئەبو حەنیفە، هەوڵمان داوە نمونە بە ناودارەکانیان بهێنینەوە:

لە لاپەڕەی ١٨٠: يؤجر المرء علی بغض ابي حنيفة (لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل م پرسی: خەڵک پاداشتی خێریان بۆ دەنوسرێت بە ڕق لێبوونەوەیان لە ئەبو حەنیفە؟ گووتی: أي والله، ئەرێوەڵڵا!)

لە لاپەڕەی ١٨١: سألت ابا يوسف عن ابي حنيفة فقال: وما تصنع به مات جهميا (ڕای ئەبو یوسفم پرسی لەبارەی ابو حنیفە، گووتی چ کارێکت پێیەتی ئەو وەک جەهمییەک مرد) درۆ بە دەوی یەکەم قوتابی ئەبو حەنیفەش دەکەن!

لە لاپەڕەی ١٨٢: (ئاینی ئەبو حەنیفە وباوکانی گوتنی قورئان مەخلوقە)

لە لاپەڕەی ١٨٤: ابن ابی لیلی نامەی نارد بۆ ابو حنیفە گووتی تۆبە بکە لە گوتنی قوئان مەخلوقە، ئەگینا کارێکت بەسەر دەهێنم پیت ناخۆش دەبێت، یەکسەر گوێرایەڵی نیشان دا، گووتم باوکە: چۆن واتکرد، گووتی کوڕم وەک توقیە ڕازی بوونم نیشان دا.

لە لاپەڕەی ١٨٤: جعلوه كافرا (تەکفیریان کردوە) مەبەستی زانایانی سەلەفیە!

سفیانی الثوري دەڵێت، حماد بن ابی سلیمان گووتی: بڕۆ لای ئەو کافرە مەبەستی ئەبو حەنیفەیە و پێی بڵێ: ئەگەر دەڵێیت قورئام مەخلوقە لێمان نزیك نەبیتەوە!

گوێم لە حماد بن ابی سلیمان جوێنی بە ئەبو حەنیفە دەدا! [ئەوە بەڵگەیە بۆ جوێندانی شەرعی سەلەفی ساڵح]

هەر ئەو حەمادە سفیان الثوري دەڵێت گوێم لیی بوو گووتی: سەیرت بە ابی حنیفە نایەت کە دەڵێت قورئان مەخلوقە؟ پیی بڵێ: هەی کافر هەی زەندیق! [ئەگەر ڕاست بیت ئەو حەمادە توحفە بووە لە جوێندان و تەکفیرکردن، باوکێکی مەزنی جوێندان وتەکفیرە]!

لە لاپەڕەی ١٨٦: ئەوزاعی دەڵێت: ئەبو حەنیفە ئیسلام تال تاڵ هەڵدەوەشێنێتەوە!

لە لاپەڕەی ١٨٧ هەر ئەوزاعی دەڵێت: ما ولد في الإسلام مولود اشر من أبي حنيفة وابي مسلم (لە ئیسلامدا کەسی خراپتر لە ئەبو حەنیفە وئەبی موسلیم لە دایک نەبوون) عروبەتی سەلەفیەت ببینە هەردووکیان عەرەبیش نین!

هەر ئەوزاعی لە لاپەڕەی ١٨٨ دەڵێت: وانه يخالف الحديث الشريف قصدا (ئەو بە ئەنقەست پێچەوانەی حەدیسی پێغەمبەر دەکات) بەڵکو هەر باوەڕی بە ١٥ حەدیسێك زیاتر نەبوو لە بلیمەتی خۆیدا.

لە لاپەڕەی ١٨٩:

گوێم لە ابن عون بوو گووتی: ما ولد في الإسلام مولود اشأم علی اهل الاسلام من أبي حنيفة (لە ئیسلامدا کەسی شومتر لەسەر ئیسلام لە ئەبو حەنیفە خەلق نەبووە!

لە لاپەڕەی ١٨٧

لە لاپەڕەی ١٩٢ ئەعمەش دەڵێت: رجل استتيب مرتين (دوو جار تۆبەی دراوە)

ابوبکر بن عیاش دەڵێت: والله الذي لا اله الا هو لانا اخوف على الدين منه من الفساق. [سوێند بە لا الە الا هو ترسم لە دین لەوان زیاترە لە فاسقەکان]!

لە لاپەڕەی ١٩٦: غیر ثقة ولا مأمون (جێگای متمانە نییە وئەمین نییە) بێگومان ئەمیین نییە لەسەر خوڕافاتی سەلەفیەت!

لە لاپەڕەی ١٩٤: سفیان الثوري دەڵێت فتاویە فتاوي الیهود (فەتواکانی فەتوای جولەکەیە) چۆن جولەکە لە تەك تەوراتدا تەلمود و میشنایان دروست کرد سەلەفیەت ئەحادیسی دروست کرد، کێ فەتوا وکاری جولەکەی کردوە؟!

لە لاپەڕەی ١٩٧: ضرب الله على قبر ابي حنیفة طاقا من نار (خوا تەوقێکی لە ئاگری خستۆتە سەر قەبری) ئەوە غەیبە بۆ منداڵ فریودان باشە!

لە لاپەڕەی ١٩٧: نبطیا استنبط الامور برأیە (نەبەتی بوو (واتە عەرەب نەبوو) بە بیروڕای خۆی بڕیاری دەدا) دیسان عروبەتی سەلەفیەت!

لە لاپەڕەی ١٩٨: سفیان الثوري دەماری عروبەتی دەجولێت و لێی دەگێڕنەوە کە باسی ابو حنیفە دەکرا، دەیگووت: ئەعوزوبیللا لە شەڕی ئەو نەبەتیەی کە ئیستیعرابی کرد، واتە بووە عەرەب! [ئەو قسەیە لە عەرەبچێتی زیاتر چیە سەلەفیەکان؟!]

لە لاپەڕەی ١٩٩: مالیکی کوڕی ئەنەس دەڵێت: ما كاد أبو حنیفة إلا الدین ، ئەبو حەنیفە دژایەتی تەنها لەگەڵ دین بوو[ ناگات بە یەك لە سەدا ی دوژمنایەتی سەلەفیەت بۆ دین، بەس نیە تۆپی زەویتان لە ئیسلام بێزارکردوە؟!]

هەر انس بن مالك لە لاپەڕەی ١٩٩ وابو حنیفة من الداء العضال وینقض السنن (ئەبو حەنیفە نەخۆشیەکی کوشندەیە وسونەتەکان هەڵدەوەشێنێتەوە) یانی سەلەفیەت دەرمانی دەردی بێ دەرمانە؟!

لە لاپەڕەی ٢٠٣: شریك بن عبدالله گوتی: لأن یكون في كل ربع أرباع الكوفة خمار یبیع الخمر خیر من ان یكون فیە من یقول بقول أبوحنیفة. (لە هەر گۆشەیەکی ئەو کوفەیە مەیخانەیەک هەبێت ومەی بفرۆشێت چاکترە لەوەی کەسێکی تێدا بێت پەیڕەو لە وتەکانی ئەبو حەنیفە بکات) دەڵێی لەسەر سەلەفیەتیان گوتووە! بەخوا لە شارەکان مەیخانەکان باشترن لەو شوێنانەی بیری تۆپیوی ترسناکی سەلەفیەت بڵاودەکەنەوە.

هەر لەو کتێبەی السنة و لە کتێبی (مسائل الامام احمد بن حنبل واسحاق بن راهویة) یش ڕووداوی سەردانی ئەبو حەنیفە بۆ الاعمش دەگێڕێتەوە کە زانایەکی گەورەی ئەهلی حەدیسە واتە لە باوکانی دامەزرێنەری سەلەفیەتە، ئەو ڕوداوە گوزارش دەکات لەو پەڕی بێ زەوقی وبێ ویژدانی بەرامبەر کەسانێکی غەیرە سەلەفی با لە ئاستی ئەبو حەنیفەش بێت، لەوەدا بۆت دەردەکەوێت کە هیچ جۆرە دۆستایەتیەك و پەیوەندیەکی مرۆییانە قابیلی دروست بوون نییە لە نێوان سەلەفیەك و دینداریکی نا سەلەفی کە لەسەر بیروڕاکانی ئەو نیە، چونکە ئەوان سەلەفیەت بە دینی هەقیقی و ڕەهای خوایی دەزانن، مەلا عبدالطیف ی مەدخەلیش گوێم لێیبوو دەیگووت برایان ئەگەر نەزانین ١٠٠٪ ئەوەی ئێمە

لەسەرینە دینی خوایە، نەك ٩٩٪ قەت ئەو ئیدیعایە ناکەین! دەڵێن ئەبو حەنیفە کە دەزانێت (ئەعمەش) نەخۆش کەوتوە سەردانی دەکات وبەو پەڕی ڕەوشتی بەرزیەوە پێی دەڵێت:
باوکی محمد ئەگەر بارگرانیت بۆ دروست نەکەم هەموو ڕۆژێک دەهاتمە سەردانت، ئەعمەش لە جیاتی ئەو ڕەوشتە بەرز وشارستانییەی ئەبو حەنیفە وەڵامی دەداتەوە ودەڵێت: بەخوا تۆ بارگرانی بەسەر من هەتا کاتێک لە ماڵەکەی خۆت دانیشتویت!! ئەی چۆن دەبێت ئەگەر هەموو ڕۆژێك سەردانم بکەیت؟!!!
( والله انك لتثقل علي وانت في منزلك فكيف اذا عدتني) !
هەر ئەو ئەعمەشە موبارەکە وتەیەکی بێ زەوقتر دەربارەی ئەبو حەنیفی دەڵێت کە لە ڕەوشتی یەکێک ناوەشێتەوە خۆی بە زانا دابنێت، ئەو زاتە موبارەکە دەڵێت: نمونەی ئەبو حەنیفە وەک یەکێکە لەشەو چوبێتە دەرەوە ورەشایەک ببینێت لەو وایە خورمایە، کەچی پیسایی سەگە!! (انما مثل ابو حنيفة مثل رجل خرج بالليل فرأى سوادا فظن انها تمرة، فأن اخطاه فيكون غير ذلك، كان خر وكلب)
عەبدولای کوڕی موبارەك هەتا گومان دەخاتە زانست و عیبادەتیشی، هەرچەندە ئەبو حەنیفە زۆر ناوداره بە کۆششکردنی لە عیبادەت، یەکێك لای باسی شارەزایی ئەبو حەنیفە دەکات لە عیلمی حەدیس و لە عیبادەت، عبدالله ابن المبارك مەلا مەعاز گووتەنی بە توندرەویەوە پیی دەڵێت: دەربارەی شارەزایی لە حەدیس ئەو کەسە شایستە نەبوو لەو عیلمە وەك تۆ دەڵێی، من بە نهێنی دەچومە مەجلیسی! دەربارەی عیبادەتی زۆریشی ئەوەش وانەبوو، چونکە زۆر چالاک بوو بەیانیان لە باسی مەسایلەکان تا دەگەیشتە ئێوارە وا چالاك بوو، ئەوەی عیبادەتکەر و شەونخونیکەر بێت بەیانیان بێ تاقەت وکزە!
ئاستی قسە پیگووتن و جنێودان دەگاتە ئەو ڕادەیەی لە شەعبیترین گەڕەك گوێت لە قسەی ئەو سەلەفی ساڵحانە نابێت: عبدالله دەڵێت: من هاوەڵانی ئەبو حەنیفە لای من وەك ئەو دەفلێدەرانەن یان دمبکچیانەن، ئەگەر یەکێکیان پاشەڵی رووت کرد لە مزگەوت، گویی پێ نادات خەڵك ببینێت! [ ما شبهت اصحاب ابي حنيفة الا بمنزلة الدفافين لو ان رجلا كشف استه في المسجد ما بالى من رآه منهم].
ئەمەو نمونەی تری زۆر لەو ئەلفازە ناشیرنانەی کە بە پێی کتێبەکەی عبدالله ی کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە دەمی سەلەفی ساڵح دەرچوە، لە دەمی خراپترین پیاوخراپ دەرناچێت، سەیرە کە بە دەست وپەنجەی عەبدولای کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەگوێزرێتەوە، کە ئەویش ئیمامێکە لە ئیمامەکانی سەلەفیەت، وابزانم ئەوی لەسەرتاوە ئەو نوسینەی خوێندبێتەوە ئێستا پێی سەیر نابێت ئەو هەموو جوێنی سوك و دەمپیسی و بوغز وغەدر وپیاوکوشتن وسەربڕینەی بەردەم کامێرا لەو سەلەفیانە دەربچێت!!

# مەدخەلیەکان: پێناسەیەك لە ناسنامەیان

ئەمڕۆ جیهانی ئیسلام دووچاری دەرهاوێشتەیەکی سەقەتی تری فیکری سەلەفی هاتووە لە ژێر ناونیشانی مەدخەلیەکان یان جامیەکان. فیکری ناهەوسەنگ بەوە دەناسرێتەوە کە هەردەم پەڕگیرە یان لەو پەڕی توندی دایە یانیش لەوپەڕی نەرمکێشی تا ڕادەی خۆ بەدەستەوەدان. ئەگەر لەو هاوکێشەیە قاعیدە وهاوشێوەکانی ئەوسەری توندرەوی بگرن بەکارە توندوتیژەکانیان، ئەوە مەدخەلیەکان لاکەی تری هاوکێشەکە دەگرن بە خۆ خستنە بەر خزمەتی دیکتاتۆر وفیرعەونەکان بە کەمالی ئاسودەیی ویژدانەوە.!

سەرهەڵدانی ئەو فیکرەیە وەك ئاڕاستەیەك دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی ١٩٩١ لە کاتی روداوەکانی داگیرکردنی کوێت لەلایەن سوپای عێراق، کاتێ سعودیەش هەستی بە هەڕەشەی سوپای عێراق کرد، لە مەتبەخی موخابەراتی سعودی ئەو جەماعەتە دروستکرا لەسەر دەستی کابرایەکی ئەسیوبی [حەبشی] بە ناوی محمد امان الجامي کە بە دان پێهێنانی لایەنگر وخودی مەدخەلیەکان هەر خەریکی ڕاپۆرت نوسین بوە لە دژی شێخەکانی تری هێڵی چاکسازی لەوانەی رەخنەیان هەبوو لە دەوڵەت وهەوڵی چاکسازیان دەدا، بۆیەش کاتێك پرسیار دەکەن لە عبدالعزیز العسکری مەدخەلی لە کاستێکی تۆمارکراودا دەربارەی حوکمی کارکردن لەگەڵ موخابەراتدا: لە وەڵامدا دەڵێت: جا زیانی چیە ئەگەر لە موخابەرات کارت کرد ودەوڵەتت پاراست لە تێکدەران وخاریجیەکان [مەبەستی ئەوانەی باوەریان بە خروج دەرکەوتن هەیە لە دژی دەوڵەت]!! خۆزگە موخابەرات ودەزگا جاسوسیەکانی خۆرهەڵات لە پیناو بەرژەوەندی خاك ونیشتیمان وهاوڵاتی دەبوون، ئەو کاتە دەکرا لەو حەماسەتە تێبگەین بۆ کارکردن وەك جاسوس وڕاپۆرت نووس، بەڵام کەس نیە نەزانێت بە مەدخەلیەکانیەوە کە ئەو دەزگایانە کاریان تەنها پاراستنی حاکم ودەسەڵاتدار وسەرکوتکردنی میللەتە، خەڵک دەناسم ئەوەی خراپە وهەولێری گۆتەنی خوا پێی ناخۆشە دەیکات، بەڵام بای هێندە نەفسیەتی بەرزە کە بە گەورەترین ئیغراش نەبۆتە جاسوس بەسەر ئازادیخوازانەوە.

ڕاستە هەندێك لە بیروباوەڕی مەدخەلیەکان سەرچاوەی تیۆری مێژوویی هەیە وەك مەسەلەی تەحریمکردنی دەرچون لە دژی سوڵتان هەتا ئەگەر زاڵم وفاسیقیش بێت، وهەتا ئەگەر هەموو ماڵ وسامانیشی لێستاندی ودارکاری وقامچیکاری پشتیشی کردی، بەڵام مەدخەلیەکان ئەو بیرۆکانەیان هێندەی تر درێو وناحەز کردوە کاتێك لە سیاقی مێژوویی خۆیانیان دەرخستوون ولەسەر حاڵەتێك یەکجار جیاواز جێبەجێی دەکەن، واتە بە کەرەستەی کۆن چارەسەری کێشەی نوێ دەکەن، بۆ نموونە ئەگەر سەلەفیەکانی بەرایی تەحریمی خروجیان دەکرد لە دژی سوڵتانەکان بۆ پاراستنی یەکڕیزی ئۆممەتی ئیسلام، هەرنەبێ ئەو سوڵتان ودەسەڵاتدارانە سەرەڕای جەور وستەمیان، بەڵام شەریعەتیان

بە یاسای خۆیان دەزانی و لەوش گرنگتر ئەو کاتە فەرمانڕەوایانی جیهانی ئیسلام سەربەخۆ بوون هیچ دەستێوەردانێکی دەرەوەیی وەك ئێستا کە لەبەر ئەو دەستێوەردانەی زلهێزەکان لە زۆربەی خاکی وڵاتانی جیهانی ئیسلامدا کەسانێك حوکم ناکەن بە ویستی خەڵک بن.

ئەگەر دەرچوون حەرام بێت لە دژی فەرمانڕۆ هەرچیشی کرد، کەوابوو دەبێت ئەو مەدخەلیانە یەکەم جار دەرچوونی ئیمام احمدی کوڕی حەنبەل لە دژی دەسەڵاتی خەلیفەی عەباسی ئیدانە بکەن کە سەرەڕای بوونی هۆکارێکی زۆر بۆ دەرچوون لە دژی جەوروستەمی عەباسیەکان، کەچی ابن حنبل لە پێناو کێشەیەکی لەفزی وتەرەفی وەك کیشەی [خلق القرآن] دەرچوو، هێندە خەڵکی هاندا لە دژی موعتەزیلەکان نەیان هێشت ئیسلام بە قۆناغی عەقلانیەتی مێژوویی تێپەڕێت، هەرچەندە موعتەزیلەش بێ گوناە نەبوون، وگەورەترین گوناهیان لە جیاتی دەیەها وسەدەها بواری پێویست بە گۆڕان هاتن لەو کێشە بێ ئەرزشەوە دەستیان پیکرد، وخەڵکیان لەسەر ئەزیەت دەدا وچەندەها قارەمانی ساختەیان لەو پێناوە دروست کرد!

مەدخەلیکان ئەمڕۆ بە ساویلکەیەکی لە ڕادەبەدەر هاتونەتە ناو گۆڕەپانی ڕوداوەکان. ناشیرینترین ڕۆڵ دەبینن لەو کێشمەکێشەی لە نێوان گەل وديموكراتخوازان لەدژی گەندەڵکار وستەمکاران دەبینن. وەك لە ناونیشانی ئەو وتارە ئاماژەمان پێکردوە، مەدخەلیەکان وەک خەواریجن لە دژی دیندار وئازادیخوازان وئەوانەی هەوڵی گۆڕینی سیستمی دیکتاتۆریەت وشمولیەت دەکەن، وبە توندترین شێوە هێرشیان دەکەنە سەر ودەسەڵات هاندەدەن لە دژیان، وهەتا ئەگەر دیندارەکان لە دەسەڵاتیش بوون ئەوان بە ئیعازی موخابەراتی سعودی لە دژیان دەوەستنەوە وەك چۆن لە دژی مورسی وەستانەوە لەناو ئەو هەموو وەلی ئەمرە فەرمەسۆنانە بەس مورسی یان بە وەلی ئەمر نەزانی، بە پێچەوانەی تەحریمکردنیان بۆ دەرچوون لە دژی وەلی ئەمر، ئەوان لە ریزی پێشەوەی کودەتاچیەکان بوون لە دژی وەلی ئەمریان، چونکە ئەوەی ئەوان دەجوڵێنێت دین وحەدیس وسونە نییە، بەڵکو فەرمانەکانی موخابەراتی سعودیە! ئێستا داویانەتە پاڵ کودەتاچیەکان وسیسی بە وەلی ئەمر دەناسێنن، وبەوپەڕی بێویژدانیەوە هانی دەدەن بۆ کوشتنی خەڵکی دژ بە کودەتا!

مورجیئەن بۆ دەسەڵاتداران لە نەرم ونیانی وهێنانەوەی هەموو عوزرێك بۆیان، با هەر تاوانیکیش ئەنجام بدەن دژی مرۆڤایەتی ودینیش، کەچی لای ئەوان هەر وەلی ئەمر وتاعەتی واجیبە وحوکمی سەرکەوتوو بە هێز واجیبە ورەوایە. هەر بۆیەش ئەمڕۆ دیکتاتۆر وسەرۆك حزبەکان لە هەر شوێنێك بن ئەو مەدخەلیانەیان تەبەننا کردوە وپیسترین کاریان پێدەکەن لە ڕاپۆرت نوسین وبەگرتدانی خەڵکدا، تەنانەت بە کەمالی دەبەنگی وچڵکاوخۆریەوە وردترین ڕاپۆرت پێشکەشی کۆنفراسی وەزیرانی ناوخۆی وڵاتانی عەرەب دەکەن کە تەنها دەزگای موخابەراتین!

ناوبانگی خۆفرۆشیان هێندە دەنگی داوەتەوە سەنتەری قەڵاچۆکردنی تیرۆریزم **Combating Terrorism Center** تەوسیە دەکات بۆ حکومەتی ئەمریکا بۆ پاڵپشتیکردنی مەدخەلیەکان وبەکارهێنانیان لە شەڕی دژی تیرۆریزم!!

http://www.ctc.usma.edu/

لە کورستانی باشوریش ئەمرۆ ئەو پەتایە مەدخەلیانە دەرکەوتوون وەك مامۆستا سعودیەکانیان هەمان پۆخڵەواتی ئەوان وخۆفرۆشی ئەوان ودەبەنگی ئەوان دوبارە دەکەنەوە، وەك کۆیلەی بێ بەها وبێ ساحێب دابەش بوونە بەسەر دوو حزبی دەسەڵاتدار وبانگەشەیان بۆ دەکەن وخەڵك سارد دەکەنەوە لە هەوڵی گۆڕینی وەزعەکە ودەسەلآت زیاتر هان دەدەن بە قسە سوەکانیان کە پڕاوپڕن لە زەلیلی وخۆبەدەستەوەدان وهەقی موتڵەق پێدانیان، ئەگەر بە دەست ئەوان بێت جەوێکی سوڵتانی دەخوڵقێنن کە تیایدا هەموو شتێك حەرامە: حزبایەتی وهەڵبژاردن وسنورداركردنی سەرۆکایەتی ورەخنەگرتن بە ئاشکرا وهەتا دوایی. ئەگەر مەدخەلیەت لەناو عەرەبدا دژی هەقیقەتی دین بن، ئەوا لەناو کوردا دژی ئەخلاق ورەوشتی کوردیشن کە دژە بە سەرشۆڕی وجاسوسیەت وماستاو کردن بۆ دەسەڵاتدارانن.
٢٠١٣/٩/١٣ سایتی ستاندار و پێنوسەکان

# ڕەبیعی مەدخەلی: ئافرەت جێگای متمانە نین!

زۆر ئاساییترە بڵێیت ئۆتۆمبیل لێخوڕین بۆ ژن مەترسی تێدایە لە ڕووی بەدەنیەوە و لە ڕووی ئاسایشی کەسێتی خۆی، یان بڵێیت کاریگەری دەبێت لەسەر حەوزی ئافرەت ومنداڵی نابێت، وەك مەلایەکی سعودی ئەو قسانەی بۆ خۆی دروست کردبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی بڕوانیتە هەموو ئافرەت بە چاوێکی نزم، و لەبەر بێ متمانەیی بە ڕەوشتی ئافرەت، و لەبەر ئەوەی نەوەك خۆی بخاتە باوەشی یەکەم پیاو کە دەیبینێت، لەبەر ئەوەی ئەگەر ئۆتۆمبیل لێخوڕێت، دەچێتە ژوانی دڵداری، ئەگەر پیاو نەبن ژن دەفەوتێن! ئەو تێڕوانینە پڕ لە تۆمەت وسوک سەیرکردنی ئافرەت، کرۆکی وتاری سەلەفیەتی کۆن ونوێیە، لە فتاوی فضیلة الشیخ ربیع بن هادي المدخلي (ج : ٢) . (ص : ٤٢٠) هاتوە:

**« پرسیار: ئایە جائیزە ئافرەت ئۆتۆمبیل لێخوڕێت؟**

وەڵام: نەخێر، چونکە ئەو کارە فەسادی زۆرە، یانی زۆر لە ژنان بێ ڕەوشت وفاسید دەبن، ئەگەر پیاو حەبلی بۆ شل کردن [وەك ئاژەڵ حەبلی بەکارهێناوە!] ، ئۆتۆمبیل لێدەخوڕێت ودەچێت بۆ گەڕان بەدوای دۆست، و چاوبازی [مغازلة] لەوانەیە ژوان بکات ، لەوانەیە ، لەوانەیە...! ئافرەت پێویستی بە پاراستن و بە قەوامەتی پیاوە، شوێنی بنەڕەتی خۆشی ماڵەوەیە ((وقرن في بیوتکن ولا تبرجن یبرج الجاهلیة الأولی )) [ الأحزاب : ٣٣ ] .

(( الرّجال قوّامون علی النساء )) [ النساء : ٣٤ ] .

ئەگەر قەوامەتی پیاو نەبێت ژنان فەوتاون، ئەگەر پیاوان بەسەریان ڕابگەن و قەوامەتی شەرعیان لەسەردا سەپاندن، ژنانیش ڕاست دەبن، ئەگەریش پیاو حەبلی بۆ شل کردن، لە زۆربەی حالەتدا تووشی لادان دەبن!"

ئەوە دەقە عەرەبیەکەیە:

السؤال :هل یجوز للمرأة أن تسوق السیارة ؟ الجواب :لا ؛ لأن هذا فیه مفاسد کثیرة ، وکثیر من النساء یعني قد تفسد إذا ألقي لها الحبل علی الغارب ، تقود السیارة وتذهب قد تخادن ، قد تغازل ، قد تعمل المواعید ، قد ، وقد ، المرأة تحتاج حمایة وتحتاج قوامة ، وأصل موقعها في المنزل ((وقرن في بیوتکن ولا تبرجن یبرج الجاهلیة الأولی )) [ الأحزاب : ٣٣ ] . (( الرّجال قوّامون علی النساء )) [ النساء : ٣٤ ] . ولولا قوامة الرجال لضاعت النساء ، إذا استقام الرجال وقاموا علیهن القوامة الشرعیة استقامت المرأة ، وإذا ألقي الحبل علی الغارب فإنها قد تنحرف غالبا .

جا تەسەوەر کە، خاوەنی ئەو بیرە دواکەوتووە لە کوردستان شوێن کەوتە وئەتباعی ببێت؟! بەڕاستی حەیفە بۆ کورد کە بە سەدان پلە پێشکەوتووترە لە کۆمەڵگای سعودی چەپێنراو، کەچی ئێستا وا بە دەبەنگی دەروێشاتی بۆ فیکرێکی بۆگەنی دواکەوتووی دەوارنشینی وا بکەن سەرچاوە: فتاوی فضیلة الشیخ ربیع بن هادي المدخلي [ (ج : ٢) . (ص : ٤٢٠)

٢٠١٥/٤/١٢

# دیاردەی شەخسپەرستی سەلەفیەکان لە کۆنەوە تا ئێستا

# خوا و زیارەتی گۆڕی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل

١-٣

من تێناگەم ئەو جەماعەتەی لە هەموو خەڵك زیاتر گوایە بایەخ بە فەرموودەی پیغەمبەر دەدات، لە هەموویان زیاتر کاری پێ ناکەن، ئەوەی سەلەفیش نەبێت و ئەهلی حەدیسیش نەبێت سەدان جار گوێی لە سەلەفیەکان و حەدیسیەکان بووە کە ئەو حەدیسە دەڵێن: [إياكم والغلو، فإنما أهلك من كان قبلكم الغلو] ئاگادارتان دەکەمەوە لە زیادەڕەوی، چونکە ئەوانەی پیش ئێوە بەو زیادەڕەوییە لە شێخەکانیان لەناوچوون.] رواه النسائي

ئەو سەلەفیانە ئەو زیادەڕەوییە تەنها دەدەنە پاڵ ڕافیزەکان و سۆفیەکان، کە ڕاستە ئەو دوو ئاڕاستەیە زیادەڕۆیی زۆریان تێدایە، بەڵام کێشەکە ئەوەیە چاوپۆشی دەکەن لە زیادەڕەوی خۆیان وەك سەلەفی لە پیاوە ناودار و شێخەکانیان. کەچی خۆشیان زۆر خراپ لەو زیادەڕەوییە تێوەگلاون.

ئەو زیادەڕەوییە بە ڕوونترین شێوە دەردەکەوێت لە کەسی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، و دەتوانین بڵێین مێژووی زیادەڕەوی سەلەفیەت لەوێوە دەست پێدەکات، تۆ وەرە ژیان و ئاستی زانستی کوڕی حەنبەل بخوێنەوە، ببینە چۆن سەدەها ئەفسانەیان لەدەوریدا دروست کردوە، کە زۆر لە ئەفسانەکانی شیعە لە ئیمامەکانیان و سۆفیەکان لە شێخەکانیان گەورەتر نەبێت بچووکتر نییە. بۆ نموونە: دەڵێن) :من أبغض أحمد بن حنبل فهو كافر. طبقات الحنابلة (١٣/١) ئەوەی ڕقی لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بێت کافرە! أن الإمام أحمد به يعرف المسلم من الزنديق، مناقب أحمد (٥٩٧) ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل موسڵمان و زەندیقی پێ دەناسرێتەوە!!

ئەوە دوو زیادەڕەوییەی سەرەوە لە ئیمام ئەحمەد، دەبێتە بنەمایەک بۆ هەموو ئیمام و شێخە سەلەفیەکان لە ئیبن تەیمیە و بەربەهاری و محمدی کوری عبدالوهاب و ئیبن باز و ابن عثيمين و الالباني تا دەگاتە شێخ ربيع المدخلي، ولەویشەوە دەگاتە شێخ ابو الحق عبداللطيفی سەلەفی مدخەلی! ئەوانە هەمووی دەبنە پێوەر بۆ جیاکردنەوەی کافر وئیسلام و ئەهلی سونە و ئەهلی بیدعە!

کار بەوە دەگات خودی خوا بە خۆی هەموو ساڵێك زیارەتی قەبری ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەکات! وأن الله عز وجل يزوره في قبره كل عام، [6] مناقب أحمد (٥٥٠)

ابن کثیر لە البداية و النهاية ٣٢٣/١٢ دەڵێت : (وفي صفر سنة ٥٤٢ رأى رجل في المنام قائلاً يقول له: من زار أحمد بن حنبل غفر له . قال: فلم يبق خاصٌ ولا عامٌ إلا زاره ، وعقدت يومئذ ثم مجلساً ، فاجتمع فيه ألوفٌ من الناس ) !! [ لە ساڵی ٥٤٢ پیاوێك لە خەونیدا یەکێك پێی گووت: ئەوەی زیارەتی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل خودا لێی خۆش دەبێت، کەسی تایبەت و گشتی نەما زیارەتی

نەکات، لەو ڕۆژە لەوێ کۆبوونەوەیەك بەسترا، هەزاران کەس ئامادەی بوون]
حەنبەلیەك لە خەوندا پرسیاری لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و یحیی بن معین کرد، وەڵامیان داوە: کە سەردانی خوایان کرد و سفرە و خوانیان بۆ ڕازاندۆتەوە!
وأن أحد الحنابلة سأل في المنام عن أحمد بن حنبل ويحيى بن معين فأجابه المسئول: بأنهما قد زارا رب العالمين ووضعت لهما الموائد، مناقب أحمد (٥٦٢) وەك سەردانی سەرۆکەکان بۆلای یەکتر!
حەنبەلیەکی سەلەفی تر خوای لە خەودا دیوە، خوا پیی گووتوە: ئەوەی پێچەوانەی ئەحمەدی کوڕی حەنبەلی کرد ئەشکەنجە دەدرێت!
وأن أحد الحنابلة رأى الله في المنام فقال له الله: من خالف أحمد بن حنبل عذب، مناقب أحمد (٥٦٣).

دەڵێن قەبرەکەی لە نێو چوار قەبری تردایە کە هەموو بەڵا و کارەسات لە بەغدا دوور دەکەوێننەوە!
و تەبەروك کردن بە قەبری ئەو شەرعیە! کەچی شەو ورۆژ بە خەڵکیتر دەڵێن قبوری و قەبرپەرست!
وأن قبره من ضمن أربعة قبور يدفعون عن بغداد جميع البلايا، مناقب أحمد (١٨٩).
وأن التبرك بقبر أحمد مشروع،مناقب أحمد (١٩١)
لەوەش خراپتر و کۆمیدی تر دەڵێن کە دوو فریشتەکەی مونکەر ونەکیر لە قەبردا پرسیاری من ربك یان لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل کرد، پێیانی گووت: بە من دەگوترێت: من ربك، کێ خواتە؟ ئەوانیش داوای لێبوردنیان کرد! یانی پێیانی گوتوە ئیحترامی خۆتان بگرن!
وأنه غضب على منكر ونكير لما سأله في القبر وقال لهما: لمثلي يقال: من ربك؟ !!فاعتذرا له[10]!!، مناقب أحمد (٥٤٩)
هەر کتێبی مناقب الإمام أحمد ی ابن الجوزي الحنبلي دا ڕیوایەتێکی زۆر سەیر و پڕ موبالەغات هاتوە، لە لاپەڕە ٤٥٤:
[ئەبوبەکر کوڕی مەکارم، کە دیارە شێخێکیساڵحی -جەماعەت بوە- ساڵێك بارانی زۆر باری و لە خەومدا وەك عادەتمە سەردانی قەبری ئەحمەدی کوڕی حەنبەلم کرد، دیتم قەبرەکەی زۆر تەنک بوە، خەریکە بە زەویەکەوە یەکسان دەبێت، گووتم لەوانەیە بە کاریگەری بارانەوە قەبرەکەی وای لێهاتبێت. کەچی گوێم لێبوو لە قەبرەکەیەوە گووتی :نەخێر، ئەوە لەبەر هەیبەتی حەقەوەیە، چونکە خودای سوبحانە وتەعالا سەردانی کردم! پرسیارم لێکرد دەربارەی نهێنی زیارەتی من هەموو ساڵێك، خوای پەروەردگار گووتی: ئەی ئەحمەد!چونکە تۆ گووتەکانی منت [قورئان] سەرکەوتانت، ئێستا بڵاودەبێتەوە و دەخوێندرێتەوە لە میحرابەکان، یەکسەر قەبرەکەیم ماچ کرد، و گووتم: گەورەم نهێنی چیە کە هیچ قەبرێك ماچ ناکرێت، جگە لە هی تۆ؟ گووتی: کوڕم ئەوە لە کەرامەتی مندا نییە، بەڵکو ئەوە کەرامەتی پێغەمبەر [د.خ] ، چونکە چەند تاڵە موێکی ئەوم لایە! ئەوەی خۆشی دەوێم با لە ڕەمەزان سەردانم کات! دوو جار دووبارەی کردەوە!] ئەوە و سەدەها ڕیوایات و گێڕانەوەی تری پڕ لە زیادەڕەوی.
ئەو جۆرە ئەدەبیات و قسە سەلەفیانەیە ئەمڕۆ دەیەها شێخی سەلەفی دروست کردوە لە نێو وڵاتانی

ئیسلامیدا، کە جەماوەری هەژار و ساویلکەی سەلەفیەکان فریو دەدەن لەسەر حیسابی خۆ پیرۆزکردنیان، لە ڕێگای ملسوڕاندنی مانای قورئان و حەدیس و قسەی پیشینان بۆ سەخسی خۆیان. من زگم بەو جەماوەرە هەژارە دەسووتێت، کە هەژاری مادی ومەعنەویشن! ڕقم لێیان نابێتەوە سەرەڕای دەمشڕیان و گەمژەییان و شەڕانگێژیان، بەڵکوو تەنها ڕقم لە سەرانیانە و بۆیە من ئەگەر کارێکم بە چەواشەکاران بێت، کارم بەو جەماوەرە هەژارە وفریوخواردوە نییە بەڵکو بە سەرانی فریودەریانە! ٢٠١٦/٤/٢٦

# دیاردەی شەخسپەرستی سەلەفیەکان لە کۆنەوە تا ئێستا شێخ ڕەبیعی مەدخەلی و قوتابیەکەی عەبدللەتیفی مەدخەلی

## ٢- ٣

ئەو خۆ پەسندانەی شێخەکانی سەلەفیەت لە ڕێگای ڕاستەوخۆی شێخەکانی سەلەفیەتەوە یان لە ڕێگای قوتابی و سەرسامەکانیان، وەك ڤایرۆس نەوە دوای نەوە بۆیان دەگوێزرێتەوە. لە ئەڵقەی پێشوو دیتمان چۆن زیادەڕەوی و غلوێك دەکەن لە شەخسی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، تا ڕادەی ئەوەی خودا زیارەتی قەبری شەریفی بکات، کەچی لای ئەوان خەڵکی ئاساییش نابێت زیارەتی قەبری هەتا پێغەمبەریش بکات!

یانی بە شێوەیەکی نائیراردی لە دەروونی ئەو سەلەفیانە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە محمدی کوڕی عەبدوڵلا پیرۆزترە، ئەگەر بە دەمیش وانەڵێن! چونکە گوێمان لێ نەبووە بڵێن خوا زیارەتی قەبری محمد دەکات هەموو ساڵێك!

سەیر لەوەدایە هەموو زاناکانی کە سەلەفیەت تەقدیسی دەکەن، و منداڵ وتاڵیان بۆ دەکەنە کۆیلەی ملکەچ، تەنها زانان لە علمی حەدیس و شەریعەت و تەهارەت و نوێژ و ڕۆژی و کەمێکیشیان لە فیقە! زانایەکیان تێدا نییە موسڵمانان شانازی پێوە بکەن لەناو جیهاندا لە نموونەی ئیبن سینا و ئیبن ڕوشد و ڕازی و ئیبن نەفیس و جابری کوڕی حەییان و فارابی، چونکە هەموو ئەوانە یان موعتەزیلە بوون یانیش شیعە و ئیسماعیلی بوون!

ئەو مەدرەسەیەی ئەهلی حەدیس لە کۆنەوە دەزگایەکی کەهەنووتیان دامەزراندوە، بە هەوەستی خۆیان خەڵك دەکەن بە فریشتە یان بە شەیتان، بە ناوی جەرح و تەعدیل، یان هەڵسەنگاندنی خەڵك لەوانەی دیندارن یان زانای دینین.

ئەوەی بکەوێتە دەمی ناودارەکانیان و بڵێن خراپە، تا ڕۆژی قیامەت ڕایان لە سەری ناگۆڕن و دەڵێن خراپە، بە دەگمەن یەکێکیان ڕایەکی پێچەوانە بەراییەکانی دەردەبڕێت، لەبارەی کەسانێکی مغضوب علیهمی وەک ابو حنیفە یان جەعدی کوڕی درهەم، یان غەیلانی دیمەشقی یان غەزالی یان ابن رشد. ئەوەشی وەك ئەوان سەلەفیەکی نصوصی بێت، و عەقڵی لەکار خستبێت لەبەرامبەر دەقدا، بەس بە قال فولان و حدثنا فولان کاری کرد، ئەوە باشترین پیاوی ناو تەرازووەکەیە، با یەك زەڕە عەقڵ و تەقوا و زانستیشی نەبێت.

ڕەبیعی مەدخەلی، بەوەندە ناوەستێت کە کەسانیکی وەك ابن باز و ئەلبانی و اب عسیمین و کێ وکێ ستایشی بکەن، بەڵکو دەیان قوتابی و شوێنکەوتەی خۆی بە جۆرێك وەسفی دەکەن لە سەرووی ئاستی مرۆڤەوە. هەرچەندە ئەو ستایشکردنانەشی هەمووی ڕاست نییە، کەسانیکی وەك ابن باز و ئەلبانی و ابن عسێمین و الفوزان و زانای تری زۆریش، زۆر بە توندی ڕەخنەیان لە ڕەوشتی توندی

و شەڕانگێزی گرتووە، و هەروەها بە سەتحیەت و ساویلکەیی تۆمەتبار کراوە لەلایەن ئەلبانی، و بە درۆکردن بە دەمی ابن عسێمین یش تۆماتبار کراوە. ئەو وتارە بخوێنەوە:

[من أقوال (كبار أهل العلم) في نقد الدكتور ربيع بن هادي المدخلي، وبعض أقواله ومواقفه.]

لە ستایشی زیادەلە حەدی مریدەکانی، موریدێکی بەناوی دکتۆر ئەحمەد بازمۆل دەربارەی دەڵێت:

[بەخوا سەلەفیەکان وەك شێخی عەللامەی موحەدیسی موجاهیدی، هەڵگری بەیداغی جەرح و تەعدیل و ئیمامی سونەی سەردەمی خۆی ، ڕەبیعی کوڕی هادی عومەیری مەدخەلی یان نەدیوە]

((فوالله - الذي لا إله إلا هو - ما عرف السلفيون : الشيخ العلامة المحدث المجاهد حامل راية الجرح والتعديل إمام السنة في زمنه ربيع بن هادي عمير المدخلي))

هەروەها لە کۆمێنتێکی لەسەر وتارێکی دەڵێت: [تۆ تەنهایت ودەگمەنیت لەو باسە، هەتا بوویتە ئایەتێك لە ئایاتی الله لە عیلم و حیکمەت و سوونە[.

((لقد تفردت في هذا الباب ، حتى صرت آية من آيات الله في العلم والحكمة والسنة)).

هەر لە وتارێکیتریدا بە ناوی " هل يسأل عن مثل الشيخ ربيع المدخلي" کە هەر ناونیشانەکەی ماستاوچیەتیە:

[هەقمانە وەک سەلەفی بە شێخمان، بەهاری سونەت و هەڵگری بەیداغی جەرح و تەعدیلی ئەو سەردەمە بە هەقەوە بڵێین: تۆ لە پردەکە پەڕیتەوە، پرسیار دەربارەی کەسێکی وەک تۆ ناکرێت، بە ڕاستگۆیی و دادپەروەریەوە[.

((ويحق لنا نحن السلفيين أن نقول فى شيخنا ربيع السنۀ حامل رايۀ الجرح والتعديل فى هذا العصر أنک قد جاوزت القنطرۀ ولا يُسأل عن مثلک نقولها بحق؛ وبصدق وبعدل)).

سالم الطويل وتارێك لەسەر شێخ ڕەبیعی، کە دروستکراوێکی موخابەراتی سعودییە بەناوی [كاد الشيخ ربيع المدخلي أن يكون بدريا [یانی وەك پلەی سەحابەی بەدر!

نمونەی تر زۆرن، هەمووی هەر خەریکی ئەو بەزمەی ستایشی یەکتر و ستایش کردنەوەن تا ئەم ڕۆژگارەی کە هێناویانە.

شێخ ربيع المدخلي بەوەندەش نەوەستاوە بە زەبری دەسەڵاتی موخابەراتی سعودی وا ستایش بکرێت لەلایەن زانایانی دەسەڵات لە ابن باز و ابن عثيمين و مقبل الوادعي و ئەلبانی، بەڵکو خۆشی ستایشی خۆی دەکات!

لە قورئاندا هاتووە: ستایش و تەزکیەی خۆتان مەکەن، ئەو ئاگادارە بە وەی خۆپارێزە! {فَلاَ تُزَكُّوا أَنْفُسَكُمْ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ اتَّقَى}.

لە کاسێتێکدا بە ناوی (صفات الأبرار) دەڵێت: «فأنا، يا إخوۀ -إن شاء الله- من أشد الناس تمسكاً بمنهج السلف الصالح واتباعاً لهم واقتفاءً لآثارهم، وهذه كتبي موجودۀ، اقرأوها ترون. (!!!) " [ برایان من ئینشاڵلا لەو کەسانەم کە بە توندترین شێوە دەستم بە مەنهەجی سەلەفی ساڵح گرتووە، و شوێن پێیان هەڵدەگرم، ئەوەش کتێبەکانم بیخوێننەوە، خۆتان دەیبینن!]

هەر لە مجموع الكتب والرسائل (١٩٦\٩) دەڵێت : "علماء السنة والتوحيد والقامعين للبدع من أمثال

الشيخ النجمي والشيخ زيد بن محمد هادي والشيخ ربيع بن هادي." [ زانایانی سونەت وتەوحید و سەرکوتکەرانی بیدعە لە نمونەی شێخ نەجمی و شێخ زيد بن محمد هادي والشيخ ربيع بن هادي!] ناوی خۆشی تێخستوە ستایشی خۆی دەکات!

جاروبار دەکەوێتە درۆ و هەڤدژیشەوە، کاتێ لە مجموع الكتب والرسائل (١١\٧٤) دەڵێت " :أنا قرأته -في الظلال- ، وأنا في الثانوي، وأعرف الأخطاء التي فيه، أعرفها والله وأنا في الثانوي، عرفنا أخطاءه في الصفات، أخطاءه في العلوم الكونية، أخطاءه في النواحي السياسية والاقتصادية، كلها عرفناها ونحن في الثانوي عرفناها ، ما أدري شبابنا إذا قرأوا هذه الكتب يميزوها وإلا لا يميزوها، والله نحن ميزناها ونحن في الثانوي."

[ من في الظلال ی سید قوتب م خوێندەوە لە قۆناغی ناوەندی، هەڵەکانیم زانی لە سیفات، لە زانستە بوونەوەریەکان، هەڵەکانی لە بواری سیاسی و ئابووری، هەموویمان زانی هێشتا لە ناوەندی بووین، نازانم گەنجانمان ئەگەر ئەو کتێبە بخوێننەوە دەتوانن هەڵەکانی دیار بکەن یان نا!؟ بەخوا ئێمە فەرقمان پێکرد هێشتا لە ناوەندی بووین.]

سەیر لەوەدایە لە پاش قۆناغی دواناوەندیش شێخ ڕەبیعی مەدخەلی کتێبی "منهج الأنبياء"، نووسی کە تیایدا ستایشی سەید قوتب ومەنهەجەکەی دەکات و دەڵێت: خودی مەنهەجی پێغەمبەرانی پێکاوە! خۆ کتێبەکەی دوای قۆناغی ناوەندی نووسیوە، ئەی کە هەڵەکانیت زانیوە ئەو ستایشە درۆیینە چییە؟! یان درۆ دەکات لەو ستایشە یان لە ستایشەکەی تر کە دەڵێت لە ناوەندیەوە ئاگاداری هەڵەکانی سەید قوتب بووم!

لە کاسێتێکی دەنگیدا دەڵێت سەلەفیەتی من لە سلفیەتی ئەلبانی بە هێزتر بوو لە زانکۆ! "ئێمەی قوتابیانی شێخ عبداللە القرعاوي سەلەفیەتەکەمان لە سەلەفیەتی ئەلبانی بەهێزتر بوو...کە چاومان بە ئەلبانی کەوت دیمان سەلەفیەتەکەمان لە سەلەفیەتی ئەلبانی بەهێزترە خوا دەزانێت لاساییمان نەکردەوە، شێخ عبداللە سەلەفیەتێکی بۆ هێناین ڕاستی و ناوەرۆکی سەلەفیەت!"

" ونحن طلاب الشيخ عبدالله القرعاوي عندنا سلفية أقوى من سلفية الألباني ... فالتقينا بالألباني وإذا نحن في السلفية أقوى منه يعلم الله ما قلدناه، الشيخ عبد الله جاء بسلفية هي صحيح السلفية"

لە وتەیەکی تردا لە مجموع الكتب والرسائل (٢٣٦\٨) خۆی دەکاتە هاوشانی بوخاری و ابو حاتم و ئیمامەکانی تر، دەربارەی توێژینەوەیەك بۆ ماجستێر لە نێوان ئیمام موسلیم و الدار قطني، سەبارەت بە ڕاستکردنەوە حەدیسێکی لاواز لە موسلیمدا دەڵێت: " ئەگەر ابو حاتم و بوخاری توێژینەوەیەکی تێروتەسەلیان کردبایە، بە ڕای من لە ئەنجامەکانیان لەو ئەنجامانەی کە من پێی گەیشتم تێ نەدەپەڕین!"

»ولو درس أبو حاتم وغيره من الأئمة، حتى البخاری دراسة وافية لما تجاوز فی نظری النتائج التی تَوصّلتُ إليها ، لأننی بحمد الله طبّقتُ قواعد المحدثين بكل دِقّة ولم آل فی ذلک جهداً. "

14/5/2016

# دیاردەی شەخسپەرستی سەلەفیەکان لە کۆنەوە تا ئێستا
# ئەزموونی مەدخەلی کوردی ئەزموونی سعودیشی تێپەڕداوە!

## ٣-٣ کۆتایی

شاراوە نییە کاتێ عەبدللەتیف باسی شێخ ڕەبیعی مەدخەلی دەکات، وەك مامۆستای خۆیی و پاشماوەی سەلەفی سالح ناوی دەهێنێت، خوا هەڵناگرێت شێخ ڕەبیعی مەدخەلیش پشتی قوتابیەکەی خۆی بۆ کوردستان و عێراق لە ئەرز نادات، لە چەندین بۆنە بە دەنگ و نووسین پاڵپشتی خۆی بۆ شێخ عەبدللەتیفی مەدخەلی دووپات کردۆتەوە، هەتا لەو ڕووداوانەی ئەو دووایەش، دەربارەی ئەو سکانداڵەی بەبێ تەحقیق گووتی " ئەمە بوختانێکی زۆر گەورەو ناقۆڵایە ، ئەمە پیلانێکی دوژمنانە!"

شێخ عەبدللەتیفی سەلەفی دەیەوێت کەسایەتیەکی هاوشێوەی ئەو لە کوردستان دروست بکات، لە ڕێگای بەکارهێنانی هەمان ئامرازەکانی شێخ ڕەبیعی مەدخەلی کە بریتین:

١- چوونە پاڵ دەسەڵاتی سیاسی و ستایشکردنی و تەحریمکردنی هەر جۆرە نارەزایەتیەك و بەرهەڵستیەك. وادیارە لەو هەنگاوەش سەرکەوتنی باشی بە دەست هێناوە، دەسەڵاتداری گەندەڵ ڕازییە لە پێناو بێ دەنگ کردنی خەڵك و بەنج کردنیان بە ئەفیونی سەلەفیەت، لە تالانی ودزی وگەندەڵی بەردەوام بێت، خەڵکیش ڕادەستی ئەو وەحشە دینییە بکات، کە لە ئاییندەدا داخراوترین و توندڕەوترین و دواکەوتووترین کۆمەڵگای لێ بەرهەم دێت. ئەو دەسەڵاتە هیچ ڕوئیایەکی کوردانە و نیشتیمانیانەی بۆ ئاییندە نییە، دەبینین چۆن تەنها خەمی بە تالان بردن و بەتاڵکردنی کوردستانە لە سەروەت وسامانی، بێ ئەوەی حیسابێك بۆ ئاییندەی نەوەکانی داهاتوو بکات. کەوابوو چۆن حیسابێك بۆ مەترسی گۆڕینی ئەو کۆمەڵگایە میانڕەوە کوردییە دەکات، لە خەمی گۆڕانی سروشتی میانڕەوی دەبێت بۆ توندڕەوی؟!

ئەو میانڕەوییەی میللەتی کورد، کە سەدان خۆرهەڵاتناس و سیاسی و توێژەر و چاودێری خۆرئاوایی و هەتا عەرەبیش، ئاماژەی پێدەکەن، بە سەرسامیەوە باس لە کراوەیی و واڵایی و قابیلیەتی گونجانی دەکەن لەگەڵ بەها سێکیولار و مەدەنیەکانی کۆمەڵگایەکی مۆدرن، و دەڵێن زیاتر لە هەموو گەلانی ناوچەکە گەلێکی سێکیولار ڕەفتارە، بە مانای پێدانی قەبارەی سروشتی ماقوڵ بە ڕەهەندی دینی لەناو کۆمەڵگادا، نەك دژایەتی دین.

٢- سەلەفاندنی خەڵکی کوردستان بە توندترین و قیامەتدۆستترین فۆرمی سەلەفی، و خەریک کردنیان بە ڕیش و نیقاب و ئاخیرەت و بیدعە و سونە، و فەرامۆش کردنی دنیای تازە. لەو بوارەوەش توانیویەتی نەوەیەکی داخراوی بێ هیچ ئاسۆیەکی بیرکردنەوە دروست بکات. نەوەیەك بۆ هێمایەکی دینی ئامادە بێت باوك و دایک و براو خوشکیشی بکوژێت، بەڵام بۆ پرسە نەتەوەییە گشتیەکانی کورد تەنها بۆ خۆڵکردنە چاوی خەڵك یان وەك ماستاوێك بۆ دەسەڵات نەبێت، دەنا هەر لە یادیشیان نییە. ئەو

سـەلەفاندنە دەفعەیەکـی بەهێزیـش دەداتـە ژیانـەوەی کلتـوری عەرەبـی لـە ڕووی داب ونەرێت و زمـان و زەوق و دنیابینـی و بەهاکانـی ژیـان.

٣- توانیویەتـی هەمـان شـێوازی شـێخ ڕەبیعـی مەدخەلـی بـەکار بهێنێـت لـە ناوزڕاندنـی نەیارە دینییەکانـی، و فـوو لەخۆکردن و خۆ گەورەکردنـی لـەلای شـوێن کەوتەکانـی، تاڕادەی تەقدیسـکردن. ئـەوەی لایەنگرانـی نیشـانیان دا لـەو سـکاندالەی شـێخ عەبدلـلەتیفی مەدخەلـی، لە بەرگری لێکردن و ڕەتکردنـەوەی بەڵگەکان و ناردنـی هەڕەشـە وجوێـن بـۆ نەیارەکانـی، بەڵکـو بـە ئاشـکرا دەڵێـن چونکـە تـۆ واتگـووت، ئێمـەش شـت و بوختانـت بـۆ دروسـت دەکەیـن! یـان دەڵێـن بـە ڤیدیـۆش سـکاندالەکە ببینیـن بـاوەڕ ناکەیـن! یـان خەونـی درۆیینـەی بـە نـاوی پێغەمبـەرەوە بـۆ دەبینـن! دەیـان کاری تـری شـەخسپەرسـتی دەیسـەلمێنێت لـە شـێخ ڕەبیعـی مەدخەلـی یشـی تێپـەڕداوە لـە نـەزەری قوتابیەکانـی، بەڵکـو خـۆی وەك ئەحمـەدی کوڕی حەنبەلـی کوردسـتان دەردەخـات! چونکـە ڕەبیـع لەنـاو کەسـانێکی عەرەبـی زانـە، لـە دەقـەکان تێدەگـەن و بـە ئاسـانی ناتوانێـت وەك شـێخ عەبدلـلەتیفی مەدخەلـی ملـی ئایـات و حەدیسـەکان بـۆ بەرژەوەنـدی خـۆی وەسـوڕێنێت! مەترسـی ئـەو گوێڕایەڵیـە ڕەهایـەش و ئـەو دەمارگرژییـە بـێ سـنوورە، کـە سـنووری خوڕافاتچیترین شـێخی سـۆفیەتیشـی بەزاندووە، لـە ئاییندە زۆر زۆر گەورەیـە، ئەگـەر شـێخ عەبدلـلەتیفی مەدخەلـی لـە سـاتێکی پـڕ ئاشـووب و قەیرانـی وەک ئێسـتای کوردسـتان، وەك مەدخەلیەکانـی میسـر فەرمانێکـی بـۆ بێـت بـۆ دەسـتکردن بـە کاری سیاسـی، بـەس خـوا دەزانێـت سـەر بـۆ چـی دەکێشـێت!

ئـەوەی لام سـەیرە ئەزموونـی سـەلەفیەتی مەدخەلـی بـە ڕابەرایەتـی عەبدلـلەتیف، دەتوانـم بڵێـم ئامـرازی زیاتـر و هێـز و ئـازادی زۆرتـری بـۆ دەسـتەبەر کـراوە، زیاتـر لـە خـودی ئەزموونـی شـێخ ڕەبیعـی مەدخەلـی! ئـەو ئـازادی و ئـەو هەمـوو کەناڵـە میدیاییـەی لـە تەلەفزیـۆن و ڕادیـۆ و کتێـب و بایەخـی ناپرۆفێشـناڵەی میدیـای کـوردی کـە خراوەتـە خزمـەت شـێخ عەبدلـلەتیفی مەدخەلـی و دەعوەکـەی، شـێخ ڕەبیـع نیـوەی ئـەوەی بـۆ دەسـتەبەر نەکـراوە! نەمزانیـوە کەناڵێکـی ئاسـمانی و ڕادیـۆی هەبێـت! یانـی دەسـەڵاتی سـعودی بـەو تێڕوانینـە سـەلەفیەی کـە هەیەتـی، هێشـتا لـە دەسـەڵاتی گەندەڵـی شـاری بـێ ساحێبی کوردسـتان وریاتـرە بـە مەترسـی ئازادیەکـی ڕەهـا بـۆ مەدخەلیـەکان! و دەزانـن چـۆن بەکاریـان بهێنـن لـە سـنورێکی ماقوڵـدا!!

لـە وەڵامـی نەیارەکانـی شـێخ عەبدلـلەتیفی مەدخەلـی، کابرایەکـی عـەرەب مامۆسـتا لـە زانکـۆی تکریـت، وتارێکـی بـۆ بەرگریکـردن لـە شـێخ عەبدلـلەتیفی مەدخەلـی نووسـیوە بەناونیشـانی: [المطالـب العاليـة في تزكيـة الإمـام ربيـع للشـيخ عبـد اللطيـف الكـردي وصـد عـدوان البغـاة !!

جمع وإعداد: سامي عويد احمد ]

بەرگریەکـی زۆر لـە شـێخ عەبدلـلەتیفی مەدخەلـی دەکات و بـە ئەهلـی متمانـەی شـێخ ڕەبیعـی مەدخەلـی دادەنێـت و لـە بڕگەیەکیـدا لەسـەر شـێوازی کۆنـی تەقلیـدی نێـوان زانایانـی سـەلەفی ستایشـی شـێخ عەبدلـلەتیفی دەکات بـەو جـۆرە: [ئینجـا ئـەوەی پشـتی سـتەمکارانی شـکاند، ستایشـی عەتـرێژ و تەزکیـەی پێـدراوی ئیمـام - شـێخ ڕەبیعـی مەدخەلـی- بـوو بـە شـێخ عەبدلـلەتیف و قوتابخانـە سـەلەفیەکەی، وەك دانهێنـان بـە فەزڵـی، و ڕێزگرتـن لـە گرنگـی ئـەو، و وریایـی ئـەو، و پەسـندکردنی پایـەی، و تەزکیـەی کارەکانـی،

و وەک سوپاسگوزاری بۆ ڕێ وشوێنی، زانینی قەدری، و شوێن کەوتنی کارامەیی، و ئاگادارکردنەوە لە ئاکار وڕەوشتی و فەزڵی، بۆیە دوچاری وروژان بوون، وەك شێت هەڵچوون، هەتا حەسەد و ستەمیان گەیاندنی بەو ڕادەیە پەلار لە ئیمامە مەزنەکان بدەن، ئینجا بە ڕاشکاوی تانە لە ئەهلی عیلم بدەن!
" ثم إن داهية الدهور ,وقاصمة الظهور-لأهل البغي- الثناء العطر, والتزكية المعطاة من الإمام ربيع للشيخ عبد اللطيف ,ومدرسته السلفية؛ اعترافا بفضله, وتبجيلا لخطره ,وإقرارا بنباهته, وتفضيلا لشأنه, وتزكية لأثاره, وإحمادا لسنته, وإيثارا لاصطفائه, وارتساما برسومه ,ومعرفة بقدره, واختيارا لاجتنائه, واقتداء بأهليته, وتنبيها بأدبه, وفضله ,فثارت ثائرتهم, وجن جنونهم؛ حتى أخرجهم الحسد, والبغي إلى التعريض حتى بالأئمة الأعلام, ومن ثم التصريح, بالثلب ,والعيب بأهل العلم الكرام."
لە هەوڵەکانی سەلەفیە عەرەبەکانی عێراق و کەنداو، و تەزکییەکانی شێخ ڕەبیعی مەدخەلی بۆ ابو عبدالحق عبداللطيف احمد، دەردەکەوێت کە شێخ عەبدللەتیفی مەدخەلی پرۆژەیەکی سعودی سەلەفی مەدخەلی دەسەڵاتی سعودییە، بۆ ئەوەی پێگەیەکی سعودی بە هێزی کوردی لەسەر سنووری ئێران دروست بکرێت، لەو ڕێگایەدا بەشێکی گەورەی دەسەڵاتی کوردی کە پارتییە لایەنێکە لەو سەفقەیە، و یەکێتیش تەماشاکارە دیارە بەشێکیان لە ژێر فشاری سیاسی و دراوی و بازرگانی پارتی، وبەشێکیشیان لەبەر خەمساردی ئێران بەرامبەر ئەو دیاردەیە، دەنا ئێران بەو نفوز ودەسەڵاتەی کە لە سلێمانی هەیەتی، دەتوانێت هەزار مزگەوتی سەلەفی و سەدان شێخی وەك شێخ عەبدللەتیفی مەدخەلی بە شەوێك بپێچێتەوە.
مەرامی ئێرانیش لە وتارێکی عەرەبیدا باسم لێکردووە کە هەتا لە کوردستانی ژێر دەستی خۆشی ڕێگا خۆش دەکات بۆ سەلەفاندنی کۆمەڵگای کوردی! هۆکارەکەشی بەڕای من بۆ ئەوەیە کە ئێران حەز دەکات خەباتی عادیلانەی کوردی بگۆڕێت بۆ شەڕێکی مەزهەبی سونە و شیعە، حەز دەکات بەیانی خەباتی کورد بکەوێتە دەستی جەماعەتێکی سەلەفی ڕیش درێژ و کورت عەقڵ، عەقڵیان لە میراتی عەلی ومعاویە زیاتر بڕ نەکات! چونکە جیهانیش هەقی بەو شەڕە نابێت کە هەڵگیرسا، و ئەو کاتە بە ئاسانی کورد لەناو دەبات. بەڵام ئەگەر کورد خەباتیکی نەتەوەیی و دیموکراسی و عادیلانە، و دوور لە کەڵکەڵەی شەڕی دینی و مەزهەبی بکات، ئەوە فشارێکی زۆر لەسەر کۆمەڵگای نێودەوڵەتی دروست دەکات، و پاڵپشتی دنیای ئازاد زیاتر بەدەست دەهێنێت، و ئەرکی ئێرانیش قورستر دەکات لە ڕوبەرو بوونەوە.
بهێنە بەرچاوت لە جیاتی پ ك ك لە باکوور حزبێکی سەلەفی داعشی جڵەوی خەباتی بە دەست گرتبا؟!
ئەوە پ ك ك سیحری داعشی بەتاڵ کردۆتەوە هێشتا وەك پێویست پشتگیری لێ ناکرێت، ئینجا ئەگەر سەلەفیەکی داعشی با یان هەر تەنها ئیسلامی با؟!
٢٠١٦/٥/١٦

# سەلەفیە مەدخەلیەکان متمانەشیان لە سعودیەوە هاوردە دەکەن!

هەر لە سەروبەندی ئەو سکاندالەش شێخ ڕەبیعی مەدخەلی بەبێ یەك ودوو، پشتگیری خۆی بۆ دەستنێژەکەی خۆیی و موخابەراتی سعودی، شێخ عەبدللەتیفی مەدخەلی دووپات دەکاتەوە، هەتا بە قسەی ئەو سەلەفیانەشی نەکردوە، کە لە ڕاستی ئابڕووچوونەکە دڵنیان، و چوونەتە لای تا متمانەی لێ وەرگریتەوە! ئەی چۆن بە ئێمە باوەڕ دەکەن، کە فاسق و بێ دین و مونافیقن بە قەولی شێخی ڕاستگۆ و داوێنپاکی؟!

لە سەردانێکی کوڕی عەبدللەتیف، عبدالحق عبداللطیف احمد و چەند کەسێکی تری سەلەفی بۆ لای شێخ ڕەبیعی مەدخەلی لە ٢٠١٦/٥/١٤ وەك هەواڵەکەی ماڵپەڕە سەلەفیەکان باسی دەکەن: "ئێمە کە کۆمەڵی براین سەردانی شێخی پایە بەرز شێخ ربیعمان کرد لە شەوی یەکشەممە وڕێکەوتی لە شاری مەدینە ، شێخ ربیع پرسیاری کرد سەبارەت بەم فیتنە ی ئێستای کوردستانی گرتۆتەوە وفەرمووی ( کەسانێک سەردانیان کردم وگویان نەدەدا بە قسەکانیان ) پاشان شێخ ربیع فەرمووی هەر کە ئەو هەواڵەم بیست ووتم پاکی و بێگەردی بۆ خوا، ئاخر ئەمە بوختانێکی زۆر گەورەو ناقۆڵایە ، ئەمە پیلانێکی دوژمنانە ."

تۆ ببینە ئەو شێخ ڕەبیعی مەدخەلی یە کە کەس نەماوە هێرشی نەکاتە سەر و گومانی وا بۆ زانا و نووسەر و عولەمای ئیسلام و سەلەفیەتیش دروست دەکات لە خەیاڵی شەیتانیش نییە، خۆی بە زانای یەکەمی زانستی الجرح و التعدیل، یانی هەڵسەنگاندنی زانایانی ئیسلام دەزانێت لەو سەردەمە، و شوێن کەوتەکانی بە امام الجرح و التعدیل في عصره ناوی دەبەن! کەچی وا ساویلکانە یەکسەر حوکم دەدات کەوا ئەو سکانداڵەی شێخ عەبدللەتیفی مەدخەلی " ئاخر ئەمە بوختانێکی زۆر گەورەو ناقۆڵایە ، ئەمە پیلانێکی دوژمنانە ."

ئەخر بۆیە من دەڵێم ئە زانستە سەقەتەی ناویان ناوە الجرح و التعدیل هەمووی وا دارێژڕاوە، شەیتانیان کردۆتە فریشتە، و فریشتەیان کردۆتە شەیتان، داوێن پیس کراوەتە شاهەنشاهی رەوشت، و ڕەوشتداریش کراوەتە لوتکەی بێ ڕەوشتی، درۆزن کراوەتە ڕاستگۆ، ڕاستگۆ کراوەتە درۆزن! ڕووداوی هەق کراوەتە بوختان و پیلانی دوژمنان، ڕووداوی خەیاڵیش بە قسەی ئەعرابیەکی درۆزن کراوەتە هەقیقەت..

ئەو شێخ ڕەبیعی مەدخەلی یە هێندە ساویلکە نییە، بەڵام خۆی دەزانێت چەند ماندوو بوونە و چەند پارەیان خەرج کردوە، و چەند ئیمکانیاتیان خستۆتە خزمەت دروستکردنی پێگەی شێخ عەبدللەتیفی مەدخەلی، ئەو ژمارەیە گەنجە دەمارگرژەی بۆ دەعوەکەی، بۆیە ناکرێت لەبەر ئافرەتێك کە خوا بە ڕای شێخ ڕەبیع بۆ پیاوی دروستکردوە، و پیاوی بۆ ئافرەت دروست نەکردوە! پێگەی شێخ عەبدللەتیفی

مەدخەلی تێک بدرێت، چونکە ئاسان نییە یەکێکیتر وا دروست کەنەوە! بەڵام ئەو گەمبۆزە شتێکی گرنگی لە بیر چووە، کە تەزکیەی ئەو بەس لای مەدخەلیەکان دەخوات، خەڵکی کوردستان زۆربەی هەرە زۆری متمانەیان بە بووکە شوشەکەی نەماوە، و خۆشیان خاوەنی متمانەکەن، نەك چڵکاوخۆرێکی موخابەراتی سعودی.

٢٠١٦/٥/١٦

# ئایە ئیبن تەیمیە ی باوکی توندوتیژی سەلەفیزم کورد بوو؟!

گومانی تێدا نییە ئیبن تەیمیە یەکێکە لە کاریگەرترینی ئەو زانایە دینیانەی کە شوێن پەنجەی خۆی لەسەر کۆی بیرمەند و جوڵانەوە ئیسلامیەکانی دنیا جێهێشتووە، کاریگەری هەتا لەسەر رووداوەکان هەیە، بۆیە بە تایبەتی لای خەڵکانێکی سەلەفی توندڕەو زۆر خۆشەویستە، لای خەڵکانێکیش کە مەترسی بیروباوەڕەکانی ئەو دەرك دەکەن تابڵێی بێزراوە! کوردێکی موسڵمان وئیسلامی سەلەفی زۆر دڵ بەوە خۆش دەکەن کە ئیبن تەیمیە کوردە و خەڵکی حەرانە.

ئەوەی یەکەم جار باسی کوردبوونی ئیبن تەیمیەی وروژاند پێموابێت ئیمام محمد ابو زهرة بوو لە کتێبی [ ابن تيمية، حياته و عصره – آراؤه و فقهه] ل ١٨، کە دەڵێت: ئەو مێژونووسانەی کە باسیان کردوە، خێزانی ئیبن تەیمیە یان نەداوەتە پاڵ قەبیلەتێك، بەڵکو تەنها دایانەتە پاڵ حەڕان کە شوێنی یەکەمی ژیانی خێزانی بووە، وەك عەرەب نەیانداوەتە پاڵ عەشیرەت وقەبیلەیەك، ئەوەش دەیسەلمێنێت کە عەرەب نەبووە، ونەدراوەتە پال هیچ قەبیلەیەکی عەرەبی، بۆیە دەتوانین تێبگەین و وا گومان ببەین کە عەرەب نەبووە، لەوانەیە کورد بوو بێت، کە قەومێکی بە هیمەت و ئازا وبە تەنگەوەهاتوون، و ڕەوشتیان بە هێزە و توندی تێدایە، ئەو سیفەتانە بە ڕوونی لە ئیبن تەیمیە دابوو، هەرچەندە لە ژیان هێمنی زانایان ، و ئاسودەیی بیرمەندان، و لەسەرخۆیی موحەقیقان ژیا بوو. هەروەها کورد لە سەدەی شەشەم و حەوتەم هەڵوێستی جوانیان هەبوو لە بەرگریکردن لە ئیسلام و موسڵمانان، لە بەرەی یەکەمی ئیسلام وەستا بوون لە دژی خاچپەرستان، و زەبری یەکەم بەر ئەوان کەوت و دوایی چەندین چەپۆکیتریان بەر کەوت بەڵام بەرەنگاربوونەوەیان خاچپەرستانی بێ ئومێد کرد لە زاڵبوون بەسەر ئیسلامدا، یان بەلایەنی کەمەوە توندئاژۆییەکەیان تێکسکاند وهەیبەتیان نەهێشتن هەتا کورد و دوایی میسریەکان بە تێکشکاوی ناردنیانەوە بۆ وڵاتانی خۆیان" دار الفكر العربي، ١٩٧٤، ل ١٨

لەوەدەچێت ئیمام ابو زهرة دەستی بە هەموو سەرچاوەیەکی مێژوویی نەگەیشتبێت دەنا سەرچاوەیتر هەیە باسی نەسەبی کردبیت وەك عەرەب!

حمدی عبدالمجیدی سەلەفی یش، کە زانایەکی سەلەفی کورد بوو، ئەو قسەیەی ابو زهرە دوبارە دەکاتەوە ودەڵێت ئیبن تەیمیە کوردە چونکە تەنها کورد بەناوی شوێنزادەی، ناوی خۆی دەنێت، بە پێچەوانەی عەرەب کە بەناوی قەبیلەکانیان ناوی خۆیان دەنێن!

بەڵام ئەو ئیدیعایە بە دڵی هەموو کەسێك نییە، زۆر بابەت وکۆمێنتم دیوە تا ڕادەی گاڵتە پێکردن بە کورد رەدی کوردبوونی ئیبن تەیمیە دەکەنەوە، زۆرجار عەرەبی سەلەفیم دیوە زۆر بە توندی ئەو ئیدیعایە ڕەت دەکاتەوە وابزانم بەپێی تێڕوانینی عەرەبی دینی ئیبن تەیمیە یان پێ خەسارە کورد بێت، چونکە وەك سەرنجمان داوە وێنەی کورد لە توراس و کەلەپوری عەرەبی ئیسلامیش تابڵێی وێنەیەکی

شێوێندراوە، کورد بەدرێژایی مێژووی عەرەب، بە دەگمەن نەبێت، وتەیەکی باشی لەسەر نەنوسراوە! هەردەم وەك ڕۆڵەکانی زینای نێوان کەنیزەکانی سلێمان پێغەمبەر و جنۆکەکان تەماشایان کراوە، یان وەك میللەتێکی بێ کۆنترۆڵ وخەریک بە دزی وجەردەیی وياخيبوون وسەركێشی. وێنەی کورد لە تێڕوانینی عەرەبی زۆر سەرنج راکێشە، بۆیە لە وتارێکی سەربەخۆ باسی دەکەین.

سەیر لەوەدایە کە ئیبن تەیمیە شتێکی گووت بە دڵی عەرەب نەبوو دەڵێن کوردە! لە وتارێک بە ناونیشانی [وهم احترام الخصوصيات] نووسەری سعودی منصور النقيدان، هەندێك قسەی ئیبن تەیمیە بە بەڵگە دەهێنێتەوە دژی بەدوەکان کە بە دژی ئیسلامیان دەزانێت! نووسەرێکیتری سعودی خالد الغنامي لە وتاری [الأعراب أشد كفراً ونفاقاً] وەڵامی توندی نووسەر دەداتەوە ودەڵێت: " لقد أخطأ ابن تيمية ( وهو كردي الأصل بحسب رأي الأغلبية الساحقة من الباحثين المستشرقين ) في أنه قرن بين المشركين والأعراب"

[ئیبن تەیمیە هەڵەی کردوە (کە کوردە لە ئەسڵدا بەپێی ڕای زۆربەی توێژەران لە ڕۆژهەڵاتناسان) بە بەستنەوەی موشریک و ئەعرابەکان! پێیوایە ئەو ڕەگەزپەرستیە دژی ئەعرابەکان، بەدوەکان فەقیهەکان لە ابن تیمیەیان وەرگرتووە!

ابن ناصرالدين الدمشقي لە کتێبی : التبيان لبديعة البيان، الربعي الدمشقي لە کتێبی: الزيادات دەڵێن عەرەب بووە لە قەبیلەی نمیر بووە!

شێخ بكر أبو زيدی سەلەفیش لە کتێبی [المداخل إلى آثار شيخ الإسلام ابن تيمية وما لحقها من أعمال] ل ١٦ دەڵێت:

( نسبته النُميرى من إفادات تلميذ تلامذته ابن ناصر الدين ( ٨٤٢ ) ، وتابعه عليها العدوى فى الزيارات ، بل هذه النسبة منصوص عليها فى بعض رسائل الشيخ المخطوطة على طرر النسخ ، وقد ذكر الشيخ ابن قاسم فى مقدمة النقض ، رسالتين رآهما فى الظاهريّة كذلك ص ٣٥ حاشية ١ ، وهى نسبة إلى بنى نُمير ، وهم بطن من عامر بن صعصعة بن معاوية بن بكر بن هوازن العدنانية ، وذكر القلقشندى فى نهاية الأرب ص ٤٣٣ نقلاً عن ابن خلدون : أن منازل بنى نُمير فى الجزيرة الفراتية والشام ، فشيخ الإسلام إذاً عربى صريح نسباً ولساناً ).

"نەسەبی ئیبن تەیمیە نومەیریە بەپیی وتەکانی قوتابیەکی قوتابیەکانی ابن ناصر الدين، العدوي یش لە [الزيارات] هەمان شت دەڵێت، بەڵکو ئەو ڕەچەڵەکە لەسەر هەندێ لە نامە دەستنووسەکانی خودی شێخ نووسراوە، وەک شێخ ابن قاسم لە پێشەکی النقض باسی دوو نامیلکە دەکات، کە لە کتێبخانەی یا دەستنوسخانەی الظاهرية بینیونی... بنی نومەیر یش بەپێی ابن خلدون شوێنیان دەکەویتە جەزیرەی فورات و شام، کەوابوو شێخی ئیسلام عەرەبێکی بێ گەردە بە نەسەب و بە زمان"

کەوابوو زۆر سەرچاوە جەخت لەسەر عەرەب بوونی ئیبن تەیمیە دەکەنەوە، لە کاتێکدا هیچ سەرچاوەیەکی کۆن ئاماژە بۆ کوردبوونی ناکات، کۆنترینیانی ئەو کتێبەی ئیمام محمد ابو زهرەی ئەزهەری میسریە کە لە ساڵی ١٩٧٤ چاپ کراوە.

ئەویش سەرەڕای ستایشکردنی کورد وە میللەت، کە ئەوە دەگمەن ڕوودەدات لە نوسراوە عەرەبیەکان، بەڵام هەموو بڕیارەکەی لەسەر زەنێک دامەزراندوە، کە ئەوەیش ئەوەیە عەرەب هەردەم نازناوی بەناوی قەبیلەی دەکات، لەبەر ئەوەی زۆربەیان کۆچەر وگەڕۆك و بەدو بوونە، میللەتانیتر نازناوەکانیان بەناوی شار وشارۆجکەکانیان کردوە، چونکە شارستانی تر بونە، چونکە حەرانیش ناوچەیەکی کوردنشین بووە، بۆیە دەبێت ئیبن تەیمیە کورد بێت!

کێشەکە لەوەدایە زانایان وناودارانی کۆنی کورد و میللەتانیتری ناعەرەب زۆریان لەبەر شانازیان بە ئیسلام کردنەوە نکوڵیان لە میللەتانی خۆیان کردوە، بەدوای بچوکترین بیانوو گەڕاون تا بڵێن عەرەبن! دەتوانم بڵێم ئەو وەزعە تا سەد، پەنجا ساڵێکیش هەرمابوو، خێزانە دینیەکان هەردەم ڕەچەڵەکیان دەبردەوە سەر عەرەب، شێخ ڕەزایەکی وازمان تیژیش ئیعتراف بە فەزڵی عەرەب بەسەر غەیری عەرەب دەکات! ئیبن تەیمیەش هەتا ئەگەر کوردیش بێت دەتوانم بڵێم داڕێژەرێکی هەرە گرنگی تیۆر و داوای باڵادەستی ڕەگەزی عەرەبە، و خۆشەویستی عەرەب وعەرەبچێتی بە بەشێك لە ئیمانی ئەهلی سونە وجەماعەت دەزانێت. لە وتاری داهاتوو باسی تیۆری عەرەبچیەتی ئیبن تەیمیە دەکەین، ئەو کاتە کوردیش بێت، خۆمان دەبێت بڵێین کورد نییە!

من لەبەر یەك شت قەت باوەڕ ناکەم ئیبن تەیمیە کورد بوو بێت، ئەویش ئەوەیە کورد بە گشتی سروشتێکی مرۆیانەتر و نەرم ونیانتری هەبووە لەو سروشتەی توند و شەڕانگێژەی عەرەب و ئیبن تەیمیە. کورد سەدان عاریف و حەکیمی وەك شێخی گەیلانی و سوهروەردی و مەحوی و مەولانا خالید و نورسی تیادا هەڵکەوتوە کە تەژی بوون لە مرۆدۆستی، هەتا پیاوێکی عەسکەری مەزنی وەك سەلاحەدینی ئەیووبی، سەرەڕای ئەوەی ژیانی هەموو لەناو شەڕ وشۆڕی ناوەکی ودەرەکی بوو، هەرچەندە بێ هەڵەش نەبوە وکەسیش نابێ، بەڵام میهرەبانی و مرۆیی سەڵاحەدین بە هیچ مونسفێك و دادپەروەرێك نکوڵی لێناکرێت، ئەوروپای سەردەمی خاچپەرستیش دانی پیادا هێناوە! نەرم و نیانی و شەهامەت و مرۆدۆستی ئەو زۆرجار سنوورەکانی ئیسلامیشی تێدەپەڕاند لە ڕەفتاری لەگەڵ دوژمن و دیلەکان و مەدەنیەکان، هەزاران کچ وژنی جوانی ئەورووپایی خاچپەرستانیان دەست دەکەوت بەو پەڕی ڕیزەوە مامەڵەی دەکردن و ئازادی دەکردن! بەڵام بەپیی رای ئیبن تەیمیە بێت ئەوانە هەموویان دەبێت دابەش بکرێن بەسەر موجاهیدان، وەك داعش و توندڕەوانیتر پەیڕەو لە ئیبن تەیمیە دەکەن لە ڕەفتارە توندوتیژەکانیان.

٢٠١٥/١١/٦

# ابو اسحاق الحوینی وگەڕانەوە بۆ سەردەمی جاریە وکەنیشکەکان

کاتێ ڕەخنە لە خیتابی سەلەفیەت دەگرین، هیچ پاڵنەرێکی شەخسیمان نیە، نە پاڵنەری شوهرەت ونە پاڵنەری ماددی، چونکە ڕێگای ئاسانتری زۆر هەیە بۆ شوهرەت پەیداکردن لەبەر بوونی شوبهەیەك یان لەدەستدانی سەربەخۆیی پێیدا نەڕۆیشتین، گوێمان لێدەبێتەوە جاروبار تانەی بێدینیمان لێدەدەن بە نسبەت ئەو تانەیەش دەڵێین، سەلەفیەت هەموو کەسێکی دەرەوەی بازنەی خۆیان بە بێدینی تاوانبار دەکەن جا با لە ئاستی ئەبو حەنیفەی نوعمانیش بێت کە سەدان وهەزاران جار تەکفیر کراوە لە سەرچاوە سەلەفیەکان لە نوسینەکانی پێشوماندا بە درێژی باسمان کردوە.

تەنها هۆیەك وپاڵنەرێك هەمان بێت لەو بوارە، شکاندنی دیواری پڕ لە ترس ولەرزی پیاوانی دینی گۆڕەپانی ئیسلامییە، لەبەرامبەر توندڕەوی ودڕندایەتی ئەو فیکرەیە، کە ناویان ناوە بە سەلەفیەت. لەوەتی شۆڕشەکانی تونسی ومیسری سەرکەوتون، وەك هەموو جارێك دیسان لە هەلومەرجی پڕ پشێوی وپاشاگەردانی، دەیان گروپی سەلەفی سەریان هەڵداوە و دەستیان داواتە کاری منداڵبازاڕی، لە هێرش کردنە سەر قەبر و مەزارەکان، وسوتاندنی کەنیسەکان، وخۆشکردنی ئاگری تایفەگەری، وتەجاوز کردنە سەر هەندێك شوێنە گشتیەکان وهتد.. وەك بڵێی ئەو شۆڕشە مەزنانە بۆ ئەوە هاتوون موحارەبەی قەبر ومردوەکان بکەن، نەك بنیاتنانی ژیانێکی نوێ ومەدەنی دوور لە وەسیەتە ڕەش وتاڵەکانی شێخەکانی سەلەفیەت.

دەیانەوێت خەڵك لەپاش ئەو شۆڕشانە، بۆ بەرژەوەندی وڵاتانێکی خەلیجی سەرقاڵ بکەن، بەو کارە لاوەکیانە ومەسەلە سەرەکیەکان لەبیر خەڵك ببەنەوە، لە دادگەری کۆمەلایەتی ودەستەبەرکردنی ئازادیەکان ومافەکان. ئەو قسانەم بە بۆنەی ئەو مشتومڕەی ئەو دواییە دێت کاتێك ناسراو بە (ابو اسحاق الحوینی) کۆڵەکەی هەرە گەورەی سەلەفیەت لە میسری تازە شۆڕش کاسێتێکی کۆنی ئاشکرا کرابوو، کە تێیدا چارەسەرێکی سەیر وسەمەرەی کێشەی ئابووری دەخاتە بەردەم خەڵکی گشتی جیهانی ئیسلام، ئەو چارەسەرەش جیهادە، بەڵام چۆن جیهادێك، جیهادێك بمانگەڕێنێتەوە بۆ دواوە بۆ سەردەمی جەواری وکەنیشك وکۆیلایەتی!! ئەوەیە دابڕانی ئیپیستمۆلۆژی مەعریفی سەلەفیەت لەگەڵ ئەو سەردەمە کە تەنها قسەکردن لەو بارەیەوە بە تاوان دەژمێردرێت، من بە خۆم گوێم لەو کاسێتەی ابو اسحاق الحوینی بوو لەسەر یوتیوب لەو ناونیشانە http://www.youtube.com/ : watch?v=jBORwJA7LDU

بەڕاستی کە گوێی لێدەگریت، هەست دەکەیت ئەو کەسە تا چ ڕادەیەك مرۆڤایەتی خۆی لەدەست داوە، ونزیك بۆتەوە لە سروشتی جانەوەر ودڕندەکان، کاتێك مەسیحیەکان ویەهودیەکان وهەموو غەیرە ئیسلامەکانیش، لە هاتنی ئیسلام وگەڕانەوەی دەترسێن پێیان دەڵێین دوژمنانی دینی خوا! ئەخر چۆن

نەترسن لە دینێك كەسانێکی تێدایە بەو جۆرە داوای تالآنکردن وکۆیلایەتی کردنی خەڵکی غەیرە ئیسلام دەکەن؟! گوێگرە بە عەرەبی لەهجەی میسری ابو اسحاق الحوینی کە هەتا ناوەکەشی دەڵێی هیچ پەیوەندی بەو سەردەمەوە نییە، چی دەڵێت بۆ چارەسەری هەژاری:
"هو الفقر اللي إحنا فيه ده مش بسبب تركنا للجهاد؟، مش لو كنا كل سنه عمالين نغزو مرة ولا اتنين ولا تلاته، مش كان هيسلم ناس كتير في الأرض، كل واحد كان هيرجع من الغزوه جايب معاه يقصد أسرى تلات أربع أشحطة وتلات أربع نسوان وتلات أربع ولاد، اضرب كل رأس في ستميت درهم ولا ستميت دينار يطلع بماليه كويسة" [مەگەر ئەو هەژارییەی ئێمە تێیداین بەهۆی وازهێنانمان لە جیهادکردن نییە؟ ئەگەر ئێمە ساڵانە جارێك ودوو یان سێ جار غەزامان کردبا خەڵکێکی زۆر موسڵمان دەبوون لەسەر زەوی، وهەرکەسەی دەگەڕایەوە لەو غەزایە بە سێ چوار زڕتە زەلام (ئەو اشحطة بەکار هێناوە، کە سوکایەتی پێکردنە بە ئادەمیەتی مرۆڤی ناموسڵمان، وەك علوجی کۆنی توراسمان) و سێ چوار ژن و سێ چوار منداڵ، هەر سەرێکی بدە لە شەش سەد درهەم یان دینار پارەیەکی چاکت لێی دەست دەکەوێت (لێرەش سەری بەکار هێناوە وەک ئاژەڵ ئاماژەیان بۆدەکات!) ]
لە جیهاندا ئەمڕۆ کۆمپانیا هەیە، بەقەد چەندین دەوڵەت بودجە وقازانجی دەست دەکەوێت! ئەو جانەوەرە فیکری کلۆڵی بۆ هیچ بازرگانیەك وپیشەسازیەك ئیش ناکات، تەنها ڕێگای تالآن وبرۆ وغەنیمەت نەبێت، وڕێگای کۆیلایەتی بەنیادەمەکان نەبێت.! وزۆر بە متمانەوە دەڵێت:
"ولو رايح علشان تعمل صفقه عمرك ما هتعمل الأموال دي. " (ئەگەر بچیتە ئەوێ بۆ سەفقەی ژیانت هەرگیز ئەو پارەیەت دەست ناکەوێت) لە هەمووی مەترسیدارتر دەڵێت ئەوەشی بەو بانگەوازە ڕازی نەبێت (لەدژی دەجەنگێین، بەدیل دەیگرین وماڵ وژن ومنداڵی دەبەین وئەوەش هەمووی بریتین لە پارە وپول!!!واللى يرفض هذه الدعوة نقاتله، ونخدوا أسير وناخد أموالهم ونساوهم وكل دي عباره عن فلوس.
بێگومان پاش کاردانەوەی خەڵك لەدژی ئەو بیرە بۆگەنانە، ابو اسحاق الحوینی وسەلەفیەکانی میسر ودونیا هاواریان لێ هەستا گوایە ئەو قسانە کۆنن پێش ١٨ ساڵان گوتراون، ولە سیاق دەرکراون وخراپ لێکدراونەتەوە وئەو قەوانە کۆن وسواوەی کە لە پاش هەموو قسەیەکی قۆڕ ولێدوانێکی نا مەسولانە دەکرێت، سەیر لەوەدایە هەر ابو اسحاق لە کلیپێکی تردا شەرم دەکات قسەکەی وەك خۆی دوبارەکاتەوە وسەدان پینە وپەڕۆی بۆ دەکات، هەرچەندە سورە لەسەر ئەسڵی فیکرەکە، گوێبگرن لەو لینکە لە یوتیوب.

http://www.youtube.com/watch?v=I9Bn8Mmbz2A&NR=1

هێشتا کاردانەوەی ئەو قسە درزێوانە تەواو نەببو کاتی ئافرەتێکی عەقڵ کلۆلی جاریە ئاسا قسەی لەو قۆڕتری کرد لە دەوڵەتی کوێتی عوزماوە کەسێك کە گوایە چالاکوانە دەیەوێت چارەسەری کێشەی زۆری زیناکردن بکات بۆ کوێتیەکان بە گەڕاندنەوەی سەردەم وعەسری جەواری وعەبید، تا دینیان لە دەست نەچێت!!! چۆن، سلوی موتەیری دەڵێت: پێویستە یاسایەك بە پەلە دابنرێت بۆ هێنانی کەنیشك لە ڕێگای نوسینگە تایبەتیەکان، چونکە بەپێی قسەکانی ئەو (کەنیشکەکان بۆ ڕابواردن کراون وئایین

مولکایەتی ئەوانی حەلال کردوە بە مەرجێك دیلی جەنگ وغەزاکانی دەولەتێکی ئیسلامی بن لەدژی دەولەتێکی نا ئیسلامی، ودەکرێت دیلە ژنەکانی روسەکان لای شیشانیەکان بهێنین یان لە روسیا و ولاتانی تر!!!

ماشەللا ولاتانی ئیسلامی چەندە بەهێزن تا منداڵ وپیاو و ژنی ولاتانی تر وا بە ئاسانی وەك مەڕومالات بفرۆشرێن لەبازاڕی نەخاسەی کوێتی عوزما!! ڕوسیا ئەگەر بیەوێت بە چەکەکانی هەموو جیهانی ئیسلامی لەوجوود تەفروتونا دەکات، چ جای شیشانێکی بەستەزمان کە تەنها خەریکی کاری نامرۆیانەی وە بارمتەکردنی قوتابخانەی سەرەتایی مندالان وتەقاندنەوەی میترۆکان وکاری تر، هەرچەندە ڕوسەکان کاری لەوە قێزەونتر دەکەن!.ئێمە کە گوێمان لەو عەقلیەتەی ژنێکی عەرەبی دەبێت ئەوسا دەزانین چیان بە کچانی ئەنفالی کورد کردوە، ئەو ئومەتە هەرگیز بستێك پێش ناکەوێت تا خاوەنی ئەو عەقلیەتە بێت، سەیر لەوەدایە ئەو ژنە دەلێت پرسیاری پیاوانی ئاینیشی کردوە وهەموویان پێیان گوتوە کە ئەو کارە حەلال وزەلالە!! ئەگەر ئایین ودەولەتی ئایینی لەژێر ئەو لافیتانە بۆ بە کۆیلەکردنی خەلك وبەمەڕومالاتکردنیان دەگەڕێتەوە یاخوا هەر نەگەڕێتەوە ودەولەتی عەلمانی سەد هێندە چاکتر وبەبەزەیی ترە..

4/7/2011

لەندەن

# شێخە ستایشکەرەکەی سەددام: عائز القرني کتێب دزیش دەرچوو

دەڵێن شاعیرێکی گەورەی وەک فورەزدەق دەڵێت: "چاکترین دزی ئەوەیە کە دەستی تێدا نابڕێت" کە مەبەستی لە دزینی شیعر و وێنەی شیعری وئەندێشەی کەسانی تر بوە .بەڵام ئەگەر یەکێک بیرۆکەی شیعرێکیش بدزێت لە پاڵ دەیەها شیعری خۆی لەوانەیە خۆ ڕزگار کردن زەحمەت بێت، بە بیانووی لێکچوونی ئەندێشەیی یان ئەوەی عەرەب پێی دەڵێت [توارد الخواطر] بەڵام بێیتو کتێبی خەڵک سەرتاسەر بدزێت وتەنها چەند دیکۆرێکی بۆ زیاد کەیت وەک گۆڕینی ناونیشانەکانی یان پاش وپێشخستنی بابەتەکانی یان زیاد کردنی چەند بابەتێکی لاوەکی کە هیچ شتێک نەخاتە سەر ناوەرۆکی دزراوی کتێبەکە، ئەوەیان دزییە بە ڕۆژی ڕوناک. بێگومان ئەو جۆرە دزیانە زۆر دەکرێت بەڵام لەبەر نەبوونی چاودێری ورەخنەگرانی چالاک زۆربەی ئەو دزیانە پەردەپۆش دەکرێت وبەسەر خەڵکدا تێدەپەڕێت.

ئینجا ئەو دزیانە کەسانێک دەیکەن کە لەڕووی ڕەوشتیەوە زۆر پەڕپوت بن وبیانەوێت بەسەر شانی خەڵک سەرکەون یان حەزیان لە زیادکردنی بەرهەمی چاپکراویان بێت بە خێرا تا لەناو مەجلیسدا بڵێن"من ئەوەندە کتێبی چاپکراوم هەیە!" من خۆم حالەتێکی وام دۆزیەوە بەڵام لەبەر چەند ئیعتبارێک بێدەنگیم لێکرد، ئەوەی سەیرە لەو حالەتەدا ئەوەیە کە ئەو کەسەی دزیە ئەدەبیەکەی کردوە لە هیچی کەم نییە لە شوهرەت وناوبانگی و ئەستێرەی کەناڵە ئاسمانییە خەلیجیەکانە ولە ڕووی مادیشەوە تابڵێی دەوڵەمەندە، کەوابوو بۆ دەبێت ئەو پیاوە لەو ئاستەوە ئەو کارە سوکە بکات وهەوڵ کۆششی ئافرەتێک بدزێت کە مامۆستای سەرەتایی و دایکی منداڵێکی نەخۆشە بە نەخۆشی ئۆتیزم ؟؟!!

بەڕاستی لە هەندێک حاڵەتە دزیەکانی بەناوبانگان بۆم دەردەکەوێت کە دزی کردن جاروبار وەک نەخۆشییە دەنا بۆ دەبێت کەسێکی میدیایی بەناوبانگی وەک [ئەلان شوگەر] خۆی ئیحراج کات ولە سوپەر مارکیتێک چەند میوە و سەوزەیەک بدزێت کە هەموویان نرخی ١٠ دەقیقەی کاری ئەوی نەدەکرد؟!

سلوی العضیدان خاوەنی کتێبی [هکذا هزموا الیأس] بەر لە دادگایی کردن دەڵێت کاتی خۆی کە ئەو کتێبەم نووسی بە هەزار دەردەسەری وبێ کاتی کە منداڵە نەخۆشەکەم زۆربەی کاتی داگیرکردووم، یەکەم دانەم بە دیاری نارد بۆ شێخ عائز قەرەنی وکە ئەویش سوپاسنامەیەکی بۆ ناردم، لە دواییدا بۆم دەرکەوت کە ئەو کتێبەی منی کۆپی پەیس کردوە وناوی خۆی خستۆتە سەر لەگەڵ گۆڕینی چەند دیکۆرێکی لەفزی، ئەوە گەورەترین خەنجەر بوو کە پێم کەوتبێت لە ژیاندا، من تاوانباری شێخ عائز قەرەنی ناکەم چونکە تاوانبار کردن بوارێکی تێدایە بۆ گومان وبەرگری لە خۆکردن، بەڵکو باسی هەقیقەتێکی ئاشکرا دەکەم وەک خۆر لە سەعات چواری ڕۆژدا، کتێبی [لا تیأس] ی شێخ عائز قەرنی

٩٠٪ لە کتێبی مندا دزراوە بە هەمان داڕشتنی من بۆ بابەتەکان وبەهەمان کۆمێنتەکانی من وبە هەمان هەڵەی چاپکردن، ئەوەی مایەی پێکەنینی گریانهێنەرە ئەوەیە هەتا سەرەتاییەکەی کتێبەکەم کە بەخۆم نوسیبوم بیرۆکەی خودی خۆم بوو، کرابوە بابەتێك وخزاندراوەتە ناو بابەتەکان!! چۆن نەڵێم گەورەترین تانەم لێدراوە لە ژیانم، شێخ عائز قەرەنی وەک نمونە وقدوەیەک بوو بۆ من لە هەوڵ وکۆشش وپشت بەخۆبەستندا کەچی دێت وئەو کۆششەی من لە ماوەی چوار ساڵدا بۆ نوسین وکۆکردنەوەی بابەتی کتێبەکەم ]هكذا هزموا اليأس] لە نێوان شەو ورۆژێکدا دەدزێت!!

ئینجا لەو چاوپێکەوتنە دەڵێت کەوا خۆیی و مێردەکەی قسەیان کردوە لەگەڵ شێخ عائز کە تێیدا بە ئاشکرا دانی بەو دزییە ئەدەبییە ناوە کە بە قەولی الفرزدق ]دەستی لەسەر نابڕێت] وداوای لێبوردنی کردوە بەڵام ئەو شێرە ژنە نەکەوتۆتە ژێر کاریگەری شەرم و عفا الله عما سلف، بەڵکو سێ مەرجی بۆ شێخ داناوە کە:

-١داوای لێبوردنێکی بە نوسین دەست.

-٢پەیمان دان بە بڵاونەکردنەوەی کتێبەکە

-٣کێشانەوەی لە بازاڕەکاندا.

بەڵام شێخ ڕازی نەبوە، بۆیە ئەویش مەسەلەکەی هەموو داوەتە دادگایەکی تایبەت بە وەزارەتی ڕاگەیاندن، لیژنەی مافی دانەر لەو وەزارەتە لە پاش خوێندنەوە و بەراوردکردنی دوو کتێبەکە بڕیاری سزادانی شێخ عائز قەرەنی دا بە بڕی ٣٣٠،٠٠٠ هەزار ریاڵی سعودی، کە ٣٠٠،٠٠٠ درایە سلوی العضیدان وەک قەرە بوو، هەروەها بڕیاری کێشانەوەی کتێبە دزراوەکەی شێخ عائز قەرەنی درا لە بازاڕەکاندا وخرایە سەر لیستی قەدەغەکردنی هێنانی لەدەرەوەش!

ئینجا لەپاش ئەوەی بڕیاری دادگاش دەرچوو بەکاوەخۆ شێخ عائز قەرەنی هاتە سەرخەت ونوسەری کتێبەکە دەلاوێنێتەوە بەقسەی شیرین وکچی شیرینم وبەڵام هێشتا بە ڕاشکاوی دانی پیا نانێت و دەڵێت وەرە ئەوە لەو ٩٠ کتێبەی من چاپم کردوە هەرچیەکەت بە دڵە بیبە!! بەڵام لە تەعویزی چیدا؟! دەبێ ئەو ٩٠ کتێبە چۆن تەئلیف کرابێت؟؟ الله اعلم. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە ئەو لینکانە:

http://alweeam.com/archives/28444

http://www.alarabiya.net/articles/2012/01/23/190083.html

http://www.alarabiya.net/articles/2012/01/24/190261.html

کتێبێکی تریش

هێشتا لەو کێشەیە دەربازی نەبوە شێخە ستایشکەرەکەی صدام لە لایەن شاعیرێکی میسری بە ناوی سمیر فراج تۆمەت بار کرا بە دزینی کتێبێکی بە ناونیشانی: " شعراء قتلهم شعرهم" کە لە چاپی مكتبة مدبولي قاهیرة یە لە ساڵی ١٩٩٧ ، کتێبە دزیاریەکەی شێخ بە ناونیشانێکی نزیك لەوە بڵاوکرایەوە بەناوی: "قصائد قتلت أصحابها"، کە لەدوای شەش ساڵ لە چاپکردنی یەکەم کتێبدا چاپکراوە. من لەوە زیاتر ناتوانم قسە لەسەر کتێبی دوەم بکەم چونکە کێشەکە هێشتا لە سەرەتایە.

دەتوانیت بۆ زانیاری زیاتر ئەو لینکە بخوێنیتەوە:

http://www.masdr.net/inf/news-action-show-id-9746.htm

لە٢٨ /١٢/ ٢٠١١بابەتێکم بڵاوکردەوە بەناوی [شێخ عائز قەرنی و قەسیدەکەی سەدام : بەدرۆخستنەوەیەکی درەنگ] تێیدا گومانم خستبوە سەر ئەو بە درۆخستنەوە درەنگەی شێخ عائز قەرنی بۆ قەسیدەکەی سەدام وەک لەو نوسینە هاتبوو: " لە پاش لە سێدارەدانی سەدام وئەو هەرایەی نایەوە گوایە لە رۆژی جەژن ورۆژێکی پیرۆز لە سێدارە دراوە، هەر لەو کاتانەدا کە عەرەب کێرڤی عەرەبچیەتی وسوننەچێتیان زۆر بەرز ببوەوە، هەر لەو ساتانەدا قەسیدەیەک بەناوی شێخێکی داعیەی بەناوبانگ شێخ عائز قەرەنی بڵاوبوەوە لەسەر سەدام کە سەرتاسەری ستایشی سەدامی [شەهیدی عروبە وئیسلام بوو] ڕاستییەکەی لەبەر هەلوێستی عەرەب بە گشتی وسعودیەکان بە تایبەتی ئەو قەسیدەیە زۆر لەگەڵ کەشی گشتی روداوەکە دەگونجا وکەس گومانی لە ڕاستی قەسیدەکە نەبوو" من گەیشتبومە ئەو باوەڕەی کە ئەو قەسیدەیە ئەگەر هی شێخ عائز قەرنی یش نەبێت بەڵام لەبەر حەزی شوهرەت کە شێخ ئامادەیە دزی بۆ بکات خۆی لێ گێل کردوە تازە لەبەردەم چەند کوردێکی سادە وبێ ئاگا قەسیدەکە بە درۆ دەخاتەوە : " وابزانم شێخ عائز قەرنی لەگەڵ ئەجوائەکە ئاوێتە ببوو لای خراپ نەبوو لە ڕێی ئەو قەسیدەیە ئەگەر هی ئەویش نەبوبێت کەمێک سەرسامی وحەزی شوهرەتی زیاتر بخاتە سەر ئەوەی هەیەتی!! بەتایبەتی خۆشەویستی سەدام لەو رۆژگارە وتا ئەمڕۆش لای زۆر لە عەرەب جێگای شانازی کردنە نەک شەرمەزاری، ئەگەر ئەو قەسیدەیە لە ستایشکردنی سوڵحی نێوان عەرەب وئیسرائیل یان لە ستایشی خومەینی با بۆ نموونە ئەو هەموو ساڵەی دەویست شێخ عائز قەرەنی بێدەنگ بێت ولە موناسەبەیەکی بچوکی کوردان لەبەر دڵی ئەوان تازە ئەو قەسیدەیە بەدرۆ بخاتەوە؟؟ "

پاش ئەو دزینە ئەدەبیە من یەك تۆزقاڵ گومانم نەماوە کە قەسیدەکەی سەدامیش هەر هی خۆیەتی، چونکە ئەوەی دزی ئەدەبی بکات لە پێناو شوهرەتدا کە خەریکە دەتەقێتەوە لەبەر پری شوهرەت زۆر ئاسانە درۆش بکات لەبەر ئیحراج بوونی بەردەم چەند گەنجێکی کورد بڵێت من شێخە ستایشکەرەکەی صدام نیم.

٢٠١٢/١/٢٤

# شێخ عائز قەرنی و قەسیدەکەی سەدام : بەدرۆخستنەوەیەکی درەنگ

لە پاش لە سێدارەدانی سەدام وئەو هەرایەی نایەوە گوایە لە ڕۆژی جەژن ورۆژێکی پیرۆز لە سێدارە دراوە، هەر لەو کاتانەدا کە عەرەب کێرڤی عەرەبچیەتی وسوننەچێتیان زۆر بەرز ببوەوە، هەر لەو ساتانەدا قەسیدەیەک بەناوی شێخێکی داعیەی بەناوبانگ شێخ عائز قەرەنی بڵاوبوەوە لەسەر سەدام کە سەرتاسەری ستایشی سەدامی [شەهیدی عروبە وئیسلام بوو]

ڕاستییەکەی لەبەر هەڵوێستی عەرەب بە گشتی وسعودیەکان بە تایبەتی ئەو قەسیدەیە زۆر لەگەڵ کەشی گشتی روداوەکە دەگونجا وکەس گومانی لە ڕاستی قەسیدەکە نەبوو تەنها کەسانێک کە شێخ عائز قەرنی یان دەناسی ودەیانزانی کە داعیەکی وا بەناوبانگە و کتێبەکانی بە سەدان هەزار چاپ دەکرێت وملیۆنەها خەڵک گوێی بۆ دەگرێت لە غەیری عەرەب کەمێک گومانیان هەبوو لە مەسەلەکە، بۆیان هەرس نەدەکرا یا شێخ بەو جۆرە ستایشی ئەو ملهوڕە بکات وپلەی شەهادەتی بداتێ وبەو شێوەیە زیادەڕەوی بکات لە ستایشکردنی، بەڵام ئەوەی زیاتر جێگای سەرسورمان بوو بێدەنگی ئەو کابرایە بوو بەرامبەر بڵاوبوونەوەی ئەو قەسیدەیە لە زۆربەی سایتە عەرەبیەکان، تۆ بڵێی ئەو پیاوە کە ڕۆژانە لە چەندین سکرین وکەناڵی ئاسمانی وئەرزی دەردەچێت ئاگاداری ئەو هەرایە نەبوبێت کە قەسیدەی ئاماژە پێکراو نابیەوە؟؟!! من گومانم هەیە، هەرچەندە وەک رای شەخسی خۆم شێخ عائز قەرەنی لە چاو شێخە توندڕەوەکانی سعودیە بە حەوت ئاوان شوراوەتەوە، بەڵام بێدەنگی بۆ ئەو هەموو کاتە جێی گومانە، چونکە ئەگەر خۆشی نەیدیبێت ئەوە دۆست وئەحبابی شێخ لە ژمارنایەن لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت، بڵێی کەسێک پێی نەگوتبێت یان کەسێک ستایشی نەکردبێت لەسەر قەسیدەکەی لەدژی [شیعە رافیزە مەلعونەکان]؟!

وابزانم شێخ عائز قەرەنی لەگەڵ ئەجوائەکە ئاوێتە ببوو لای خراپ نەبوو لە ڕێی ئەو قەسیدەیە ئەگەر هی ئەویش نەبوبێت کەمێک سەرسامی وحەزی شوهرەتی زیاتر بخاتە سەر ئەوەی هەیەتی!! بەتایبەتی خۆشەویستی سەدام لەو رۆژگارە وتا ئەمرۆش لای زۆرینەی عەرەب جێگای شانازی کردنە نەک شەرمەزاری، ئەگەر ئەو قەسیدەیە لە ستایشکردنی سوڵحی نێوان عەرەب وئیسرائیل یان لە ستایشی خومەینی با بۆ نموونە ئەو هەموو ساڵەی دەویست شێخ عائز قەرەنی بێدەنگ بێت ولە موناسەبەیەکی بچوکی کوردان لەبەر دڵی ئەوان تازە ئەو قەسیدەیە بەدرۆ بخاتەوە؟؟ دیسان باوەر ناکەم، شێخ عائز قەرەنی خۆی چاک؛ دەزانێت کە تا ئێستا ملیۆنەها کەس بەو قەسیدەیەی سەدام هەڵخەڵەتاون وهەزارەهاش رقیان لە شێخ وبەڵکو خودی ئیسلامیش بۆتەوە سەبارەت بەو قسە تورەهاتانەی ناو قەسیدەکە، سەیر نییە پاش ئەو هەموو ساڵە یا شێخ تازە بە درۆی بخاتەوە؟ ئەی ئەو هەموو کاریگەرە

نێگەتیڤانەی ئەو قەسیدەیە دروستی کردوە چۆن یا شێخ قەرەبووی دەکاتەوە؟! لە هەمووی سەیرتر یا شێخ لەژێر کاریگەری پرسیار ونیگەرانی چەند کوردێک پاش ئەو هەموو ساڵە دێت ولە سوچێک ئەو درۆیە گەورەیەی کە گوایە لەسەر زمانی ئەو هەڵبەستراوە بە درۆی دەخاتەوە هێشتا ئەگەر بابەتەکە گوگل بکەیت نایدۆزیتەوە.

بۆ نموونە بنوسە [الشیخ عائض القرنی و صدام] تەنها قەسیدەیەکی پڕ لە ستایشی سەدام ت دەداتێ، واتە هێشتا شێخ هێندە لای گرنگ نییە بە بەیاننامەیەکی نوسراو وبیستراو و بینراو لە سایتە عەرەبیەکان وسەلەفیەکان بەتایبەتی ئەو قەسیدەیە پڕ لە تاوانە بەدرۆ خاتەوە، کاکی کوردی هەمیشە ساویلکە سیفەتیش دڵی زۆر خۆشە بە قسەکانی یا شێخ وەک لە ڤیدیۆکەی بۆنەیەکی ئایینی لە بەریتانیا دەردەکەوێت لەپاش تەواو بوونی قسەکانی پڕ دەداتە سەری شێخ وماچی دەکات، نازانن جاروبار داوای لێبوردنی درەنگ لە تاوانەکە تاوانترە، کەنگر و ماست بەوەختی خۆی.

سەرنج: بۆ دیتنی ڤیدیۆکە ئەو لینکە بەکار بێنە:

http://dangiislam.org/news/5967

Wednesday, 12.28.2011, 12:00 PM

# فەتوای ئیبن عسێمین لە حەڕامکردنی فێربوونی زمانی ئینگلیزی!

ئیبن تەیمیە لە کتێبی اقتضاء الصراط المستقیم.. دەڵێت زمانی عەرەبی دروشمی ئیسلام و خەڵکەکەیەتی، دروست نیە موسڵمان بە غەیری عەرەبی قسە بکات" ل٢٠٣

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل پرسیاری لێکرا دەربارەی نزاکردن بە فارسی؟ گوتی زمانێکی خراپە، کە ناشێ سویندی پێ بخورێ یان نوێژ وهەموو عیبادەتەکانی تری پێ بکرێت! ل ٢٠٤

ئیبن عەمەر لە پێغەمبەر (د.خ) دەگێڕێتەوە دەڵێت: ئەوانەی عەرەبی بزانن بە چاکی، با بە زمانێکی عەجەمی واتە غەیرە عەرەبی قسە نەکەن چونکە دەبێتە هۆی دروست بوونی نیفاق!! (.. عن نافع عن ابن عمر رضي الله عنهما قال: " قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: من يحسن أن يتكلم بالعربية فلا يتكلم بالعجمية فإنه يورث النفاق) ل ٢٠٥

زانراوە کە ڕاهاتن لەسەر قسەکردن بە غەیری زمانی عەرەبی تا دەبێتە عادەت کارێکی شەرعی نییە، چونکە دەبێتە هۆی خۆشەویستی خاوەنی ئەو زمانانە لە کافرەکان، ئەوەش پێچەوانەی عەقیدەی وەلا و بەڕا یە وەك ئیبن تەیمیە دەڵێت: "بزانە ڕاهاتن بە زمانێك زۆر بە توندی و ئاشکرا کاردەکاتە سەر عەقڵ و ڕەوشت و دین، کاریش دەکاتە سەر پێچوون بە بەرایەکانی ئەو ئومەتە لە ئەسحابە و تابیعیەکان، پێچوون بە ئەوانیش عەقڵ و دین و ڕەوشت زیاد دەکەن" ل ٢٠٧

من وایدەبینم ئەوەی مندالآنی خۆی فێری زمانی ئینگلیزی بکات لە مندالّیەوە، ڕۆژی قیامەت لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت، چونکە دەبێتە هۆی خۆشەویستی ئەو منداڵە بۆ ئەو زمانە، ئینجا خۆشەویستی ئەوانەی قسەی پیدەکەن، ئەوە بە نسبەت ئەوەی منداڵی لە بچوکیەوە فێری ئینگلیزی کرد یان زمانی تر"

ئەوە دکتۆرە بلیمەتەکەی کورد عبدالواحیدیش لەوەی کۆپی کردبوو؟! هیچ قسەیەکی قۆڕ ناکرێت لە جەزیرەی عەرەبی ئیللا دەبێت وەربگێڕدرێتە سەر کوردی!

فتوى ابن عثيمين في تحريم تعلم اللغة الإنجليزية!

بسم الله الرحمن الرحيم والصلاة والسلام على سيد الأنبياء والمرسلين نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين، قال شيخ الإسلام ابن تيمية عليه رحمة الله في كتابه "اقتضاء الصراط المستقيم مخالفة أهل الجحيم " فإن اللسان العربي شعار الإسلام وأهله ، ولايصح لمسلم التكلم بغيره ... ) ص٢٠٣

وقد سئل الإمام أحمد بن حنبل رحمه الله عن الدعاء في الصلاة بالفارسية ؟ فكرهه . وقال: لسان سوء ولايصح الحلف بها ولا الصلاة ولاسائر العبادات. ص ٢٠٤

وقد روى السلفي من حديث سعيد بن العلاء البرذعي حدثنا إسحق بن إبراهيم البلخي حدثنا عمر بن هارون البلخي حدثنا أسامة بن زيد عن نافع عن ابن عمر رضي الله عنهما قال : قال رسول الله صلىالله عليه وسلم ( من يحسن أن يتكلم بالعربية فلا يتكلم بالعجمية فإنه يورث النفاق ) ص٢٠٥

ومعلوم أن اعتياد التكلم بغير العربية حتى يكون عادة أمر غير مشروع لأن يورث محبة أهل تلك اللغة من الكفرة وهو مخالف لعقيدة الولاء والبراء من الكفار. قال شيخ الإسلام ابن تيمية رحمه الله : (واعلم أن اعتياد اللغة يؤثر في العقل والخلق والدين تأثيرا قويا بينا، ويؤثر أيضا في مشابهة صدر هذه الأمة من الصحابة والتابعين ، ومشابهتهم تزيد في العقل والدين والخلق) ص٢٠٧ والذي أراه أن الذي يعلم صبيه اللغة الإنجليزية منذ الصغر سوف يحاسب عليه يوم القيامة ؛ لأنه يؤدي إلى محبة الطفل لهذه اللغة ، ثم محبة من ينطق بها من الناس ؛ هذا من أدخل أولاده منذ الصغر لتعلم اللغة الإنجليزية أو غيرها من اللغات .

# تێڕوانینی داعشی موسڵمانانی عەرەب بۆ کورد
# ئەبو بەسیری تەرتووسی وەك نموونە

-١-

ئەبو بەسیری تەرتووسی یەکێکە لە مەرجەعە گەورەکانی جیهادیەکانی عەرەب، ناوی ڕاستی خۆی عبدالمنعم مصطفی حليمة یە، لە ١٩٥٩ لە شاری تەرتوسی سوریا لە دایك بووە، لە خێزانێکی سەلەفی. هەر لە ١٧ ساڵیەوە بەژداری کرد لە شۆڕشی ئیسلامی ئیخوانی لە حەما و حەلەب. دوایی ڕایکرد بۆ ئوردن، ئینجا بۆ عێراق و پاکستان، لەوێش بۆ ئەفغانستان، لە پیشاوەر عبدالله عەزامی ئەمیری جیهادیەکانی عەرەبی ناسی، و بووە کەسێکی نزیکی.

لە ناوەڕاستی هەشتاکان گەڕایەوە ئوردن، لە ١٩٨٧ لە شاری زەرقی ئوردن نیشتەجێ بوو لە گەڕەکی "حي معصوم" بووە هاوسێی ابو مصعب الزرقاوي، خۆی لە کتێبێکی دا دەڵێت: " ماڵی زەرقاوی چەند دە مەترێك لە من دوور بوو، لە سەرەتای پابەندبوونی، کەیفی بە من و بە چەند کتێبێکم دەهات. زەرقاوی لە زۆر بابەتدا دەگەڕایەوە لای من و پرسی پێ دەکردم" هەر بۆیەش زەرقاوی ئەو سەربرەی لێ دەرچوو!

دوایێ لە ئوردن دەرکرا بۆ یەمەن و بۆ مالیزیا و دوایی تایلەند، لە کۆتاییدا لە بەریتانیا، لەندەنستان گیرسایەوە!

لە سەرەتای شۆڕشی سوریا زۆر هەوڵی دەدا ببێتە شۆڕشێکی خوێناوی، کە بووە شۆڕشی چەکدار گووتی: "ویستیان شۆڕشێکی ئاشتی غاندیانە بێت، بەڵام خوا هەر ویستی ببێتە جیهادێك لە ڕێگای ئەودا" یانی ئەو داعشیە گاڵتەی بە غاندی دێت!

لە ٢٠١٢ گەڕایەوە تورکیا بۆ جیهاد، دوایی بۆ ناو سوریا، لەوێ حركة احرار الشام ی دروست کرد، کە لە یەکگرتنی "حركة الفجر الإسلامية" و "لواء الحق" پێك هات.

زۆر شانازی نەك بە سەلەفیەتی بەڵکو بە وەهابیەتیشی دەکات، و وتارێکی دوور ودرێژی نووسیوە بە ناوی: بەڵێ من وەهابیم! تێیدا هاتووە: هەرچەندە حەز لەو ناوە نوێیانە ناکەم کە موسڵمانان لێك جیادەکاتەوە و یەکیان ناکات، بەڵام من بە ڕاشکاوی دەڵێم کە من وەهابیم، شانازیشە بۆم الشيخ محمد بن عبد الوهاب م خۆش بوێت و دەعوەکەینم خۆش بوێت. دەربارەی دەسەڵاتدارانی سعودیە دەڵێت: ئەگەر لەسەر ڕێگای وەهابی ڕاست برۆن، خێری هەبوو بۆ خۆیان و نەتەوەکەیان"!

سەلەفیە جیهادییە کوردەکان تەرتوسی لایان گرنگە، دەیان پرسیاری شەرعی لیدەکەن، کاتی خۆی پرسیاریان لێکردیش لەسەر عەلی باپیر و پەیوەندی لەگەڵ یەکێتی، بەو شێوەیە لە سایتە کوردیە سەلەفیەکان هاتووە:

"ئایا بۆ موسڵمان دروستە دۆستایەتی مورتەددەکان بکات یاخود یارمەتییان بدات یان هێندێك شوێنە سەربازییەکانی خۆی و چۆلیبکات بۆ ئەوان بۆ ئەوەی موسڵمانان بکوژن .. ... تاوەکو وێنەکە ڕۆشن بێت من دەربارەی عەلی باپیر و ڕێککەوتنەکەی لەگەڵ یەکێتی نیشتیمانی کوردستان دژی برایانی ئەنصار ولئیسلام پرسیار دەکەم .. وبارك الله فیکم وجزاکم خیرا؟

وەڵام: الحمد لله رب العالمین.

ئەوکەسەی یارمەتی مورتەددەکان و جگەلەوانیش لە کافرە موجریمەکان دەدات لەدژی موسڵمانە یەکخواپەرستەکان ، ئەوە کافر وموجریمە وەکو ئەوان ، ئەوەی عەلی باپیریش کردی .. بێگومان ئێمە بیستمان .. بریتییە لە خیانەت وغەدر وکوفر .. هەروەها ئەم پیاوە – بەهۆی ئەو کارە بەدوخراپانەی کە لێی زاندراوە – لەلای ئێمە تۆمەتبارە !!!

یەکسەر کافری کرد و لەلای جەنابی تۆمەتبارە!"

# بەیانێك بۆ ئەكراد

-٢-

كە ئەبو بەسیری تەرتوسی گوێی لێدەبێتەوە، كوردێك قورئانی سوتاندبوو لە یادی ئەنفالدا لە وڵاتێكی ئەوروپادا لە ٢٠١٠ ئەو زانایە گەورەی سەلەفیەتی جیهادی، ابو بصیر الطرطوسي، بەیانێكی هێندە سەیر وپڕ لە هەڵە وحیقدی لەسەر كورد بڵاوكردەوە، كە هەقیقەتی هەڵویستی دەروونی مێژوویی موسڵمانانی عەرەب و تورك و ئیسلامیەكانیان بەرامبەر كورد دەردەكات. لە سەرەتاوە دەڵێت: " إلى الأكراد بعامة، وأكراد العراق وسورية بخاصة، السلام على من اتبع الهدى منكم، وبعد."

[بۆ ئەكراد بە گشتی، و ئەكرادی عێراق و سوریا بە تایبەتی..] یانی دەنەفەرێك یا بابڵێین هەزار نەفەرێك خۆپیشاندانیان كردوە، نەفەرێك قورئانی سوتاندوە، تەرتووسی وتارەكەی ئاراستەی هەموو كورد دەكات، كوردی عێراق و سوریا بە تایبەتی! وەك بڵێی هەموو كورد ئەو كارەیان كردبێت، ئەوە فلمێكی ئەمریكیم بیردەهێنێتەوە، كە فرۆكەیەكیان لە كوردستان كەوتبوە خوارە، لەو شوێنە شاخایە بە پەرەشوت دابەزین، و سەربازێك بڵندگۆیەكی لەدەست بوو هاواری دەكرد، ئەی گەلی كوردستانی عێراق! بەس ئەو دەرهێنەرە كورد نەناسێ ئاساییە، بەڵام ئەو تیرۆرستە خەڵكی سوریایە، كە ڕۆژانە كورد دەبینن و تێكەڵاوی دەبن، كەچی وەک ئەمریكیەكە قسە ئاراستەی هەموو گەلی كوردستانی هەر چوار پارچە دەكات، عێراق و سوریا بە تایبەتی! ئینجا سەلامەكەشی " السلام على من اتبع الهدى منكم، وبعد" حادەتەن بۆ كافر و بێ باوەڕان بەكار دێت!

ئەو بلیمەتە و زانایە بەردەوام دەبێت بە دواندن بە زمانی كۆ دەڵێت: " دەستدرێژی بەردەوای ئێوە بۆ سەر كتێبی خوامان پێگەیشتووە، بە سوكایەتی پێكردن و سوتاندنی لەبەرچاوی خەڵكی گشتی و تایبەتیدا!" ئەوە گوزارش لەو ڕایە خراپە گشتییەی ئیسلامیەكانی عەرەب دەكات، بە هۆكاری سیاسی و مێژوویی دژی كورد، دەنا هەزاران كەس لە سعودیە و میسر و جەزائیر و سوریاش گەورەترین سووكایەتی بە قورئان و ئیسلام دەكەن، بۆ بەیانێكی بۆ گەلی پاكستان یا میسر یا سوریا دەرنەكرد لەبەر سوكایەتی پاكستانیەك یان جەزائیریەك یان میسریەك یان سوریەك بە قورئان؟!

# هێشتا کورد ڕەگەزپەرستە لای داگیرکەرانی کوردستان و کوردە فریوخۆرەکان

-٣-

دیاردەیەکیتریش هەیە لەناو عەرەب و موسڵمانان، کە کارەساتێکە بۆ عەقڵ، ئەوەش ئەوەیە سەرەڕای چەوساندنەوەی کورد بەدەستی سێ نەتەوەی سەرەکی ئیسلام: عەرەب و تورك و فارس، کەچی هێشتا چاوەڕوانی ئەوە نین کورد بچوکترین بەرگری لە وجود و مانی خۆی بکات، بۆیە هەر کە بەرگری لە خۆی دەکات، و باسی چەوساندنەوەی نەتەوەیی خۆی دەکات، یەکسەر بە ڕەگەزپەرستی تاوانباری کورد دەکەن، هیچ ڕەگەزپەرستیەک لە داگیرکردنی کوردستان و کوشتنی رۆلەی کورد و لەناوبردنی خەونی نەتەوەیەك بۆ ئازادی نابینن! تەڕتووسی دەڵێت: "... هەروەها ئێمە لە بەیانات و وتارە ڕەگەزپەرست و نەتەوەپەرستەکانتان بێ ئاگا نین، کە لەسەر بنچینەی ئیلحاد و جیاوازی نانەوە و، دوژمنایەتی ئیسلام و خەڵکەکەی بنیات نراوە!" كما أننا لا نجهل خطاباتكم وبياناتكم القومية والعنصرية الحاقدة .. والمتكررة .. التي تقوم على الإلحاد، وبث الفرقة .. واستعداء الإسلام وأهله!"

ئەو هەڵوێستەیان کاری کردۆتە سەر زۆر کورد، کە بێ هەڵوێست بن و دەروون بەزیو بن، و هەتا شەرم لە کوردبوونی خۆیان بکەن، بە تایبەتی ئیسلامیەکان! بەڵام کەسانێکیتریش دوور لە ئیسلام و ئیسلامیبوونیش، نزیکتر لە چەپ گەرایی بە هەمان خۆبە سووکزان و کورد سوکزان هەڵوێست وەردەگرێت، و پێی تاوانە ئەگەر کورد بڵێت ئاخ لە ژێر ئەشکەنجەی چەوساندنەوەی نەتەوەییدا!

تەڕتووسی دڵێت: "نەتەوەی عەرەب و نەتەوەی تریشتان کردە دوژمنی خۆتان..کەوتنە داوی خراپترین مانای دەمارگرژی بۆ نەتەوەی کورد...برایەتی شەیتانتان کرد لە دەمارگرژیتان بۆ نەتەوەی کورد.. بریاری جەنگتان دا لە دژی ئیسلام و خەڵکەکەی، و شارستانی و مێژووەکەی..لە پێناو دەمارگرژی بۆ نەتەوەیی نەفامیتان!"

یانی هێشتا کورد دوژمنایەتی عەرەب و تورک و فارسی کردوە، سەرەڕای ئەوەی خاکیان لەلایەن ئەوانەوە داگیرکراوە، و ڕۆڵەکانیان دەکوژرێ بە دەستیان!

ئەوە هەموو ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە کورد دوای چەند حزبێکی ئیسلامی جیهادی نەکەوتن بۆ شەڕی ئەمریکا، لە پێناو عەرەب و سەدامدا، بۆیە دەڵێت: " وەلاتان دایە سەڵیبیەکان..داوای پشتگیری ئەوانتان کرد لە دژی ئیسلام و موسڵمانان..داگیرکردنی وڵاتتان بۆ ئاسان کردن..لەبەر توڕەبوونتان لە پیناو دەمارگرژی نەتەوەی کوردی بۆگەنتان کە لەو ڕۆژانە تیایدا دەژین!"

یانی کورد ئەگەر برا موسڵمانەکانی قڕیشی تێخەن نابێت داوای یارمەتی لە کەس بکات، بە تایبەتی نا موسڵمانان! یانی ئەوان وەك کافر کورد بکوژن، بەڵام نابێت کورد داوای یارمەتی بکات لە خاچ پەرستان

و زایۆنیزمەکان، ئەگەر ئەوان تەنها دەرەتانێکیش بن، و موسڵمانێکیش نەبێت بە هانای بێت؟! ئەوە چ لۆژیکێکی نەخۆش و ستەمکارانەیە؟!

استعديتم القومية العربية، وغيرها من القوميات .. ووقعتم في أسوأ معاني التعصب للقومية الكردية .. فواليتم وعاديتم في قوميتكم الكردية .. وآخيتم الشيطان عصبية لقوميتكم الكردية .. وأعلنتم الحرب على الإسلام وأهله، وحضارته، وتاريخه .. انتصارا لعصبيتكم القومية الجاهلية.

واليتم الصليبيين، واستنصرتم بهم على الإسلام والمسلمين .. وسهلتم لهم غزو البلاد والعباد .. غضبا للعصبية القومية الكردية المقيتة التي تعيشونها في هذه الأيام!

"دەستدرێژییە ڕاشکاو و دووبارە بووەکانتان بۆ سەر کتێی خوا، پێمان دەڵێن و بە هەموو موسڵمانان دەڵین: کێشەی ئێوە لەگەڵ کیتابی خوایە، لەگەڵ ئیسلامە..لەگەڵ نەتەوەی عەرەب نییە وەك وادەڵێن و دەیپۆشن!

ئێوە ئەو ستەمەی لەسەرتانە بە ستەمێکی گەورەتر ..دوژمنکاریەکی گەورەتر ...کوفرێکی توندتر لەسەر خۆتانی لادەدەن..ئەو ستەمەی سەر ئێوەی لە بیربردینەوە..ڕق وقینەیەکی زۆرتان خستە جەستەی ئومەت..زەحمەتە نەوەکانی داهاتوو لەبیری کەن!"

ومن آخر حلقات حقدكم على الإسلام وأهله .. التي تطالعوننا بها .. اعتداءاتكم الصريحة والمتكررة على كتاب الله تعالى .. لتقولوا لنا وللمسلمين جمعاء: أن مشكلتكم مع كتاب الله تعالى .. مع الإسلام .. وليس مع القومية العربية كما تزعمون وتتسترون!

انتصرتم لدفع الظلم والعدوان عنكم بظلم أشد .. وعدوان أشد .. وكفر أشد .. أنسانا ما تعرضتم له من ظلم .. وأوغرتم في جسد الأمة أحقادا .. يصعب على الأجيال من بعدكم نسيانها!

یانی بەرامبەر کیمیاباران و ئەنفال و سەدان هەزار کوژراوی کورد بە دەستی وڵاتانی عەرەب و تورك و فارس، هیچ نەخوەتێك و ئیمانێکی لای ئەو تیرۆرستە نە بزواندوە، بەڵام بە سوتاندنی قورئانێك لەلایەن نەفەرێك " ئەو ستەمەی سەر کوردی لە بیربردەوە"! یانی زۆر بە بیری بوو پێش سوتاندنی قورئانەکە؟! دەبێت پێش سوتاندنی قورئانەکە، تەڕتووسی چەند کتێب و وتار و سیمناری بەستبیت بۆ کێشەی کورد؟ چەند خۆپیشاندانی کردبێت؟!

# ئێوە بێ ئیسلام یەکسانن بە هیچ!

-٤-

ئینجا شێوازی خۆشی و ترشی، حەزبزواندن و تۆقاندن [ترغیب و ترهیب] بەکار دەهێنێت لەگەڵ کورد و دەڵێت: "کوردەکان، ئێوە بە ئیسلام برای ئێمە بوون و هەر براشمان دەمێننەوە پێی.. دوو دڵیش ناکەین ئەگەر کەسێکمان لە ئێوە دۆزیەوە وەک سەلاحەدینی ئەیوبی. قارەمانیەتی و جیهاد نوێبکاتەوە لە ئومەت...بیکەینە ئەمیر و سەرداری خۆمان.. ببینە سەرباز و پاڵپشتی." یانی دەبیت ببینە قاعیدە و داعش و باقی پۆخڵەواتی سەلەفیەتی جیهادی، یانیش لەناوتان دەبەین! ناوهێنانی سەلاحەدین لەو سیاقە و لەو مێژووە جیاوازە هیچ پەیوەندی بەو سەلەفیەتیە جیهادییە تیرۆرستە نییە، و دوو شتی لێك جیاوازن.

ئینجا شێوازی تۆقاندن بەکار دەهێنێت و دەڵێت: " بەڵام ئەگەر بە ڕاشکاوی جاڕی دەمارگرژی کوردیتان دا، پشتی کوفر و کافرانتان گرت، چونە شەڕەوە لەگەڵ دوژمنانی ئومەت دژی ئیسلام و خەڵکەکەی.پشتگیری ئیلحاد و شیوعیەتتان کرد دژی ئیمان و تەوحید.. بە ڕاشکاوی پێتان دەڵێم – هیچ موسڵمانێکیش نادۆزنەوە پێچەوانەی ئەو قسانەم بێت!- ئێوە ژیانتان نامێنێت لە نێو ماندا و لەگەڵ ئێمەدا..لە جەنگ و دوژمنایەتی و ڕق و قین زیاتر نادۆزنەوە لە نێوان موسڵمانان بە هەموو نەتەوە و گەلەکانیان!"

جیهادیە سەلەفیەکان توانیویانە ئەو وێنەیە دوژمنکارانەی دژی کورد، لە زیهنی ئیسلامیە سەلەفیە جیهادیەکانی جیهان بە عەرەب و کوردەوەش بچێنن!

أيها الأكراد: كنتم ـ ولا زلتم، وستبقون ـ بالإسلام إخوانا لنا .. ولن نتردد لحظة إن وجدنا منكم من يجدد في الأمة سيرة وبطولة وجهاد صلاح الدين الأيوبي المسلم .. أن نجعله علينا سيدا وأميرا.. وأن نكون له جندا وأعوانا.

أما إن أعلنتموها صراحة عصبية كردية؛ توالون الكفر والكافرين فيها، وتعادون الإيمان والمؤمنين فيها .. وتدخلون في حرب ـ مع أعداء الأمة ـ على الإسلام وأهله .. وتنصرون الإلحاد والشيوعية على الإيمان والتوحيد .. أقولها لكم صراحة ـ ولن تجدوا لقولي هذا مخالفا مسلما ـ: أنه لا عيش لكم بيننا ومعنا .. ولن تجدوا من المسلمين بكل أطيافهم، وقومياتهم .. إلا الحرب والعداء، والكراهية والبغضاء!

ئینجا دەڵێت: ئێوە بێ ئیسلام... یەکسانن بە هیچ..وەك منالێکی خراپن کە خۆی لە دایك و باوکی بەری بکات.. وەك گەڵایەکی وشکن کە کرم بیخوات..لە دارێکی گەورە وبەرز لێدەبێتەوە، کە ڕەگی بە قوڵایی زەوی و مێژوودا چووە، و لق و پۆپیشی بە ئاسماندا هەڵچووە!" [١]

أنتم من دون الإسلام .. لا تساوون شيئا .. كولد عاق يتبرأ من أمه وأبيه .. وكورقة يابسة تآكلها الدود

